# تویشووی ڕێبوار



## لە زیکر و یادی پەروەردگار



وەرگێڕاوی

# الأذكار


تأليف:

الإمام الحافظ المحدّث الفقيه أبي زكريّا

يحيى بن شرف النووي

(٦٣١ - ٦٧٦ هـ)

وەرگێڕ:

مامۆستا مەلا ئەحمەد موحەممەد خۆراسانی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | نووی، یحیی‌بن شرف، ۶۳۱ - ۶۷۶ق. Nawawi |
| عنوان قراردادی | : | الاذکارالمنتخبة من کلام سیدالابرار .کردی |
| عنوان و نام پدیدآور | : | توشەی ریبوار وەرگیراوی الاذکاری ئیمام نەوەوی/ وەرگیراوی امجد محمد خوراسانی. |
| مشخصات نشر | | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۶. |
| مشخصات ظاهری | | ۲ج. |
| شابک | | :ج۱. ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۳۱٤-۲ ؛ـ ج۲: ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۳۱۵-۹ ؛ :دوره ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۳۱٦-٦: |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | ذکر |
| موضوع | : | Islamic meditations |
| موضوع | : | ذکر -- احادیث |
| موضوع | : | Islamic meditations -- Hadiths |
| شناسه افزوده | : | محمدخوراسانی، امجد، ۱۹۶۱ -، مترجم |
| رده بندی کنگره | : | BP۲۶۶/۴۵/الف۹ن۴۰۴۷ ۱۳۹۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۲۹۷/۷۷ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۴۷۵۳۷۸۸ |

# تویشووی ڕێبوار

## له زیکر و یادی پەروەردگار

وەرگێڕاوی:

# «الأذکار»ی

## ئیمامی نەوەوی

وەرگێڕ:

ئەمجەد موحەممەد زاهید شێخ موحەممەد خۆراسانی

(بەرگی یەکەم)



انتشارات کردستان

سنه






# تویشووی ڕێبوار


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | تویشووی ڕێبوار |
| ✓ وەرگێڕان (ترجمه): | ئەحمەد موحەممەد زاهیدشیخ موحەممەد خوراسانی |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ۱۳۹۷ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰ بەرگ (دوره) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ۱۲۷۵ لاپەڕە (صفحەی وزیری) |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |
| ✓ شابک: | چ۱: ۲ - ۳۱٤ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸ ؛ ـ چ۲: ۹ - ۳۱۵ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸<br>دوره: ٦ - ۳۱٦ - ۹۸۰ - ۹٦٤ - ۹۷۸ |

✓ نرخ (قیمت): ۲۳،۰۰۰ دینار





سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزّتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن:
سنه ـ پاساژی عیززەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون:

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ

﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ [الْبَقَرَة: ١٥٢]

﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ [الرَّعْد: ٢٨]

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللهَ ذِكْراً كَثِيراً﴾ [الْأحْزَاب: ٤١]

﴿وَاذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ [الْجُمُعَة: ١٠]

# پێشکەش کردن

پێشکەشە بە:

- بەندەی ڕاسالّی یەزدان، سەروەری زیکرکاران، سەرداری پێغەمبەران، حەزرەتی (مُحَمَّد) پێغەمبەری ئاخر زەمان (دروودی خوای لەسەر بێت).
- تەواوی ئەو کەسانەی کە دەقی قورئانی پیرۆزیان بە ڕاستیو دروستی گەیاندوەو، ئەو کەسانەش وا ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوایان ڕیوایەت کردوە، کە سەبارەت بە زیکر کردن هاتوون.
- هەموو ئەو زانایانەی کتێبی تایبەتیان سەبارەت بە زیکر کردن داناوە، بەتایبەتی زانای ناودارو خواناسی کەم وێنە ئیمامی نەوەوی.
- شێخانی هەورامان، پیرانی ڕێبازی خواپەرستی ڕاستەقینە، ڕابەرانی ڕێبازی تەصەوفی نەقشبەندی، بەتایبەتی: شێخ (مُحَمَّد عُثْمَان سِرَاجُ الدِّيْن)ی دوەم.
- مامۆستای گەورەو سەروەرم، خۆشەویستو تاجی سەرم، عەللامەی مەریوانی مامۆستا مەلا (مُحَمَّد أمِيْن)ی کانی سانانی.
- باپیرەی خۆشەویستم، زانای ڕەببانی، مەرحومی مامۆستا شێخ (مُحَمَّد)ی خۆراسانیو، باوکی دڵسۆزو دایکی بەسۆزم، خوای گەورە لەشساغو، عاقیبەت خێریان بکات.
- هەموو شەیدایانی خواپەرستیو زیکر کردن.

## پێشەکی وەرگێڕ:

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس‌و ستایشی بێ پایان بۆ بەدیهێنەری زەوی‌و ئاسمان، پەروەردگاری گشت گیانلەبەران، تایبەت لەناویان گرۆهی ئینسان. درووودو سەلام وەك تاوی باران، بۆ سەر پێشەواو ڕابەری هەموان، سەردارو سەروەر، تاجی سەر سەرمان، گەورەی نێردراوان، حەزرەتی (مُحَمَّد)، پێغەمبەری ئاخر زەمان. هەم بۆ سەر هەموو یارو یاوەران، گشت شوێنکەوتوان، تێکڕای زانایان، هەم خواپەرستان، هەموو ئەوانەش پابەندی دینن، لەسەر گۆی زەوی‌و، لەژێر ئاسمان، تایبەت ئەمانەی خاکی کوردستان. پاشان:

حیکمەتی خوای گەورە لە درووست کردنی جنۆکەو مرۆڤەکان بریتیە لەوەی، بەندایەتی بۆ ئەو بکەن. وەکو خۆی فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾. [الذّاريَات: ٥٦]. واتە: {من جنۆکەو مرۆڤم درووست نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت بەندایەتی من بکەن‌و بمپەرستن}.

بۆیە دەبێت مرۆڤە ئیماندارەکان هەمیشە خوای گەورەو پەروەردگاریان لەبیر بێت‌و، زیکرو یادی ئەو زۆر بکەن. وەکو خۆی فەرمانی کردوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللهَ ذِكْراً كَثِيراً﴾. [الأحزَاب: ٤١] واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، زیکرو یادی خوا زۆر بکەن}. چونکە یادی خوا کردن کارو پیشەی خواناسە گەورەو پایەدارەکانە، لە زیکر توێشووی خۆیان پڕدەکەن‌و، تەمەنی زێڕینی خۆیان خەرج دەکەن‌و، بەردەوام پێوەی سەرقاڵن‌و لێی ماندوو نابن.

هەروەها زیکر کردن پەڕاوی دەستی دۆستانی خوایە، ئەگەر خوای گەورە کەسێکی خەڵات کرد بە تەوفیقدانی بۆ زیکر کردن، ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی پەیوەندی بەهێزی ئەو کەسە بەخوای پەروەردگارەوە، بە پێچەوانەوە ئەگەر لەگەڵ

زیکر کردن پەیوەندی نەبوو، ئەوە مانای وایە خوای گەورە پەراوێزی خستوەو ڕووی لوتفی لێ وەرگێڕاوە.

هەروەها زیکر کردن خۆراکی دڵی ئەولیاو خواپەرستە ڕاساڵەکانە، ئەوانەی کە ئەگەر بۆ ساتێکیش یادو زیکری خوا لەدڵیاندا نەمێنێت، وادادەنێن کە لاشەیان بە زیندوویی بوەتە گۆڕی ڕۆحیانو، ماڵی ئاوەدانی دڵیان وێرانو خاپوور بوەو، چەکی خۆپارێزیو بەرەنگاریان لەدەست داوە لە بەرامبەر چەتەو ڕێگرانی ڕێبازی پیرۆزی خواپەرستی.

دیسان زیکر کردن بریتیە لە ئاوی ڕەوانو سازگار بۆ کپکردنەوەو دامرکاندنەوەی هالاوی ئاگری ڕێگەی خواناسیو، بریتیە لە دەرمانو چارەسەر بۆ بۆ دڵو ناخی مرۆڤەکان، کە ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی چەندەها نەخۆشی ترسناکو دەردی کوشندەیان هەیەو، تەنها ڕێگەی گەیشتنو پەیوەندی بەهێزە لە نێوان خۆیانو خوای پەروەردگاریاندا، کە ئاگای لە هەموو نهێنیو پەنهانێکە.

خواناسە زیکرکارەکان لە ڕێگەی زیکرو یادی خواوە بەلاو نەهامەتی لەکۆڵ خۆیان دەخەنو، هەموو لیقەومانو دەردەسەریەك بە بچووكو ساناو سادە دەزاننو، لەکاتی هەموو ناڕەحەتیو زەحمەتو ترسو بیمێکدا زیکر کردن بە پەناگای خۆیان دەزانن.

هەروەها زیکرو یادی خوا بریتیە لە باخچەی ڕازاوەی بەهەشتی دنیای دۆستانی خوا، کە جۆرەها چێژی بێوێنەی لێ دەبەنو، بریتیشە لە سەرمایەی بەختەوەریو خۆشبەختیان، کە بازرگانی دەستخستنی بەهەشتی هەتاهەتاییو خۆشی نەبڕاوەی پێ دەکەن.

دیسان به زیکرو یادی خوای گەورە دڵە غەمگینو شکاوەکان خۆشحاڵو چەسپاو دەبنو، بێ دەسو بێ کەسەکان خۆیان بە نامۆ نازاننو، دەزانن کە کەسی فریادرەس تەنها خوای باڵادەستە.

هەروەها زیکر کردن بەندایەتیەکی هەمیشەیی دڵو زمانەو، مرۆڤەکان فەرمانیان پێ کراوە کە هەمیشە لە یادو زیکری پەروەردگارە خۆشەویستەکەیاندابن، چی کاتێك بەپێوە ڕاوەستاون، یان دانیشتوون، یان ڕاکشاونو پاڵیان داوەتەوە. چونکە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت وەکو دەشتێکی پانو بەرینی نەرمو سازکراو وایەو، زیکرو یادی خواش نەمامو شەتڵی ئەو دەشتەیە، جا کێ دەیەوێت زۆرترین پانتایی لەو زەویە بەپیتە دەست بکەوێت، با زۆرترین نەمامو شەتڵی بۆ ئامادە بکات.

هەروەها یادی خوا زاخاوی مێشكو پاککەرەوەی ئاوێنەی دڵەکانو چارەسەری نەخۆشیە دەروونیەکانەو، چەندە موسوڵمان لەبیری زیکرو یادی خوای گەورەدا بێت، ئەوەندەش خوای گەورە بە شەوقو لوتفەوە لە پێشوازیو چاوەڕوانی گەیشتنی ئەودایە.

هەروەها زیکر کردن هۆکارە بۆ لابردنی ئەو گوێ قورسیو گران بیستیەی کە تووشی غافڵو بێ ئاگاکان بوونو، هۆکاریشە بۆ کرانەوەو بەربوونی لاڵی زمانیانو، لادانی پەردەی گومڕاییو ڕەواندنەوەی تاریکایی لەسەر چاویان.

خوای گەورە بەلوتفی خۆی زمانو گوێو دڵی زیکرکارانی بە زیکر کردن ڕازاندۆتەوە، هەروەك چۆن ڕووخساریانی بە نوورو ڕووناکی پرشنگدار کردوە. بۆیە کەسی بێ ئاگا خۆی بەرپرسیارە لە نەبینینی چاوەکانیو، لە نەبیستنی گوێیەکانیو، لە شەلەپەتەیی ئەندامەکانی تری لاشەی، چونکە دەرگای فراوانو کراوەی نێوان بەندەو خوای پەروەردگار بریتیە لەم دەرگایە، بۆیە نابێت کەس بەهۆی بێ ئاگاییەوە ئەو دەرگایە لەسەر خۆی دابخات.

هەروەها بەهۆی زیکی خوای گـەورەوە خواناسـان توانیویانـە لـەگـەڵ شـەیتاندا زۆرانبازی بکەنو، بەسەریدا زاڵ بن، هەروەکو چـۆن شـەیتان توانیـویّتی زاڵ ببێـت بەسەر ئەو کەسانەی کە بێ ئاگان لە زیکرو یادی خوا.

بە هەمان شێوە زیکر وەکـو ڕۆحـی کـردەوە چـاکەکان وەهایـە، بۆیـە ئەگـەر کردەوە زیکرو یادی خوای لەگەڵدا نەبێت، وەکو لاشەی بێ ڕۆح وەهایە.

جا دەتوانین بڵێین: زیکر کردن گەلێك سوودو کەڵکی هەیە، لەوانە:

١) هۆکارە بۆ ئەوەی خوای گـەورە بـە لوتـفو میهرەبانیـەوە یـادی بەنـدەکانی بکات. وەکو خۆی فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ [البَقَـرَة: ١٥٢]. واتـە: {دەی ئێوە یادی من بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم}.

زانای پایەبەرز (ابْنُ قَيِّمِ الْجَوْزِيَّة) فەرموویەتی: ئەگـەر زیکـری خـوا تـەنها ئـەم سودەی هەبێت، ئیتر بەسە بۆ فەزڵو ڕێزو گەورەییەکەی.(١)

٢) هۆکاری دەستخستنی پشتیوانیو هاوکاریو لەگەڵبوونی خوای پـەروەردگارە بۆ بەندەکانی. وەکو لە حەدیسی قودسیدا هاتوە، کە خۆی فەرموویەتی: (وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي).(٢)

٣) یـادی خـوای گـەورە تاکـە هۆکـاری ئـارامی دڵو دەروونـە. وەکـو خـۆی فەرموویەتی: ﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾. [الرَّعْد: ٢٨]. واتـە: {هۆشـیاربن کە تەنها بە زیکرو یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن}.

٤) یادی خـوا زۆر کـردن هۆکـاری بەختـەوەریو سـەرفرازی دوارۆژە. وەکـو پەروەردگارمان فەرموویـەتی: ﴿وَاذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾. [الْجُمُعَـة:

---

(١) بڕوانە: الْوَابِلُ الصَّيِّبُ مِنَ الْكَلِمِ الطَّيِّب (تَحْقِيق: سَيِّد إِبْرَاهِيم) / ٤٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٩٤ / بە ژمارە: ٦٩٧٠.

١٠]. واتــه: {ئێــوه زیکــری خــوا زۆر بکــهن، تــاوهکو بهختــهوهرو سهرکهوتووبن}.

٥) یادی خوا کردن دهبێته قهڵایهکی بههێزو بتهو بۆ پاراستنی ئادهمیزاد لـه دهستی شهیتان. وهکو لـهم حهدیسهدا هـاتوه: «وَآمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللهَ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ الْعَدُوُّ فِي أَثَرِهِ سِرَاعاً، حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِينٍ، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ، كَذَلِكَ الْعَبْدُ لَا يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنْ الشَّيْطَانِ إِلَّـا بِـذِكْرِ اللهِ». واتـه: "فهرمانتان پێ دهکهم که زیکری خـوا بکـهن. چـونکه نموونـهی ئهمـه وهکـو پیاوێك وههایه، که دوژمن بهخێرایی شوێنی کهوتبن‌و، ههتا ئهو دهستی دهگاته قهڵایهکی بههێزو بتهوو، خۆی تێدا دهپارێزێت لـهوان. بهههمان شێوه بهنـدهش ناتوانێت خۆی لـه شهیتان بپارێزێت، تهنها به زیکرو یادی خوا نهبێت".[1]

شێخی (ابْنُ الْقَيِّم) فهرموویهتی: ئهگهر زیکری خـوا تـهنها ئـهم سـودو سیفهته جوانهی ههبێت، شایستهی ئهوهیه که بهنده زمانی سست‌و تهمبهڵ نهبێت لـه کردنی زیکری خواو، بهردهوام ڕایبهێنێت لـهسهری، تـا دهقـی پێـوه بگرێـت. چـونکه بـه زیکری خوا نهبێت ناتوانێت خۆی لـه دوژمنهکهی بپارێزێت‌و، دوژمنهکهشـی تـهنها لـه دهرگای غهفڵهت‌و بێئاگاییهوه بۆی دێتـه ژوورهوهو، کـهمین‌و قهرهوڵیشـی بـۆ گرتوه، ههر که ئاگای لـه زیکر نهما، ئیتر ههڵدهکوتێته سهری‌و لـهناوی دهبات.[2]

---

(١) بڕوانه: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٤٨ / به ژماره: ٢٨٦٣، وصَحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَة / ٣ / ١٩٥ / به ژماره: ١٨٩٥، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ١٤ / ١٢٤ / بـه ژمـاره: ٦٢٣٣، والْمُسْـتَدْرَكُ عَلَى الصَّـحِيْحَيْن / ١ / ٥٨٢ / بـه ژمـاره: ١٥٣٤. ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ) فهرموویـهتی: حهدیسـێکی (حَسَن)ی (صَـحِيْح)ـه. ئیمـامی (حَـاكِم)یـش فهرموویـهتی: حهدیسـێکی (صَحِيْح)ـه لـهسهر مهرجی ئیمامی بوخاری‌و موسلیم.

(٢) بڕوانه: الْوَابِلُ الصَّيِّبُ مِنَ الْكَلِمِ الطَّيِّب / ٣٦. شێخی (ابْنُ الْقَيِّم) لـهدوای ئهم فهرمایشتهوه باسی سوودهکانی زیکر دهکات‌و، دهفهرموێت زیاد له سهد (١٠٠) سودی ههیهو، ئهوجا خۆیشی زۆرێکیان باس دهکات.

جا هەر وەكو چۆن جەستەی مرۆڤەكان پێویستی بە دابین كردنی خواردنو خواردنەوە هەیە. بە هەمان شێوە ڕۆحی مرۆڤەكانیش ئەو پێویستیەی هەیە. بەلاّم خۆراكی ڕۆح بریتیە لە یادی خوای پەروەردگار. بۆیە ئەو كەسەی یادی ئەو ناكات بە مردوو دادەنرێت. وەكو هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ) (خوای لیٚ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَثَلُ الَّذِيْ يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِيْ لا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ».[1] واتە: "وێنەی ئەو كەسەی یادی پەروەردگاری دەكاتو، ئەو كەسەش یادی پەروەردگاری ناكات، وەكو دوو كەسی زیندووو مردوو وەهایە".

بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمان
یادی خوا بكات بە دڵ بە زمان
لە كاتی خۆشیو كاتی ناخۆشی
كاتی لەشساغیو كاتی نەخۆشی
ئاگای لە خۆیە بە ڕۆژو بە شەو
یا وا خەریكە چاو ئەچێتە خەو
كاتیٚ مەشغوڵە، گەلیٚ سەرقاڵە
یاخو بیٚ ئیشەو، دەستی بەتاڵە
لەكاتی هەبوونو دنیاداری
لەكاتی نەبوون، واتە: نەداری
چی دەوڵەمەندە یاخو فەقیرە
سەپانە یاخو پاشاو وەزیرە
كاتیٚ كە دنیا لەبۆی دەڕوانیٚ
یاخو موحتاجە بە تیكە نانیٚ
كاتیٚ مناڵە، یا گەنجو جوانە
یا كاتیٚ پیرەو بەرەو نەمانە
كاتیٚ تەنهایە، یا لە نێو خەڵكە
خەریكی كاری چاكو بەكەڵكە
كاتیٚ هاوینەو تەواو گەرمایە
یاخو زستانەو زقمو سەرمایە
بەهارە دنیا سەوزو جوانە
پایزە وادەی گەلاّ ڕێزانە
خولاصە ئەوەی كە داناو ژیرە
كەسێكە هەردەم خودای لەبیرە

زانایانی ئیسلام، پێشەوایانی دین، بایەخێكی زۆریان داوە بە باسی یادو زیكری خوای گەورەو، كتێبی تایبەتیان تێدا داناوە، بۆ ڕۆشن كردنەوەی بەرچاوی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٣ / بە ژمارە: ٦٠٤٤.

موسوڵمانان، تاوەکو بزانن لە هەموو کاتو شوێنێکدا چۆن یادی خوا دەکەن، ئەویش بە پشت بەستن بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت).

جا یەکێك لە ناودارترینو گشتگیرترینی ئەو کتێبانە بریتیە لە کتێبی (أَذْكَار)ی ئیمامی نەوەوی، کە ناوە تەواوەکەی بریتیە لە: (حِلْيَةُ الْأَبْرَارِ وَشِعَارُ الْأَخْيَارِ فِي تَلْخِيصِ الدَّعَوَاتِ وَالْأَذْكَارِ الْمُسْتَحَبَّةِ فِيْ اللَّيْلِ والنَّهَار)، واتە: (**خشڵی چاکەکارانو دروشمی هەڵبژێردراوان لە پوختەی ئەو پاڕانەوەو زیکرانەی کە لە شەوو ڕۆژدا سوننەتن**).

ئەوجا زۆر کەمن ئەو کتێبخانە گشتیو تایبەتیانەی، کە ئەم کتێبەیان تێدا نەبێت. زۆریش کەمن ئەو خوێندەوارانەی، ناوی ئەم کتێبەیان نەبیستبێت. زۆریش کەمن ئەو خواناسو پیاوچاکانەی، کە سوودیان لێ وەرنەگرتبێت. زۆریش کەمن ئەو نووسەرانەی، کە لە بواری زیکرو یادی خوادا کتێبیان دانابێتو، وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی پشتیان بەم کتێبە نەبەستبێت.

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو شت:

١) خاوەنی کتێبەکە یەکێکە لە زانا شەرعزانە فەرموودەناسە ناودارە شارەزا بەپارێزە لەخواترسەکانی مێژووی ئیسلام، کە بە زانستو لە خواترسیەکەی دنیای سەردەمی خۆیو دواتریشی ڕووناك کردۆتەوە.
٢) کتێبەکەش داگرەوەو گشتگیرە بۆ زۆرێك لەو یادو زیکرە خواییانەی، کە مرۆڤی موسوڵمان لە ماوەی تەمەنی خۆیدا بە ڕۆژو بە شەو خەریکیان دەبێت.

منیش ماوەیەکی زۆرە کەوتۆتە خەیاڵمەوە، کە خزمەتێك بەو کتێبە بکەمو، خوێندەوارانی وڵاتی کوردەواری خۆمانی پێ ئاشناتر بکەم. ئەویش لە ڕێگەی وەرگێڕانو لەسەرنووسینی بە زمانی شیرینی کوردی.

پاڵنەری سەرەکیشم بۆ ئەم کارە بریتیە لەو دوو هۆکارەی سەرەوە. چونکە:

- جارێك بە خزمەتی کتێبێکی زانای پایەبەرز شێخ (شَمْسُ الدِّيْن)ی (سَخَاوِيّ) گەیشتم، کە لەبارەی ناسینی کەسایەتی ئیمامی نەوەویەوە دایناوە، جا ناونیشانی کتێبەکە ئەوەندە سەرنجڕاکێش بوو، خۆم پێ ڕانەگیرا تاوەکو پەیدام کرد. ناوی کتێبەکەش بریتی بوو لە: (الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ فِيْ تَرْجَمَةِ قُطْب الْأَوْلِيَاء النَّوَوِيّ). جا لەبەر خۆمەوە پرسیم: دەبێت چی وای لە زانایەکی پایەبەرزی وەکو شێخی (سَخَاوِيّ) کردبێت، کە ئیمامی نەوەوی بە (قُطْبُ الْأَوْلِيَاء) وەسفدار بکات؟
- لە تەمەنی منداڵیمدا باوکم هەندێك لە کتێبە سەرەتاییەکانی فێربوونی پایەکانی ئیمانو پایەکانی ئیسلامو ئامۆژگاریو بڕیارە شەرعیەکانو فێربوونی زمانی عەرەبی پێ دەوتین، لە نێویاندا کتێبە پڕچێژو بەپێزەکانی زانای پایەبەرز، کەموێنەی دەوران، جێگەشانازی کوردو کوردستان، کە لە ئاسمانی دنیای زانستدا وەکو ئەستێرە هەردەم دیارە، مامۆستای مامۆستایان مەرحوومی مامۆستا مەلا (عَبْدُالْكَرِيْم)ی بیارە. جا مامۆستای خوالێخۆشبوو لە دێڕە هۆنراوەیەکی کتێبی (ئیقباڵ نامە)دا فەرموویەتی:

زانایان ئەڵێن لەبەر ئیعتیبار (اذْهَبْ بِعِ الدَّار وَاشْتَرِ الْأَذْكَار)

بۆیە خۆیشم سەبارەت بەم دوو خاڵە دەڵێم:

شایانی لەوە زیاترە ناوی بە گەورە ببرێ شێخی (نَوَاوِيّ)

بەڵێ کە (قُطْب)ی (أوْلِيَا)یە ئەو وەکو فەرمویە (شَمْس)ی (سَخَاوِيّ)

زانایانی دین لەبەر گرنگیو بایەخی زۆری ئەڵێن تا ماوی

خانوو بفرۆشەو بیدە بە (أَذْكَـــار)          باشـــترە لـــەوەی بچـــیتە نـــاوی

جا لەبەر ئەوەی، کە مرۆڤەکان هەموو ڕێبوارنو، درەنگ یاخود زوو دەچـنەوە بەردەم پـەروەردگاری خۆیـانو، بـە مـەنزڵی کۆتاییـان دەگـەنو، سەفەرەکەشـیان پێویستی بە توێشوو هەیـەو، باشـترین توێشـووش بریتیـە لـە یـادو زیکـری خـوای پەروەردگار. بۆیە بیرم کردەوە، کە ئەم وەرگێـڕانو لەسەرنووسـینە نـاو بنـێم بـە: **(توێشووی ڕێبوار لە زیکرو یادی پەروەردگار)**.

ئومێدەوارم ببێت بە توێشـوویەکی کـەم وێنـە، سـەرەتا بـۆ خـۆمو، پاشـان بـۆ خوێندەوارانی کوردزمانیش، تاوەکو ئەوانیش وەکو گەلانی تر، هەموو بەرهەمێکیان بە زمانی شیرینی خۆیان بکەوێتە بەردەستو، لێی بەهرەوەرو سودمەند بن.

دروودو سەلام لەسەر ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەری خواو، خزمو
کەسوکارەکەیو، هاوەڵە خۆشەویستەکانیو شوێنکەوتوانی بەرنامەکەی بەگشتی

كُلَّمَا ذَكَرَهُ الذَّاكِرُوْنَ وَغَفَلَ عَنْ ذِكْرِهِ الْغَافِلُوْنَ

وَآخِرُ دَعْوَانَا أنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ

أمْجَد مُحَمَّد زَاهِد شێخ مُحَمَّد خۆراسانی

دەربەندیخان: ٢٠ / ١١ / ٢٠١٣ی زاینی

بەرامبەر: ١٦ی / مُحَرَّم ی / ١٤٣٥ی کۆچی

## پەیڕەوی کارکردن لەم کتێبەدا:

بەرلەوەی بچمە سەر وەرگێڕان و لەسەرنووسینی کتێبەکە، بە پێویستی دەزانم لە چەند دێڕێکدا پەیڕەوی خۆم بخەمەڕوو بۆ کارەکەم، کە خۆی لەم چەند خاڵەدا دەبینێتەوە:

١) هەستاوم بە نووسینی پوختەیەك لە ژیانی ئیمامی نەوەوی و، پوختەیەك لەبارەی کتێبی (الْأَذْكَار)ەوە.

٢) بە زمانێکی تا ڕادەیەك سادە دەقە عەرەبیەکانم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی.

٣) دەقی تەواوی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزم وەکو خۆی هێناوەو، ناوی سورەتەکەو ژمارەی ئایەتەکانیشم نوسیوەو، پاشان بە پشتبەستن بە هەندێك تەفسیری کوردی پوختەی ڕاڤەو تەفسیرەکەیانم نوسیوە.

٤) دەقی هەموو یان زۆرینەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوام بە زمانی عەرەبی هێناوە، ئەوجا پوختەی ماناکەیم نوسیوە. ئەمەش لەبەر دوو هۆ: لەلایەك ئەگەر خوێنەر ویستی لەبەریان بکات، با بزانێت دەقی فەرمایشتەکان چۆن هاتوون و، لەلایەکی تریشەوە بتوانێت بە ئاسانی لە سەرچاوەکاندا بیانبینێتەوە.

٥) بۆ وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای فەرموودەکان پشتم بە سەرچاوە متمانەدارەکانی ڕوون کردنەوەی حەدیسەکان بەستوە، لە هاووێنەی: (شَرْحُ صَحِيْح مُسْلِم)ی ئیمامی نەوەوی و (فَتْحُ الْبَارِيّ) شێخی عەسقەلانی و (عُمْدَةُ الْقَارِيْ) شێخ (بَدْرُ الدِّيْن)ی (عَيْنِيّ)و، (مِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْح)ی زانای پایەبەرز مەلا عەلی قاری و، (فَيْضُ الْقَدِيْر)ی شێخ (عَبْدُالرَّؤُوْف)ی (مُنَاوِيّ)و، چەند سەرچاوەیەکی تریش. سەرەڕای هەندێك لە کتێبە وەرگێڕراوەکانی مامۆستای بەڕێز (نوری فارس حەمە خان) (خوا بەرەکەت بخاتە تەمەنی نورینیەوە)، کە تا ڕادەیەك سوودی زمانەوانیم لێ وەرگرتوون.

٦) تـەخریجی تـەواوی حەدیسـەکانم کـردوەو، ژمـارەی بـەرگو لاپـەڕەی سەرچـاوەکانو ژمـارەی حەدیسەکەشـم نوسـیوەو، بڕیـاری پێـوەرگرتنو پێوەرنەگرتنی حەدیسەکەشم نوسیوە، بە پشـت بەسـتن بـە فەرمایشـتی زانـا متمانەدارەکانی وەکو ئیمامی (بَغَوِيّ)و ئیمامی (مُنْذِرِيّ)و حافظـی عێراقـیو شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ)و، شێخ (ابْـنُ حَجَـر)ی عەسـقەلانیو شێخی (بُوْصِيْرِيّ)و شـێخی (سَخَاوِيّ)و شـێخی (سُـيُوْطِيّ)و شـێخی (مُنَـاوِيّ)و، هەندێکیش لـە لێکۆڵـەرەکانی ئەم ساڵانەی ڕابردوو.

٧) لـە هەندێك جێگەدا بـە پێویسـتم زانیـوە هەنـدێك ڕوون کردنـەوە لەسـەر بابەتەکان بدەم، ئەویش بە پشتبەستن بە سەرچاوە متمانەدارەکان.

٨) لـە هەر جێگەیەکدا باسی پێغەمبەری خـوا کرابێـت، نوسـیومە (درودی خوای لەسەر بێت)و، لـە هەر جێگەیەکیشدا باسی یەکێك لـە هاوسـەرو خێزانـەکانی کرابێت، بە ئەدەبەوە نوسیومە (دایکی ئیمانداران)و، لـە هەر جێگەیەکیشـدا باسی یەکێك لـە هاوەڵان کرابێت، نوسیومە (هاوەڵی خۆشەویست)و، پاشان نوسیومە (خوای لێ ڕازی بێت) یان (خوا لـە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)و، لـە هـەر جێگەیەکیشدا ناوی یەکێك لـە زانایان هاتبێت، نوسیومە (شـێخ، یـان زانـای پایەبەرز، یان پێشەوای پایەبەرز، یان........ هتد)، ئیتر گـوێم بـەوە نـەداوە کە نوسراوەکە درێژ دەبێتەوە، وەکو هەندێك کەس بەو پاساوەوە، وازیان لە ڕەچاو کردنی ئەم جۆرە ئەدەبە هێناوە!!!

٩) لە چەندین جێگادا ئیمـامی نـەوەوی بـۆ باسـێکی دیـاریکراو تـەنها وشـەی (فَصْلٌ)ی بەکارهێناوە، جا من هاتووم ناونیشـانی گونجـاوم بـۆ تـەواوی ئـەو جێگایانە داناوە.

١٠)تێڕوانینی من بۆ ناوەڕۆکی ئەم کتێبـە تێڕوانینێکـی بابەتیانەیـەو، دوورە لـە دەمارگیری مەزهەبی. بۆیە لـە هەندێك جێگەدا بە پشتبەستن بـە فەرمایشـتی زانا پایەبەرزەکان سەرنجو تێبینیم لەسەر هەندێك لـە فەرمایشتەکانی ئیمـامی نەوەوی نوسیوە، ئەگەرچی خۆمو خەڵکانی خوێندەواریش باش دەزانـین کـە

(من منم‌و ئه‌و ئیمامه‌ش ئه‌و ئیمامه‌یه‌). به‌ڵام یه‌کێك له‌و بنه‌ما سه‌ره‌کیانه‌ی، که‌ له‌ بواری زانستدا په‌یڕه‌و ده‌کرێت، ئه‌وه‌یه‌ که‌: (لا تَنْظُرْ إِلَى مَنْ قَالَ، وَانْظُرْ إِلَى مَا قَالَ) واته‌: ته‌ماشای ئه‌وه‌ مه‌که‌، که‌ کێ خاوه‌نی ئه‌و فه‌رمایشته‌یه‌، به‌ڵکو ته‌ماشای ئه‌وه‌ بکه‌، که‌ فه‌رمایشته‌که‌ چیه‌و چۆنه‌.

# پوختەیەك لە ژیانی ئیمامی نەوەوی

ئەو کتێبانەی کە تایبەت بە ژیانو ساڵی لەدایکبوونو ساڵی لەدنیا دەرچوونو مامۆستاو قوتابیو بەرهەمو کتێبی زانایان دانراون، بە شێوەیەکی کورت یان درێژ باسی ژیانی زانایانیان تێدا کراوە.

بەڵام دەبینرێت، کە هەندێك لە زانایان کتێبی تایبەتی لەسەر ژیانیان نوسراوە. ئەویش لەبەر گەورەییو پایەبەرزیو دینداریو لە خواترسانو ئەو خزمەتەی، کە بە ئاینو زانستو موسوڵمانانیان کردوە.

جا یەکێك لەو زانایانەی، کە زۆرترین کتێبی تایبەتی لەسەر ژیانی نوسراوە، بریتیە لە ئیمامی نەوەوی. چی لەلایەن قوتابیەکانی خۆیەوە، یان لەلایەن زانایانی دواترەوە. بگرە لەلایەن هەندێك لە نووسەرەکانی ئەم سەردەمەی ئێمەشەوە.

وا منیش بە یارمەتی خوای گەورە، تەنها ناوی ئەو کتێبانە دەنووسم، کە لەلای خۆم دەست دەکەون:

١) (تُحفَةُ الطَّالِبِيْن فِيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ مُحْيِ الدِّيْن). دانراوی زانای پایەبەرز (عَلِيّ)ی کوڕی (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (دَاوُد)ی کوڕی (سُلَيْمَان)، ناسراو بە (عَلاءُ الدِّيْن)ی (ابْنُ الْعَطَّار)، کە قوتابی ئیمامی نەوەوی بوەو، لە نێوان ساڵەکانی (٦٥٤ – ٧٢٤)ی کۆچیدا ژیاوە. ئەوەندە لە خزمەتی ئیمامی نەوەویدا بوەو، لێی جیانەبوەتەوە، تاوەکو پێی وتراوە (مُخْتَصَرُ النَّوَوِيّ).

٢) (بُغْيَةُ الرَّاوِيْ فِيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ النَّوَاوِيّ). دانراوی زانای پایەبەرز (مُحَمَّد)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدُالرَّحْمن)، ناسراو بە (ابْنُ إِمَامِ الْكَامِلِيَّة). لە نێوان ساڵەکانی (٨٠٨ – ٨٧٤)ی کۆچیدا ژیاوە.

٣) (الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ فِيْ تَرْجَمَةِ قُطْبِ الْأَوْلِيَاءِ النَّوَوِيّ). دانراوی زانای پایەبەرز (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدُالرَّحْمن)، ناسراو بە (شَمْسُ الدِّيْن)ی (سَخَاوِيّ). لە نێوان ساڵەکانی (٨٣١ – ٩٠٢)ی کۆچیدا ژیاوە.

٤) (الْمِنْهَاجُ السَّوِيّ فِـيْ تَرْجَمَـةِ الْإِمَـامِ النَّـوَوِيّ). دانـراوی زانـای پایەبـەرز (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی (أَبُوْ بَكْر)ی کوڕی (مُحَمَّد)، ناسراو بـە (جَلالُ الدِّيْن)ی (سُيُوْطِيّ). لە نێوان ساڵەکانی (٨٤٩ - ٩١١)ی کۆچیدا ژیاوە.

٥) (الْإِمَامُ النَّوَوِيّ -أَعْلامُ التَّأْرِيْخ ٤-). دانراوی مامۆستای بەڕێز (عَلِيّ الطَّنْطَاوِيّ). لە ساڵی (١٩٦١) بۆ جاری یەکەم لەلایەن (دَارُ الْفِكْر)ەوە لە شـاری دیمەشـق بەچاپ گەیەنراوە.

٦) (الْإِمَامُ النَّوَوِيّ شَيْخُ الْإِسْلامِ وَالْمُسْلِمِيْنَ وَعُمْدَةُ الْفُقَهَاءِ وَالْمُحَـدِّثِيْن - أَعْـلامُ الْمُسْلِمِيْن ١٠ -) دانراوی مامۆستای بەڕێز (عَبْدُالْغَنِي الدَّقْر). لـە دەوروبـەری ساڵی (١٩٧٥)دا نوسیوێتیو، بۆ جاری چوارەم لەلایـەن (دَارُ الْقَلَـم)ەوە لـە شاری دیمەشق بەچاپ گەیەنراوە.

٧) (أَعْذَبُ الرَّوِيّ فِيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ النَّوَوِيّ). دانراوی مامۆستای بـەڕێز (عَبْدُالْحَمِيْد بْنُ صَالِحِ بْنِ عَبْدِالْكَرِيْمِ الْكَرَّانِيُّ الْغَامِـدِيّ). لـە سـاڵی (١٤٢٩)ی کۆچـیدا نوسیوێتی.(١)

ئەمەش سەرەڕای ئەو هـەموو لێکۆڵینـەوەو ماسـتەرنامەو دکتۆرانامانـەی، کـە لەسەر ژیانو بەرهەمەکانی ئیمامی نـەوەوی نوسـراونو، لـە پێشـەکی هەموویانـدا باسی ژیانی ئەو زانا پایەبەرزەی بە درێژی تێدا کراوە.

وا منیش بە یارمەتی خوای گەورەو، بە پشت بەستن بەم سەرچـاوانەو چـەندین سەرچاوەی تریش، بەتایبەتی کتێبەکەی شێخی (ابْنُ الْعَطَّار)، پوختەیەك لە ژیانەکەی بە چەند بەشێك باس دەکەم.

(١) هەروەها لەسـەر (CD)ی (الْمَوْسُوْعَةُ الشَّامِلَة)ش کەسـێك بـە نـاوی (أَحْمَـد فَرِيْـد)ەوە نوسراوێکی هەیە بەناونیشانی (الْإِمَامُ النَّوَوِيّ).

## ناوو نەسەب و کونیە و نازناوی:

ناوی (یَحْیَی)ی کوڕی (شَرَف)ی کوڕی (مُرِّي)[1] کـوڕی (حَسَـــن)ی کـوڕی (حُسَیْن)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی (جُمُعَة)ی کوڕی (حِزَام)ـە.

نیسبەتەکەشی بریتیە لە: (نَوَوِيّ) یان (نَـــوَاوِيّ). کـە بـە هـەردووکیان هـاتوە. چونکە لە گونـدی (نَوَی) لـەدایك بـوە. هـەروەها نیسـبەت دراوە بـۆ لای بـاپیرە گەورەی‌و، پێی وتراوە (حِزَامِيّ). هەروەها پێیشی وتراوە (دِمَشْقِيّ). چونکە نزیکەی بیست‌و هەشت (٢٨) ساڵ لەوێ ژیاوە. زانای پایەبەرز (عَبْدُاللّٰه)ی کـوڕی (مُبَارَك) فەرموویەتی: هەر کەسێك چوار سـاڵ لــە شـارێکدا بمێنێتـەوە، درووسـتە نیسـبەت بدرێت بۆ لای ئەو شارە.[2]

کونیەکەشی بریتیە لە: (أَبُوْ زَكَرِيَّا). ئەگەر چی ژنیشی نەهێناوە، تاوەکو منداڵی بوو بێت. بەڵام لە ناو عەرەبدا وا باوە، کە بۆ (یَحْیَی) دەوترێـت: (أَبُوْ زَكَرِيَّا)و، بـۆ (زَكَرِيَّا)ش دەوترێت: (أَبُوْ يَحْيَى).

ئیمامی نـەوەوی لــە کتێبـی (رَوْضَـــةُ الطَّـــالِبِيْن)دا لـەبارەی بـوونی کونیـەوە فەرموویەتی: سونەتە پیاوان‌و ئافرەتانی گەورەو پایەدار کونیەیان بۆ بەکار بهێنرێـت، ئیتر منداڵیان هەبێت، یان نا. سونەتە کونیەکەشیان بەناوی منداڵی خۆیانـەوە بێـت، یان بەناوێکی ترەوە. خۆ ئەگەر کەسێك منداڵی هەبوو، سونەتە کونیەکەی بـەناوی گەورەترینی منداڵەکانیەوە بێت.[3]

---

(١) لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا نوسراوە (مُرِي)و، لە هەندێکیشیاندا نوسراوە (مِرَا).

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن فِيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ مُحْيِ الدِّيْن / ٤١ – ٤٢، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ فِيْ تَرْجَمَةِ قُطْبِ الْأَوْلِيَاءِ النَّوَوِيّ / ١٠.

(٣) بڕوانە: رَوْضَةُ الطَّالِبِيْنَ وَعُمْدَةُ الْمُفْتِيْن / ٣ / ٢٣٥.

نازناویشی (مُحْيِ الدِّيْن)ـه. ئەگەرچی وتراوە: پێی خۆش نەبوە، ئەو نازناوەی بۆ بەکار بهێنرێت.[1] بەڵام هەم زانای پایەبەرز (ابْنُ الْعَطَّار) لە ناونیشانی کتێبەکەیداو، هەم زانایانی دواتریش لە کتێبەکانی خۆیاندا بۆیان بەکار هێناوە.[2]

## بەروارو مێژووی لەدایکبوونی:

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن، کە ئیمامی نەوەوی لە نێوان (١٠ – ٢٠)ی مانگی (مُحَرَّم)ی[1] ساڵی (٦٣١)ی کۆچیدا لە گوندی (نَـوَى) لەدایك

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١١. جێگەی سەرسوڕمان بوو بۆم کە لەسەر بەرگی کتێبی (رِيَاضُ الصَّالِحِيْن) بە کوردی، وەرگێڕانی مامۆستا (نوری فارس حەمەخان) نازناوی (شَرَفُ الدِّيْن) بەکارهێنراوە بۆ ئیمامی نەوەوی!!! بۆیە لە ڕێگەی تەلەفونەوە پەیوەندیم بە مامۆستای وەرگێڕەوە کرد، ئەویش فەرمووی: من نەمنوسیوە، بەڵکو ئەو کەسانە نوسیویانە، کە بەرگەکەیان بۆ درووست کردوەو، بەچاپیان گەیاندوە.

(٢) بڕوانە: ذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان (قُطْبُ الدِّيْنِ الْيُوْنِيْنِيّ) / ٣ / ٢٨٣، والْعِبَر فِيْ خَبَرِ مَنْ غَبَر (شَمْسُ الدِّيْنِ الذَّهَبِيّ) / ٣ / ٣٣٤، وتَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ (الذَّهَبِيّ) / ٤ / ١٧٤، وتَأرِيْخُ ابْنِ الْـوَرْدِيّ / ٢ / ٢١٩، وفَوَاتُ الْوَفَيَات (ابْنُ شَاكِرِ الْكُتُبِيّ) / ٤ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ٥٦٨، ومِـرْآةُ الْجِنَانِ وَعِبْرَةُ الْيَقْظَان (أَبُوْ مُحَمَّد الْيَافِعِيّ) / ٤ / ١٣٨، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْـرَى (تَـاجُ الدِّيْنِ السُّبْكِيّ) / ٨ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ١٢٨٨، والْبِدَايَةُ وَالنِّهَايَـة (ابْـنُ كَثِيْـر) / ١٣ / ٣٢٦، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ كَثِيْر) / ٨٢٥، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (الْإِسْـنَوِيّ) / ٢ / ٢٦٦، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) / ٢ / ١٥٣ / بە ژمارە: ٤٥٤، وعِقْدُ الْجُمَانِ فِيْ تَأرِيْخِ أَهْلِ الزَّمَان (بَدْرُ الدِّيْنِ الْعَيْنِيّ) / عَصْرُ سَلاطِيْنِ الْمَمَالِك / ٢ / ١٩٤، وبُغْيَةُ الـرَّاوِيْ فِـيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ النَّوَاوِيّ / ١٩، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٠، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ فِـيْ تَرْجَمَـةِ الْإِمَامِ النَّوَوِيّ / ٢٥، وطَبَقَاتُ الْحُفَّاظ (السُّيُوْطِيّ) / ٥١٣ / بە ژمارە: ١١٢٨، والدَّارِسُ فِيْ تَارِيْخِ الْمَدَارِس / ١ / ١٩، وشَذَرَاتُ الذَّهَبِ فِيْ أَخْبَارِ مَنْ ذَهَبَ (ابْنُ الْعِمَاد الْحَنْبَلِيّ) / ٧ / ٦١٨.

بوە. کە ئێستە بوە بە شارێکی تا ڕادەیەك گەورەو، سەر بە پارێزگای (دَرْعَــا)یـەو، کەوتۆتە بەشی ڕۆژئاوای ناوەڕاستی ناوچەی (حَوْرَان) لە ولاّتی (سُوْرِيَّة). نزیکـەی (٨٥ کم) لە (دِمَشْق)ی پایتەختـەوە دوورەو، نزیکەی (٤٠ کم)یـش لـە (دَرْعَا)وە دوورەو، نزیکەی (١٠ کم)یش لە سنووری (فَلَسْطِيْن)ی داگیرکراوەوە دوورە.

## دەرکەوتنی نیشانەی پایەبەرزی لە سەرەتای تەمەنیدا:

خوای گەورە ویستی خەیری بەم ئیمامی پایەبەرزە هەبوە. بۆیە هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە، چـەند نیشـانەیەکی پیاوچـاکی تێـدا دەرکـەوتوە. بـەڵکو وەکـو زانـای پایەبەرز (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: لە یەکێك لە پیاوچاکە گەورەکانم بیسـتوە، کـە فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی هەر لـەدایك بـوە، بـۆی نوسـراوە، کـە یەکێکـە لـە ڕاستگۆیان.

هەروەها (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: باوکی ئیمامی نەوەوی بۆی گێڕامـەوە، کـە ئیمامی نەوەوی لـە تەمەنی حەوت (٧) ساڵانیدا لـە تەنیشـتی ئـەودا خـەوتبوو، ئـەو شەوەش شەوی بیستو حەوت (٢٧)ی مانگی (رَمَضَان) بوو. جا لـە نیوەی شـەودا بەخەبەر هاتوو، منیشی بەخەبەر هێناو، وتی: باوە گیان، ئەو ڕووناکیە چیە، کە پڕی ماڵەکە بوە؟ پاشان تەواوی ماڵەوەمانی بەخەبەر هێناو، کەسیشمان ڕووناکیەکـەمان نەدی! جا باوکی فەرمووی: ئەوجا زانیم، کە ئەو شەوە شەوی (لَيْلَةُ الْقَدْر)ە.[٢]

---

(١) تەقدیری خوا وەهایە، کە منیش لە (١٦)ی مـانگی (مُحَرَّم)ی سـاڵی (١٤٣٥)ی کۆچـیدا دەستم کرد بە نووسینی ئەم ژیاننامەیە. واتە: دوای نزیکەی (٨٠٤) ساڵی کۆچی.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٢ – ٤٣. هەروەها بڕوانە هەریەکە لـە: تَأْرِيْخُ الْإِسْلام (الذَّهَبِيّ) / ٥٠ / ٢٤٧، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ٨ / ٣٩٦، وبُغْيَــةُ الــرَّاوِيْ / ٢٧، والْمَنْهَــلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣٠.

هەروەها (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: خواناسی گەورە، شێخ (یَاسِـیْن)ی کـوڕی (یُوْسُف)ی (مَرَاكِشِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: لـە گونـدی (نَوَی) چـاوم بـە ئیمامی نەوەوی کەوت، کە تەمەنی دە (١٠) سالأن بوو، مندالأن زۆریان لێ دەکرد تـا یاریـان لـەگەڵـدا بکـاتو، ئـەویش ڕای دەکـرد لـەدەسـتیانو، دەگریـاو، بـەو حالەتەشەوە قورئانی دەخوێند. بۆیە خۆشەویستی کەوتـە دڵـمـەوە. باوکیشـی لـە دوکانـدا داینـابوو، کـڕینو فرۆشـتنی دووکـان سـەرقاڵی نـەدەکرد، تـا قورئـان نەخوێنێت. پاشان شێخ (یَاسِیْن) فـەرمووی: چـووم بـۆلای ئـەو مامۆسـتایەی، کـە قورئانی پێ دەوتو، پێم وت: ئاگای لێی بێتو، وتیشم: هیوادارم ئەم منداڵە ببێتـە زاناترینو بەپارێزترینو دنیانەویستترینی کەسانی سەردەمی خۆیو، خەڵکی سوودی لێ وەربگرن. مامۆستاکەشی پێی وتم: بۆ تـۆ ئەسـتێرەگرەوەی؟ منـیش وتم: نـەخێر، ئەوە شتێك بوو، کە خوا خستیە سەر زمانم. پاشان مامۆستاکە ئەم باسەی گێڕایـەوە بۆ باوکی ئیمامی نەوەویو، ئەویش بایەخێکی زیـاتری پێـدا، تـا بـەر لـە بـاڵغبوون قورئانی خەتم کرد.[1]

## تەشریف هێنانی بۆ شاری (دِمَشْق)و، جێگیربوونی لە قوتابخانەی (رَوَاحِيَّة):

ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: کاتێك تەمەنم گەیشتە نۆزدە (١٩) ساڵ باوکم لە ساڵی شەش سەدو چلو نۆ (٦٤٩) هێنامی بۆ شـاری (دِمَشْــق)و، لـە قوتابخانـەی

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٤ - ٤٥. هەروەها بڕوانە هەریەکـە لـە: ذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان / ٣ / ٢٨٤، وتَأْرِيْخُ الْإِسْلام / ٥٠ / ٢٤٧، وطَبَقَاتُ الشَّـافِعِيَّةِ الْكُبْـرَى / ٨ / ٣٩٦ - ٣٩٧، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٢٩ - ٣٠، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣١.

(رَوَاحِيَّة) مامەوەو، بۆ ماوەی نزیکەی دوو ساڵ ڕانەکشامو پاڵ نەکەوتمو، تەنها لـە خۆراکی قوتابخانەکەشم دەخوارد.

هەروەها فەرموویەتی: کتێبی (التَّنْبِيْه)م لـە مـاوەی چـوار مـانگو نیـودا لەبـەر کردو، بەشی (عِبَادَات)ی کتێبی (الْمُهَذَّب)یشم لـە پاشمـاوەی ئـەو سـاڵەدا لەبـەر کـرد.[1] پاشـان فـەرمووی: دەسـتم کـرد بـە ڕوون کردنـەوەو سـاغ کردنـەوەی کتێبەکان لـە خزمەت پێشەوای دنیانەویست، زانای بەپارێزی پایەبەرزی شارەزا (أَبُوْ إِبْرَاهِيْم) (إِسْحَاق)ی کـوڕی (أَحْمَد)ی کـوڕی (عُثْمَان)ی (مَغْرِبِيّ)، شـوێنکەوتووی مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)، ئیتر لـە خزمەتی ئەودا مامەوەو، ئەویش زۆر پێم سەرسـام بوو. بەهۆی ئەوەی، کە دەیبینیم زۆر خەریکی خوێندنو خوێندنەوە دەبوومو، لـەو جیا نەدەبوومەوەو، تێکەڵی خەڵکم نەدەکرد. ئەوەبوو زۆری خۆش دەویستمو، پێی ڕاسپاردم، کە دەرسەکە بۆ زۆربەی قوتابیەکانی دووبارە بکەمەوە.[2]

---

(١) هەردوو کتێبەکە دانراوی زانای پایەبـەرز (أَبُوْ إِسْحَاق)ی (شِيْرَازِيّ)ن و، دواتـریش ئیمـامی نەوەوی ڕوون کردنەوەی لـەسەر بەشێکی (الْمُهَذَّب) نووسیو، ناوی نـا (الْمَجْمُوْع شَـرْحُ الْمُهَذَّب). شێخی (ابْنُ كَثِيْر) فەرموویەتی: یەکێك لـەو کتێبو دانراوانەی ئیمامی نـەوەوی، کە تەواوی نەکردوەو، ئەگەر تەواوی بکردایە، هاوێنـەی نـەدەبوو لـەو بابەتـەی خۆیـدا، بریتیە لـە ڕوون کردنەوەی کتێبـی (الْمُهَـذَّب)، کـە نـاوی لێنـابوو (الْمَجْمُـوْع). پاشـان فەرموویەتی: من وا نازانم لـە کتێبە فیقهیەکاندا لـەو باشـتریان تێـدا بێـت. بڕوانـە: الْبِدَايَـةُ وَالنِّهَايَة / ١٣ / ٣٢٦.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٥ – ٤٧، وذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان / ٣ / ٢٨٥، وتَأْرِيْخُ الْإِسْلام / ٥٠ / ٢٤٨، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٠ – ٣١، والْمَنْهَلُ الْعَـذْبُ الـرَّوِيّ / ١٢ – ١٣، والْمِنْهَـاجُ السَّوِيّ / ٣١ – ٣٣، والدَّارِسُ فِيْ تَارِيْخِ الْمَدَارِس / ١ / ١٩.

## بەجێهێنانی ڕوكنی (حَجّ)ی ماڵی خوا:

ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: لە ساڵی شەش سەدو پەنجاو یەك (٦٥١)دا لە خزمەتی باوكمدا چوین بۆ بەجێهێنانی (حَجّ)ی ماڵی خواو، ئەو ساڵەش ڕۆژی (عَرَفَة) كەوتبووەوە ڕۆژی (جُمُعَة)وە. ئێمەش هەر لە سەرەتای مانگی (رَجَب)ـەوە بەڕێكەوتینو، نزیكەی مانگو نیوێك لە شاری مەدینەی پیرۆزدا مامەوە.

شێخی (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: باوكی ئیمامی نەوەوی پێی وتم: كاتێك لە (نَوَى)وە بەڕێكەوتین، ئیمامی نەوەوی تایەك دایگرتو، هەتا ڕۆژی (عَرَفَـة) بەری نەداو، لەو ماوەیەشدا ئاخو ئۆفێكی نەكرد. كاتێكیش مەناسكی حەجمان تەواو كردو، گەڕاینەوە بۆ لادێكەی خۆمانو، پاشان ئیمامی نەوەوی ڕۆشتەوە بۆ (دِمَشْق)و، ئیتر خوای گەورە بە لێشاو زانستی بەسەردا دەباراندو، دەستی كردەوە بە خەریكبوون بە زانستەكانو، شوێنپێی مامۆستاكەی خۆی گرتەبەر، لە دینداریو نوێژو ڕۆژووی تەواوی ساڵو، دنیانەویستیو پارێزكاریو، بەفیڕۆ نەدانی هیچێك لە كاتی خۆی، تا ئەو كاتەی مامۆستاكەی وەفاتی كرد (خوای گەورە ڕەحمی پێ بكاتو لێی ڕازی بێت). جا كە مامۆستاكەی وەفاتی كرد، ئیتر خەریكبوونی بە زانستو بە دینداریو عیبادەتەوە زیاتری كرد.[1]

## بایەخدانی بە زانستە ئیسلامیەكان:

شێخی (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی بۆی باس كردمو فەرمووی: هەموو ڕۆژێك دوانزە (١٢) دەرسی ڕوون كردنەوەو ساغ كردنەوەم لە خزمەت مامۆستایاندا دەخوێند. دوو دەرس لە كتێبی (الْوَسِيْط)و، دەرسێك لە كتێبی

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٧ – ٤٩. هەروەها بڕوانە هەریەكە لە: بُغْيَةُ الـرَّاوِيْ / ٣١، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٣، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣٣.

(الْمُهَذَّب)و، دەرسێك لە كتێبی (الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّحِيْحَيْن)و، دەرسێك لە صەحیحی موسلیمو، دەرسێك لە كتێبی (اللُّمَح)ی (ابْنُ جِنِّي) لە زانستی (نَحْو)و، دەرسێك لە كتێبی (إصْلاحُ الْمَنْطِق)ی (ابْنُ السِّكِّيْت) لە زمانو، دەرسێك لە زانستی (تَصْرِيْف)و، دەرسێك لە زانستی (أُصُوْلُ الْفِقْه)، جارێك لە كتێبی (اللُّمَع)ی (أَبُوْ إِسْحَاق)و، جارێكیش لە كتێبی (الْمُنْتَخَب)ی (فَخْرُ الدِّيْن)ی (رَازِيّ)و، دەرسێك لەبارەی ناسینی ڕاویەكانی حەدیسەوە (أَسْمَاءُ الرِّجَال)و، دەرسێكیش لە عەقیدەو (أُصُوْلُ الدِّيْن).[1] پاشان ئیمامی نەوەوی فەرمووی: خۆیشم ڕوون كردنەوەی زانستیو زمانەوانیم لەسەر جێگە گرانو سەر لێدەرنەچوەكان دەنووسیو، خوای گەورەش فەڕو بەرەكەتی خستبوە كاتو كارمەوەو، هاوكاریو پشتیوانی دەكردم.[2]

هەروەها شێخی (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی بۆی گێڕامەوە، كە نە بە شەوو نە بە ڕۆژ كاتی خۆی لەدەست نەدەدا، مەگەر لە خەریكبوون بە زانست

---

(١) لە هەموو سەرچاوەكاندا بەم جۆرە ناوی دەرسو كتێبەكان براوەو، ژمارەشیان یانزە (١١) دەرسە!!! بەلاّم لە كتێبی (تَأْرِيْخُ الْإِسْلام / ٥٠ / ٢٤٨)ی ئیمامی (ذَهَبِيّ)دا هاتوە، كە ئیمامی نەوەوی ڕۆژانە دوو دەرسی لە كتێبی (الْمُهَذَّب) خوێندوە. بەمەش دەرسەكان بوون بە دوانزە. كەچی پێم سەیرە، هەر ئیمامی (ذَهَبِيّ) لە كتێبی (تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٤)دا فەرمایشتەكەی شێخی (ابْنُ الْعَطَّار)ی هێناوەو، تەنها یەك دەرسی لە كتێبی (الْمُهَذَّب) باس كردوە!!! بۆیە مامۆستای بەڕێز شێخ (نُوْرُ الدِّيْن عِتْر) لە پێشەكی كتێبێكی ئیمامی نەوەویدا، كە كورتكراوەی كتێبی (عُلُوْمُ الْحَدِيْث)ی (ابْنُ الصَّلاح)ی شارەزووریە، بەناونیشانی (إرْشَادُ طُلاَّبِ الْحَقَائِقِ إِلَى مَعْرِفَةِ سُنَنِ خَيْرِ الْخَلائِق)، نوسیویەتی: ژمارەی دەرسەكان یانزە دانەیەو، دەرسێكی كەمە. بۆیە ڕەنگە ئەو دەرسە دەرسی تەفسیر بوو بێت.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٩ – ٥٠. هەروەها بڕوانە هەریەكە لە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٤، وفَوَاتُ الْوَفَيَات / ٤ / ٢٦٥ – ٢٦٦، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ كَثِيْر) / ٨٢٥، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) / ٢ / ١٥٤، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٢، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٣ – ١٤، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣٤، وشَذَرَاتُ الذَّهَب / ٧ / ٦١٩.

نـەبێت. هـەتا لــە هــاتو چــوونی ڕێگەشــدا هــەر دەوری دەكــردەوەو، كتێبــی دەخوێندەوەو، بۆ ماوەی نزیكەی شەش ساڵ لەسەر ئەم حاڵەتە ماوەتەوە.[1]

زانای پایەبەرز (قُطْبُ الدِّين)ی (يُونِيْنِيّ) فەرموویەتی: ئیمـامی نـەوەوی قورئـانی زۆر دەخوێنــدەوەو، یــادو زیكــری خــوای زۆر دەكــردو، هــەر لــە ســەرەتای پێگەیشتنیەوە پشتی لە دنیا هەڵكردبوو، ڕووی لە دوارِۆژ كردبوو.[2]

ئیمامی (سَخَاوِيّ) فەرمایشتێكی ئیمامی (ذَهَبِيّ) هێناوە، كە ئەو لە كتێبی (سِـــيَرُ أَعْلَامِ النُّبَلَاء)دا فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی بووبوو بە نموونە لــەوەدا، كــە شــەوو ڕۆژ خەریكی زانست بوو، وازی لــە خــەوتن هێنــابوو، مەگــەر زۆری بــۆ بهاتایــە. هەموو كاتەكانی خۆی زەبت كردبوو، یان بە دەرس خوێندن، یان بە نووســین، یــان بە خوێندنەوە، یان بە هاتوچۆ بۆ خزمەتی زانایان.[3]

## خواپەرستیو دنیانەویستیەكەی:

ئەو كەسەی چاو دەگێڕێت بە ژیانی زانایانی ئیسلامدا دەبینێت، هەندێكیان زیاتر بە زانستەكەیان بەناوبانگنو، هەندێكیشیان زیــاتر بــە خواپەرســتیو دینداریەكــەیان بەناوبانگنو، هەندێكیشیان هەم بە زانستو هەم بە خواپەرســتیش بــەناوبانگن. جــا ئیمامی نەوەوی یەكێكە لەو زانایانەی، كە هەم ناوبانگی زانایيو شارەزاییان هەیەو، هەم ناوباگی خواپەرستیو دینداریو دنیا نەویستیشیان هەیە.

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٤. هەروەها بڕوانە هەریەكە لــە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّــاظ / ٤ / ١٧٥، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٥ -٣٦، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٩.

(٢) بڕوانە: ذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان / ٣ / ٢٨٤.

(٣) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٤. بەڵام سەیرە، كە نوسخە بەچاپ گەیەنراوەكــەی ئــەو كتێبە باسی ژیانی ئیمامی نەوەوی تێدا نیە!!!

ئیمامی (ذَهَبِيّ) وای وەسفکردوە، کە لەگەڵ ئەوەی زانایەکی زۆر شارەزا بوە لە حەدیس‌و شەرع‌و زمان‌و زانستەکانی تردا، یەکێکیش بوە لە سەرانی دنیانەویستی‌و، پێشەنگ بوە لە پارێزکاری‌و، بێ وێنە بوە لە فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە. کەسێکی زۆر بە قەناعەت بوەو، ئەو لە خوا ڕازی بوەو، خواش لە ئەو ڕازی بوەو، بە کەمترین پۆشاك‌و خۆراك قاپ‌و قاچاغ قەناعەتی کردوە.[1]

هەروەها لە جێگەیەکی تردا وای وەسفکردوە، کە هەمیشە خەریکی خوێندنەوەو دانانی کتێب‌و بڵاو کردنەوەی زانست‌و، عیبادەت‌و ویردو دوعاو ڕۆژووگرتن‌و یادو زیکری خوا بوە.[2]

شێخی (ابْنُ الْعَطَّار)یش فەرموویەتی: هەموو کاتی خۆی خەرج دەکرد لە زانست‌و کردەوەی چاکدا. هەندێك بۆ دانانی کتێب‌و، هەندێکیشی بۆ دەرس وتنەوەو فێرکردنی خەڵك‌و، هەندێکیشی بۆ نوێژو، هەندێکیشی بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆزو، هەندێکیشی بۆ فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە.[3]

دەگێڕنەوە لە زانای پایەبەرز (بَدْرُ الدِّيْن)ی (ابْنُ جَمَاعَة)، کە یەکێك بوە لە قوتابیەکانی ئیمامی نەوەوی. جارێك دەربارەی پشوودان‌و خەوتن پرسیاری لە ئیمامی نەوەوی کردوە: ئەویش فەرموویەتی: ئەگەر خەو زۆرم بۆ بهێنێت، پاڵ دەدەم بە کتێبەکانەوەو، ساتێك خەوم لێ دەکەوێت‌و، بەخەبەر دێمەوە. هەروەها (ابْنُ جَمَاعَة) فەرموویەتی: هەر جارێك بهاتمایە بۆ خزمەتی‌و سەردانم بکردایە،

---

(١) بڕوانە: الْعِبَر فِيْ خَبَرِ مَنْ غَبَر / ٣ / ٣٣٤.

(٢) ئەم فەرمایشتەی ئیمامی (ذَهَبِيّ) لە کتێبی (سِيَرُ أَعْلَامِ النُّبَلَاء)دایە، وەکو ئیمامی (سَخَاوِيّ) لێیەوە نقڵی کردوە. بەڵام سەیرە لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی ئەو کتێبەدا باسی ئیمامی نەوەوی تێدا نیە!!! بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٦٢.

(٣) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٥.

هەندێك لە کتێبەکانی دەخستە سەر هەندێکی تریان، تاوەکو جێگەیەکم بۆ بکاتەوەو، تێیدا دانیشم.[1]

دەگێڕنەوە، کە ڕۆژی یەك جار نانی خواردوەو، یەك جاریش لە بەرەبەیاندا ئاوی خواردۆتەوەو، زۆر بە کەمیش دوو جۆر خواردنی بە یەکەوە خواردوەو، زیاتریش لە ماڵی باوکیەوە خواردنی بۆ دەهاتو، هەرگیز لە میوەهاتی شاری (دِمَشْق)ی نەخواردوە. بە پاساوی ئەوەی، کە زەوی‌و زاری وەقف لەو شارەدا زۆرەو، سەرپەرشتیارانیشی وەکو پێویست، بەو شێوەی شەرع باسی کردوە، سەرپەرشتیان ناکەن. بۆیە بەرهەمەکانیان جێگەی گومانە، کە حەڵاڵن یان نا.[2]

هەروەها کاتێك سەرۆکایەتی مامۆستایانی قوتابخانەی (دَارُ الْحَدِيْث)ی پێ سپێردرا، بڕێك پارەی وەکو مووچە بۆ بڕیار درا. بەڵام ئەو هیچی لێ وەرنەدەگرتو، لای سەرپەرشتیاری قوتابخانەکە دایدەنا، تا کۆدەبویەوەو، پاشان پارەکەی دەدا بە موڵك، یان بە کتێبو شتی تر بۆ قوتابخانەکە.[3]

شێخی (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: هاوڕێیەکی خۆم بە ناوی (أَبُوْ عَبْدِاللهِ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِيْ الْفَتْحِ الْبَعْلِيُّ الْحَنْبَلِيّ) بۆی گێڕامەوە، کە جارێك لە کۆتایی شەودا چوومە مزگەوتی (دِمَشْق)و، ئیمامی نەوەوی بە تاریکی ڕووی کردبوە یەکێك لە پایەکانی مزگەوتو نوێژی دەکردو، بە دەنگێکی گریاناویو ملکەچیو کزۆڵیەوە ئەم ئایەتەی چەند جارێك دووبارە دەکردەوە: ﴿وَقِفُوْهُمْ إِنَّهُمْ مَّسْئُوْلُوْنَ﴾ [الصَّافَّات: ٢٤]، واتە: {ڕایانگرنو بیانوەستێنن، چون بەڕاستی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت}

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤٣، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٥.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٧ – ٦٨، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٨، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤٤، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٦.

(٣) بڕوانە: بُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٩، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤٤.

منیش لەو دیمەنە کاریگەریەکی وەهام دەستکەوت، هەر خوا خۆی دەزانێت چەندبوو.[1]

هەروەها فەرموویەتی: مامۆستایەکی خۆم، بە ناوی (وَلِيُّ الدِّيْن أَبُوْ الْحَسَن عَلِيّ)، کە لە مزگەوتی (بَيْتَ لَهْيا) بوو، لە دەرەوەی (دِمَشْق)، بۆی گێرامەوەو، فەرمووی: قاچم تووشی نەخۆشیەك بوو، پێی دەوترا (النِّقْرِس). جا ئیمامی نەوەوی هات بۆلامو، کاتێك دانیشت دەستی کرد بە باسی ئارامگرتن. ئیتر کەم کەم ئازارەکەم دەڕۆیشتو، ئەویش هەر باسی ئارامگرتنی دەکرد، تا هەموو ئازارەکەم نەماو، وەکو بڵێیت هەر ئازاریشم نەبوە. پاشان فەرمووی: پێش ئەو سەردانەی ئیمامی نەوەوی لە تاو ئازاردا شەو خەوم لێ نەدەکەوت. بۆیە زانیم نەمانی ئازارەکە لە فەڕو بەرەکەتی ئەوەوە بوە.[2]

دەگێڕنەوە لە خواناسی پایەبەرز (أَبو عَبْدِالرَّحِيْم مُحَمَّدُ الْـإِخْمِيْمِيّ)، کە فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی لەسەر ڕێبازو پەیڕەوی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا دەڕۆیشتو، لەم سەردەمەی ئێمەشدا بێجگە لەو، کەسێکی تر شارەزا نیم، کە لەسەر ڕێبازو پەیڕەوی ئەوان بڕوات.[3]

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٥. هەروەها بڕوانە هەریەکە لە: بُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٧، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤٣ – ٤٤، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٣ – ٤٤.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٦. هەروەها بڕوانە هەریەکە لە: بُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٧، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٤. لێکۆڵەرانی هەردوو کتێبی (تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن)و (الْمِنْهَاجُ السَّوِيّ) نووسیویانە: (النِّقْرِس): نەخۆشیەکی ئازاراویەو، لە جومگەکانی پێدا دروست دەبێتو، زیاتریش لە پەنجە گەورەکەیدا. ئێستەش بەم نەخۆشیە دەوترێت: (دَاءُ الْمُلُوْك).

(٣) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٩، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٤١، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٧. لەم سەرچاوەی دواییەدا لەبریتی (أَبُو عَبْدِالرَّحِيْم) نوسراوە: (أَبُو عَبْدِالْحَلِيْم).

هەروەها دەگێڕنەوە لە زانای پایەبەرز (تَقِيُّ الدِّيْن)ی (سُبْكِيّ)، کە فەرموویەتی: ئەو هەموو سیفاتە بەرزانەی لە ئیمامی نەوەویدا کۆ بوونەتەوە، لەدوای سەردەمی شوێنکەوتوانەوە (تَابِعِيْن) لە کەسی تردا کۆ نەبوونەتەوە.(١)

زانای پایەبەرز (ابْنُ فَرْح)ی (إِشْبِيْلِيّ)ش، کە یەکێك بوە لە قوتابیەکانی ئیمامی نەوەوی، لە وەسفیدا فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی گەیشتبوە سێ پلەی بەرز، کە ئەگەر یەکێك لەو پلانە لە کەسێکدا هەبوایە، ئەوا خەڵکی کۆڵێو باریان دەپێچایەوەو دەهاتن بۆ خزمەتی. پلەکانیش بریتین لە: زانستو، دنیانەویستیو، فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە.(٢)

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٦٩، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٤١، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٧.

(٢) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ١١٣، وطَبَقَاتُ عُلَمَاءِ الْحَدِيْث (ابْنُ عَبْدِالْهَادِيْ الْحَنْبَلِيّ) / ٤ / ٢٥٦، وتَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٦، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٥٤، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤١، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٤٩.

## ئەو مامۆستایانەی دەرسی لە خزمەتدا خوێندون:

ئیمامی نەوەوی لـە خزمـەت کۆمـەڵێك لـە گـەورەزانایانی سـەردەمی خۆیـدا دەرسی خوێندوە. بەمەش ئەوەی لای ئەوان بە پەرتوبڵاوی هەبوە، ئـەم توانیـوێتی لای خۆی کۆیان بکاتەوە، تا ڕادەیەکی وەها، کە ببێتە پێشەوای سەردەمی خۆی لە حەدیسو لـە فیقهدا.

لەو زانایانەی، کە حەدیسی لە خزمەتدا خوێندون:

١) زانای پایەبەرز (شَرَفُ الدِّيْن أَبُوْ مُحَمَّد عَبْدُالْعَزِيْز بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِالْمُحْسِنِ الْأَنْصَارِيّ)، ناسراو بە (شَيْخُ الشُّيُوْخ). کە لـە نێوان ساڵەکانی (٥٨٦ – ٦٦٢)ی کۆچیدا ژیاوە.
٢) زانای پایەبەرز (عِمَادُ الدِّيْن أَبُوْ الْفَضَائِل عَبْدُالْكَرِيْم بْنُ عَبْدِالصَّمَدِ بْنِ الْحَرَسْتَانِيّ). کە لـە نێوان ساڵەکانی (٥٧٧ – ٦٦٢)ی کۆچیدا ژیاوە.
٣) زانای پایەبەرز (زَيْنُ الدِّيْن أَبُوْ الْبَقَاء خَالِدُ بْنُ يُوْسُفَ بْنِ سَعْد النَّابُلُسِيّ). کە لـە نێوان ساڵەکانی (٥٨٥ – ٦٦٣)ی کۆچیدا ژیاوە.
٤) زانای پایەبەرز (أَبُوْ إِسْحَاق إِبْرَاهِيْمُ بْنُ عِيْسَى الْمُرَادِيُّ الْأَنْدَلُسِي). کە لـە ساڵی (٦٦٨)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.
٥) زانای پایەبەرز (تَقِيُّ الدِّيْن أَبُوْ مُحَمَّد إِسْمَاعِيْلُ بْنُ إِبْرَاهِيْمَ بْنِ أَبِيْ الْيُسْر التَّنُوْخِيّ). کە لـە نێوان ساڵەکانی (٥٨٩ – ٦٧٢)ی کۆچیدا ژیاوە.
٦) زانای پایەبەرز (شَمْسُ الدِّيْن أَبُوْ الْفَرَج عَبْدُالرَّحْمنِ بْنُ الشَّيْخ أَبِيْ عُمَر مُحَمَّدِ بْنِ أَحْمَدَ بْنِ قُدَامَةَ الْمَقْدِسِيّ). کە لـە نێوان ساڵەکانی (٥٧٩ – ٦٨٢)ی کۆچیدا ژیاوە.[١]

---

(١) هەروەها چەند زانایەکی تریش. لەوانە: (أَبُوْ إِسْحَاق إِبْرَاهِيْمُ بْنُ عَلِيِّ بْن أَحْمَدَ بْـنِ فَضْـلِ الْوَاسِطِيّ)و، (أَبُوْ الْعَبَّاس أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِالدَّائِم الْمَقْدِسِيّ)و، (الضِّيَاءُ ابْنُ تَمَام الْحَنَفِيّ)و، (أَبُـوْ مُحَمَّد عَبْدُالرَّحْمنِ بْنُ سَالِمِ بْنِ يَحْيَى الْأَنْبَارِيّ)و، (أَبُوْ زَكَرِيَّا يَحْيَى بْنُ أَبِيْ الْفَـتْح الْحَرَّانِـيُّ

لەو زانایانەش، کە شەرعی لە خزمەتدا خوێندون:

- زانای پایەبەرز (كَمَالُ الدِّيْن أَبُوْ إِبْرَاهِيْم إِسْحَاقُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ عُثْمَانَ الْمَغْرِبِـيّ). کە لە ساڵی (٦٥٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.
- زانای پایەبەرز (شَمْسُ الدِّيْن أَبُوْ مُحَمَّد عَبْدُالرَّحْمنِ بْنُ نُوْحِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيْمَ بْنِ مُوْسَى التُرْكُمَانِيُّ الْمَقْدِسِيّ). کە لە ساڵی (٦٥٤)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.
- زانای پایەبەرز (كَمَالُ الدِّيْن أبو الْفَضَائِل سَلاَّرُ بْنُ الْحَسَن الْإِرْبِلِّيّ). کە لە ساڵی (٦٧٠)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.
- زانای پایەبەرز (عِزُّ الدِّيْن أَبُوْ حَفْص عُمَرُ بْنُ أَسْعَدَ بْنِ أَبِيْ غَالِبٍ الرَّبَعِيّ الْإِرْبِلِّيّ). کە لە ساڵی (٦٧٥)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە.

جا بزانە، کە سیان لەم مامۆستایانە -یەکەمو سێیەمو چوارەم- قوتابی شێخی (ابْنُ الصَّلاح)ی شارەزووری بون.[1] ئیمامی سەخاویش فەرموویەتی: زۆرترین سوودی لە یەکەم مامۆستایان وەرگرتوە.

هەروەها دەرسی زانستنی (أُصُوْلُ الْفِقْه)و، زانستی (نَحْو)و (صَرْف)یشی لە خزمەت هەندێك لە زانایاندا خوێندوە.

---

الصَّيْرَفِيّ)و، (أَبُوْ الْفَضْل مُحَمَّدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ مُحَمَّدٍ الْبَكْرِيّ). بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٨، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣٨ - ٤١.

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٥٣ - ٥٥، وتَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٤، وطَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) / ٢ / ١٥٥، وبُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٣٤، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٥، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٣٩ - ٤٠. بەمەش ئەو بۆچوونە هەڵەیە، کە لە هەندێك کتێبدا نوسراوە، گوایە ئیمامی نەوەوی قوتابی شێخی شارەزووری بوە.

## ئەو قوتابییانەی دەرسیان لە خزمەتیدا خوێندوە:

زۆرن ئەو کەسانەی دەرسیان لـە خزمەت ئیمامی نەوەویدا خوێندوەو، دواتریش بوون بە کەڵەزانای سەردەمی خۆیان. ئیمامی (سَخَاوِيّ) ناوی زۆرێکیانی هێناوە.(1) بەڵام من تەنها ناوی چەند ناودارێکیان دەهێنم:

١) زانای پایەبەرز (شِهَابُ الدِّيْن أَبُوْ الْعَبَّاس أَحْمَدُ بْنُ فَرْحِ بْنِ أَحْمَدَ اللَّخْمِيُّ الْإِشْبِيْلِيّ). لە نێوان ساڵەکانی (٦٢٤ - ٦٩٩)ی کۆچیدا ژیاوە. ئیمامی (ذَهَبِيّ) بەم جۆرە وەسفی کردوە: (شَيْخُنَا الْإِمَامُ الْعَالِمُ الْحَافِظُ الزَّاهِدُ شَيْخُ الْمُحَدِّثِيْن).(2) منیش دەڵێم: ئەم زانا پایەبەرزە بە زاراوەی فەرموودەناسی هۆنراوەیەکی بۆ خۆشەویستێکی خۆی نوسیوەو، زیاتر بە هۆنراوەی (غَرَامِيْ صَحِيْح) ناسراوەو، زانایانی وەکو (ابْنُ عَبْدِالْهَادِيْ)ی (حَنْبَلِيّ)و، (عِزُّ الدِّيْن)ی (ابْنُ جَمَاعَة)و، (قَاسِم)ی کوڕی (قُطْلُوْبُغَا)و، چەند زانایەکی تریش ڕوون کردنەوەیان لەسەر نوسیوەو، سوپاس بۆ خوای گەورە، منیش ڕوون کردنەوەیەکم بە زمانی شیرینی کوردی لەسەر نوسیوەو، ئامادەیە بۆ چاپ.

٢) زانای پایەبەرز (عَلاءُ الدِّيْن أَبُوْ الْحَسَن عَلِيُّ بْنُ إِبْرَاهِيْمَ بْنَ دَاوُدَ بْنِ الْعَطَّار). لە نێوان ساڵەکانی (٦٥٤ - ٧٢٤)ی کۆچیدا ژیاوە. خاوەنی کتێبی (تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن فِيْ تَرْجَمَةِ الْإِمَامِ مُحْيِ الدِّيْن)، کە تێکڕای زانایان سوودی سەرەکیان لەو کتێبە وەرگرتوە بۆ نوسینی زانیاری لەسەر ژیانی ئیمامی نەوەوی. زانای پایەبەرز (صَلاحُ الدِّيْن)ی (صَفَدِيّ) لە وەسفی شێخی (ابْنُ الْعَطَّار)دا فەرموویەتی: (الشَّيْخُ الْإِمَامُ الْمُفْتِيْ الْمُحَدِّثُ الصَّالِحُ بَقِيَّةُ السَّلَف).(3) هەروەها

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٣٧ - ٤٠.

(٢) بڕوانە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٨٥ / بە ژمارە: ١١٧٠.

(٣) بڕوانە: أَعْيَانُ الْعَصرِ وَأَعْوَانُ النَّصْر (الصَّفَدِيّ) / ٣ / ٢٤٥ / بە ژمارە: ١١٠٠.

شێخی (ابْنُ تَغْرِيْ بَرْدِي)ش لە وەسفیدا فەرموویەتی: (الشَّيْخُ الْإِمَامُ الْعَالِمُ الزَّاهِدُ الْحَافِظُ الْمُحَدِّثُ).(١)

٣) زانای پایەبەرز (بَدْرُ الدِّيْنِ أَبُوْ عَبْدِاللهِ مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيْمَ بْنِ سَعْدِ اللهِ بْنِ جَمَاعَةَ الْكِنَانِيُّ الْحَمَوِيّ). لە نێوان ساڵەکانی (٦٣٩ - ٧٣٣)ی کۆچیدا ژیاوە. خاوەنی کتێبی (الْمَنْهَلُ الرَّوِيُّ فِيْ مُخْتَصَرِ عُلُوْمِ الْحَدِيْثِ النَّبَوِيّ)، کە کورتکراوەی کتێبی (عُلُوْمُ الْحَدِيْث)ی شێخی شارەزووریە. ئیمامی (سُبْكِيّ) لە وەسفی شێخی (ابْنُ جَمَاعَة)دا فەرموویەتی: (شَيْخُنَا قَاضِيْ الْقُضَاة........ مُحَدِّثٌ فَقِيْهٌ ذُوْ عَقْلٍ لا يَقُوْمُ أَسَاطِيْنُ الْحُكَمَاء بِمَا جُمِعَ فِيْهِ).(٢)

٤) زانای پایەبەرز (جَمَالُ الدين أبو الْحَجَّاج يُوْسُفُ بْنُ الزَّكِيّ عَبْدِالرَّحْمنِ بْنِ يُوْسُفَ الْمِزِّيُّ الدِّمَشْقِيّ). لە نێوان ساڵەکانی (٦٥٤ - ٧٤٢)ی کۆچیدا ژیاوە. خاوەنی کتێبی (تَهْذِيْبُ الْكَمَالِ فِيْ أَسْمَاءِ الرِّجَال)، کە ئیمامی (سُبْكِيّ) لە وەسفیدا فەرموویەتی: (زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە لە بواری خۆیدا کتێبی وەکو ئەو کتێبە دانەنراوە).(٣) هەروەها گێڕاویێتیەوە لە باوکی خۆیەوە، کە لە وەسفی خاوەنی ئەو کتێبەدا فەرموویەتی: "ئەمە پێشەوای فەرموودەناسانەو، سوێند بەخوا، ئەگەر ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ) لە ژیاندا بوایە، شەرمی دەکرد لە جێگەکەی ئەودا دەرس بڵێتەوە".(٤) ئیمامی (ذَهَبِيّ)ش لە وەسفیدا فەرموویەتی: (شَيْخُنَا الْإِمَامُ الْعَالِمُ الْحَبْرُ الْحَافِظُ الْأَوْحَدُ مُحَدِّثُ الشَّام).(٥)

---

(١) بڕوانە: النُّجُوْمُ الزَّاهِرَةُ فِيْ مُلُوْكِ مِصْرَ وَالْقَاهِرَة (ابْنُ تَغْرِيْ بَرْدِي) / ٩ / ١٨٨.

(٢) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ٩ / ١٣٩ / بە ژمارە: ١٣١١.

(٣) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ١٠ / ٤٠١.

(٤) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ١٠ / ٣٩٨.

(٥) بڕوانە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٩٣ / بە ژمارە: ١١٧٦.

## دوو هەڵوێستی سەرنج ڕاکێشی زانای پایەبەرز (تَقِيُّ الدِّيْن)ی (سُبْكِيّ)

زانای پایەبەرز (تَاجُ الدِّين)ی (سُبْكِيّ) بۆمان دەگێڕێتەوە، کاتێك باوکی، واتە: زانای پایەبەرز (تَقِيُّ الدِّيْن)ی (سُبْكِيّ)، لە ساڵی (٧٤٢)ی کۆچیدا لە هۆڵی قوتابخانەی (دَارُ الْحَدِيْث)ی (أشْرَفِيَّة) نیشتەجێ بوو، شەوانە بۆ شەونوێژ کردن دەچوە هەیوانەکەی، تاوەکو لەسەر ئەو ڕاخەرو فەرشە نوێژ بکات و، دەموچاوی خۆی پێدا بهێنێت، کە ئیمامی نەوەوی لەسەری دانیشتوەو، دەرسی فەرموە.

جا دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، کە ئەم دوو دێڕە هۆنراوەشی سەبارەت بەم حاڵەتەی خۆی نوسیوە:

وَفِيْ دَارِ الْحَدِيْثِ لَطِيْفُ مَعْنىً ... عَلَى بُسْطٍ لَهَا أصْبُوْ وَآوِيْ
عَسَى أنِّيْ أمَسُّ بِحُرِّ وَجْهِيْ ... مَكَاناً مَسَّهُ قَدَمُ النَّوَاوِيْ[1]

هەروەها زانایان دەگێڕنەوە لە شێخ (تَاجُ الدِّيْن)ـەوە، کە فەرموویەتی: جارێك باوکم بەسواری وڵاخەوە بوو بە هاوەڕێی پیاوێکی بەتەمەنی نەخوێندەوار، کە ئەو بە پێ ڕێی دەکرد. جا کە کەوتنە گفتوگۆ، پیاوەکە وتی: (جارێك ئیمامی نەوەویم بینی). دەستبەجێ باوکم لە وڵاخەکە دابەزی و، دەستی پیاوە نەخوێندەوارەکەی ماچ کردو، داوای دوعای خەیری لێ کرد. پاشان پێی فەرموو: دەبێت لە پاشکۆی مندا سوار بیت. چونکە من سواری وڵاخ نابم و، کەسێکیش چاوی بە ئیمامی نەوەوی کەوتبێت، لە بەردەممدا بە پێ ڕێ بکات.[2]

---

(١) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ٨ / ٣٩٦.

(٢) بڕوانە: بُغْيَةُ الرَّاوِيْ / ٢٨، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٦٤، والْمِنْهَاجُ السَّوِيّ / ٥١.

## مەزهەبە فیقهیەکەی و عەقیدەکەی:

کاتێك تەماشای کتێبە فیقهیەکانی ئیمامی نەوەوی دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە کەسێکی شوێنکەوتووی مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ) بوە. بەڵکو وەکو زانایان فەرموویانە: یەکێکە لە گەورەترین زانایانی شوێنکەوتووی ئەو مەزهەبەو، بگرە گەورەی زانایانی دوای سەردەمی خۆیەتیو، کتێبە فیقهیەکانیشی بوون بە سەرەکیترین سەرچاوەو، جێگەی بایەخی زانایان.

سەبارەت بە عەقیدەو مەزهەبە ئوصولیەکەشی، ئەمیش وەکو دەیانو سەدانو هەزاران زانای پێش خۆیو دوای خۆی، یەکێکە لە شوێنکەوتوانی مەزهەبی زانای پایەبەرز (عَلِيّ)ی کوڕی (إِسْمَاعِيْل)ی کوڕی (إِسْحَاق)، ناسراو بە (أَبُو الْحَسَـن)ی (أَشْعَرِيّ).

ئیمامی (سَخَاوِيّ) فەرموویەتی: هەردوو زانای پایەبەرز (أَبُوْ مُحَمَّد)ی (يَافِعِيّ)و، (تَاجُ الدِّيْن)ی (سُبْكِيّ) بە ڕاشکاوی فەرموویانە: ئیمامی نەوەوی لەسەر مەزهەبی ئیمامی (أَشْعَرِيّ) بوە.

ئیمامی (ذَهَبِـيّ) فەرموویەتی: مەزهەبی ئیمامی نەوەوی لە (صِـفَات)ـە (سَمْعِيّ)ـەکاندا (واتە: ئەو سیفەتانەی کە لە قورئانو حەدیسدا بۆ خوای پەروەردگار بەکار هێنراون)، بریتیە لە بێدەنگیو، بەڕێکردنیان وەك چۆن هاتون. بەڵام کەم جارانێك لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا تەئویلی کردوە. ئیمامی (سَخَاوِيّ) دوای ئەوەی ئەم فەرمایشتەی هێناوە، خۆیشی فەرموویەتی: بەڵکو تەئویل کردن لە فەرمایشتی ئیمامی نەوەویدا زۆر هاتوە.[1]

شایانی وتنە، کە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی زۆری زانا پایەبەرزەکانی ئیسلام لە عەقیدەدا لەسەر مەزهەبی ئیمامی (أَشْـعَرِيّ)ن. کەچی هەندێك (موسوڵمانی)

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٤٤.

نیوەخوێندەواری ئەم سەردەمانەی ئێمە، ئەو مەزهەبە بە هەڵە دەزانن و، بە مەزهەبی ئەهلی سونەت و جەماعەتی نازانن!!! وەکو بڵێیت: (ئەمان زۆرتر پەرۆشی عەقیدەو دینداری خەڵکن، تا ئەو زانا پایەبەرزانە!!!) کە ئەمەش بەلای منەوە بێ ئەدەبیەکی زۆر گەورەیە، لە خزمەت ئەو زانایانەی، کە شارەزایی و دینداریان لە ئاستێکدایە، خەڵکانی ئەم سەردەمانەی دوایی، بە هیچ جۆرێك نزیکیشی نابنەوە. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی، دەرگای ڕەحمەتی خوای گەورە داخراوە. بەڵکو ویستی خوا لەسەر ئەوەیە، کە سەردەمەکە کەسانی لەو جۆرە هەڵناخات. وەکو لە هەموو سەردەمێکدا زانایان لە پاش وەفاتی یەکێك لە زانایان فەرموویانە: (لَمْ يُخلِّفْ بَعْدَهُ مِثْلَهُ).

## فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەو ئامۆژگاری دەسەڵاتداران:

کاتێك لە سەرچاوەکاندا تەماشای ژیانی ئیمامی نەوەوی دەکەین، دەبینین یەکێك لە باسە سەرەکی و بایەخپێدراوەکان بریتیە لە فەرمان کردنی بە چاکەو، نەهی کردنی لە خراپەو، ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمە.

ئیمامی (ذَهَبِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی ڕووبەڕووی پاشاو ستەمکارەکان دەبوویەوەو، نارەزایی لێ دەردەبڕین و، نامەی بۆ دەنوسین و، ترسی خوای گەورەی دەخستەوە بیریان.[1] لە جێگەیەکی تریشدا فەرموویەتی: کەسێکی بێ وێنە بوە لە فەرمان کردن بە چاکەو، نەهی کردن لە خراپە.[2]

---

(١) بڕوانە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٦.

(٢) بڕوانە: الْعِبَر فِيْ خَبَرِ مَنْ غَبَر / ٣ / ٣٣٤.

زانای پایەبەرز (قُطْبُ الدِّيْن)ی (يُوْنِيْنِيّ) فەرموویەتی: چەندین جار لە ڕووی پاشاو دەسەلآتدارو فەرمانڕەوای ئەو کاتە (رُكْنُ الـدِّيْن بِيْبَـرْسُ الْبُنْدُقْـدَارِيّ)دا وەستاوەتەوەو، بۆیشیان گێڕاومەتەوە، کە ئەو پاشایە لەبارەی ئیمامی نەوەوییەوە فەرموویەتی: (من لێی دەترسم)، یان شتێك بەو مانایە.[1]

## کتێبو نووسراوەکانی:

ئەگەر خوای گەورە فەڕو بەرەکەت بخاتە تەمەنو پێنووسی کەسێکەوە، ئەوا وەکو ئیمامی نەوەوی دەردەچێت، کە لەماوەیەکی کورتدا کۆمەڵێکی زۆر کتێبی کەموێنەی نووسیوە، کە تا دنیا بەردەوامە سوودیان بۆ موسوڵمانان دەبێتو، کتێبخانەکانیشیان پێ ڕازاوە دەبێت.

ئیمامی (ذَهَبِيّ) فەرموویەتی: خوای گەورە بە کتێبەکانی ئیمامی نەوەوی سوودی بە موسوڵمانان گەیاندو، لە وڵاتاندا بڵاوبوونەوەو، بران بەرەو شارو ناوچەکان.[2]

شێخی (إِسْـنَوِيّ)ش فەرموویەتی: ئیمامی نەوەوی خاوەنی چەندین کتێبی بەناوبانگی پیرۆزی بەسوودە.[3]

جا لە گرنگترین ئەو کتێبانەی، کە بەچاپکراوی دەست دەکەون:

١) (الْمِنْهَاجُ فِيْ شَرْحِ صَحِيْحِ مُسْلِمِ بْنِ الْحَجَّاجِ)، کە ناسراوە بە شەرحی ئیمامی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم. ئیمامی سەخاوی فەرموویەتی: کتێبێکی زۆر

---

(١) بڕوانە: ذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان / ٣ / ٢٨٣. هەروەها بڕوانە هەریەکە لە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٦، ومِرْآةُ الْجنَانِ وَعِبْرَةُ الْيَقْظَان / ٤ / ١٣٩، والْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٥١.
(٢) بڕوانە: تَأْرِيْخُ الْإِسْلام / ٥٠ / ٢٥٢ – ٢٥٣.
(٣) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة / ٢ / ٢٦٦.

به بەرەکەتە.[1] منیش دەڵێم: ئەگەرچی هەندێکی تر لە زانایان صەحیحی موسلیمیان شەرح کردوە، بەڵام شەرحەکەی ئەو ئەوەندە گرنگ‌و متمانەدارو بەناوبانگە، هەر کە وترا شەرحی صەحیحی موسلیم، ئیتر دەستبەجێ کەسی بیسەر بیری بۆلای شەرحەکەی ئەو دەچێت.

٢) (مُخْتَصَرُ صَحِيْحِ مُسْلِم). کە پوختەی حەدیسەکانی صەحیحی موسلیمی تێدا کۆکردۆتەوە.

٣) (الْمَجْمُوْع). ڕوون کردنەوەی کتێبی (الْمُهَذَب)ی زانای پایەبەرز (أَبُوْ إِسْحَاق)ی (شِيْرَازِيّ)ـە. هەتا باسی (رِبَا)ی هێناوەو، تەواوی نەکردوە. بەڵام دواتر زانایان تەواویان کردوەو، بڵاوترین نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی ئەوەیە کە مامۆستای بەڕێز (مُحَمَّد نَجِيْب الْمُطِيْعِيّ) تەواوی کردوە. ئیمامی نەوەوی لە پێشەکیەکەیدا فەرموویەتی: تکام وایە ئەگەر ئەم کتێبە تەواو ببێت، ئیتر پێویست بە هیچ کتێبێکی تر نەبێت‌و، ئەگەر خوای گەورەش بیەوێت، لەمەوە مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ) بە دڵنیاییەوە بزانرێت.

٤) (رَوْضَةُ الطَّالِبِيْنَ وَعُمْدَةُ الْمُفْتِيْنَ). کورتکراوەی ڕوون کردنەوەیەکی ئیمامی (رَافِعِيّ)ـە لەسەر کتێبی (الْوَجِيْز)ی ئیمامی (غَزَالِيّ)، بە ناونیشانی (الْعَزِيْز فِيْ شَرْحِ الْوَجِيْز)، ناسراو بە (الشَّرْحُ الْكَبِيْر).

٥) (مِنْهَاجُ الطَّالِبِيْنَ). کورتکراوەی کتێبی (الْمُحَرَّر)ی ئیمامی (رَافِعِيّ)ـەو، چەندین زانای پایەبەرز ڕوون کردنەوەیان لەسەر نوسیوە. لە گرنگترین چاپکراوەکانیان: (بَيَانُ غَرَضِ الْمُحْتَاج)ی زانای پایەبەرز (ابْنُ الْفِرْكَاح)و، (عُجَالَةُ الْمُحْتَاج)ی شێخی (ابْنُ الْمُلَقِّن)و، (النَّجْمُ الْوَهَّاج)ی شێخ (كَمَالُ الدِّيْن)ی (دَمِيْرِيّ)و، (بِدَايَةُ الْمُحْتَاج)ی زانای پایەبەرز (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة)و، (كَنْزُ الرَّاغِبِيْن)ی شێخ (جَلَالُ الدِّيْن)ی (مَحَلِّيّ)و، (مُغْنِيْ الرَّاغِبِيْن)ی زانای پایەبەرز (ابْنُ قَاضِيْ عَجْلُوْن)و، (تُحْفَةُ الْمُحْتَاج)ی شێخ (ابْنُ حَجَر)ی

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٩.

هەیتەمی‌و، (مُغْنِيْ الْمُحْتَاجِ)ی خەطیبی (شِرْبِينِيّ)و، (نِهَايَةُ الْمُحْتَاجِ)ی شێخ (شَمْسُ الدِّيْنِ)ی ڕەملی‌و، (السِّرَاجُ الْوَهَّاجِ)ی شێخ (مُحَمَّد)ی غەمراوی‌و، (زَادُ الْمُحْتَاجِ)ی شێخ (عَبْدُاللهِ)ی (كُوْهَجِيْ)و......... هتد. هەروەها زانای پایەبەرز مامۆستا مەلا (عَبْدُ اللهِ)ی (هەرتەلی)ش (خوا بەرەکەتی زیاتر بخاتە تەمەن‌و پێنووسەکەیەوە) ڕوون کردنەوەیەکی بەسوودی بە زمانی شیرینی کوردی لەسەر نوسیوە.

٦) (دَقَائِقُ الْمِنْهَاجِ). هەندێك وشەو زاراوەی ناو کتێبی (مِنْهَاجُ الطَّالِبِيْنِ)ی تێدا ڕوونکردۆتەوەو، جیاوازی کردوە لە نێوان ئەو وشانەو وشەو زاراوەکانی ناو کتێبی (الْمُحَرَّرِ)ی ئیمامی (رَافِعِيّ).

٧) (الْأَرْبَعِيْنَ النَّوَوِيَّة). چەندین زانای پایەبەرز ڕوون کردنەوەیان لەسەر نوسیوە. لەوانە: شێخی (ابْنُ دَقِيْقِ الْعِيْدِ)و، شێخی (ابْنُ الْمُلَقِّنِ)و، شێخ (نَجْمُ الدِّيْنِ)ی (طُوْفِيّ)و، شێخ (سَعْدُ الدِّيْنِ)ی تەفتازانی‌و، شێخ (ابْنُ حَجَرِ)ی هەیتەمی‌و، شێخ (أَحْمَد)ی (فَشْنِيّ)و...... هتد. هەروەها بەڕێز مامۆستا مەلا (عَبْدُ اللهِ)ی (هەرتەلی)ش ڕوون کردنەوەیەکی بەسوودی بە زمانی شیرینی کوردی لەسەر نوسیوە.

٨) (رِيَاضُ الصَّالِحِيْنَ مِنْ كَلامِ سَيِّدِ الْمُرْسَلِيْنَ). زانای پایەبەرز (ابْنُ عَلَّانِ الْبَكْرِيُّ الصِّدِّيْقِيّ) ڕوون کردنەوەی لەسەر نوسیوە، بە ناونیشانی (دَلِيْلُ الْفَالِحِيْنَ فِيْ شَرْحِ رِيَاضِ الصَّالِحِيْنَ). هەروەها مامۆستای زۆر بەڕێز (نوری فارس حمە خان)یش (خوا بەرەکەتی زیاتر بخاتە تەمەن‌و پێنووسەکەیەوە) کردوویەتی بە کوردی.

٩) (حِلْيَةُ الْأَبْرَارِ وَشِعَارُ الْأَخْيَارِ فِيْ تَلْخِيْصِ الدَّعَوَاتِ وَالْأَذْكَارِ الْمُسْتَحَبَّةِ فِيْ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ). چەندین کتێب لەبارەیەوە دانراوەو، چەند جارێکیش بە تەحقیقکراوی بەچاپ گەیەنراوەو، وا ئێمەش بە یارمەتی خوای گەورە، وەریدەگێڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی‌و، هەندێك ڕوون کردنەوەی پێویستی لەسەر دەنووسین.

١٠) (خُلاصَةُ الْأحْكَام مِنْ مُهِمَّاتِ السُّنَنِ وَقَوَاعِدِ الْإسْلامِ). هەتا باسی زەکاتی هێناوە. شێخی (ابْنُ الْمُلَقِّن) فەرموویەتی: ئەگەر تەواو بوایە، لەو بابەتەی خۆیدا بێ وێنە دەبوو.[١]

١١) (الْإِيْضَاحُ فِيْ مَنَاسِكِ الْحَجِّ وَالْعُمْرَة). شێخ (ابْنُ حَجَر)ی هەیتەمی حاشیەی لەسەر نوسیوە.

١٢) (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآنِ). ئیمامی سەخاوی فەرموویەتی: کتێبێکی زۆر بەنرخەو، کەس نیە پێویستی پێی نەبێت، بەتایبەتی قوتابیو مامۆستای قورئان.[٢]

١٣) (إرْشَادُ طُلاَّبِ الْحَقَائِقِ إلَى مَعْرِفَةِ سُنَنِ خَيْرِ الْخَلائِقِ). کورتکراوەی کتێبی (عُلُوْمُ الْحَدِيْث)ی شێخ (ابْنُ الصَّلاح)ی شارەزووریە.

١٤) (التَّقْرِيْبُ وَالتَّيْسِيْرُ لِمَعْرِفَةِ سُنَنِ الْبَشِيْرِ النَّذِيْرِ). کورتکراوەی کتێبی (إرْشَادُ طُلاَّبِ الْحَقَائِق)ەو، هەریەکە لە ئیمامی سەخاویو ئیمامی (سُيُوْطِيّ) ڕوون کردنەوەیان لەسەر نوسیوە. بەڵام زیاتر ڕوون کردنەوەکەی ئیمامی (سُيُوْطِيّ) بڵاوەو، چەندین جار بە تەحقیقکراوی بەچاپ گەیەنراوە، بە ناونیشانی: (تَدْرِيْبُ الرَّاوِيْ فِيْ شَرْحِ تَقْرِيْبِ النَّوَاوِيّ).

١٥) (تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَاتِ). خۆی لە پێشەکیەکەیدا فەرموویەتی: تایبەتە بەو وشانەی، کە لە هەریەکە لەم کتێبانەدا هاتون: "مُخْتَصَرُ أَبِيْ إبْرَاهِيْمَ الْمُزَنِيّ"،و "الْمُهَذَّب"،و "التَّنْبِيْه"،و "الْوَسِيْط"،و "الْوَجِيْز"،و "الرَّوْضَة".

١٦) (تَحْرِيْرُ لُغَاتِ التَّنْبِيْه). کتێبێکی زمانەوانی فیقهیەو، وشە بەکارهاتوەکانی ناو کتێبی (التَّنْبِيْه)ی زانای پایەبەرز (أَبُوْ إسْحَاق)ی شیرازی تێدا ڕوون کردۆتەوە.

١٧) (تَصْحِيْحُ التَّنْبِيْه). زانایان فەرموویانە: ئەم کتێبەو کتێبەکەی پێشتر لە سەرەتایی ترین دانراوەکانی ئیمامی نەوەوین.[٣]

---

(١) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ١٩.

(٢) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٢٠.

(٣) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّة (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) / ٢ / ١٥٦، وشَذَرَاتُ الذَّهَب / ٧ / ٦٢٠ – ٦٢١.

١٨) (طَبَقَاتُ الْفُقَهَاءِ الشَّافِعِيَّة). كورتكراوەی كتێبێكی شێخ (ابْنُ الصَّلاح)ی شارەزوریەو، هەندێك زانیاریشی بۆ زیاد كردوەو، تێیدا ناوی (٢٧٧) زانای هێناوە.

١٩) (فَتَاوَى الْإِمَامِ النَّوَوِيّ). كە پێیشی دەوترێت: (الْمَسَائِلُ الْمَنْثُوْرَةُ)و، شێخی (ابْنُ عَطَّار) ڕێكی خستوەو، فەتواكان جۆراوجۆرنو ژمارەشیان (٢٦٠) فەتوایە.

٢٠) (كِتَابُ التَّحْقِيْق). كە تەحقیقی بابەتە فیقهیەكانی كردوەو، هێناویتی تا باسی نوێژی كەسی سەفەركەر.

٢١) (رُؤُوْسُ الْمَسَائِلِ وَتُحْفَةُ طُلاَّبِ الْفَضَائِل). كە كۆمەلێك یاساو ڕێسای تێدا كۆكردۆتەوە سەبارەت بە تەفسیرو حەدیسو شەرعو زمان.

٢٢) (الْإِشَارَاتُ إِلَى بَيَانِ الْأَسْمَاءِ الْمُبْهَمَات). كە كورتركاوەی كتێبی (الْأَسْمَاءُ الْمُبْهَمَةُ فِيْ الْأَنْبَاءِ الْمُحْكَمَة)ی زانای پایەبەرز خەطیبی بەغدادیە.

٢٣) (الْإِيْجَاز فِيْ شَرْحِ سُنَنِ أَبِيْ دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيّ). ڕوون كردنەوەیەكی پوختو كورتە لەسەر هەندێك لە حەدیسەكانی (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد).

٢٤) (الْمَقَاصِدُ النَّوَوِيَّة). كتێبێكی كورتە لەبارەی عەقیدەوە.

٢٥) (بُسْتَانُ الْعَارِفِيْنَ). كتێبێكی كەم وێنەیە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی خواپەرستانو دنیانەویستانو چاكەكاران.

٢٦) (آدَابُ الْفَتْوَى وَالْمُفْتِيْ وَالْمُسْتَفْتِيْ).

٢٧) (وُجُوْبُ تَخْمِيْسِ الْغَنِيْمَةِ وَقِسْمَةُ بَاقِيْهَا).

٢٨) (الْأُصُوْلُ وَالضَّوَابِط). كتێبێكی كورتەو تێیدا باسی چەند مەسەلەیەكی عەقیدەو فیقهی كردوە، بەپێی چەند ڕێسایەكی گشتی.

٢٩) (التَّرْخِيْصُ بِالْقِيَامِ لِذَوِيْ الْفَضْلِ وَالْمَزِيَّةِ مِنْ أَهْلِ الْإِسْلاَم).[١]

---

(١) هەروەها چەندین كتێبی تریش، كە دەستی پێ كردونو، تەواوی نەكردون. لەوانە: ڕوون كردنەوەی صەحیحی بوخاری.

## مێژووی لەدنیا دەرچوونی:

شێخی (ابْنُ عَطَّار) فەرموویەتی: ماوەیەك بەر لە وەفاتی ئیمامی نەوەوی چوومە خزمەتی‌و، ئەویش فەرمووی: مۆڵەتم پێ دراوە بۆ سەفەر کردن. منیش عەرزم کرد: چۆن؟ ئەویش فەرمووی لەم جێگەی خۆمدا دانیشتبووم، لەو تاقەی ڕووی قیبلەوە بینیم، وا کەسێك بە ئاسماندا دەڕوات، لە لای خۆرئاوای قوتابخانەکەوە بەرەو لای خۆرهەڵات‌و، پێی وتم: هەستە بڕۆ بۆ زیارەتی (بَيْتُ الْمَقْدِس).

پاشان شێخی (ابْنُ عَطَّار) فەرموویەتی: من ئەم فەرمایشتەی ئیمامی نەوەویم بە سەفەری عادەتی لێکدایەوە، کەچی ئەو مەبەستی سەفەری ڕاستەقینە بوو.

ئەوجا فەرمووی: ئیمامی نەوەوی پێی فەرمووم: هەستە با خواحافیزی بکەین لە دۆست‌و خۆشەویستەکانمان. منیش لە خزمەتیدا چووم بۆ ئەو گۆڕستانەی، کە هەندێك لە مامۆستاکانی تێدا ئەسپەردە کرابوو، چوە سەر گۆڕەکانیان‌و، هەندێك قورئانی خوێندو، دوعای کردو گریاو، پاشان چوو بۆلای دۆست‌و هاوەڵە زیندووەکانی، وەکو شێخ (يُوسُف)ی (فُقَاعِيّ)و، شێخ (مُحَمَّد)ی (إِخْمِيْمِيّ)و، گەورەی زانا حەنبەلیەکان، شێخ (شَمْسُ الدِّيْنِ ابْنُ أَبِيْ عُمَر). ئەوجا سبەینێ ڕۆشتەوە بۆ (نَوَى)و، دواتریش زیارەتی (قُدْس)و (خَلِيْل)ی کردو، پاشان گەڕایەوە بۆ (نَوَى)و، لەوێ لە ماڵی باوکی نەخۆشکەوت‌و، منیش خەبەرم زانی‌و، لە دیمەشقەوە چووم بۆ خزمەتی‌و، ئەویش پێی خۆش بوو، پێی فەرمووم: بگەڕێرەوە بۆ ناو کەس‌وکاری خۆت‌و، منیش خوا حافیزیم لێ کردو، ئەو ڕۆژە بەرەو چاکبوونەوە دەچوو، ڕۆژی شەممە بوو، (٢٠)ی مانگی (رَجَب)ی ساڵی (٦٧٦)، پاشان لە شەوی چوار شەممە، (٢٤)ی ئەو مانگەدا وەفاتی کرد.[١]

هەروەها شێخی (ابْنُ عَطَّار) فەرموویەتی: دوای وەفاتی ئیمامی نەوەوی خزم‌و کەس‌وکارو دراوسێکانی ویستیان گومەزەیەك لەسەر گۆڕەکەی درووست بکەن،

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٩٦ – ٩٨.

ئەویش چوە خەوی گەورەترین ئافرەتی خزمەکانی خۆی، کە وابزانم خوشکی باوکی بوو، پێی فەرموو: بلێ بە براکەم و ئەو خەڵکە شتی وا دروست نەکەن. چونکە هەرکەی شتێکی لەو جۆرە دروست بکەن دادەهەڕۆژێ. ئەوەبوو ئەویش بە نارەحەتیەکەوە خەبەری بوویەوەو، خەوەکەی بۆ گێڕانەوەو، ئەوانیش وازیان لە کارەکە هێناو، تەنها بە بەرد پەرژینێکیان بە دەوری گۆڕەکەیدا دروست کرد، بۆ ڕێگری کردن لە ئاژەڵو لە شتی تر.

هەروەها شێخی (ابْنُ عَطَّار) گێڕاوێتیەوە لە هەندێك لە خزم و کەس و کارو دۆستەکانی ئیمامی نەوەویەوە لە (نَــوَی)، کە داوایان لێ کردوە، لە ساحەی مەحشەردا لەبیریان نەکات. ئەویش سوێندی بۆ خواردون، کە ئەگەر خوا بۆی بکات، ناچێتە بەهشتەوە، تا کەسێك لەوانەی دەیانناسێت لەدوایەوە مابن و، بەڵێنی پێ داون، کە لەدوای هەموویانەوە دەچێتە بەهەشتەوە.[1]

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ١٥٣ – ١٥٤.

## پلەو پایەو ئاستی زانستیو فەرمایشتی زانایان لەبارەیەوە:

پلەوپایەو ئاستی زانستیو خواپەرستیو دنیانەویستی ئیمامی نەوەوی گەیشتۆتە رادەیەك، کە هەرچی وەسفی ڕێزو گەورەیيو پایەداری هەیە، لەلایەن زانایانەوە بۆی بەکار هێنراوە. لەوانە: (الشَّيْخ ، الْفَقِيْهُ ، الزَّاهِد ، الْوَرِع ، الْمُفِيْد ، الْفَاضِل ، الْمُحَدِّث ، الْحَافِظ ، الْعَالِم ، الْعَلاَّمَة ، الْقُدْوَةُ ، الْمُتْقِن ، الْإِمَام ، شَيْخُ الْإِسْلام ، عَلَمُ الْأَوْلِيَاء ، قُطْبُ الْأَوْلِيَاء ، أَوْحَدُ دَهْرِهِ ، فَرِيْدُ عَصْرِهِ). جا لەبەر درێژنەبوونەوە تەنها فەرمایشتی هەندێکیان دەهێنم:

- زانای پایەبەرز (عَلاءُ الدِّيْن)ی (ابْنُ الْعَطَّار) فەرموویەتی: (الشَّيْخُ الزَّاهِدُ الْوَرِعُ وَلِيُّ الله........ ذُوْ التَّصَانِيْفِ الْمُفِيْدَةِ، وَالْمُؤَلَّفَاتِ الْحَمِيْدَةِ، أَوْحَدُ دَهْرِهِ وَفَرِيْدُ عَصْرِهِ، الصَّوَّامُ الْقَوَّامُ، الزَّاهِدُ فِيْ الدُّنْيَا، الرَّاغِبُ فِيْ الْآخِرَة، صَاحِبُ الْأَخْلَاق الْمَرْضِيَّةِ وَالْمَحَاسِنِ السَّنِيَّة، الْعَالِمُ الرَّبَّانِيُّ، الْمُتَفَقُ عَلَى عِلْمِهِ وَإِمَامَتِهِ وَجَلالَتِهِ وَزُهْدِهِ وَوَرْعِهِ وَعِبَادَتِهِ وَصِيَانَتِهِ فِيْ أَقْوَالِهِ وَأَفْعَالِهِ وَحَالاتِهِ، لَهُ الْكَرَامَاتُ الطَّافِحَة وَالْمَكْرُمَاتُ الْوَاضِحَة، الْمُؤْثِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ لِلْمُسْلِمِيْن، وَالْقَائِمُ بِحُقُوْقِهِمْ وَحُقُوْق وُلاةِ أُمُوْرِهِمْ بِالنُّصْحِ وَالدُّعَاءِ فِيْ الْعَالَمِيْنَ، وَكَانَ كَثِيْرَ التِّلاوَةِ وَالذِّكْرِ لِلَّهِ تَعَالَى).[1]
- زانای پایەبەرز (قُطْبُ الدِّيْن)ی (يُوْنِيْنِيّ) فەرموویەتی: (الْفَقِيْهُ الشَّافِعِيُّ الْمُحَدِّثُ الزَّاهِدُ الْعَابِدُ الْوَرِعُ الْمُتَبَحِّرُ فِيْ الْعُلُوْمِ، صَاحِبُ التَّصَانِيْفِ الْمُفِيْدَةِ. كَانَ أَوْحَدَ زَمَانِهِ فِيْ الْوَرْعِ وَالْعِبَادَةِ، وَالتَّقَلُّلِ مِنَ الدُّنْيَا، وَالْإِكْبَاب عَلَى الْإِفَادَةِ وَالتَّصْنِيْفِ مَعَ شِدَّةِ التَّوَاضُع، وَخُشُوْنَةِ الْمَلْبَسِ وَالْمَأْكَلِ، وَالْأَمْرِ بِالْمَعْرُوْفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَر).[2]

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ٤٠.

(٢) بڕوانە: ذَيْلُ مِرْآةِ الزَّمَان / ٣ / ٢٨٣.

- زانای پایەبەرز (ابْنُ عَبْدِالْهَادِي) (حَنْبَلِيّ) فەرموویەتی: (الْإمَامُ الْفَقِيْـــهُ الْحَـــافِظُ الْأَوْحَدُ الْقُدْوَةُ الزَّاهِد).[1]
- زانای پایەبەرز (شَمْسُ الدِّيْن)ی (ذَهَبِيّ) فەرموویەتی: (الْإمَامُ الْحَـــافِظُ الْأَوْحَـــدُ الْقُدْوَةُ شَيْخُ الْإسْلام عَلَمُ الْأَوْلِيَاء........ كَانَ حَافِظاً لِلْحَدِيْثِ وَفُنُوْنِـــهِ وَرِجَالِـــهِ وَصَحِيْحِهِ وَعَلِيْلِهِ رَأْساً فِيْ مَعْرِفَةِ الْمَذْهَب).[2]
- زانای پایەبەرز (زَيْنُ الدِّيْن)ی (ابْنُ الْوَرْدِيّ) فەرموویـەتی: (شَيْخُ الْإسْلَام الْعَـــالِمُ الرَّبَّانِيُّ الزَّاهِد........ وَلَهُ سِيْرَةٌ مُفْرَدَةٌ فِيْ عُلُوْمِهِ وَتَصَانِيْفِهِ وَدِيْنِهِ وَيَقِيْنِهِ وَوَرْعِـــهِ وَزُهْدِهِ وَقَنَاعَتِهِ بِالْيَسِيْرِ وَتَعَبُّدِهِ وَتَهَجُّدِهِ وَخَوْفِهِ مِنَ اللهِ تَعَالَى).[3]
- زانای پایەبەرز (ابْنُ شَـــاكِر)ی (كُتْبِـــيّ) فەرموویـەتی: (مُفْتِـــيْ الْأُمَّـــةِ شَـــيْخُ الْإسْلام........ الْحَافِظُ الْفَقِيْهُ الشَّافِعِيُّ الزَّاهِدُ، أَحَدُ الْأَعْلام).[4]
- زانای پایەبەرز (بَدْرُ الدِّيْن)ی (يَافِعِيّ) فەرموویـەتی: (الْفَقِيْهُ الْإمَامُ شَيْخُ الْإسْـــلامِ مُفْتِيْ الْأَنَام الْمُحَدِّثُ الْمُتْقِنُ الْمُحَقِّقُ الْمُدَقِّقُ النَّجِيْبُ الْحَبْرُ الْمُفِيْدُ الْقَرِيْبُ الْبَعِيْدُ مُحَرِّرُ الْمَذْهَب وَمُهَذِّبُهُ وَضَابِطُهُ وَمُرَتِّبُهُ، أَحَدُ الْعُبَّادِ الْوَرِعِيْنَ الزُّهَّادِ الْعَالِمُ الْعَامِلُ الْمُحَقِّقُ الْفَاضِلُ الْوَلِيُّ الْكَبِيْرُ السَّيِّدُ الشَّهِيْرُ، ذُوْ الْمَحَاسِنِ الْعَدِيْـــدَةِ، وَالسِّـــيْرَةِ الْحَمِيْدَةِ، وَالتَّصَانِيْفِ الْمُفِيْدَةِ الَّذِيْ فَاقَ جَمِيْعَ الْـــأَقْرَانِ، وَسَـــارَتْ بِمَحَاسِـــنِهِ الرُّكْبَانُ، وَاشْتَهَرَتْ فَضَائِلُهُ فِيْ سَائِرِ الْبُلْدَانِ، وَشُوْهِدَتْ مِنْهُ الْكَرَامَات).[5]
- زانای پایەبەرز (تَاجُ الدِّيْن)ی (سُبْكِيّ) فەرموویەتی: (الشَّيْخُ الْإمَامُ الْعَلاَّمَةُ....... شَيْخُ الْإسْلامِ أُسْتَاذُ الْمُتَأَخِّرِيْنَ وَحُجَّةُ اللهِ عَلَى اللَّاحِقِيْنَ وَالـــدَّاعِيْ إلَـــى سَـــبِيْلِ السَّالِفِيْنَ كَانَ يَحْيَى –رَحِمَهُ اللهُ– سَيِّداً وَحَصُوْراً وَلَيْثاً عَلَـــى الـــنَّفْسِ هَصُـــوْراً

(١) بڕوانە: طَبَقَاتُ عُلَمَاءِ الْحَدِيْث / ٤ / ٢٥٤.
(٢) بڕوانە: تَذْكِرَةُ الْحُفَّاظ / ٤ / ١٧٤ – ١٧٥.
(٣) بڕوانە: تَأرِيْخُ ابْنِ الْوَرْدِيّ / ٢ / ٢١٩.
(٤) بڕوانە: فَوَاتُ الْوَفَيَات / ٤ / ٢٦٤ – ٢٦٥.
(٥) بڕوانە: مِرْآةُ الْجِنَان / ٢ / ٢١٠.

وَزَاهِداً لَمْ يُبَالِ بِخَرَابِ الدُّنْيَا إِذَا صَيَّرَ دِيْنَهُ رَبْعاً مَعْمُوْراً، لَـهُ الزُّهْـدُ وَالْقَنَاعَـةُ وَمُتَابَعَةُ السَّالِفِيْنَ مِنْ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ، وَالْمُصَابَرَةُ عَلَى أَنْـوَاعِ الْخَيْـرِ، لا يَصْرِفُ سَاعَةً فِيْ غَيْرِ طَاعَةٍ، هذا مَعَ التَّفَنُّنِ فِيْ أَصْنَافِ الْعُلُـوْمِ فِقْهـاً وَمُتُـوْنَ أَحَادِيْثَ وَأَسْمَاءَ رِجَالٍ وَلُغَةً وَتَصَوُّفاً وَغَيْرَ ذلِك).[1]

- زانای پایەبەرز (جَمَالُ الدِّيْن)ی (إِسْنَوِيّ) فەرموویـەتی: (مُحَرِّرُ الْمَذْهَبِ وَمُهَذِّبُهُ وَمُنَقِّحُهُ وَمُرَتِّبُهُ، وَسَارَ فِيْ الْآفَاقِ ذِكْرُهُ، وَعَلا فِيْ الْعَالَمِ مَحَلُّهُ وَقَدْرُهُ، صَـاحِبُ التَّصَانِيْفِ الْمَشْهُوْرَةِ الْمُبَارَكَةِ النَّافِعَةِ).[2]
- زانای پایەبەرز (ابْنُ كَثِيْر) فەرموویەتی: (الْعَلاَّمَةُ شَيْخُ الْمَذْهَبِ وَكَبِيْرُ الْفُقَهَاءِ فِيْ زَمَانِهِ........ وَقَدْ كَانَ مِنَ الزَّهَادَةِ وَالْعِبَادَةِ وَالْوَرْعِ وَالتَّحَرِّيْ وَالِانْجِمَاحِ عَـنِ النَّاسِ عَلَى جَانِبٍ كَبِيْرٍ لا يَقْدِرُ عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنَ الْفُقَهَاءِ غَيْرَه).[3] لـە جێگەیـەکی تریشدا فەرموویەتی: (الشَّيْخُ الْإِمَامُ الْعَلاَّمَةُ........ الْحَافِظُ الْفَقِيْهُ الشَّافِعِيُّ النَّبِيْلُ. مُحَرِّرُ الْمَذْهَبِ وَمُهَذِّبُهُ وَضَابِطُهُ وَمُرَتِّبُهُ أَحَدُ الْعُبَّادِ وَالْعُلَمَاءِ الزُّهَّاد).[4]
- زانای پایەبەرز (كَمَالُ الدِّيْن)ی (دَمِيْرِيّ) فەرموویەتی: (الْحَبْرُ الْإِمَامُ الْعَلاَّمَةُ شَيْخُ الْإِسْلامِ قُطْبُ دَائِرَةِ الْعُلَمَاءِ الْأَعْلَامِ الشَّيْخُ....... مُحَرِّرُ الْمَذْهَبِ الْمُتَّفَـقُ عَلَـى أَمَانَتِهِ وَدِيَانَتِهِ وَسُؤْدُدِهِ وَسِيَادَتِهِ وَوَرَعِهِ وَزَهَادَتِهِ، كَانَ ذَا كَرَامَاتٍ ظَاهِرَةٍ وَآيَاتٍ بَاهِرَةٍ وَسَطَوَاتٍ قَاهِرَةٍ، فَلِذَلِكَ أَحْيَا اللَّهُ ذِكْرَهُ بَعْدَ مَمَاتِهِ، وَاعْتَرَفَ أَهْـلُ الْعِلْـمِ بِعَظِيمِ بَرَكَاتِهِ، وَنَفَعَ اللَّهُ بِتَصَانِيفِهِ فِي حَيَاتِهِ وَبَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَا يَكَادُ يَسْتَغْنِي عَنْهَـا أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِ الْمَذَاهِبِ الْمُخْتَلِفَةِ، وَلَا تَزَالُ الْقُلُوبُ عَلَى مَحَبَّـةٍ مَـا أَلِفَـهُ مُؤْتَلِفَةً).[5]

---

(١) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ الْكُبْرَى / ٨ / ٣٩٥.

(٢) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ (الْإِسْنَوِيّ) / ٢ / ٢٦٦.

(٣) بڕوانە: الْبِدَايَةُ وَالنِّهَايَة / ١٣ / ٣٢٦.

(٤) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ (ابْنُ كَثِيْر) / ٨٢٥.

(٥) بڕوانە: پێشەکی کتێبی (النَّجْمُ الْوَهَّاجِ فِيْ شَرْحِ الْمِنْهَاج).

- زانای پایەبەرز (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) فەرموویەتی: (الْفَقِيْهُ الْحَافِظُ الزَّاهِدُ أحَدُ الْأعْلامِ شَيْخُ الْإسْلام).[1]
- زانای پایەبەرز (بَدْرُ الدِّيْن)ی (عَيْنِيّ) فەرموویەتی: (الْإمَامُ الْعَالِمُ الْعَلاَّمَةُ....... شَيْخُ الْمَذْهَبِ وَكَبِيْرُ الْفُقَهَاءِ فِيْ زَمَانِه، وَمَنْ حَازَ قَصَبَ السَّبْقِ دُوْنَ أقْرَانِهِ....... وَقَدْ كَانَ مِنَ الزَّهَادَةِ وَالْعِبَادَةِ وَالتَّحَرِّيْ وَالْوَرْعِ وَالِانْجمَاعِ عَنِ النَّاسِ وَالتَّخَلِّيْ لِطَلَبِ الْعِلْمِ وَالتَّحَلِّيْ بِهِ عَلَى جَانِبٍ عَظِيْمٍ لا يَقْدِرُ عَلَيْهِ غَيْرُه).[2]
- زانای پایەبەرز (ابْنُ تَغْرِيْ بَرْدِي) فەرموویەتی: (شَيْخُ الْإسْلامِ........ الْفَقِيْهُ الشَّافِعِيُّ الْحَافِظُ الزَّاهِدُ صَاحِبُ الْمُصَنَّفَاتِ الْمَشْهُوْرَة........ وَفَضْلُهُ وَعِلْمُهُ وَزُهْدُهُ أشْهَرُ مِنْ أنْ يُذْكَر).[3]
- زانای پایەبەرز (شَمْسُ الدِّيْن)ی (سَخَاوِيّ) فەرموویەتی: (شَيْخُ الْإسْلام، وَإمَامُ الْأئِمَّةِ الْأعْلامِ، قُطْبُ الْأوْلِيَاءِ الْكِرَام، وَنَادِرَةُ الزُّهَّادِ الْوَافِرُ فِيْ رَوْعَةِ السِّهَامِ، الْمُجْتَهِدُ فِيْ الصِّيَامِ وَالْقِيَامِ، وَالْقَائِمُ بِخِدْمَةِ الْمَلِكِ الْعَلاَّم).[4]
- زانای پایەبەرز (جَلالُ الدِّيْن)ی (سُيُوْطِيّ) فەرموویەتی: (الْإمَامُ الْفَقِيْهُ الْحَافِظُ الْأوْحَدُ الْقُدْوَةُ شَيْخُ الْإسْلامِ عَلَمُ الْأوْلِيَاء......... وَكَانَ إمَاماً بَارِعاً حَافِظاً مُتْقِناً، اتْقَنَ عُلُوْماً شَتَّى، وَبَارَكَ اللهُ فِيْ عِلْمِهِ وَتَصَانِيْفِهِ لِحُسْنِ قَصْدِهِ، وَكَانَ شَدِيْدَ الْوَرْعِ وَالزُّهْدِ أمَّاراً بِالْمَعْرُوْفِ نَاهِياً عَنِ الْمُنْكَرِ، تَهَابُهُ الْمُلُوْكُ، تَارِكاً لِجَمِيْعِ مَلاذِّ الدُّنْيَا).[5]
- زانای پایەبەرز شێخ (عَبْدُالْقَادِر)ی (نُعَيْمِيّ) فەرموویەتی: (الْإمَامُ الْعَلاَّمَةُ وَلِيُّ اللهِ شَيْخُ الْإسْلامِ الْفَقِيْهُ الزَّاهِدُ الْحَافِظ).[6]

---

(١) بڕوانە: طَبَقَاتُ الشَّافِعِيَّةِ (ابْنُ قَاضِيْ شُهْبَة) / ٢ / ١٥٣.
(٢) بڕوانە: عِقْدُ الْجُمَان / عَصْرُ سَلاطِيْنِ الْمَمَالِك / ٢ / ١٩٤.
(٣) بڕوانە: النُّجُوْمُ الزَّاهِرَة / ٧ / ٣٣٦ – ٣٣٧.
(٤) بڕوانە: الْمَنْهَلُ الْعَذْبُ الرَّوِيّ / ٩.
(٥) بڕوانە: طَبَقَاتُ الْحُفَّاظ / ٥١٣.
(٦) بڕوانە: الدَّارِسُ فِيْ تَارِيْخِ الْمَدَارِس / ١ / ١٩.

- زانای پایەبەرز شێخ (ابْنُ حَجَر)ی (هَيْتَمِيّ) فەرموویەتی: (الْقُطْبِ الرَّبَّانِيِّ وَالْعَالَمِ الصَّمَدَانِيِّ وَلِيِّ اللَّهِ بِلَا نِزَاعٍ وَمُحَرِّرِ الْمَذْهَبِ بِلَا دِفَاعٍ).[1]
- زانای پایەبەرز (خَطِيْب)ی (شِرْبِيْنِيّ) فەرموویەتی: (الْإِمَامُ الرَّبَّانِيُّ الشَّافِعِيُّ الثَّانِي........ الْحَبْرُ الْإِمَامُ قُطْبُ دَائِرَةِ الْعُلَمَاءِ الْأَعْلَامِ الشَّيْخُ).[2]
- زانای پایەبەرز شێخ (شَمْسُ الدِّيْن)ی (رَمْلِيّ) فەرموویەتی: (سَيِّدُ طَائِفَةِ الْعُلَمَاءِ مِنْ الْقَرْنِ السَّادِسِ وَإِلَى هَذَا الْحِينِ، وَصَاحِبُ الْفَضْلِ عَلَى أَهْلِ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ ذُو الْفَضْلِ الْمُبِينِ........ شَيْخُ الْإِسْلَامِ بِلَا نِزَاعٍ، وَبَرَكَةُ الْأَنَامِ بِلَا دِفَاعٍ، الْقُطْبُ الرَّبَّانِيُّ، وَالْعَالِمُ الصَّمَدَانِيُّ).[3]
- زانای پایەبەرز (ابْنُ الْعِمَاد)ی (حَنْبَلِيّ) فەرموویەتی: (شَيْخُ الْإِسْلَامِ........ الْفَقِيْهُ الشَّافِعِيُّ الْحَافِظُ الزَّاهِدُ أَحَدُ الْأَعْلَامِ).[4]
- زانای پایەبەرز (ابْنُ علاّن)ی (صِدِّيْقِيّ) فەرموویەتی: (حَبْرُ الْأُمَّةِ وَعَالِمُهَا، وَشَيْخُ الشَّرِيْعَةِ وَحَاكِمُهَا، وَنَاصِرُ السُّنَّةِ النَّبَوِيَّة، وَقَامِعُ الْبِدْعَةِ غَيْرِ الْمَرْضِيَّة، مُحَرِّرُ مَذْهَبِ الشَّافِعِيِّ الْإِمَامِ، وَمُذْهِبُ إِشْكَالِ مَا أُشْكِلَ مِنَ الْأَحْكَامِ، الْمُتَّفَقُ عَلَى جَلالَتِهِ وَعُلُوِّ رُتْبَتِهِ وَوِلايَتِهِ وَارْتِقَاءِ مَكَانَتِهِ).[5]

---

(١) بڕوانە: پێشەکی کتێبی (تُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ فِيْ شَرْحِ الْمِنْهَاجِ).

(٢) بڕوانە: پێشەکی کتێبی (مُغْنِي الْمُحْتَاجِ إِلَى مَعْرِفَةِ أَلْفَاظِ الْمِنْهَاجِ).

(٣) بڕوانە: پێشەکی کتێبی (نِهَايَةُ الْمُحْتَاجِ إِلَى شَرْحِ الْمِنْهَاجِ).

(٤) بڕوانە: شَذَرَاتُ الذَّهَبِ / ٧ / ٦١٨.

(٥) بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ٣.

## لاواندنەوەی زانایان بۆ ئیمامی نەوەوی:

کاتێك زانایەکی کەموێنەی خواناسی پایەبەرزی وەکو ئیمامی نەوەوی لە دنیا دەردەچێت، گومانی تێدا نیە، کە کەلێنێکی گەورە لە بینای زانستو خواپەرستیدا درووست دەبێت. بۆیە زۆرێك لە زانایان بۆ دەربڕینی خەفەتو نارەحەتی دڵی خۆیانو، هەست کردن بەو موصیبەتە گەورە، چەند دێڕە هۆنراوەیەکیان بۆ لاواندنەوەی نوسیوە.

شێخی (ابْنُ عَطَّار) هۆنراوەی بیست لە زانایانی هێناوە. بەڵاّم من لەبەر زۆری، تەنها هۆنراوەی یەکێکیان دەهێنم، کە بریتیە لە زانای پایەبەرز (مَجْدُ الدِّيْن مُحَمَّدُ بْنُ أحْمَدَ بْنِ عُمَر)، ناسراو بە (ابْنُ الظَّهِيْر الْحَنَفِيّ).(١)

عَزَّ الْعَزَاءُ وَعَمَّ الْحَادِثُ الْجَلَلُ ... وَخَابَ بِالْمَوْتِ فِيْ تَعْمِيْرِكَ الْأَمَلُ
وَاسْتَوْحَشَتْ بَعْدَمَا كُنْتَ الْأنِيْسَ لَهَا ... وَسَاءَهَا فَقْدُكَ الْأَسْحَارُ وَالْأُصُلُ
قَدْ كُنْتَ لِلدِّيْنِ نُوْراً يُسْتَضَاءُ بِهِ ... مُسَدَّداً مِنْكَ فِيْهِ الْقَوْلُ وَالْعَمَلُ
وَكُنْتَ تَتْلُوْ كِتَابَ اللهِ مُعْتَبِراً ... لا يَعْتَرِيْكَ عَلَى تَكْرَارِهِ مَلَلُ
وَكُنْتَ فِيْ سُنَّةِ الْمُخْتَارِ مُجْتَهِداً ... وَأنْتَ بِالْيُمْنِ وَالتَّوْفِيْقِ مُشْتَمِلُ
وَكُنْتَ زَيْناً لِأهْلِ الْعِلْمِ مُفْتَخِراً ... عَلَى جَدِيْدٍ كَسَاهُمْ ثَوْبُكَ السَّمَلُ
وَكُنْتَ أسْبَغَهُمْ ظِلاًّ إذَا اسْتَعَرَتْ ... هَوَاجِزُ الْجَهْلِ وَالْإظْلال يَنْتَقِلُ
كَسَاكَ رَبُّكَ أوْصَافاً مُجَمَّلَةً ... يَضِيْقُ عَنْ حَصْرِهَا التَّفْصِيْلُ وَالْجُمَلُ
أسْلَى كَمَالُكَ عَنْ قَوْمٍ مَضَوْا بَدَلا ... وَعَنْ كَمَالِكَ لا مُثْلٍ وَلا بَدَلُ
فَمِثْلُ فَقْدِكَ تَرْتَاعُ الْعُقُوْلُ لَهُ ... وَفَقْدُ مِثْلِكَ جَرْحٌ لَيْسَ يَنْدَمِلُ
زَهِدْتَ فِيْ هذِهِ الدُّنْيَا وَزُخْرُفِهَا ... عَزْماً وَحَزْماً فَمَضْرُوْبٌ بِكَ الْمَثَلُ
أعْرَضْتَ عَنْهَا احْتِقَاراً غَيْرَ مُحْتَفِلٍ ... وَأنْتَ بِالسَّعْيِ فِيْ أُخْرَاكَ مُحْتَفِلُ

---

(١) بڕوانە: تُحْفَةُ الطَّالِبِيْن / ١١٤ - ١١٦.

عَزَفْتَ عَنْ شَهَوَاتٍ مَا لِعَـزْمِ فَـتىً بِهَـا سِـوَاكَ إذَا عَنَّـتْ لَـهُ قِبَـلُ
أسْهَرْتَ فِيْ الْعِلْمِ عَيْناً لَمْ تَذُقْ سِـنَةً إلاّ وَأنْتَ بِهِ فِـيْ الْحُلْـمِ مُشْـتَغِلُ
يَا لَهْفَ حَفْلٍ عَظِيْمٍ كُنْـتَ بَهْجَتَـهُ وَحَلْيُـهُ فَعَـرَاهُ بَعْـدَكَ الْعَطَـلُ
وَطَالِبُوْا الْعِلْمِ مِـنْ دَانٍ وَمُغْتَـرِبٍ نَالُوْا بِيُمْنِكَ مِنْـهُ فَـوْقَ مَـا أمِلُـوْا
حَارُوْا لِغَيْبَةِ هَادِيْهِمْ وَضَـاقَ بِهِـمْ لِفَرْطِ حُزْنٍ عَلَيْـهِ السَّـهْلُ وَالْجَبَـلُ
تُرَى دَرَى تُرْبَـهُ مَـنْ غَيَّبُـوْهُ بِـهِ أوْ نَعْشُهُ مَنْ عَلَى أعْـوَادِهِ حَمَلُـوْا؟
عَنَّاهُ شُـغْلُهُمُ دَهْـراً وَعَـادَ لَهُـمْ بِلاعِجِ الْوَجْدِ عَـنْ أشْـغَالِهِمْ شُـغُلُ
يَا مُحْيِيَ الدِّيْنِ كَمْ غَادَرْتَ مِنْ كَبِدٍ حَرَّى عَلَيْكَ وَعَـيْنٍ دَمْعُهَـا هَطِـلُ
وَكَمْ مُقَامٍ كَحَدِّ السَّـيْفِ لا جَلَـدٌ يَقْوَى عَلَى هَوْلِـهِ فِيْـهِ وَلا جَـدَلُ
أمَـرْتَ فِيْـهِ بِـأمْرِ اللهِ مُنْتَضِـياً سَيْفاً مِنَ الْعَزْمِ لَمْ يُصْـنَعْ لَـهُ خَلَـلُ
وَكَمْ تَوَاضَعْتَ عَنْ فَضْلٍ وَعَنْ شَرَفٍ وَهِمَّـةٍ هَامَـةِ الْجَـوْزَاءِ تَنْتَعِـلُ
عَالَجْتَ نَفْسَكَ وَالْـأدْوَاءُ شَـامِلَةٌ حَتَّى اسْتَقَامَتْ وَحَتَّى زَالَـتْ الْعِلَـلُ
بَلَغْتَ بِالتَّعَبِ الْفَانِيْ رِضَـى مَلِـكٍ ثَوَابُهُ فِـيْ جِنَـانِ الْخُلْـدِ مُتَّصِـلُ
ضَيْفُ الْكَرِيْمِ جَدِيْرٌ أنْ يُضَافَ لَـهُ إلَـى الْكَرَامَـةِ مِـنْ ألْطَافِـهِ نُـزُلُ
بَرَزْتَ أصْلَيْكَ فِيْ دَارَيْكَ مُحْتَسِـباً فَقَدْ تَكَافَأَ فِيْـكَ الْحُـزْنُ وَالْجَـذَلُ
فَجَعْتَ بِالْأمْسِ لَيْلاً كُنْـتَ سَـاهِرَهُ لِلّهِ وَالنَّوْمُ قَدْ خِيْطَـتْ بِـهِ الْمُقَـلُ
وَحَالَ نُوْرُ نَهَـارٍ كُنْـتَ صَـائِمَهُ إذَا الْهَجِيْرُ بِنَـارِ الشَّـمْسِ مُشْـتَعِلُ
لا زَالَ مَثْوَاكَ مَثْـوَى كُـلِّ عَارِفَـةٍ وَرَوْضُهُ النَّضْرُ مِنْ سُحْبِ الرِّضَا خَضِلُ
إلَى مَتَى بِغُـرُوْرٍ تَطْمَـئِنُّ وَلا الْـ مُلُوْكُ رُدَّ الرَّدَى عَـنْهُمْ وَلا الرُّسُـلُ
وَلا حِمىً مِنْ حِمَامٍ جَحْفَلٍ لَجِـبٍ وَلا حُصُـوْنٌ مَنِيْعَـاتٌ وَلا قُلَـلُ
يَا لاهِياً لاهِياً عَنْ هَـوْلِ مَصْـرَعِهِ وَضَاحِكُ السِّنِّ مِنْهُ يَضْـحَكُ الْأجَـلُ
لا تُخْلِ نَفْسَكَ مِنْ زَادٍ فَإنَّـكَ مِـنْ حِيْنِ الْوِلادِ مَـعَ الْأنْفَـاسِ مُرْتَحِـلُ
وَمَـا مَقَـامٌ يُـدِيْمُ السَّـيْرَ يَتْبَعُـهُ إلَـى مَحَـلٍّ تَـلاهُ سَـائِقٌ عَجِـلُ

## پوختەیەك دەربارەی كتێبی (الأذكار):

وەكو لە پێشەكیەكەدا ئاماژەم پێدا، كتێبی (أذْكَار) پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژو شەوی مرۆڤی موسوڵمانەوە هەیە، چۆن یادی خوای گەورە بكات لە بەیانیو لە ئێوارە، لە هەستانو لە دانیشتن، لە هەموو جووڵەو بزاوتێكیدا.

باسی یادی خوای گەورەی كردوە لە نوێژو، لە ڕۆژوو، لە حەجو، لە جیهادو، لە سەفەرو، لە كاتی خوێندنی قورئانی پیرۆزو، لە كاتی خواردنو خواردنەوەو، لە كاتی نەخۆشیو مردنو، چۆنێتی سوپاسو ستایشی پەروەردگارو، چۆنێتی دروودو سەلام لەسەر پێغەمبەرو یارو یاوەرانیو، ئادابی ژنهێنانو، ئەوەش پەیوەندی پێیەوە هەیەو، ئادابی سڵاو كردنو، مۆڵەتوەرگرتن بۆ چوونە ماڵی خەڵكیو، چۆنێتی فەرمان كردن بە چاكەو، نەهی كردن لە خراپەو، پاراستنی زمان لە غەیبەتو دووزمانیو قسەی پڕوپووچو، چۆنێتی دوعا كردنو پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون كردن لە پەروەردگار.

بۆ هەموو ئەم باسانەش بەڵگەی بە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزو، بە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هێناوەتەوە، تایبەت ئەوانەی، كە لە پێنج كتێبە بەناوبانگەكەی حەدیسدا هاتون: (صَحِيْح)ی (بُخَارِيّ)و (صَحِيْح)ی (مُسْلِم)و (سُنَن)ـەكانی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ).

هەروەها چەندین حەدیسیشی لە كتێبی (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة)ی ئیمامی (نَسَائِيّ)و (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة)ی زانای پایەبەرز (ابْنُ السُّنِّيّ) وەرگرتوە.

هەندێك جار سوودیشی لەم سەرچاوانە وەرگرتوە: (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)و، (مُسْنَد)ی ئیمامی (أَحْمَد)ی كوڕی (حَنْبَل)و، (مُسْنَد)ی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)و، (سُنَن)ی ئیمامی (دَارِمِيّ)و، (مُسْنَد)ی زانای پایەبەرز (أَبُو عَوَانَة)ی (إِسْفَرَايِيْنِيّ)و، هەردوو صەحیحەكەی شێخی (ابْنُ خُزَيْمَة)و شێخی (ابْنُ حِبَّان)و، (سُنَن)ی ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ)و، (حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء)ی زانای پایەبەرز (أَبُو نُعَيْم)ی

(أَصْبَهَانِيّ)و، (السُّنَنُ الْكُبْرَى)ى ئیمامی (بَيْهَقِيّ)و، (الْمُسْتَدْرَك)ى ئیمامی (حَاكِم)و، چەند سەرچاوەیەكی تریش.

پلەی زۆربەی زۆری حەدیسەكانی دەستنیشان كردوە، كە ئایا (صَحِيْح)ن، یان (حَسَن)ن، یان (ضَعِيْف)ن. بەڵام بۆ ئەوەی كتێبەكەی درێژ نەبێتەوە حەدیسەكانی بەڕشتەوە نەهێناوە.

زۆربەی زۆری ئەو حەدیسانەی لەم كتێبەدا هێناونی، دەم بەدەم لە مامۆستاكانی خۆیەوە وەری گرتوونو، بە ڕشتەی تایبەتی بۆی ڕیوایەت كراون، بۆیە كاتێك دەیانهێنێت، زاراوەی (روینا) بەكاردەهێنێت.[1]

---

(١) هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەو وشەیە بە دوو جۆر دەخوێنرێتەوە: یەكەم: (رُوِيْنَا) بە صیغەی (مَبْنِيّ لِلْمَفْعُوْل). واتە: بۆمان ڕیوایەت كراوە. دووەم: (رَوَيْنَا) بە صیغەی (مَبْنِيّ لِلْفَاعِل). واتە: ڕیوایەتمان كردوە.

هەندێكیش فەرموویانە: زۆربەی زانایان بە (رَوَيْنَا) خوێندویانەتەوە. بەڵام كۆمەڵێك فەرموویانە: باشتر وەهایە بە (رُوِّيْنَا) -بە صیغەی (مَبْنِيّ لِلْمَفْعُوْل)و، بە شەدەی واوەكە- بخوێنرێتەوە. بڕوانە: شَرْحُ التَّفْتَازَانِيّ عَلَى الْأَحَادِيْثِ الْأَرْبَعِيْنَ النَّوَوِيَّة / ٤٢. (تَحقِيْق: مُحَمَّد حَسَن مُحَمَّد حَسَن إسْمَاعِيْل / دَارُ الْكُتُب الْعِلْمِيَّة - بَيْرُوْت - لُبْنَان / الطَّبْعَة: الْأُوْلَى / ٢٠٠٤ م - ١٤٢٥ ه)، والْفَتْحُ الْمُبِيْن بِشَرْحِ الْأَرْبَعِيْن لِابْنِ حَجَر الْهَيْتَمِيّ / ١٠١. (عُنِيَ بِهِ: أَحْمَد جَاسِم مُحَمَّد الْمُحَمَّد، وقُصَيّ مُحَمَّد نَوْرَس الْحَلاَّق، وأَنْوَرُ بْنُ أَبِيْ بَكْرٍ الشَّيْخِيّ الدَّاغِسْتَانِيّ / دَارُ الْمِنْهَاج - جُدَّة - الْمَمْلَكَة الْعَرَبِيَّة السُّعُوْدِيَّة / الطَّبْعَة: الثَّانِيَة / ١٤٣٠ ه - ٢٠٠٩ م)، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّةُ عَلَى الْأَذْكَارِ النَّوَاوِيَّةِ (لِابْنِ عَلاَّن الصِّدِّيْقِيّ) / ١ / ٢٩ - ٣٠.

ماوە كە بڵێم: زانای پایەبەرز شێخ (عَبْدُالْغَنِيّ)ى (نَابُلُسِيّ)ش ڕیسالەیەكی كورتی لە وەڵامی پرسیاری كەسێكدا سەبارەت بە چۆنێتی خوێندنەوەی ئەم تەعبیرە نوسیوەو، ناوی ناوە: (إِيْضَاحُ مَا لَدَيْنَا فِيْ قَوْلِ الْمُحَدِّثِيْنَ: روينا). سوپاس بۆ خوای گەورە بە چاپكراوی لە خزمەتیدام.

زۆرێـك وشـەی غـەریبو سەرلێدەرنەچـووی مانـا کـردوە، کـە لـە دەقـی حەدیسەکاندا هاتوون.

لـە چـەند جێگەیەکـدا بۆچـوونی جیـاوازی زانایـانی سـەبارەت بـە بابەتـەکان هێناوەو، زۆر جار خۆیشی بۆچوونە بەهێزەکەیانی دەستنیشان کردوە.

هەروەها ناوی چەندین کەسی هێنـاوەو، لەپاڵیانـدا فەرموویـەتی: (یەکێکـە لـە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا)و، ناوی هەندێك زاناو شەرعزانیشی هێـاوەو، لەپاڵیانـدا فەرموویەتی: (یەکێکە لە هاوەڵانمان. واتە: یەکێکـە لـە زانایـانی مەزهـەبی ئیمـامی شَافِعِيّ).

هەندێك باسـی صـۆفیتیو، باسـی زاراوەکـانی فەرموودەناسـیو، باسـی بابەتـە فیقهیەکانیشی تێکەڵ بە باسەکانی تر کردوە. هەموو ئەمانـەش بـە زمـانێکی سـادەو ساکارو ئاسان، تاوەکو هەموو کەسێك سوودیان لێ وەرگرێت.

سەبارەت بە هەندێك باسو بابەتی تایبەتیش بۆچوونو فەرمایشـتی هەنـدێك لـە پێشەوایانو فەرموودەناسانو شـەرعزانە ناودارەکـانو تەفسـیرزانانو زمانزانـەکانی پێش خۆیی هێناوە، لەوانە: ئیمامی (شَافِعِيّ)و شـێخ (أَبُو الْحَسَن)ی (مَدَائِنِيّ)و شـێخ (أَبُو جَعْفَر)ی (نَحَّاس)و شێخ (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)و شێخی (جَــوْهَرِيّ)و شـێخ (أَبُو الْحَسَن)ی (مَاوَرْدِيّ)و قاضی (حُسَيْن)و شـێخ (أَبُو الْقَاسِم)ی (قُشَيْرِيّ)و شـێخ (أَبُو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ)و شێخ (أَبُو نَصْر)ی (صَبَّاغ)و شێخ (أَبُو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي)و شێخ (أَبُو الْمَحَاسِن)ی (رُوْيَانِيّ)و شێخ (أَبُو حَامِد) (غَزَالِيّ)و شـێخی (ابْنُ الْعَرَبِــي) مالیکیو قاضی (عِيَاض)و شێخ (ابْنُ الصَّــلاح)ی شارەزووریو، چـەند زانایـەکی تریش.

لەبەرئەوەی بەر لەم کتێبە چەندین کتێبی تریشی داناوە، بۆیە دەبینین بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەندێك باسو بابەتی دیاریکراو، چەندین جـار خوێنـەر ڕەوانـەی لای

ئەو کتێبانە دەکات. لەوانە: (الْمَجْمُوْعُ شَرْحُ الْمُهَذَّب)و، (شَرْحُ صَحِيْحِ مُسْلِم)و، (تَهْذِيْبُ الْأسْمَاء وَاللُّغَات)و، (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)و، (طَبَقَـاتُ الْفُقَهَـاءِ الشَّافِعِيَّة)و، (الْإِيْضَاحُ فِيْ مَنَاسِكِ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ).

بەکورتی کتێبی (أذْكَار) یەکێکە لەو کتێبانەی، کە هەرگیز مرۆڤی موسوڵمان لێی بێ نیاز نابێت‌و، هەمیشە پێویستی پێی دەبێت. بۆیە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: (بِعْ الدَّارَ وَاشْتَرِ الْأَذْكَارَ). واتە: "خانوو بفرۆشەو، کتێبی (أذْكَار) بکڕە". هەندێکیش فەرموویانە: (لَيْسَ يَذْكُرُ مَنْ لَمْ يَقْرَأ الْأَذْكَارَ). واتە: "ئەو کەسەی کتێبی (أذْكَار)ی نەخوێندبێتەوە زیکری خوای بەتەواوی نەکردوە".[1]

ئیمامی (ذَهَبِيّ) لەبارەی گرنگی هەردوو کتێبی (أذْكَارَ)و (رِيَاضُ الصَّالِحِيْن)ـەوە فەرموویەتی: هەر کەسێك لە قورئانی پیرۆز تێگات‌و، بەردەوام بەوردی تەماشای هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیم‌و، (سُنَن)ی (نَسَائِيّ)و، (رِيَاض)و (أذْكَار)ەکەی ئیمامی نەوەوی بکات، بەختەوەرو سەرکەوتوو دەبێت.[2]

شێخ (ابْنُ حَجَر)ی عەسقەلانیش فەرموویەتی: هەر بۆ بەرەکەت بە کتێبی (أذْكَار)و بە خاوەنەکەشی بڕیارمدا تەخریجی حەدیسەکانی بکەم، ئای کە چەندە دانەرو دانراوێکی باشن![3]

ئەمەش وای کردوە، کە زانایان بایەخێکی تایبەتی پێ بدەن، چ بە ڕوون کردنەوە، یان بە کورت کردنەوە، یان بە تەخریجی حەدیسەکانی ناوی.

شێخی عەسقەلانی تەخریجی بەشێکی زۆری حەدیسەکانی کردوەو، ناوی ناوە (نَتَائِجُ الْأفْكَارِ فِيْ تَخْرِيْجِ أحَادِيْثِ الْأذْكَارِ)و، ئیمامی (سُيُوْطِيّ)ش کتێبێکی لەسەر

---

(١) بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ٤.

(٢) بڕوانە: سِيَرُ أعْلَامِ النُّبَلَاء / ١٩ / ٣٤٠.

(٣) بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَارِ فِيْ تَخْرِيْجِ أحَادِيْثِ الْأذْكَارِ / ١ / ١٥.

داناوە بە ناونیشانی (تُحْفَةُ الْأَبْرَارِ بِنُكَتِ الْأَذْكَارِ)، كە زۆربەی زانیاریەكانی لە كتێبەكەی شێخی عەسقەلانیەوە وەرگرتوەو، زانای پایەبەرز (ابْنُ عَلَّانَ)ی (صِدِّيْقِيِّ)ش ڕوون كردنەوەیەكی زۆر بەسوودی لەسەر نوسیوە، بە ناونیشانی (الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّةُ عَلَى الْأَذْكَارِ النَّوَاوِيَّةِ)، كە تێیدا زۆربەی فەرمایشتەكانی شێخی عەسقەلانی هێناوە، سەبارەت بە تەخریجی حەدیسەكانی ناو (أَذْكَار).

هەروەها زۆرێك لە خوێندەوارانی ئەم سەردەمەش هەوڵیان داوە تەحقیقی بكەن‌و، تەخریجی حەدیسەكانی ناوی بكەن، ئەمەش وای كردوە، كە چەندین جار بەچاپ بگەیەنرێت.

لە گرنگترین ئەو نوسخە بەچاپگەیەنراوانەی، كە دەستی من كەوتون:

١) نوسخەی ئامادەكراو لەلایەن دەستەیەك، بە سەرپەرشتی شێخ (أَحْمَد سَعْد عَلِيّ)و، چاپكراو لەلایەن (شَرِكَةُ مَكْتَبَةِ وَمَطْبَعَةِ مُصْطَفَى الْبَابِيْ الْحَلَبِيِّ وَأَوْلَادِهِ فِيْ مِصْر) لە ساڵی (١٣٧٥ ك - ١٩٥٦ ز).

٢) نوسخەی مامۆستای پایەبەرز، لێكۆڵەری ناودار، شێخ (عَبْدُالْقَادِرِ الْأَرْنَاؤُوْط).

٣) نوسخەی مامۆستای بەڕێز (مُحْيِي الدِّيْن مُسْتُو).

٤) نوسخەی مامۆستای بەڕێز (أَحْمَد عَبْدُالله بَاجُوْر).

٥) نوسخەی مامۆستای بەڕێز (عَامِر عَلِيّ يَاسِيْن).

٦) نوسخەی ئامادەكراو لەلایەن (مَرْكَزُ الدِّرَاسَاتِ وَالْبُحُوْثِ بِمَكْتَبَةِ نِزَار الْبَاز)، لە عەرەبستانی (سُعُوْدِيَّة)، كە لە ساڵی (١٩٩٧ ز) بە دوو بەرگ چاپكراوە.

٧) نوسخەی مامۆستای بەڕێز (بَسَّام عَبْدُالْوَهَّاب الْجَابِيْ).

٨) نوسخەی مامۆستای بەڕێز (بَشِيْر مُحَمَّد عُيُوْن).

٩) نوسخەی هەرسێ مامۆستای بەڕێز (صَلَاحُ الدِّيْن مُحَمَّد مَأْمُوْن الْحِمْصِيّ)و، (عَبْدُاللَّطِيْف أَحْمَد عَبْدُاللَّطِيْف)و، (مُحَمَّد مُحَمَّد طَاهِر شَعْبَان).

١٠)   نوسخەی هەردوو مامۆستای بـەڕێز (يُوْسُف عَلِيّ بديوي)و، (أحْمَد مُحَمَّـــد السَّيِّد).

١١)   نوسخەی مامۆستای بەڕێز (عِمَاد ذَكِيّ الْبَارُوْدِيّ).

١٢)   نوسخەی مامۆستای بەڕێز (مُحَمَّد أسَامَة طَبَّاع).

هەروەها بینیومە کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسیو زمانی ڕووسی.

ماوە کە بڵێین: لە کۆتایی تەواوی ئەم نوسخانەدا هاتوە، کە ئیمامی نەوەوی لـە مانگی (مُحَرَّم)ی ساڵی (٦٦٧)ی کۆچیدا لـە نوسینەوەی کتێبـی (أذْكَار) بوەتـەوە، بێجگە لـە چەند باسێکی کەم، کە دواتر پێیەوە لکاندوە.

هـەروەها هـاتووە، کـە فەرموویـەتی: مۆڵـەتو ئیجـازە دەدەم، کـە تـەواوی موسوڵمانان زانیاریەکانی ناو ئەم کتێبە لـە منەوە ڕیوایەت بکەن.

# پێشەکی کتێبی (الأذکار):

## بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ

(الحمْدُ لله الواحدِ القَهَّار، العَزيز الغَفَّار، مُقَدِّر الْأقْدَار، مُصَرِّفِ الْأُمُوْر، مُكَوِّر اللَّيْلِ عَلَى النَّهَارِ، تَبْصِرَةً لِذَوي القُلُوب والأَبصَارِ، الَّذِيْ أَيقَظَ مِنْ خَلْقِهِ مَن اصطَفاهُ، فَأَدْخَلَهُ فِيْ جُمْلَةِ الْأَخْيَار، وَوَفَّقَ مَن اجْتَبَاهُ مِنْ عَبِيْدِهِ، فَجَعَلَهُ مِنَ الْمُقَرَّبِيْنَ الْأَبْرَار، وَبَصَّرَ مَنْ أَحَبَّهُ، فَزَهَّدَهُمْ في هذهِ الدَّار، فَاجْتَهَدُوا فِيْ مَرْضَاتِهِ وَالتَّأَهُّب لِدَارِ الْقَرَار، وَاجْتِنَاب مَا يُسْخِطُهُ، وَالْحَذَرِ مِنْ عَذَاب النَّار، وَأَخَذُوا أَنْفُسَهُمْ بِالْجِدِّ فِيْ طَاعَتِهِ، وَمُلازَمَةِ ذِكْرِهِ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَار، وَعِنْدَ تَغَايُرِ الْأَحْوَالِ وَجَمِيْعِ آنَاءِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، فَاسْتَنَارَتْ قُلُوْبُهُمْ بِلَوَامِعِ الْأَنْوَار.

أَحْمَدُهُ أَبْلَغَ الْحَمْدِ عَلَى جَمِيْعِ نعَمِهِ، وَأَسْأَلُهُ الْمَزِيْدَ مِنْ فَضْلِهِ وَكَرَمِهِ. وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ الْعَظِيْمُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ الْعَزِيْزُ الْحَكِيْمُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ، وَصَفِيُّهُ وَحَبِيبُهُ وَخَلِيلُهُ، أَفْضَلُ الْمَخْلُوْقِيْنَ، وَأَكْرَمُ السَّابِقِيْنَ وَاللاَّحِقِيْنَ، وَصَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ، وَعَلَى سَائِرِ النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِيْنَ، وَآلِ كُلٍّ، وَسَائِرِ الصَّالِحِيْنَ).

سوپاس و ستایش بۆ خودای تاك و تەنهای زاڵی دەسەڵاتداری لێبوردەی گوناهپۆش، بڕیاردەر لە قەزاو قەدەر، بەڕێكەرو ڕاپەڕێنەری كاروبارەكان، پێچەرەوەو هەڵسوڕێنەری شەو بەدەوری ڕۆژدا، بۆ ڕوون كردنەوەی بەرچاوی ئەو كەسانەی دڵ و چاویان كاردەكات، ئەو خودایەی، كە لە درووستكراوەكانی خۆی، كەسێكی هۆشیار كردۆتەوە، كە هەڵیبژاردوەو، كردوویەتی بەناو گرۆی چاكەكارانداو، ئەو كەسەشی موەفەق و سەركەوتوو كردوە، كە هەڵیبژاردوە لەناو بەندەكانیداو، لە ڕیزی چاكەكارە نزیككراوەكانی خۆیدا دایناوەو، بەرچاوی ئەو كەسانەشی ڕوناك كردۆتەوە، كە خۆشی دەوێن و، كردونی بە دنیا نەویست لەمماڵەی دنیای ئێستەدا، بۆیە ئەوانیش تێكۆشاون لە پێناو دەستخستنی ڕەزامەندی ئەوداو، لە پێناو خۆئامادەكردن بۆ ماڵی مانەوەو جێگیربوونی دوارۆژو،

دووركەوتنەوە لەو شتانەی خوای گەورە زویرو نیگەران دەکەن‌و، خۆپاراستن لە سزای ئاگری دۆزەخ‌و، خۆیان ڕاهێناوە لەسەر گوێڕایەڵی‌و پابەندبوون بە زیکرو یادی ئەو بە ئێواران‌و بە بەیانیان‌و، لە کاتی گۆڕانی بارودۆخەکان‌و، هەموو ساتەکانی شەوو ڕۆژدا، بەمەش دڵیان بە پرشنگی ڕووناکی ڕۆشن بوەتەوە.

ئەوپەڕی سوپاس‌و ستایشی دەکەم لەسەر تەواوی نیعمەتەکانی‌و، داوای فەرزڵو بەخششی زیاتری لێ دەکەم‌و، شایەتی دەدەم، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای مەزنی تاك‌و تەنهای جێگە هیوای دەستەلآتداری کاربەجێ، شایەتیش دەدەم، کە (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەرو هەڵبژێردراوو خۆشەویست‌و دۆستی خوای پەروەردگارەو، باشترینی درووستکراوانەو، بەڕێزترینی خەڵکانی ڕابردووو داهاتووشە، دروودو سەلامی خوا لەسەر ئەوو، لەسەر تێکڕای پێغەمبەرانی ترو، خزم‌و کەس‌وکاری هەمویان‌و، سەرجەم پیاوچاکانیش بێت.

پاشان: بەڕاستی خوای مەزنی دەسەلآتداری کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ [البَقَرَة: ١٥٢] واتە: {دەی ئێوە یادی من بکەن، تا منیش بە لوتف‌و هاوکاریەوە یادی ئێوە بکەم}. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ [الذّارِيَات: ٥٦] واتە: {من جنۆکەو مرۆڤم درووست نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت بەندایەتی من بکەن‌و بمپەرستن}.

لەم ئایەتانەوە دەردەکەوێت، کە باشترین -یان یەکێك لە باشترین- ئەو حاڵەتانەی کە بەندەی خوای تێدایە، بریتیە لەو حاڵەتەی کە زیکرو یادی پەروەردگاری عالەمی تێدا دەکات‌و، خۆی خەریك‌و سەرقاڵ دەکات بەو زیکرو ویردانەی، کە لەسەر زمانی سەردارو گەورەی پێغەمبەرانەوە هاتون (دروودی خوای لەسەر بێت).

لای شارەزایان مەعلومە، کە زانایان (خوایان لێ ڕازی بێت) چەندین کتێبیان لەبارەی کردەوەی ڕۆژو شەوی مرۆڤی موسوڵمان‌و، نزاو پاڕانەوەکان‌و، زیکرو یادی خوای

گەورە داناوە. بەلاّم بـەهۆی هێنـانی ڕشـتەی حەدیسـەکانو دووبارەبوونەوەیانـەوە کتێبەکان درێژبوونەتەوە. بەمەش هیمـەتو توانـای قوتابیـان لـە بەرامبـەریان لاواز بوون. بۆیـە بەمەبەسـتی ئاسـانکاری کـردن بـۆ ئارەزوومەنـدان، دەسـتم کـرد بـە کۆکردنەوەی ئەم کتێبە، تاوەکو پوختەی بابەتە سـەرەکیەکانی ئـەو کتێبانـەی تێـدا بهێنم، بە مەبەستی نزیك کردنەوەیان لەو کەسانەی، کە بایەخ بەو بابەتانـە دەدەن. جا هەستاوم ڕشتەکانی زۆربەی حەدیسەکانم لابـردوە، چـونکە مەبەسـتم بـوە، کـە کتێبەکەم کورت بێتو، بۆ کەسانی خواپەرستیشم داناوە، کە ئەوانیش ئاگایـان لـە ڕشتەی حەدیسەکان نیە، بەڵکو، کەسانێکی کەم نەبێت، حەزیان لە ڕشتە هەر نیـە، باوەکو کورتیش بێت. هەروەها مەبەستیش لە دانانی ئـەم کتێبـە بریتیـە لـە زانینـی زیکرەکانو، کار پێکردنیانو، دەستنیشان کردنی شـوێنەکانیان بـۆ ئـەو کەسـانەی بەشوێن ڕێنموویيدا دەگەڕێن.

منیش -ئەگەر خوا بیەوێت- لە بریتی ڕشتەکان، باسی شتێکی گرنگتر دەکـەم، کە بە زۆری لـە کتێبەکاندا باس ناکرێـت، ئـەویش باسـکردنە لـە (صَـحِیْح)ی‌و، (حَسَن)ی‌و، (ضَعِیْف)ی‌و، (مُنْکَـر)ی حەدیسـەکان، کـە ئەمـە هـەموو خـەڵکی پێویستیان پێیەتی، بێجگە لە کەسانێکی زۆر کەم نەبێت لە فەرموودەناسـان.[1] ئـەم باسەش گرنگترین باسە، کە پێویستە بایەخی پێ بدرێتو، قوتـابیو فێرخـوازیش لـە ڕێگەی فەرموودەناسـە بـەتواناکانو پێشـەوا کارامـەو متمانەدارەکانـەوە دەسـتیان دەکەوێت.

هەروەها -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- هەندێك زانیاری بـەنرخی گرانبـەهای تریش باس دەکەم، لە زانسـتی فەرموودەناسـیو، وردەکاریـەکانی شـەرعو، ڕێسـا گشـتیە گرنگـەکانو، ڕاهێنـانو ڕیـازە پێکردنـی نـەفسو، ئـەو ئادابانـەی، کـە

---

(١) شێخی (ابْنُ عَلاَّن) فەرموویەتی: ئەو فەرموودەناسانە پێویستیان بەوە نیە، ئەو زانیاریانـە لـە کەسانی ترەوە نقلّ بکەن، چونکە خۆیان توانای ئەوەیان هەیە کە بیانزانن. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِیَّة / ١ / ٢٤.

ئاگالێبوونیان زۆر گرنگە بۆ پەیڕەوانی ڕێبازی خواپەرستی ڕاستەقینە. هەموو ئەمانەش بە جۆرێك باس دەکەم، کە تێگەیشتنیان ئاسان بێت لەسەر نەخوێندەواران و زانستخوازان.

حەدیسێکمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ دَعا إِلَى هُدَىً كَانَ لَهُ مِنَ الْأجْرِ مِثْلُ أُجُوْرِ مَنْ تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذلِكَ مِنْ أُجُوْرِهِمْ شَيئاً».[1] واتە: "ئەو کەسەی ڕێنموویی خەڵکی بکات بۆسەر ڕێگەی ڕاست، خۆیشی بەئەندازەی پاداشتی شوێنکەوتوەکانی پاداشتی دەست دەکەوێت و، ئەمەش هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم ناکاتەوە".

جا ویستم یارمەتی خەیرخوازان و چاکەکاران بدەم، بەوەی، کە ڕێگەی چاکەکردنیان بۆ ئاسان بکەم و، پیشانیان بدەم و، بۆیان ڕوون بکەمەوە، کە چۆن دەکەونە سەری و، خەڵکیش ڕێنموویی دەکەن بۆ سەری.

لە سەرەتای ئەم کتێبەشەوە چەند بابەتێکی گرنگ باس دەکەم، کە خاوەنی ئەم کتێبە و ئەو کەسانەش پێویستیان پێیانە، کە ئەو بابەتانە جێگەی بایەخ و گوێپێدانیانە.

ئەگەر لەناو هاوەڵانی پێغەمبەری خواشدا یەکێك هەبوو، کە بەلای هەندێك کەسی نەشارەزاوە مەشهورو ناسراو نەبوو، ئەوا هۆشداری لەسەر دەدەم و، دەڵێم: (ئەم حەدیسەمان لە فلانە هاوەڵی پێغەمبەری خواوە بۆ ڕیوایەت کراوە)، تاوەکو گومان نەبرێت لە هاوەڵێتی ئەو کەسەدا.

---

(١) بەشی کۆتایی حەدیسەکەش بەم شێوەیە: «وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً». بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٠ / بە ژمارە: ٢٦٧٤.

لەم کتێبەشدا تەنها ئەو حەدیسانە دەهێنم، کە لە پێنج کتێبە بەناوبانگەکەی حەدیسدا هاتوون، کە سەرچاوەی سەرەکی وەرگرتنی زانیاریەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن، ئەوانیش بریتین لە: (صَحِيْح)ی (بُخَارِيّ)و (صَحِيْح)ی (مُسْلِم)و (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ).

هەندێك جاریش –بە کەمی– حەدیس لە کتێبە مەشهورەکانی ترەوە ڕیوایەت دەکەم.

سەبارەت بە (جُـزْء)ە حەدیسیەکانو (مُسْـنَد)ەکانیش[1]، تەنها لە چەند جێگەیەکی کەمدا حەدیسیان لێوە نقلْ دەکەم.

لە کتێبە سەرەکیە مەشهورەکانیشەوە –بە کەمی نەبێت– حەدیسی لاوازیان لێوە ناهێنم، ئەگەر هێناشم، دەڵێم: لاوازە.

زۆربەی زۆری ئەو حەدیسانەی لەم کتێبەدا دەیانهێنم، حەدیسی (صَـحِيْح)ن. بۆیە هیوادارم ئەم کتێبە –لەم باسەدا– ببێتە ئەصڵێکی پشت پێ بەستراو.

پاشان لە هەر باسێکیشدا تەنها ئەو حەدیسانە دەهێنم، کە بە ئاشکرا دەلالەت لەسەر بابەتەکە دەکەن.

داوای سەرکەوتنو گەڕانەوەو هاوکاریو ڕێنمویىو پارێزگاری لە خوای بەخشندە دەکەمو، داوای ئاسانکاریشی لێ دەکەم لەو کارە خەیرانەی دەمەوێت ئەنجامیان بدەمو، داواشی لێ دەکەم بە بەردەوامی جۆرەها خەلاتو بەخششم

---

(١) (جُزْء)ە حەدیسیەکان: بەو کتێبانە دەوترێت، کە حەدیسەکانی تایبەت بە مەسەلەیەکی دیاریکراویان تێدا کۆکراوەتەوە، وەکو: (جُزْءُ الْقِرَاءَةِ خَلْـفَ الْإِمَـامِ)، یان حەدیسەکانی ڕاویەکی دیاریکراویان تێدا کۆکراوەتەوە، وەکو: (جُزْءُ الْحَسَنِ بْنِ عَرَفَة). (مُسْنَد)ەکانیش: بەو کتێبانە دەوترێت، کە حەدیسەکانی یەکە بە یەکەی هاوەڵانیان تێدا کۆکراوەتەوە، بەبێ گوێدانە پلەی حەدیسەکان. وەکو (مُسْنَد)ی ئیمامی (أَحْمَد).

پێشکەش بکاتو، لەگەڵ خۆشەویستەکانمیشدا لە ماڵی ڕێزو حورمەتی خۆیداو لە تێکڕای ڕێگاکانی چاکەکاریدا کۆمان بکاتەوەو بەیەکترمان بگەیەنێت.

منیش تەنها خودام بەسەو، ئەویش باشترین پشتیوانمەو، هیچ هێزێکیش نیە بۆ خۆلادان لە خراپەو بۆ ئەنجامدانی چاکە بێجگە لە هێزی پشتیوانی خوای دەسەڵاتداری کاربەجێ.

پشتو پەنام هەر خوایەو، دەستم بە هێزی لوتفی ئەوەوە گرتوەو، داوای هاوکاریم لە ئەو کردوەو، کاروباری خۆم بەو سپاردوەو، ئاینەکەمو نەفسی خۆمو باوکمو دایکمو براکانمو خۆشەویستەکانمو سەرجەم ئەوانەش چاکەیان لەگەڵدا کردومو، تەواوی موسوڵمانانو، هەموو ئەو نازو نیعمەتانەی ڕژاندونی بەسەر منو ئەوانیشدا، لە کاروباری دوارۆژو دنیاش، بە خوا دەسپێرم. چونکە ئەو خودا پاکو بێگەردە، ئەگەر شتێکی پێ سپێردرا، دەیپارێزێتو، باشترین پارێزەریشە.

## باسی: فەرمان کردن بە ئیخلاصو نیەت پاکی لە هەموو کردەوە ئاشکراو پەنهانەکاندا

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أُمِرُوا إلاَّ لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّيْنَ حُنَفَاءَ﴾ [الْبَيِّنَة: ٥]. واتە: {فەرمانیان پێ نەکراوە تەنها بەوە نەبێت، کە خوای گەورە بپەرستنو، ئاینەکەیان بە پاکو خاوێنی ڕابگرنو، لە هەموو ئاینێکی هەڵەو ناڕاست لادەنو، بەرەو ئاینی حەقو ڕاستی بڕۆن}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَنْ يَنالَ اللهَ لُحُوْمُها وَلاَ دِماؤُها وَلكِنْ يَنالُهُ التَّقْوى مِنكمْ﴾ [الْحَجّ: ٣٧]. واتە: {نە گۆشتەکانی ئەو قوربانیانەو نە خوێنەکانیشیان ناگات بەخوای گەورە، بەڵکو تەنها نیەتو تەقواو خواپەرستیەکەی ئێوەی پێ دەگات}.

هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبَّاس) (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت) فەرموویەتی: مانای (وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقوى مِنكمْ) ئەوەیە: کە (وَلَكِنْ يَنَالُهُ النِّيَّاتُ). واتە: نیەتەکان دەگەن بە خوای گەورە.

مامۆستاکەمان، زانای پایەبەرز (أَبو الْبَقَاءِ خَالِدُ بْنُ يُوسُفَ بْنِ الْحَسَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ الْمُحْسِنِ بْنِ الْمُفَرِّجِ بْنِ بَكَّارٍ الْمَقْدِسِيُّ النَّابُلْسِيُّ الدِّمَشْقِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت) بۆی گێڕاینەوە، ئەویش (أَبو الْيُمْن)ی (كِنْدِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدِالْبَاقِيْ) (أَنْصَارِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (حَسَن)ی کوڕی (عَلِيّ) (جَوْهَرِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (مُحَمَّد)ی کوڕی (مُظَفَّر) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (مُحَمَّد)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی (سُلَيْمَان)ی (وَاسِطِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (عُبَيْد)ی کوڕی (هِشَام)ی (حَلَبِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك) بۆی گێڕایەوە، ئەویش (يَحْيَى)ی کوڕی (سَعِيْد)ی (أَنْصَارِيّ) بۆی گێڕایەوە، ئەویش لە (مُحَمَّد)ی کوڕی (إِبْرَاهِيْم)ی (تَيْمِيّ)ـەوە، ئەویش لە (عَلْقَمَة)ی کوڕی (وَقَّاص)ی (لَيْثِيّ)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویستو خەلیفەی دوەمی پێغەمبەری خواو پێشەوای موسوڵمانان ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِىءٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيا يُصِيبُها أَوِ امْرَأَةٍ يَنْكِحُها فَهِجْرَتُه إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ».[1] واتە: "دامەزرانو پاداشتی هەموو کردەوەکان تەنها بەپێی نیازو نیەتی خاوەنەکانیانە. هەموو کەسێکیش تەنها پاداشتی نیازو نیەتی خۆی دەست دەکەوێت. بۆیە ئەو کەسەی کۆچو هیجرەتەکەی بۆ ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی بووبێت، پاداشتی هیجرەتەکەشی هەر لای خواو پێغەمبەرەکەیەتی. ئەو کەسەش هیجرەتەکەی بۆ دەستکەوتێکی دنیایی، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٠ / بە ژمارە: ٥٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥١٥ / بە ژمارە: ١٩٠٧.

بوو بێت، ئەوا هیجرەتەکەی هەر بۆ ئەو شتە بێنرخو گەمبایەخە دەبێت، کە لە نیازی خۆیدا بوەو، لای خوای گەورەش هیچ پاداشتێکی چاکەی دەست ناکەوێت".

ئەمە حەدیسێکی (صَحِیْح)ـەو، ئیمامی بوخاری‌و موسلیمیش بەیەکەوە هێناویانەو، کۆدەنگیش هەیە لە نێوان زانایاندا لەسەر گەورەیی‌و گرنگی ناوەڕۆکەکەی‌و، یەکێکیشە لەو فەرموودانەی، کە بوونەتە تەوەرەی سەرەکی ئاینی ئیسلام‌و، زانایانی (سَلَف)و شوێنکەوتوانیشیان لە (خَلَف) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) بە سونەتیان داناوە، کە سەرەتای کتێبەکان بەم حەدیسە دەست پێ بکرێت، وەك هۆشداری‌و ئاگادار کردنەوەیەك بۆ کەسی خوێنەر، کە نیەتی پاك بێت‌و، بایەخ‌و گرنگی زۆریش بە نیەتپاکی بدات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (مَهْدِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: (ئەو کەسەی دەیەوێت کتێبێك دابنێت، با بەم حەدیسە دەست پێ بکات).

هەروەها زانای پایەبەرز (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: مامۆستا پێشینەکانمان بە سونەتیان زانیوە، کە هەموو کاروبارێکی ئاینی بە حەدیسی (الْأعْمالُ بِالنِّيَّةِ) دەستی پێ بکرێت. چونکە هەموو جۆرە کاروبارێکی ئاینی پێویستی بەو حەدیسە هەیە.

هەروەها پێمان گەیشتوە لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: وتەو قسەی کەسێك بە ئەندازەی نیەتپاکی کەسەکە پارێزراو دەبێت‌و دەمێنێتەوە.

کەسێکی تریش فەرموویەتی: خەڵکی بە ئەندازەی نیەتەکانیان پاداشتیان دەدرێتەوە.

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە زاناو خواناسی پایەبەرز (فُضَیْل)ی کوڕی (عِیَاض)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: وازهێنان لە کارێك لەبەر خەڵکی ڕیابازیەو، کردنی کارێکیش لەبەر خەڵکی هاوبەشدانانە بۆ خوا، ئیخلاصیش ئەوەیە، کە خوای گەورە لەو دوانە بتپارێزێت.

هەروەها زانای پایەبەرز (حَارِث)ی (مُحَاسِبِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: کەسی ڕاستگۆ ئەوەیە، کە لە پێناو چاکبوونی دڵی خۆی، گوێ بەوە نادات هەرچی ڕێزو حورمەتی هەیە لە دڵی خەڵکیدا بێتە دەرەوە، حەزیش ناکات خەڵکی ئاگایان لە ئەندازەی کێشی زەڕەیەکیش لە کردەوە چاکەکانی بێتو، پێیشی ناخۆش نیە، کە خەڵکی ئاگایان لە کردەوە خراپەکانی بێت.

هەروەها (حُذَیْفَة)ی (مَرْعَشِيّ) فەرموویەتی: ئیخلاص ئەوەیە، کە کردەوەو هەڵسوکەوتی بەندەیەك بە ئاشکراو بە نیهێنی وەك یەكو یەکسان بێت.

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (أَبُو الْقَاسِم)ی (قُشَیْرِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: ئیخلاص ئەوەیە، کە کەسێك لە بەندایەتی کردنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەدا تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت. ئەویش بەوە دەبێت، کە مەبەستی لە گوێڕایەڵی گردنەکە نزیکبوونەوە بێت لە خوای گەورە، نەوەك لە شتێکی تری وەکو: خۆنواندن بۆ کەسێك، یان دەستخستنی ستایشی خەڵکی، یان پێخۆشبونی وەسفو سەنای خەڵکی، یان هەر ماناو مەبەستێکی تر، بێجگە لە نزیکبوونەوە لە خوای پەروەردگار.

هەروەها زانای پایەبەرز (سَهْل)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی (تُسْتَرِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: خەڵکانی عاقڵو ژیر بە وردی بیریان لە تەفسیری وشەی ئیخلاص کردۆتەوەو، بێجگە لەم تەفسیرە هیچی تریان دەست نەکەوتوە: ئیخلاص ئەوەیە کە

جوڵەو ڕاوەستانی مرۆڤی موسوڵمان، لە نهێنیو لـە ئاشکرادا بـۆ خـوای گـەورە بێتو، نە نەفسو نە ئارەزوو، نە دنیای تێکەڵ نەبێت.

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە زانای پایەبەرز (أَبُو عَلِـيّ)ی (دَقَّـاق)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: ئیخلاص بریتیە لە خۆپاراستن لـە سـەرنجدانو ئاگالێبوونی خەڵکیو،[1] ڕاستگۆییش بریتیە لـە خۆ پـاك کردنـەوە لـە گوێڕایـەڵی نەفس. کەواتە کەسی خاوەن ئیخلاص ڕیای نیەو، کەسی ڕاستگۆش سەرسام نابێت بەخۆی.

لـە خواناسی پایەبەرز (ذُو النُّوْن)ی (مِصْرِيّ)شەوە هاتوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: سێ شت لە نیشـانەکانی ئیخلاصـن: وەسـفو زەمـی خـەڵکی لـەلا یەکسان بێت، لەبیرکردنی بینینی کارو کردەوە لەکاتی ڕاپەڕاندنیداو، لـەبیرکردنی هەبوونی پاداشتی کردەوە لـە دوارۆژدا.

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە شێخی (قُشَيْرِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویـەتی: کـەمترین ڕاسـتگۆیی بریتیـە لـەوەی کـە نهێنـیو ئاشـکرای مرۆڤـی موسوڵمان وەکیەك وەهابێت.

هەروەها لـە زانای پایەبەرز (سَهْل)ی (تُسْتَرِيّ)شەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: ئەو بەندەیە بۆنی ڕاستگۆیی ناکات، کە تەڵـەکـەبازیو ڕووپامـایی لـەگـەڵ خـۆی، یـان لەگەڵ کەسانی تردا بکات.

فەرمایشتی زانایانیش لـەم بـارەوە ئەوەنـدە زۆرن، لـە ژمـارە نایـەنو، ئـەوەی ئاماژەشم پێکرد، بەسە بۆ کەسێك، کە خوای گەورە موەفەقی کردبێت.

---

(١) واتە: نابێت پێی خۆشبێت خەڵکی بە کارو کردەوەی چاکەوە ببینن، تاکو دواتـر وەسـفی بکەن، یان بێن بۆلای، یان گوێڕایەڵی بکـەنو، سەرپێچـی لێ نەکـەن. بڕوانـە: الْفُتُوْحَـاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ٧٦.

## باسێك: {كار كردن بەو حەدیسانەی لەبارەی كردەوە چاكەكانەوە هاتوون}

بزانە، كە ئەو كەسەی سەبارەت بە كردەوە چاكەكان فەرمایشتێكی پێگەیشتوە، ئەگەر بۆ جارێكیش بێت سونەتە كاری پێ بكات، تاوەكو ببێتە یەكێك لە ئەهلی ئەو كارو كردەوەیەو، نابێت هەر وازی لێ بهێنێت، بەڵكو چەنێكی لێ توانی، با جێبەجێی بكات. چونكە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە حەدیسێكی صەحیحدا، كە ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان كردوە، فەرموویەتی: «إِذَا أَمَرْتُكُمْ بَشَيءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطعْتُمْ».[1] واتە: "ئەگەر فەرمانم پێكردن بە شتێك، چەنێكتان توانی جێبەجێی بكەن".

## باسێك: {حوكمی كار كردن بە حەدیسی لاواز (ضَعِیف) لە كردەوە چاكەكانو لە هاندانو ترساندندا}

فەرمودەناسانو شەرعزانانو زانایانی تریش فەرموویانە: كار كردن بە حەدیسی (ضَعِيْف) لە كردەوە چاكەكانو، لە هاندانو ترساندندا درووستەو سونەتیشە، بە مەرجێك حەدیسەكە هەڵبەستراو (مَوْضُوْع) نەبێت.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٥٨ / بە ژمارە: ٦٨٥٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٩٧٥ / بە ژمارە: ١٣٣٧.

(٢) یان زۆر لاواز نەبێت. وەكو ئەوەی كە ڕاویەكەی تۆمەتبار كرابێت بە درۆ كردن، یان هەڵەی زۆر بكات لە گێڕانەوەی حەدیسدا. هەروەها دوو مەرجی تریش ماوە بۆ كار كردن بە حەدیسی (ضَعِيْف)و، كەچی ئیمامی نەوەوی باسی نەكردون! ئەوانیش:

- دەبێت حەدیسەكە ئەصڵێكی هەبێت. واتە: لەژێر ڕێسایەكی گشتیدا جێگەی ببێتەوە.

سەبارەت بە بڕیارە شەرعیەکانی، وەکو حەڵاڵو حەرامو، فرۆشتنو، مارەبڕینو، تەڵاقدانو، بابەتەکانی تریش، ئەوە تەنها کار بە حەدیسی (صَحِيْح) یان (حَسَن) دەکرێت، مەگەر بۆ ئیحتیات کردن لەیەکێك لەو بابەتانەدا. وەکو ئەوەی، کە حەدیسێکی (ضَعِيْف) سەبارەت بە ناپەسەندی جۆرە فرۆشتنێك، یان جۆرە مارەبڕینێك هاتبێت، ئەوا سونەت وەهایە مرۆڤی موسوڵمان خۆی لەو جۆرە فرۆشتنو مارەبڕینە بپارێزێت، بەڵام واجب نیە.

جا بۆیە ئەم باسەم هێنا، چونکە لەم کتێبەدا چەندین حەدیس دەهێنرێنو، خۆشم لەبارەیانەوە دەڵێم (صَحِيْح)ن، یان (حَسَن)ن، یان (ضَعِيْف)ن، یان بەهۆی لەبیرنەبوونو مەشغوڵیەوە، یان لەبەر هەر هۆکارێکی تر هیچ لەبارەیانەوە ناڵێم. بۆیە ویستم ئەم ڕێسایە لای ئەو کەسەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە چەسپاوو زانراو بێت.

## باسێك: {دانیشتن لە کۆڕی زیکردا سونەتە}

بزانە، وەکو چۆن زیکرو یادی خوا سونەتە، هەروا دانیشتن لە کۆڕی زیکریشدا سونەتەو، چەندین بەڵگەی ئاشکراش لەسەر ئەم باسە هاتوون، کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لە جێگەی خۆیاندا دەهێنرێنو، ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر) (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت) بەسە لەم بارەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا». قَالُوا: "وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ يَا رَسُوْلَ اللهِ؟" قَالَ: «حِلَقُ الذِّكْرِ. فَإِنَّ لِلَّهِ تَعَالَى سَيَّارَاتٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ يَطْلُبُونَ حِلَقَ الذِّكْرِ، فَإِذَا أَتَوْا عَلَيْهِمْ حَفُّوا

---

- نابێت لەکاتی کار کردن بە حەدیسەکە باوەڕ وابێت، کە سابت بوە لە خاوەنەکەیەوە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيّة / ١ / ٨٣ – ٨٤.

بِهِمْ».[1] واته: "ئەگەر بەلای باخەکانی بەهەشتدا تێپەڕین، بچنە ناویانو، چێژ لە خێروبێریان وەربگرن". عەرزیان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، باخەکانی بەهەشت کامانەن؟" ئەویش فەرمووی: "کۆڕی زیکرو یادی خوا. چونکە خوای گەورە چەندین فریشتەی گەڕۆکی هەیە، بەشوێن کۆڕەکانی زیکردا دەگەڕێن. جا کە هاتن بەسەر ئامادەبوانی ئەو کۆڕانەدا، ئیتر دەوریان لێ دەدەن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاوِيَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنا بەسەر کۆڕێکی هاوەڵاندا، فەرمووی: «مَا أَجْلَسَكُمْ؟» واتە: "ئەوە بۆچی دانیشتوون؟" ئەوانیش عەرزیان کرد: "دانیشتوین یادی خوای گەورە دەکەین‌و، سوپاس‌و ستایشی دەکەین، لەسەر ئەوەی ڕێنموویی کردوین بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام‌و، منەتی ئیسلامەتی ناوە بەسەرماندا". پێغەمبەریش فەرمووی: «آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟» واتە: "توخوا تەنها بۆ ئەوە دانیشتوون؟"

---

(١) ئەم حەدیسە تەنها زانای پایەبەرز (أَبُو نُعَيْم)ی ئەصبەهانی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە بەم جۆرە هێناویتی (إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا. قَالُوا: يَا رَسُوْلَ اللّهِ، وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ؟! قَالَ: حِلَقُ الذِّكْرِ). پاشان فەرموویەتی: "غَرِيْبٌ مِنْ حَدِيْثِ مَالِكٍ، لَمْ نَكْتُبْهُ إِلاَّ مِنْ حَدِيْثِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرٍ". بڕوانە: حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاءِ وَطَبَقَاتُ الْأَصْفِيَاء / ٦ / ٣٥٤.
بۆیە شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: من لە کتێبە بەناوبانگەکان‌و لە ئەجزائە حەدیسیەکانیشدا نەمبینیوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر) ئەم حەدیسە یان بەشێکیشی ڕیوایەت کردبێت. بەڵکو بینیومە، کە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس) بە هەمان دەق‌و بە پارچە پارچەیی هێناویتی‌و، هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)یش بە هەمان ماناو بە کورتی هێناویتی‌و، بە پارچە پارچەیی‌و بە تەواوەتیش هێناویتی.
پاشان شێخی عەسقەلانی حەدیسەکانی هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)و (جَابِر) تەخریج دەکات‌و، لە کۆتاییشدا دەفەرموێت: ئەم حەدیسە ئەصڵێکی بەهێزی هەیەو، ئیمامی بوخاری‌و موسلیم لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە بە درێژی هێناویانە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَارِ فِيْ تَخْرِيْجِ أَحَادِيْثِ الْأَذْكَارِ / ١ / ٢١ - ٢٥.

هـاوەڵانیش عـەرزیان کـرد: "بـەخوا تـەنها بـۆ ئـەوە دانیشـتووین". پێغەمبـەریش فەرمووی: «أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَـأَخْبَرَنِي: أَنَّ اللهَ تَعَالَى يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ».[1] واتە: "دەی بزانن، من لەبەر ئەوە سوێندم نەدان، کە گومانم لێتان هەبێتو باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵام جوبرەئیـل تەشـریفی هێنـا بـۆلامو، هەواڵی پێدام، کە خوای گەورە شانازیتان پێوە دەکات بەسەر فریشتەکانیدا".

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لـە ڕێگـەی هـەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)و (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێت)، هەردووکیان لـە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بون (درودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویەی: «لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ تَعَالَى إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَـةُ وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ».[2] واتە: "هەر کۆمەڵێك دابنیشنو زیکرویادی خوای گەورە بکەن، فریشتەکان دەوریان لێ دەدەنو، سۆزو میهرەبـانی خوا دایان دەپۆشێتو، سەکینەو ئارامی بەسەریاندا دادەبارێـتو، خـوای گـەورەش لەناو فریشتەکانی خزمەتی خۆیدا باسیان دەکات".

## باسێك: {چۆنێتی زیکر کردن}

زیکرو یادی خوا بە دڵ دەبێتو، بە زمـانیش دەبێـتو، باشـترین زیکـرو یـادی خواش ئەوەیە، کە بە دڵو بە زمانیش بکرێت. خۆ ئەگەر تەنها بـە یـەکێکیان بـوو، ئەوا بە دڵ باشترە.

پاشان، نابێت زیکری خوا تەنها بەدڵ بکرێتو، واز لە زیکـر کـردن بـە زمـان بهێنرێت، لـە ترسی ئەوەی نەوەکو گومانی ڕیابـازی بـە کەسـی زیکرکـەر ببرێـت،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٥ / بە ژمارە: ٢٧٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٤ / بە ژمارە: ٢٧٠٠.

بەڵکو دەبێت بە هەردووکیان بکرێتو، لەبەر خاتری خوای گەورەش بکرێت.
پێشتریش هێنامان لە خواناسی گەورە (فُضَيْل)ی کوڕی (عِيَاض)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە: وازهێنان لە کاروکردەوەیەك لەبەر خەڵکی ڕیایەو، مرۆڤیش ئەگەر دەرگای تێبینی کردنو ئاگالێبوونی خەڵکی لەسەر خۆی بکاتەوەو، خۆی لە درووستبوونو پەیدابوونی گومانە پوچەڵەکانیان بپارێزێت، ئەوا زۆرینەی دەرگاکانی چاکەکاری لەسەر دادەخرێتو، بەشێکی گەورەی بابەتە گرنگەکانی ئاین لە دەستی خۆی دەردەکاتو، ئەمەش ڕێگاو ڕێبازی خواناسان نیە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبارەی نزاو پاڕانەوەوە دابەزیوە: ﴿وَلا تَجْهَرْ بِصَلاتِكَ وَلا تُخَافِتْ بِهَا﴾ [الإسراء: ١١٠] واتە: {با دەنگت لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا مامناوەند بێت، نە زۆر بەرزو، نە کپو زۆر نزمیش}.[(١)]

## باسێك: {بەندایەتی کردنیش هەر زیکری خوایە}

بزانە، کە گەورەیی یادو زیکی خوا تەنها لە (سُبْحَانَ الله)و (لا إلـهَ إلاّ الله)و (الْحَمْدُ لِلّهِ)و (اللهُ أكْبَرُ)و هاووێنەکانیاندا نیە. بەڵکو هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوای گەورە بکات لە کردنی کارێکدا، ئەوە یادی خوای گەورەی کردوە، وەکو زانای پایەبەرز (سَعِيْد)ی کوڕی (جُبَيْر)ە (خوای لێ ڕازی بێت)و، زانایانی تریش فەرموویانە.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٥٠ / بە ژمارە: ٤٤٤٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٢٩ / بە ژمارە: ٤٤٧.

زانای پایەبەرز (عَطَاء)ی کـوڕی (أَبو رَبَاح) (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) فەرموویـەتی: کۆڕەکانی یادو زیکری خوا بریتین لـە کۆڕی حەلاڵو حەرام، واتە: تۆ چـۆن شـتێك دەکڕیتو چۆنی دەفرۆشیتو، چۆن نوێژ دەکەیتو، چۆن ڕۆژوو دەگریتو، چۆن هاوسەرگیری دەکەیتو چۆن ژن تەلاّق دەدەیتو، چۆن حـەج دەکـەیتو، چـۆن هەموو کارو کردەوەیەکی تری هاوشێوەی ئەمانە ئەنجام دەدەیت.[1]

## باسێك: {فەزڵو گەورەیی زیکر کردن}

خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ﴾ هـەتا ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾. [الأحزاب: ٣٥] واتە: {بەڕاستی موسوڵمانانی پیاوانو ئافرەتانو.......... ئەوانەشیان زیکرو یادی خوا زۆر دەکەن، خوای گەورە لێخۆشبوونو پاداشتێکی گەورەو مەزنی بۆ ئامادە کردوون}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صەحیحی موسلیمدا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبـو هُرَيْـرَةَ)وە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی: «سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ». قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «الذَّاكِرُونَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتُ».[2] واتە: "خۆبەتـەنها هێڵـەرەوەکان پێشـکەوتنو بردیانـەوە (واتە: ئەوانەی خۆیان لـە خـەڵکی کـەنار گرتـوەو، خـەریکی زیـرو یـادی خـوای گەورەن. یان: ئەوانەی لـەبەر گەورەییان هاوتەمەنیان نەماوە). عەرزیان کـرد: ئـەی پێغەمبەری خوا ،خۆبەتەنها هێڵەرەوەکان کێن؟ ئەویش فەرمووی: "ئەو پیاوو ژنانەن کە یادی خوا زۆر دەکەن".

---

(١) کەواتە ئەگەر کەسێك لـە هەموو مامەڵەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتێکیدا پـەیڕەوی لـە شـەرع دەکرد، مانای وایە ئەو کەسە هەمیشە زیکری خوا دەکات.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٢ / بە ژمارە: ٢٦٧٦.

منیش (واتە: ئیمامی نەوەوی) دەڵێم: ڕائی وشەی (الْمُفَرِّدُونَ) بە شەدەو بە بێ شەدەش هاتوە (واتە: الْمُفْــرِدُونَ). بـەڵام وەکـو زۆربـەی زانایـانیش فەرموویانـە: شەدەکەیان مەشهورترە.[1]

هەروەها بزانە، کە ئەم ئایەتە پیرۆزە (ی سورەتی: الْأَحْزَاب)، لەو ئایەتانەیە، کە پێویستە خاوەنی ئەم کتێبە ئاگای لێی بێتو بایەخ بـە زانینـی مانـاو ناوەڕۆکەکـەی بدات.

لـە لێکدانەوەو ڕاڤەکردنیشیدا ڕای جیاواز هەیە:

زانای پایەبـەرز (أَبو الْحَسَن)ی (وَاحِدِيّ) فەرموویـەتی: هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبَّاس) (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت) فەرموویەتی: مەبەست ئەوەیـە، کە ئەو کەسانە لەپاش نوێژە فـەرزەکانو، لــە بەرەبـەیانو، لــە ئێـوارانو، لەسـەر جێگەی نوستنو، لەکاتی لەخەوهەستانو، لەکاتی چوونەدەرەوە لە ماڵو، لــەکاتی هاتنەوەشدا هەر زیکری خوا دەکەن.

زانای پایەبەرز (مُجَاهِد)ی کوڕی (جُبَیْر)یش فەرموویەتی: هیچ کەسـێك ناچـێتە ڕیـزی ئەوانــەی، کــە زیکـری خـوا زۆر دەکـەن، تـاوەکو بــە ڕاوەسـتانەوەو، بــە دانیشتنەوەو، بە ڕاکشانەوە زیکری خوا نەکات.

زانای پایەبەرز (عَطَاء)ی کوڕی (أَبو رَبَاح)یش فەرموویەتی: هەرکەسـێك پێـنج نوێژە فەرزەکان بە تەواوی مافەکانیانەوە جێبەجێ بکات، ئەوە بەر ئەو فەرمایشـتەی خوای گەورە دەکەوێت، کە فەرموویەتی: ﴿والذَّاكِرِينَ اللهَ كَثيراً وَالذَّاكِرَاتِ﴾.

ئەمە فەرمایشتی ئەو زانایانەبوو، کە شێخی (وَاحِدِيّ) لەبارەی ڕاڤەی ئایەتەکەوە هێناونی.

---

(١) شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ڕائەکە (مَفْتُوْح)ـەو، وتراویشـە: (مَکْسُـوْر)ە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٧.

لە حەدیسێکی هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِیْد)ی (خُدْرِيّ)شدا هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خـوای لێ بێـت) فەرموویـەتی: «إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّيَا -أَوْ صَلَّى- رَكْعَتَيْنِ جَمِيعاً كُتِبَا فِي الـــذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ». واتە: "ئەگەر پیاوێك لـە شەودا ژنەکەی خۆی خەبەربکاتـەوەو، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکەن -یان نوێژ بکات-، ئەوا لە ڕیزی ئـەو پیـاوو ژنانـەدا ناویان تۆمار دەکرێت، کە یادو زیکری خوا زۆر دەکەن".

ئەمە حەدیسێکی مەشهورەو، ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَـــه)و (نَسَـــائِيّ) لـــە (سُنَن)ەکانیاندا ڕیوایەتیان کردوە.[1]

پرسیار کراوە لـە زانای پایەبـەرز (أَبو عَمْرو ابْنُ الصَّلاح)ی شـارەزوری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، سەبارەت بەو ئەندازەیەی، کە مرۆڤـی پـێ دەچـێتە ڕیـزی ئـەو پیـاوو

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤١٨ / بە ژمارە: ١٣٠٩، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٢٣ / بـە ژمارە: ١٣٣٥، وَسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ١ / ٤١٣ / بە ژمارە: ١٣١٠.

شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: ئـەوەی کـە ئیمـامی نـەوەوی فەرموویـەتی: ئەمـە حەدیسێکی (مَشْهُوْر)ە، مەبەستی ئەوەیە کە مەشهورە لـەسەر زمانی زانایان، نـەك (مَشْهُوْر)، وەکو زاراوەی فەرموودەناسی. چونکە حەدیسەکە تەنها (عَلِيّ) کوڕی (أَقْمَر) لە (أَغَـــرّ)ەوە ڕیوایەتی کردوە.

پاشان فەرموویەتی: ڕاستە حەدیسەکە هەریەکە لـە (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)و (نَسَـــائِيّ) ڕیوایەتیان کردوە. بەڵام ئەوان باسی (أَبو هُرَيْرَة)شیان لـەگـەڵ (أَبو سَـــعِيْد)دا کـردوە. ئـیتر نازانم بۆچی ئیمامی نەوەوی (أَبو هُرَيْرَة)ی لابردوە؟! چونکە ئەو سێ ئیمامـە حەدیســەکەیان لە ڕێگەی ئەو دوو هاوەڵە خۆشەویستەوە بەو جۆرە هێناوە، کە فەرمایشتی پێغەمبەری خـوا بێت. ئەگینا ئەو کەسەی، کە تەنها لـە ڕێگـەی (أَبو سَعِيْد)ەوە هێنـاویەتی، وای هێنـاوە، کـە حەدیسەکە فەرمایشتی (أَبو سَعِيْد) خۆیەتی. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٤٠.

منیش دەڵێم: زاراوەی (مَشْهُوْر) بەلای فەرموودەناسانەوە بەو حەدیســە دەوترێـت، کـە ژمارەی ڕاویەکانی لە دوو کەس زیاتر بێت‌و، نەشـگات بـە ژمـارەی ڕاویـەکانی حەدیسـی (مُتَوَاتِر). بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ١٢٢.

ژنانەی، کە یادی خوا زۆر دەکەن. ئەویش فەرموویەتی: ئەگەر بەیانیانو ئێواران، لە هەموو کاتو بارودۆخێکدا، بە شەوو بە ڕۆژ، بەردەوام بێت لەسەر ئەو زیکرانەی، کە لە پێغەمبەرو هاوەڵانەوە هاتوونو، لە کتێبی (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَـــةِ)دا باس کراون، ئەوا دەچێتە ڕیزی ئەو پیاوو ژنانەی، کە یادی خوا زۆر دەکەن.[1] خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## باسێك: {ڕوون کردنەوەی حوکمی شەرع لەبارەی زیکر کردنی کەسی بێ دەستنوێژو لەش گرانەوە}

زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە درووستە کەسی بێ دەستنوێژو، لەش گرانو، ئافرەتی (حَائِض)و زەیسانیدار بە دڵو بە زمان زیکری خوا بکەن. جا زیکرەکانیش لە جۆری (سُبْحَانَ اللهِ)و (لا إلهَ إلاّ اللهُ)و (الْحَمْدُ لِلّهِ)و (اللهُ أكْبَـــرُ)و، صەلاواتدانو، نزاو پاڕانەوەو، شتی لەو جۆرە بێت.

بەڵام خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لەلایەن کەسی لەش گرانو، ئافرەتی (حَائِض)و زەیسانیدارەوە حەرامە. ئیتر کەم بخوێنن یان زۆر، با بەشە ئایەتێکیش بێت. هەروەها درووستە بۆ ئەمانە، کە لە دڵی خۆیاندا قورئان بخوێنن، بێ ئەوەی بە زمان دەریببڕن. وە درووستیشە لە یەك کاتدا تەماشای قورئانیش بکەنو، بە دڵیش بیخوێنن.

هاوەڵانمان (واتە: زانایانی مەزهەبی ئیمامی شَافِعِيّ) فەرموویانە: بۆ کەسی لەش گرانو، بۆ ئافرەتی (حَائِض) درووستە، کە لەکاتی نەهامەتیو مەینەتیدا بڵێن: ﴿إِنَّا

---

(١) بڕوانە: فَتَاوَى ابْنِ الصَّلاح (تَحْقِيْق: د. مُوَفَّق عَبْدُالله عَبْدُالْقَادِر) / ١ / ١٤٩ – ١٥٠ / بە ژمارە: ٥.

لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾. وه لـه‌كاتی سـواربوونی هۆكـاری گواستنه‌وه‌شـدا بلـێن: ﴿سُبْحَانَ الَّذِيْ سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْـرِنِينَ﴾. وه لـه‌كاتی نـزاو پاڕانه‌وه‌شـدا بلـێن: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّـارِ﴾، بێگومـان ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستیان به‌و فه‌رمایشتانه ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز نه‌بێت.

هه‌روه‌ها بۆیان هه‌یه، كه بلێن: (بِسْمِ اللهِ)، یان (الْحَمْدُ لِلّهِ)، ئه‌گـه‌ر مه‌به‌سـتیان قورئان نه‌بێت، ئیتر ئایا مه‌به‌ستیان زیكری خوا بێـت، یـان هـه‌ر هـیچ مه‌به‌سـتێكیان نه‌بێت. وه گوناهباریش نابن، مه‌گه‌ر كاتێك كه مه‌به‌ستیان قورئان بێت.

هه‌روه‌ها بۆیان هه‌یه ئه‌و جۆره ئایه‌تانه بخوێننـه‌وه، كـه خوێندنه‌وه‌كـه‌یان نه‌سـخ كراوه‌ته‌وه، وه‌كو: (الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوْهُمَا). (١)

به‌ڵام ئه‌گه‌ر به كه‌سێكیان وت: (خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ)، یان وتیان: (ادْخُلُوهَا بِسَلامٍ آمِنِينَ)، یان هه‌ر ڕسته‌و ته‌عبیرێكی تری هاووێنه‌ی ئه‌مانه، ئـه‌وا، ئه‌گـه‌ر مه‌به‌سـتیان قورئان نه‌بێت، حه‌رام نیه. (٢)

ئه‌گه‌ر ئاویشیان ده‌ست نه‌كه‌وت بۆ خۆشۆردن، ئه‌وا (تَيَمُّم) ده‌كه‌ن‌و، درووسته بۆیان قورئان بخوێنن. خۆ ئه‌گه‌ر دواتر هه‌ركامیان ده‌ستنوێژیان نه‌ما، ئه‌وا حه‌رام نیـه

---

(١) كـه تـه‌نها نوسـینه‌وه‌و خوێندنه‌وه‌كـه‌ی نه‌سـخ كراوه‌تـه‌وه‌و، حوكمه‌كـه‌ی وه‌كـو خـۆی ماوه‌ته‌وه. خۆ ئه‌گـه‌ر نوسـینه‌وه‌و حوكمه‌كه‌شـی نه‌سـخكرابوونه‌وه، ئـه‌وا هـه‌ر درووسـته بیخوێنن. به‌ڵام ئه‌گه‌ر تـه‌نها حوكمه‌كـه‌ی نه‌سـخكرابوه‌وه‌و، نوسـینه‌وه‌كه‌ی وه‌كـو خـۆی مابوو، یان هه‌ردووكیان مابوونه‌وه، ئه‌وا درووست نیه بیخوێنن. بڕوانـه: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ١٣١. جا بۆ زانیاری زیاتر لـه‌سه‌ر ئه‌م باسه، بڕوانه ئه‌و كتێبانه‌ی، كه له باره‌ی ناسخ‌و مه‌نسوخی قورئانه‌وه دانراون.

(٢) به‌ڵام ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستیان قورئان بێت، ئه‌وا حه‌رامه. چـونكه یه‌كـه‌میان به‌شـێكه لـه ئایـه‌تی (١٢)ی سوره‌تی (مَرْيَم)، كه ده‌فـه‌رموێت: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُـوَّةٍ وَآتَيْنَـاهُ الْحُكْـمَ صَبِيّاً﴾. دوه‌میشیان بریتیه له ئایه‌تی (٤٦)ی سوره‌تی (الْحِجْر).

قورئان بخوێنێت، وەکو ئەوەی کە یەکێك لەوان خۆی بشوات‌و، پاشان دەستنوێژی نەمێنێت.

ئەوجا جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی، کە کردنی (تَیَمُّم)ـەکە -لەبەر بێ ئاوی- لە ماڵەوەدا بێت، یان لە سەفەردا. بۆیە بۆی هەیە دوای (تَـیَمُّم)ـەکە قورئان بخوێنێت، ئیتر باوەکو دەستنوێژەکەشی نەمێنێت.

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر ئەو کەسە لەماڵەوە بوو، ئەوا بەو (تَیَمُّم)ـەی کردوویەتی، نوێژیش دەکات‌و، قورئانیشی لە نوێژدا پێ دەخوێنێت. بەڵام بۆی نیە لە دەرەوەی نوێژدا قورئان بخوێنێت.

جا وەکو باسمان کرد، بۆچوونی ڕاست ئەوەیە کە درووستە. چونکە (تَیَمُّم)ـەکەی جێگەی خۆشۆردنی بۆ دەگرێتەوە.

ئەگەر کەسێکی لەش گران (تَـیَمُّم)ی کردو، پاشان ئاوێکی دەستکەوت، پێویستە ئەو ئاوە بەکار بهێنێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا هەتا خۆی دەشوات، قورئان خوێندن‌و هەموو ئەو شتانەشی لێ حەرامە، کە لەسەر کەسی لەش گران حەرامن.

ئەگەر کەسێکی لەش گران (تَیَمُّم)ی کردو، ئەوجا نوێژی کردو، قورئانیشی خوێندو، پاشان ویستی (تَیَمُّم)ێکی تر بکاتەوە بەهۆی بێ دەستنوێژیەوە، یان بۆ جێبەجێ کردنی فەرزێکی تر، یان بۆ شتێکی تر، ئەوا قورئان خوێندی لێ حەرام نابێت.

ئەمەش مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراوە. بەڵام بۆچوونی یەکێك لە هاوەڵانمان هەیە، کە پێی وایە لەم حاڵەتەدا قورئان خوێندنی لێ حەرامە. ئەویش بۆچوونێکی لاوازە.

خۆ ئەگەر کەسی لەش گران ئاوی دەست نەکەوت‌و، خۆڵیشی دەست نەکەوت بۆ (تَیَمُّم) کردن، ئەوا لەبەر ڕێزو حورمەتی کاتەکە با نوێژەکەی بکات،

ئەویش بەپێی حاڵەتی کەسەکە. جا لەم حاڵەتەشدا حەرامە ئەو کەسە لە دەرەوەی نوێژەکەدا قورئان بخوێنێت‌و، حەرامیشە لە نوێژەکەدا لە سورەتی (الْفَاتِحَـــة) زیاتر هیچ ئایەتێکی تر بخوێنێت.

جا ئایا خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة) لەو کەسە حەرامە، یان نا؟ ئەوە دوو بۆچوونی لەسەرە: ڕاستترینیان ئەوەیە کە حەرام نیە، بەڵکو واجبە. چونکە بەبێ خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة) نوێژ درووست نیە. جا هەروەکو چۆن نوێژەکە لەبەر ناچاری درووستە، بە هەمان شێوە خوێندنی قورئانەکەش لەبەر ناچاری درووستە.

بۆچوونی دوەمیش ئەوەیە کە خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة) لەو کەسە حەرامە. بەڵکو پێویستە ئەویش ئەو جۆرە زیکرانە بکات، کە کەسی قورئاننەزان لە نوێژدا لە بریتی قورئان دەیانکات.

ئەمانەش چەند لقە باسێك بوون، پێم باش بوو لێرەدا بیانهێنم، چونکە پەیوەندیان بەوەوە هەبوو، کە پێشتر باسم کرد. جا بە کورتیش هێنامن، ئەگینا لە کتێبە فیقهیەکاندا بە تەواوەتی‌و بە بەڵگەی تەواوەوە باس کراون. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## باسێك: {ئادابەکانی کەسی زیکرکەر}

ئەو کەسەی زیکری خوا دەکات پێویستە لەسەر تەواوترین صیفەت بێت. جا ئەگەر لە جێگەیەکدا دانیشتبوو، با ڕوو بکاتە قیبلەو، بە کەساسی‌و بە ملکەچی‌و بە ئارامی‌و بە ڕێزەوە دابنیشێت‌و، سەری دابخات. خۆ ئەگەر زیکری خوا بکات‌و، بەم شێوەش نەبێت، ئەوا هەر درووستەو، ناپەسەندیش نیە. بەڵام ئەگەر هیچ بەهانەیەکی نەبێت، ئەوە وازی لە شێوازە باشترینەکە هێناوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ناپەسەند نیە، بریتیە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَاب * الَّذِيْنَ يَذْكُرُونَ اللهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ [آل عِمْرَان: ١٩٠ - ١٩١]. واتە: {بەڕاستی لە بەدیهێنانو درووست کردنی ئاسمانەکانو زەوی‌و، لە جیاوازی شەوو ڕۆژدا بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەو کەسانەی، کە خاوەنی دڵی هۆشیارو ژیرن. ئەوانەی بە ڕاوەستانو بە دانیشتن‌و لەسەر لاتەنیشتەکانیان زیکرو یادی خوا دەکەن‌و، بیر لە درووست کردنی ئاسمانەکانو زەوی دەکەنەوە}.

لە حەدیسی صەحیحدا لە دایکە عائیشەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "كَانَ رَسُولُ اللهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَتَّكِئُ فِيْ حِجْرِيْ، وَأَنَا حَائِضٌ، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ". واتە: "هەندێك جار پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لە باوەشمدا پاڵی دەدایەوەو، منیش لە سوڕی مانگانەدا بووم‌و، ئەویش بەو حاڵەتەوە قورئانی دەخوێند".

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە.[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کە دایکە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: "وَرَأْسُهُ فِي حَجْرِي، وَأَنَا حَائِضٌ".[2] واتە: پێغەمبەری خوا سەری لە کۆش‌و چاکمدا بوو، منیش لە سوڕی مانگانەدا بووم.

هەروەها لە دایکە عائیشەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "إِنِّيْ لَأَقْرَأُ حِزْبِيْ وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيْرِ".[1] واتە: "بەڕاستی من زیکرو ویردی دیاریکراوی ڕۆژانەی خۆمم دەخوێندو، لەسەر جێگەش ڕاکشابووم".

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١١٤ / بە ژمارە: ٢٩٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٤٦ / بە ژمارە: ٣٠١.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧٤٤ / بە ژمارە: ٧١١٠.

## باسێك: {سیفەتی ئەو جێگایەی زیکری تێدا دەکرێت}

پێویستە ئەو جێگایەی یادو زیکری خوای تێدا دەکرێت چۆڵو خاوێن بێت. چونکە جێگەی لەو جۆرە ڕێزی گەورەو تەواوی تێدایە بۆ زیکرەکەو بۆ زیکرکراوەکەش. هەر بۆیە وەسفو ستایشی ئەو یادو زیکرە کراوە، کە لە مزگەوتەکانو لە جێگە پیرۆزەکاندا دەکرێت.

لە پێشەوای پایەبەرز (أَبو مَيْسَرَةَ)وە هاتوە، کە بریتیە لە: (عُمَـرُ)ی کوڕی (شُرَحْبِيْل)ی (هَمْدَانِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەو فەرموویەتی: "با زیکرو یادی خوا تەنها لە جێگەی پاكو خاوێندا بکرێت".

هەروەها پێویستە دەمی کەسەکەش خاوێن بێت. خۆ ئەگەر بۆنی گۆڕابوو، با بە سیواك بۆنەکەی لاببات‌و، ئەگەر شتێکی پیسیشی تێدابوو، با بە ئاو بیشوات. جا ئەگەر دەمی نەشۆردو، زیکری خوایشی کرد، ئەوە ناپەسەندەو، حەرام نیە. هەروەها ئەگەر دەمی پیس بوو، قورئانیشی خوێند، ئەوە ناپەسەندە. بەڵام ئایا حەرامە، یان نا؟ ئەوە بەلای هاوەڵانمانەوە دوو بۆچوونی لەسەرە: ڕاسترینیان ئەوەیە، کە حەرام نیە.

## باسێك: {حوکمی زیکر کردن لە چەند حاڵەتێکدا}

بزانە، کە زیکری خوای گەورە -بە زمان- لە هەموو حاڵەت‌و بارودۆخێکدا باشەو پەسەندە، مەگەر لە چەند حاڵەتێکدا نەبێت، کە شەرع هەڵاوێری کردوون‌و

(١) بڕوانە: فَضَائِلُ الْقُرْآنِ لِلْفِرْيَابِيّ / ٢٣٠ / بە ژمارە: ١٥٤. هەروەها زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ شَيْبَة)ش بەم جۆرە هێناویێتی: "إِنِّيْ لَأَقْرَأُ حِزْبِيْ أَوْ عَامَّةَ حِزْبِيْ وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَـى فِرَاشِـيْ". بڕوانە: الْمُصَنَّفُ فِيْ الْأَحَادِيْثِ وَالْآثَار (مُصَنَّفُ ابْنِ أَبِيْ شَيْبَة) / كِتَابُ الصَّلَوَات / مَا أُمِرَ بِـهِ مِنْ تَعَاهُدِ الْقُرْآنِ / ٢ / ٢٤١ / بە ژمارە: ٨٥٧١.

جیای کردوونەتەوە. ئێمەش لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەین، وەکـو ئاماژەیـەك بـۆ ئەوانی تریان، کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لـە جێگەی خۆیاندا باسیان دەکەین.

جا لـەو حاڵەتانەی، کە زیکر کـردن -بـە زمـان- تێیانـدا ناپەسـەندە: حاڵـەتی دانیشتن بۆ سەرئاو کردنو، حاڵەتی جووتبوونو سەرجێگەیی ژنو مێردو، حاڵـەتی گـوێگرتن لـە وتـار، بـۆ ئـەو کەسـەی دەنگـی وتاربێژەکـە دەبیسـێتو، حاڵـەتی ڕاوەستانی ناو نوێژ، کە باشـتر وایـە نوێژخوێنەکـە خـۆی بـە خوێنـدنی قورئانـەوە خەریك بکات[1]و، حاڵەتی وەنەوزدانو خەوەنوچکە بردنەوە.

بەڵام زیکر کردن لە ڕێگەو لە حەمامدا ناپەسەند نیە. خواش لە هـەموو کـەس زانا ترە.

## باسێك: {مەبەست لە زیکر کردن}

مەبەست لـە زیکر کردن ئەوەیە کە دڵی مرۆڤـی موسـوڵمان هەمیشـە بـەئاگاو هۆشیار بێت. بۆیە دەبێت ئەو ئاگایی دڵە مەبەستی سـەرەکی کەسـە زیکرکەرەکـە بێتو، هەوڵی جیدی بدات بۆ دەستخستنیو، بـە وردی بـیر لــە مانـاو نـاوەڕۆکی زیکرەکە بکاتەوەو، لێی تێبگات.

کەواتە بە وردی بیرکردنەوەو تێگەیشتن لـە مانـای زیکـر، کـارێکی پێویسـتە، هەروەکو چۆن بیرکردنەوەو تێگەیشتن لە کاتی قورئان خوێندندا پێویسـتە. چـونکە مەبەست لـە هەردووکیان یەك شتە. هـەر بۆیـە مەزهـەبی درووسـتی هەڵـبژێردراو

---

(١) بێ گومان ئەمەش بێجگە لەو نوێژانەی، کە هەندێك زیکری تایبەتیان تێدا دەکرێت. وەکو: نوێژی (صَلاةُ التَّسْبِیْح)، کە لـە پێشو لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە -یان تەنها لـەدوایـەوە- هەندێك زیکری تایبەتی تێدایە.

ئەوەیە، کە سونەتە کەسی زیکرکەر لەکاتی وتنـی (لا إلهَ إلاّ اللّه)دا دەنگـی خـۆی درێژ بکاتـەوە، چـونکە لـە درێـژ کردنـەوەدا بیرکردنـەوەو تێگەیشـتنی تێدایـەو، فەرمایشتی زانایانی (سَلَف)و، پێشەوایانی (خَلَف)یش لـەمبارەوە مەشـهورە. خـواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {حوکمی قەزاکردنەوەو گێڕانەوەی زیکر}

ئـەو کەسـەی لـە کـاتێکی دیـاریکراودا، چـی شـەو یـان ڕۆژ، یـان لـەدوای نوێژەکانەوە، یان لە هەر حاڵەتێکی تردا کردبووی بە عادەت بۆ خـۆی، زیکرێکـی دیاریکراوی دەکرد، بەڵام بۆی نەکرا بیکاتو، لە دەستی دەرچوو، پێویستە ئەگـەر بۆی کرا بە پەلە بیکاتەوەو پشتگوێی نـەخات. چـونکە ئەگـەر عـادەتی گـرت بـە پابەنـدبوون بـەو زیکـرەوە، ئـیتر نایفـەوتێنێتو لـە دەسـتی نـادات. ئەگـەر کەمتەرخەمیشی کرد لە قەزاکردنەوەیدا، ئەوا بە ئاسانی لەکاتی خۆیدا لـە دەسـتی دەدات.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی خەوتو، تەواوی یان بەشێکی ئـەو ویردو زیکرە دیاریکراوەی نەخوێند، کە بۆ خۆی بڕیاری دابـوو، دواتـر لـە نێـوان نوێژی بەیانیو نوێژی نیوەڕۆدا خوێندیەوە، ئەوا بۆی دەنوسرێت، هەروەکو ئەوەی، کە لە شەودا خوێندبێتی".

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥١٥ / بە ژمارە: ٧٤٧.

## باسێك: سەبارەت بەو حاڵەتانەی بۆ کەسی زیکرکەر دێنە پێش و، سونەتە بەهۆیانەوە زیکرەکەی بپچڕێنێت و، دوای نەمان و لاچوونیان بگەڕێتەوە بۆ زیکرەکە:

هەندێك لەو حاڵەتان ئەمانەن:

- ئەگەر سڵاوی لێ کرا، با وەڵامی سڵاوەکە بداتەوەو، دواتر بگەڕێتەوە بۆ زیکرەکە.
- ئەگەر کەسێك لەلایدا پژمی(و، وتی: الْحَمْدُ لِلّه)، با دوعای خەیری بۆ بکات(و، پێی بڵێت: يَرْحَمُكَ اللهُ)و، دواتر بگەڕێتەوە بۆ زیکرەکە.
- ئەگەر گوێی لێبوو، کە وتاربێژ دەستی کرد بە وتارەکەی.
- ئەگەر گوێی لە بانگخوێن بوو، با وەڵامی وشەکانی بانگ و قامەتەکەی بداتەوەو، دواتر بگەڕێتەوە بۆ زیکرەکە.
- ئەگەر چاوی بە خراپەو تاوانێك کەوت، با هەوڵی لادان و لابردنی بدات، یان ئەگەر چاوی بە کارێکی باش کەوت، با خەڵکی بۆ ڕێنموویی بکات، یان ئەگەر کەسێك پرسێکی پێکرد، با وەڵامی بداتەوەو، دواتر بگەڕێتەوە بۆ زیکرەکە.
- ئەگەر وەنەوزو خەوەنوچکە یان شتێکی لەو جۆرە زۆری بۆ هێنا.

بە هەمان شێوە ئەگەر حاڵەتێکی تری وەکو ئەم حاڵەتانەی بۆ هاتەپێش. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {حیساب بۆ زیكر ناكرێت، هەتا بە زمان نەكرێت}

بزانە، كە ئەو زیكرانەی شەرع لە نوێژدا یان لە غەیری نوێژدا دایناون -واجب بن یان سونەت- حساب بۆ هیچیان ناكرێت، هەتا بە زمان نەكرێن‌و نەوترێن، بە جۆرێك ئەگەر زیكركەرەكە هەستی بیستنی ساغ بێت‌و، هیچ كێشەیەكی نەبێت، خۆی گوێی لە زیكرەكەی خۆی بێت. خواش لە هەموو كەس زاناترە.(١)

## باسێك: {ئەو كتێبانەی سەبارەت بە كردەوەی ڕۆژو شەو دانراون‌و، ڕشتەی ئیمامی نەوەویش تا دەگاتە خاوەنەكانیان}

بزانە، كە كۆمەڵێك لە پێشەوایان كتێبی گرانبەهاو بەنرخیان سەبارەت بە كردەوەی ڕۆژو شەو داناوەو، ئەوەی لەو كتێبانەدا باسیان كردوە، بە ڕشتەی پێكەوەبەستراوی خۆیان ڕیوایەتیان كردوەو، لە چەندین ڕێگەوە هێناویانە. جا یەكێك لە باشترینی ئەو كتێبانە بریتیە لە كتێبی (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ)ی پێشەوای

---

(١) جا نابێت وا تێبگەین، كە زیكرێك تەنها بەدڵ بكرێت‌و، شاراوە بێت لە شەرعدا هیچ حیسابێكی بۆ ناكرێت. بەڵكو لێرەدا مەبەست ئەو زیكرانەیە، كە شەرع باسی كردوون. ئەگینا وەكو لە حەدیسدا هاتوە، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «خَيْرُ الذِّكْرِ الْخَفِيُّ». ئیمامی (أَحْمَد)و شێخی (أَبُو يَعْلَى)و شێخی (ابْنُ حِبَّان) ڕیوایەتیان كردوەو، شێخ (نُورُ الدِّين)ی (هَيْثَمِيّ)ش فەرموویەتی: كەسێك لە ڕشتەكەیدایە بەناوی (مُحَمَّد)ی كوڕی (عَبْدُالرَّحْمَن)ی كوڕی (أَبِيْ لَبِيْبَة)وە، شێخی (ابْنُ حِبَّان) بە متمانەداری داناوە. منیش دەڵێم: شێخی (ابْنُ مَعِيْن) بە لاوازی داناوەو، سەرجەم كەسەكانی تری ڕشتەكەی ئیمامی (أَحْمَد)و شێخی (أَبُو يَعْلَى) لەو كەسانەن، كە لە ڕشتەی حەدیسی صەحیحدا ناویان هاتوە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٣ / ٧٦ / بە ژمارە: ١٤٧٧، ومُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ٢ / ٨١ / بە ژمارە: ٧٣١، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ٩١ / بە ژمارە: ٨٠٩، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ٨١ / بە ژمارە: ١٦٧٩٥.

پایەبەرز (أَبو عَبْدِالرَّحْمن)ی (نَسَائِيّ)و، باشترو بەنرخترو بەسودتر لەویش بریتیە لە کتێبی (عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَةِ)ی قوتابیەکەی، کە بریتیە لە پێشەوای پایەبەرز (أَحْمَد)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی (إِسْحَاق)، ناسراو بە شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) (خوایان لێ ڕازی بێت).

جا من تەواوی کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)م لە مامۆستاکەی خۆم بیستوە، کە بریتیە لە پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْبَقَاءِ خَالِدُ بْنُ یُوْسُفُ بْنِ سَعْدِ بْنِ الْحَسَن) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەو فەرمووی: پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْیُمْنِ زَیْدُ بْنُ الْحَسَنِ بْنِ زَیْدِ بْنِ الْحَسَنِ الْكِنْدِيّ) لە ساڵی (٦٠٢) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَنِ سَعْدُ الْخَیْرِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ سَهْلٍ الْأَنْصَارِيّ) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: پێشەوای پایەبەرز (أَبو مُحَمَّدٍ عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ حَمْدِ بْنِ الْحَسَنِ الدُّوْنِيّ) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: پێشەوای پایەبەرز (الْقَاضِيْ أَبو نَصْرٍ أَحْمَدُ بْنُ الْحُسَیْنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْكَسَّارِ الدِّیْنَوَرِيّ) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: پێشەوای پایەبەرز (أَبو بَكْرٍ أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ السُّنِّيّ) (خوای لێ ڕازی بێت) بۆی گێڕاینەوە.

ئەوجا بۆیە ئەم ڕشتەیەم لێرە هێنا، چونکە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەمەولا کۆمەڵێك زانیاری لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە نقلْ دەکەم. بۆیە پێم خۆش بوو ڕشتەی گێڕانەوەی کتێبەکە پێشتر بهێنم، کە ئەمەش بەلای پێشەوایانی فەرموودەو زانایانی تریشەوە کارێکی باش‌و پەسەندە.

هەروەها بۆیە ڕشتەی ئەم کتێبە باس دەکەم، چونکە گشتگیرترین کتێبە لەم بوارەدا. ئەگینا سوپاس بۆ خوای گەورە، هەموو ئەو حەدیسانەی لەم کتێبەدا دەیانهێنم، بە ڕشتەی پێکەوەبەستراوی صەحیح بیستومن، تەنها شتێکی زۆر کەمی نەبێت.

جا هەندێك لەو حەدیسانە لەو پێنج كتێبەكەوە نقلّ دەكەم، كە ئەصلّو بناغەی ئاینی ئیسلامن، ئەوانیش بریتین لە: هەردوو (صَــحِیْح)ی (بُخَـارِيّ)و (مُسْـلِم)و، (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ).

هەندێكیشیان لە (مُسْنَد)ەكانو، لە (سُنَن)ـەكانەوە دەهێنم، وەكو (مُوَطَّـأ)ی ئیمامی (مَالِك)و، (مُسْنَد)ی ئیمامی (أَحْمَد)ی كوڕی (حَنْبَل)و، (مُسْـنَد)ی (أَبُـو عَوَانَة)و، (سُنَن)ی (ابْنُ مَاجَه)و (دَارَقُطْنِيّ)و (بَيْهَقِيّ)و، كتێبە بەناوبانگەكانی تر.

هەندێكیشیان لە كتێبی (أَجْزَاء)ەكانەوە دەهێنم، وەكو لەمەولا -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- دەیبینیت.

جا هەموو ئەم كتێبانەی، كە ناوم هێنان، -سوپاس بۆ خوا- بە ڕشتەی پێكەوەبەستراوی صەحیح لە خاوەنەكانیانەوە ڕیوایەتیان دەكەم. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

## باسێك: {چەند كتێبێكی پشت پێ بەستراو بۆ دانانی ئەم كتێبە}

بزانە، ئەو حەدیسانەی لەم كتێبەدا دەیانهێنم، دەیاندەمە پاڵ كتێبە بەناوبانگەكانو، ئەوانەی تر، كە باسم كردن. پاشان هەر حەدیسێك لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، یان لە یەكێكیاندا هاتبێت، تەنها بەوەندە واز دەهێنم، كەدەیدەمە پاڵ ئەوان. چونكە مەبەستەكە -كە صەحیحیو بەبەڵگەبوونی حەدیسەكەیە- بەوە دێتەدی. لەبەرئەوەی هەموو حەدیسەكانی ناویان حەدیسی صەحیحن.

سەبارەت بەو حەدیسەش، كە لە كتێبەكانی تردایە، دەیدەمە پاڵ كتێبی (سُنَن)ـەكانو هاووێنەكانیانو، لە زۆربەی جێگەكانیشدا باسی (صَـحِیْح)یو

(حَسَن)ی‌و (ضَعِيف)ی حەدیسەکە دەکەم -ئەگەر لاوازی تێدا بوو-، جاری واش هەیە لەبیرم دەچێت‌و باسی هیچکامیان ناکەم.

بشزانە، کە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد) یەکێکە لەو کتێبانەی، کە حەدیسی زۆر لێوە نقلْ دەکەم‌و، بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە ئیمامی (أَبُو دَاوُد)ەوە، کە فەرموویەتی: "لەم کتێبەمدا حەدیسی (صَحِيْح)یشم هێناوە‌و، حەدیسی هاوشێوە‌و نزیك لە (صَحِيْح)یشم هێناوە. هەر حەدیسێکیش لاوازیەکی توندی تێدا بێت، باسی لاوازیەکەیم کردوە. هەر حەدیسێکیش هیچم لەبارەیەوە نەوتبێت، ئەوە گونجاوە بۆ کار پێکردن‌و، هەندێکیشیان لە هەندێکیان صەحیحترن".

ئەمە فەرمایشتەکەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد) بوو. سوودو فائیدەیەکی جوانیشی تێدایە، کە خاوەنی ئەم کتێبی (أَذْكَار)ە‌و کەسانی تریش پێویستیان پێی دەبێت. سودەکەش ئەمەیە: هەر حەدیسێك ئیمامی (أَبُو دَاوُد) لە (سُنَن)ەکەیدا ڕیوایەتی کردبێت‌و، باسی لاوازی حەدیسەکەی نەکردبێت، ئەوە بەلای ئەوەوە حەدیسێکی (صَحِيْح)ە، یان (حَسَن)ە‌و، هەردووکیشیان دەکرێن بە بەڵگە بۆ بڕیارە شەرعیەکان، چیجای بۆ کردەوە چاکەکان.

جا ئەگەر ئەمەت زانی، ئیتر کاتێك لەم کتێبەدا حەدیسێکت بینی، کە ڕیوایەتی ئیمامی (أَبُو دَاوُد) بوو، باسی لاوازی حەدیسەکەشی نەکردبوو، ئەوە بزانە، کە ئەو بە لاوازی دانەناوە. خواش لە هەموو کەس شارەزاترە.

ئەوجا واشم بەباشزانی، کە لە سەرەتای ئەم کتێبەوە باسێك سەبارەت بە فەزڵ‌و گەورەیی زیکر بە ڕەهایی بهێنم (واتە: بێ بەستنەوەی بە کات‌و شوێن‌و حاڵەتێکی دیاریکراوەوە)، چەند زانیاریەکی کەمی لەوبارەوە تێدا باس بکەم، وەکو دەستپێکێك بۆ باسەکانی دواتر. پاشان مەبەستە سەرەکیەکەی کتێبەکە لە چەند بەشێکدا باس دەکەم‌و، ئەگەر خوای گەورەش بیەوێت، کۆتایی کتێبەکەش بە باسی

(داوای لێخۆشبوون کردن) دەهێنم، بە ئومێدی ئەوەی، کە خوای گەورە کۆتایی ئێمەش بە لێخۆشبوون بهێنێت.

خوای گەورە موەفەق و سەرکەوتومان بکات، پشت و پەناو جێگەی هیوامان هەر ئەوە.

## باسێکی کورت سەبارەت بەو ئایەت و حەدیسانەی لەبارەی گەورەیی زیکرەوە هاتون، بەبێ بەستنەوەی زیکرەکە بە کاتێکی دیاریکراوەوە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَذِكْرُ اللهِ أَكْبَرُ﴾ [العَنكَبُوت: ٤٥]. واتە: {یادو زیکری خوا لە یادی هەموو شتێکی تر گەورەترە. یان: یادو زیکری خوا بۆ بەندەکەی، لە یادو زیکری بەندە بۆ خوا گەورەترە}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ [البَقَرَة: ١٥٢].

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ * لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ [الصَّافَّات: ١٤٣ - ١٤٤]. واتە: {خۆ ئەگەر حەزرەتی (یُونُس) یەکێك نەبوایە لەو کەسانەی، کە بەردەوام تەسبیحاتی منیان دەکرد، ئەوا لە ناوسکی حوت و ماسیەکەدا دەمایەوە هەتا ئەو ڕۆژەی ئادەمیزادەکان زیندوو دەکرێنەوە}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لا يَفْتُرُونَ﴾ [الأنبِيَاء: ٢٠]. واتە: {فریشتەکانی خوای گەورە بە شەوو بەڕۆژ تەسبیحاتی خوا دەکەن، هەراسان و ماندوو نابن}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا {ئیمامی بوخاری کونیەکەی (أَبو عَبْدِالله)یەو، ناویشی (مُحَمَّد)ی کوڕی (إِسْمَاعِيل)ی کوڕی

(إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (مُغِيْرَة)ی (بُخَارِيّ) (جُعْفِيّ)ـەو، ئیمامی موسلیمیش کونیەکەی (أَبُو الْحُسَيْن)ـەو، ناویشی (مُسْلِم)ی کوڕی (حَجَّاج)ی کوڕی (مُسْلِم)ی (قُشَيْرِيّ) (نَيْسَابُوْرِيّ)ـە} (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، بە ڕشتەی خۆیان، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت) –سەبارەت بە ناوی خۆی‌و باوکی سی (٣٠) بۆچوونی جیاواز هەیە، کە ڕاستترینیان بریتیە لە (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی (صَخْر). لەناو هاوەڵانیشدا زۆرترین حەدیسی لێوە ڕیوایەت کراوە[1]– فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ».[2] واتە: "دوو فەرمایشت هەن، لەسەر زمان سووک‌و ئاسانن، لەناو ترازووی کردەوەکانیشدا قورس‌و سەنگینن، بەلای خوای میهرەبانیشەوە خۆشەویستن، ئەوانیش بریتین لە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ). واتە: پاک‌و بێگەردی‌و سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورە‌و مەزن".

---

(١) لەناو هاوەڵاندا تەنها حەوت کەسیان زیاد لە هەزار (١٠٠٠) حەدیسیان لێوە ڕیوایەت کراوە، کە ڕیزبەندیەکەیان بەم جۆرەیە:

- (أَبُو هُرَيْرَة) پێنج هەزارو سێ سەدو حەفتاوچوار (٥٣٧٤) حەدیس.
- (ابْنُ عُمَر) دوو هەزارو شەش سەدو سی (٢٦٣٠) حەدیس.
- (أَنَس)ی کوڕی (مَالِك) دوو هەزارو دوو سەدو هەشتاو شەش (٢٢٨٦) حەدیس.
- دایکە (عَائِشَة) دوو هەزارو دوو سەدو دە (٢٢١٠) حەدیس.
- (ابْنُ عَبَّاس) هەزارو شەش سەدو شەست (١٦٦٠) حەدیس.
- (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله) هەزارو پێنج سەدو چل (١٥٤٠) حەدیس.
- (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ) هەزارو سەدو حەفتا (١١٧٠) حەدیس.

بڕوانە: تَدْرِيْبُ الرَّاوِي فِيْ شَرْحِ تَقْرِيْبِ النَّوَاوِيّ (لِلسُّيُوْطِيّ) / ٤٩١. حَقَّقَهُ: أَبُو قُتَيْبَة نَظْر مُحَمَّد الْفَارِيَابِيّ / مُؤَسَّسَةُ الرَّيَّان – بَيْرُوْت – لُبْنَان / الطَّبْعَةُ الثَّانِيَة / ١٤٣٠ هـ – ٢٠٠٩ م.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٢ / بە ژمارە: ٦٠٤٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٢ / بە ژمارە: ٢٦٩٤.

ئەم حەدیسە دوایین حەدیسە لە صەحیحی بوخاریدا.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ تَعَالَى»؟ «إِنَّ أَحَـبَّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْـدِهِ».(١) واتـە: "ئایـا خەبـەرت پـێ بـدەم، کـە خۆشەویسـترین فەرمایشـت بـەلای خـوای گـەورەوە کامەیـە؟ خۆشەویسـترین فەرمایشت بەلای خواوە بریتیە لـە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)".

لـە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: پرسیار کراوە لـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت): ئایا باشترین فەرمایشت کامەیە؟ ئەویش لـە وەڵامدا فەرموویـەتی: «مَا اصْطَفَى اللهُ لِمَلاَئِكَتِهِ أَوْ لِعِبَادِهِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ».(٢) واتە: "خۆشەویسـترین فەرمایشـت بەلای خوای گەورەوە ئەوەیـە، کـە خـوا هەڵبـژاردوە بـۆ فریشـتەکانی، یـان بـۆ بەندەکانی، ئەویش بریتیە لـە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (سَمُرَة)ی کوڕی (جُنْدَب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ تَعَالَى أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَـرُ. لاَ يَضُـرُّكَ بِـأَيِّهِنَّ بَـدَأْتَ».(٣) واتـە: "خۆشەویسترین فەرمایشت بەلای خوای گەورەوە چوارن: (سُبْحَانَ اللهِ)و، (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و، (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و، (اللهُ أَكْبَرُ). زیانیشت لێ نادات بـە هـەرکامیان دەسـت پـێ بکەیت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٣ / بە ژمارە: ٢٧٣١.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٣ / بە ژمارە: ٢٧٣١.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٦٨٥ / بە ژمارە: ٢١٣٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو مَالِك)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّـهِ تَمْـلأُ الْمِيـزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ -أَوْ تَمْلأُ- مَا بَيْنَ السَّـمَوَاتِ وَالأَرْضِ».[1] واتـە: "پاكوخاوێنی نیوەی ئیمانەو، (الْحَمْدُ لِلَّهِ)یش تای چاکەی ترازووی کردەوەکان پـڕ دەکاتو، (سُبْحَانَ اللهِ)و (الْحَمْدُ لِلَّهِ)یش نێوان ئاسمانەکانو زەوی پڕ دەکەن".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (جُوَيْرِيَـةَ)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە بەیانیەك زوو پێغەمبەری خـوا ویسـتی تەشـریف ببات بۆ نوێژی بەیانی، ئەمیش لـە جێگەی نوێژ کردنەکەی خۆیدا (خـەریکی زیکـر کردن) بوو، پاشان کە گەیشتە چێشتەنگا پێغەمبەری خوا گەڕایەوەو، ئەم هـەر لـە جێگەکەی خۆیدا دانیشتبوو. جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: «لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَـعَ كَلِمَاتٍ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ، لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْـدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِـدَادَ كَلِمَاتِـهِ».[2] واتـە: "مـن لـەدوای جیابوونەوەم لە تۆ چوار فەرمایشتم سێ جار وتۆتەوە، کـە ئەگـەر بخرێنـە بەرامبـەر هەموو ئەو زیکرانەی تۆ ئەمڕۆ هەتا ئێستە کردووتن، ئەوا هاوتـای زیکرەکـانی تـۆ دەردەچن، یان لـەوان قورستڕو زیاتر دەردەچن. فەرمایشتەکانیش ئەمانـەن: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ)، (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، رِضَا نَفْسِهِ)، (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، زِنَةَ عَرْشِهِ)، (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، مِدَادَ كَلِمَاتِهِ). واتە: پـاكو بێگـەردیو سـوپاسو ستایش بۆ خوا بە ئەندازەی ژمارەی درووستکراوەکانیو، بـە ئەنـدازەی ڕازیبـوونی خـۆیو، بـە ئەنـدازەی کـێشو قـەبارەی عەرشـەکەیو، بـە ئەنـدازەی زۆری فەرمایشتەکانی (یان بە ئەندازەی مەرەکەبی نووسینی فەرمایشتەکانی)".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٠٣ / بە ژمارە: ٢٢٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٠ / بە ژمارە: ٢٧٢٦.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: «سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ».

ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)شدا بۆ ڕیوایەت کراوەو، دەقەکەشی بەم شێوەیە: «أَلا أُعَلِّمُكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِينَهَا: سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ، سُبْحَانَ اللهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ، سُبْحَانَ اللهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ».(1) واتە: "ئایا چەند فەرمایشتێکت فێر نەکەم، تا بیانڵێیت؟".

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَأَنْ أَقُولَ: "سُبْحَانَ اللهِ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ" أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ».(2) واتە: "ئەگەر بڵێم: "(سُبْحَانَ اللهِ)و (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و (اللهُ أَكْبَرُ)"، لام خۆشەویستترە لە هەموو ئەو شتانەی خۆر لەسەریان هەڵهاتوە. (واتە: لە هەموو موڵكو سەروەتو سامانی دنیا)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أَيُّوب)ی (أَنْصَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" عَشْرَ مَرَّاتٍ؛ كَانَ كَمَنْ

---

(1) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٦ / بە ژمارە: ٣٥٥٥.

(2) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٢ / بە ژمارە: ٢٦٩٥.

أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ».[1] واته: "ئەو کەسەی دە (١٠) جار بڵێت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، وەکو ئەو کەسە وەهایە، کە چوار کەس لە نەوەکانی حەزرەتی (إِسْمَاعِيْل)ی لە کۆیلایەتی ئازاد کردبێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردووکیاندا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ؛ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ».[2] واته: "ئەو کەسەی لە ڕۆژێکدا سەد (١٠٠) جار بڵێت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، وەکو ئەوە وایە دە کۆیلەی ئازاد کردبێتو، سەد (١٠٠) چاکەشی بۆ دەنوسرێتو، سەد (١٠٠) تاوانی بچووکیشی لەسەر لادەبرێتو، ئەو ڕۆژەش هەتا ئێوارە ئەو زیکرانە بۆی دەبن بە پەرژینو پارێزەر لە شەیتانو، هیچ کەسێکیش کاری لە کارەکەی ئەو باشتر ناکات، مەگەر کەسێك لەو زیاتر ئەو زیکرەی کردبێت". وە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ" فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ؛ حُطَّتْ خَطَايَاهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».[3] واته: "ئەو کەسەی لە ڕۆژێکدا سەد (١٠٠) جار بڵێت: (سُبْحَانَ اللهِ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥١ / بە ژمارە: ٦٠٤١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧١ / بە ژمارە: ٢٦٩٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥١ / بە ژمارە: ٦٠٤٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧١ / بە ژمارە: ٢٦٩١.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٢ / بە ژمارە: ٦٠٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧١ / بە ژمارە: ٢٦٩١.

وَبِحَمْدِهِ)، ئەوا تاوانەکانی دادەوەرێنرێن، ئەگەرچی لە زۆریدا وەکو کەفی دەریا وابن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَفْضَلُ الذِّكْرِ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ». واتە: "گەورەترین و باشترین زیکر بریتیە لە: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مُوسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَثَلُ الَّذِيْ يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِيْ لا يَذْكُرُهُ، مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ».[2] واتە: "وێنەی ئەو کەسەی یادی پەروەردگاری دەکات و، ئەو کەسەش یادی پەروەردگاری ناکات، وەکو دوو کەسی زیندوو و مردوو وەهایە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: "فەرمایشتێکم فێر بکە، با بیڵێم". پێغەمبەریش فەرمووی: بڵێ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ». کابرا وتی: ئەم فەرمایشتانە سوپاس و ستایش بوون بۆ پەروەردگارم، ئەی بۆ خۆم چی بڵێم؟ پێغەمبەریش فەرمووی: بڵێ: «اللّهُمَّ، اغْفِرْ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٢ / بە ژمارە: ٣٣٨٣، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٤٩ / بە ژمارە: ٣٨٠٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٣ / بە ژمارە: ٦٠٤٤.

لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي» واته: "خوایه، لێم خۆشبەو، بەزەییت پێمدا بێتەوەو، ڕێنموویيم بکەو، ڕزق‌و ڕۆزی حەلاڵیشم پێ ببەخشە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ». واتە: "ئایا یەکێك لە ئێوە ناتوانێت هەموو ڕۆژێك هەزار (١٠٠٠) چاکە پەیدا بکات؟". جا یەکێك لە دانیشتوانی کۆڕەکەی پرسیاری لێ کرد: "چۆن هەزار (١٠٠٠) چاکە پەیدا بکات؟" پێغەمبەریش فەرمووی: «يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ».[2] واتە: "سەد (١٠٠) جار تەسبیحات بکات، هەزار (١٠٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێت، یان هەزار (١٠٠٠) تاوانی لێ هەڵدەوەرێت".

پێشەوای پایەبەرز (أَبو عَبْدِاللهِ)ی (حُمَيْدِيّ) فەرموویەتی: لە هەموو ڕیوایەتەکانی صەحیحی موسلیمدا بەم جۆرە هاتوە (أَوْ يُحَطُّ). شێخی (بَرْقَانِيّ)ش فەرموویەتی: ئیمامی (شُعْبَة)و (أَبُوْ عَوَانَة)و (يَحْيَى)ی (قَطَّان) لەو (مُوْسَى) ناوەوە ڕیوایەتیان کردوە، کە ئیمامی موسلیم حەدیسەکەی لە ڕێگەی ئەوەوە ڕیوایەت کردوەو، فەرمووشیانە (وَيُحَطُّ)، بەبێ هەمزە.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٢ / بە ژمارە: ٢٦٩٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٣ / بە ژمارە: ٢٦٩٨.

(٣) لە باسکردنی ئەم جیاوازیەی نێوان ڕیوایەتەکانی ئەم حەدیسەدا وا دەردەکەوێت، کە جۆرە ناچوونیەکیەك لەنێوان هەردوو ڕیوایەتەکەدا هەیە. چونکە ئەگەر (أَوْ يُحَطّ) بێت، مانای وایە ئەو کەسەی سەد (١٠٠) جار تەسبیحات بکات، تەنها یەکێك لەم دوو پاداشتەی دەست دەکەوێت: یان هەزار (١٠٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێت، یان هەزار (١٠٠٠) تاوانی لێ هەڵدەوەرێت. بەڵام ئەگەر (وَيُحَطّ) بێت، مانای وایە ئەو کەسە لە یەك کاتدا هەردوو پاداشتەکەی دەست دەکەوێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى».[1] واتە: "هەموو ڕۆژێك تەواوی جەمگەكانی لاشەی هەریەكە لە ئێوە خەیرو صەدەقەیەكیان لەسەرە. جا هەموو (سُبْحَانَ اللهِ)یەك صەدەقەیەكەو، هەموو (الْحَمْدُ لِلَّهِ)یەك صەدەقەیەكەو، هەموو (لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یەك صەدەقەیەكەو، هەموو (اللهُ أَكْبَرُ)ێك صەدەقەیەكەو، فەرمان كردن بە چاكە صەدەقەیەكەو، نەهی كردن لە خراپە صەدەقەیەكەو، دوو ڕكات نوێژیش لە چێشتەنگادا جێگەی هەموو ئەم صەدەقەو خەیرانەی بۆ دەگرێتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێی فەرمووم: «أَلا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ»؟ واتە: "ئایا ڕێنمووییت نەكەم بۆلای گەنجینەیەك لە گەنجینەكانی

---

بەڵام من دەڵێم: دەكرێت بە دوو جۆر هەردوو ڕیوایەتەكە بخرێنەوەیەك‌و جیاوازی لە نێوانیاندا نەهێڵرێت:

- بوترێت: یان حەرفی (أَوْ)ەكە لە ڕیوایەتی یەكەمدا بە مانای (وَاو)ە لە ڕیوایەتەكەی تردا، یان بە پێچەوانەوە.
- بوترێت حەرفی (أَوْ)ەكە لەو ڕیوایەتەدا بۆ (مَنْعُ الْخُلُوّ)ە. واتە: ئەو كەسەی ئەوەندە تەسبیحات بكات، بە لوتفی خوا بەلایەنی كەمەوە دەبێت یەكێك لەو دوو پاداشتەی دەستكەوێت. جا دەگونجێت هەر بە لوتفی خواش هەردوو پاداشتەكەشی دەستكەوێت. چونكە (مَانِعَةُ الْجَمْع) نیە. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٣ / بە ژمارە: ٢٦٩٨.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٩٨ / بە ژمارە: ٧٢٠.

بەهەشت؟". منیش عەرزم کرد: "بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێنموویم بکە". ئەویش فەرمووی: بڵێ: «لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاّ بِاللَّهِ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) چوون بۆلای ژنێك، چەند ناوکە خورمایەك، یان چەند بەردێکی لەبەردەستدا بوو، تەسبیحاتی پێ دەکردن. پێغەمبەریش فەرمووی: «أَلا أُخْبِرُكِ بِمَا هُوَ أَيْسَرُ عَلَيْكِ مِنْ هَذَا أَوْ أَفْضَلُ؟» واتە: "ئایا زیکرێکت پێ نەڵێم، کە وتن و ئەنجامدانی لەمەی تۆ خەریکیتی ئاسانترە یان باشترە؟". ئەوجا فەرمووی: شتەکەش ئەمەیە: «سُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ، وَسُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي الأَرْضِ، وَسُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا بَيْنَ ذَلِكَ، وَسُبْحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ، وَاللهُ أَكْبَرُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ مِثْلُ ذَلِكَ». واتە: "(سُبْحَانَ اللهِ) بە قەدەر ژمارەی ئەوانەی درووستی کردوون لە ئاسمان و، ئەوانەش درووستی کردوون لە سەر زەوی و، ئەوانەش لەنێوان هەردووکیاندان و، ئەوانەی لەمەولاش درووستیان دەکات، (الْحَمْدُ لِلَّهِ)یش بەقەدەر ئەو، (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یش بەقەدەر ئەو، (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)یش بەقەدەر ئەو"

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوکیاندا بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (يُسَيْرَة)وە، کە یەکێکە لە هاوەڵە کۆچەبەرەکان (خوای لێ ڕازی بێت)،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٤١ / بە ژمارە: ٣٩٦٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٦ / بە ژمارە: ٢٧٠٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧١ / بە ژمارە: ١٥٠٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٢ / بە ژمارە: ٣٥٦٨.

که پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی پێکردون، کە زۆر بە چاکی ئاگایان لە کردنی (اللهُ أكْبَرُ)و، (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ یان سُبُّوْحٌ قُدُّوْسٌ؛ رَبُّ الْمَلائِكَةِ وَالرُّوْحِ)و، (لا إلهَ إلاّ اللهُ) بێتو، بە گرێی یان بە سەری پەنجەکان بیانژمێرن؛ چونکە سەری پەنجەکان پرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێتو، دەشهێنرێنە گۆو، شایەتی لە بەرژەوەندی یان لە دژی خاوەنەکانیان دەدەن.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوکیانداو، لە (سُنَن)ی (نَسَائِيّ)شدا بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام بینی (دروودی خوای لەسەر بێت) بە پەنجەکانی تەسبیحاتی دەکرد. لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: بە پەنجەکانی دەستی ڕاستی تەسبیحاتی دەکرد.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەو کەسەی بڵێت: «رَضِيتُ باللهِ رَبّاً، وَبالإسْلاَمِ دِيْناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً» بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.[3] واتە: بڵێت: "ڕازیم بەوەی، کە خوای گەورە پەروەردگارم بێتو، ئیسلامیش ئاینم بێتو، (مُحَمَّد)یش پێغەمبەرم بێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧١ / بە ژمارە: ١٥٠١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧١ / بە ژمارە: ٣٥٨٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧١ / بە ژمارە: ١٥٠٢، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢١ / بە ژمارە: ٣٤٨٦، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٧٩ / ١٣٥٥.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٨ / بە ژمارە: ١٥٢٩. شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمامی (حَاكِم) بە (صَحِيْح)یان داناوە. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ١٤٤ / بە ژمارە: ٨٦٣، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٩٩ / بە ژمارە: ١٩٠٤، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ١ / ٩١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (بُسْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك عەرزی پێغەمبەری کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام زۆر بون لەسەرم، شتێکم پێ بفەرموو، تا دەستی پێوە بگرم". پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «لا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ تَعَالَى». واتە: "با بەردەوام زمانت تەڕو پاراو بێت بە کردنی زیکری خوا".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پرسـیار کـراوە لـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت): "چـی پەرسـتش‌و بەندایەتیـەك لـە ڕۆژی دواییدا بەرزترین‌و باشترین پلـەی هەیـە لای خـوای گـەورە؟" ئـەویش فـەرمووی: (بەندایەتی ئەو کەسانەی بەر ئەم وەصفە دەکەون) «الذَّاكِرُوْنَ اللهَ كَثِيْـــراً». منـیش عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، لەو کەسەش کە لـە ڕێگـەی خـوای گـەورەدا غەزا دەکات؟" ئەویش فەرمووی: «لَوْ ضَرَبَ بسَيْفِهِ فِي الْكُفَّار وَالْمُشْـــرِكِينَ حَتَّـــى يَنْكَسِرَ وَيَخْتَضِبَ دَماً، لَكَانَ الذَّاكِرُونَ اللهَ أَفْضَلَ مِنْهُ دَرَجَةً».[2] واتـە: "ئەگـەر بـە شمشێرەکەی لە کافرو موشریکەکان بدات تا دەشکێت‌و، خۆی (یان شمشـێرەکەی) بە خوێن سوور ببێت، هەر ئەوانەی زیکـری خـوا دەکـەن پلـەیان لـە پلـەی ئـەو بەرزترە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٥٨ / بە ژمارە: ٣٣٧٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٥٨ / بە ژمارە: ٣٣٧٦. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (غَرِيْب)ـەو، تەنها لە ڕێگەی (دَرَّاج)ـەوە ئاگامـان لێـەتی. بۆیـە حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٩٦ – ٩٧، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ١ / ٢٥٩ – ٢٦٠.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لەوداو، لە کتێبەکەی ئیمامی (ابْـنُ مَاجَـه)شدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو الـدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْـرِ أَعْمَـالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْـوَرِقِ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ، فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ، وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» واتە: "ئایا خەبەرتان پێ بدەم، کە باشترین و بەرەودارترین و پاکترینی کردەوەکانتان لای خوای گەورە کامەیەو، لە هەمان کاتدا لە بەخشینەوەی ئاڵتوون و زیویش باشترە بۆتان و، لەوەش باشترە کە ڕووبەڕووی دوژمنەکانتان ببنەوەو، ئێوە بدەن لە گەردنی ئەوان و، ئەوانیش بدەن لە گەردنی ئێوە؟" ئەوانیش عەرزیان کرد: "بەڵێ خەبەرمان پێ بدە". پێغەمبەریش فەرمووی: «ذِكْرُ اللهِ تَعَالَى».[1] واتە: "ئەو کردەوەیە بریتیە لە زیکری خوای گەورە".

ئیمامی (حَاكِم) لە کتێبی (الْمُسْـتَدْرَكُ عَلَـى الصَّـحِيْحَيْنِ)دا فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلامَ، وَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّ الْجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ، عَذْبَةُ الْمَاءِ، وَأَنَّهَا قِيْعَـانٌ، وَأَنَّ غِرَاسَهَا: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَـرُ». واتە: "ئەو شەوەی شەوڕەویەکەم پێکرا، گەیشتم بە خزمەتی حەزرەتی (إِبْرَاهِيم) (دروودی خوای لەسەر بێت). پێی فەرمووم: {ئەی (مُحَمَّد)، لە منەوە سڵاو بە ئومەتەکەت بگەیەنەو، خەبەریشیان پێ بدە، کە بەهەشت خاکەکەی پاک و بۆنخۆشەو، ئاوەکەشی سازگارو

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٥٩ / بە ژمارە: ٣٣٧٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ٢ / ١٢٤٥ / ٣٧٩٠.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٧٣ / بە ژمارە: ١٨٢٥.

شیرینەو، هەمووی دەشتو تەختاییەو، نەمامو شەتڵەکانیشی بریتین لــە: (سُــبْحَانَ اللهِ)و (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و (اللهُ أَكْبَرُ)}".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.(١)

بۆشمــان ڕیوایــەت کــراوە لــە کتێبەکــەی ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئــەویش لــە پێغەمبــەری خــواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ" غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَــةٌ فِي الْجَنَّةِ». واتە: "ئەو کەسەی بڵێــت: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، دارخورمایــەکی لــە بەهەشتدا بۆ دەنێژرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.(٢)

بۆشمــان ڕیوایــەت کــراوە لــە کتێبەکــەی ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (أَبُو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویــەتی: عــەرزی پێغەمبەرم کرد: "ئەی پێغەمبەری خــوا، خۆشەویســترین فەرمایشــت بــەلای خــوای گەورەوە کامەیە؟" پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فــەرمووی: «مَا اصْطَفَى اللهُ تَعَالَى لِمَلاَئِكَتِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيْ وَبِحَمْــدِهِ، سُــبْحَانَ رَبِّــيْ وَبِحَمْــدِهِ». واتــە: "ئــەو فەرمایشتەیە، کە خوای گەورە هەڵیبژاردوە بۆ فریشتەکانی، کە ئەویش بریتیــە لــە: (سُبْحَانَ رَبِّيْ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ رَبِّيْ وَبِحَمْدِهِ)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ــە.(٣)

ئیتر لێــرە بــەدواوە کــاتی دەســت کردنمــە بــە باســکردنی مەبەســتی ســەرەکی کتێبەکەمو، تەرتیبی باسەکانیشم بەپێی واقیعی ژیانی ڕۆژو شەوی مرۆڤەکان هێناوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٠ / بە ژمارە: ٣٤٦٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١١ / بە ژمارە: ٣٤٦٤.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٦ / بە ژمارە: ٣٥٩٣.

سەرەتا بەوە دەستپێدەکەم، کە مرۆڤی موسوڵمان لە خەو هەڵدەسێت، پاشان دوای ئەو بە تەرتیب هەتا لە شەودا دەخەوێتەوەو، ئەوجا چەند جار خەبەری دەبێتەوەو، دواتر هەم دەخەوێتەوە.

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش بەتەمای تەوفیق‌و پشتیوانی خوای پەروەردگارم.

## زیکری کاتی لەخەو هەستان

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ مَكَانَهَا: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنْ اسْتَيْقَظَ وَذَكَرَ اللهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقَدُهُ كُلُّهَا، فَأَصْبَحَ نَشِيطاً طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلانَ».[1] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە بخەوێت، شەیتان سێ گرێ لە پشتی سەری دەداتو، بە هەریەکە لە گرێکانیشدا دەکێشێت‌و، دەڵێت: (بخەوە، شەوێکی دوورو درێژت لە بەردەمدا ماوە)، جا ئەگەر خەبەری ببێتەوەو زیکری خوا بکات، ئەوا یەکێك لە گرێکان دەکرێتەوە. خۆ ئەگەر دەستنوێژیش بگرێت، گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە. خۆ ئەگەر نوێژیش بکات، هەرسێ گرێکە دەکرێنەوەو، دواتریش بە گورجوگۆڵی‌و بە دڵخۆشیەوە ڕۆژدەکاتەوە، ئەگینا (ئەگەر هیچکام لەمانە نەکات) بە پەستی‌و بە دڵگرانی‌و تەمبەڵیەوە ڕۆژدەکاتەوە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ١ / ٣٨٣ / بە ژمارە: ١٠٩١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٨ / بە ژمارە: ٧٧٦.

ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریە، ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمیش هەر هەمان مانای ڕیوایەتەکەی ئەوی هەیە.

(قَافِيَةُ الرَّأْسِ)یش واتە: کۆتایی سەرو پشتی سەر.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)ی کوڕی (يَمَان)و (أَبو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویانە: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی ببردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «بِاسْمِكَ اللّٰهُمَّ، أَحْيَا وَأَمُوتُ». واتە: "خوایە، بەناوی تۆوە دەژیمو دەمرم". ئەگەر لە خەویش هەستایە، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ».[1] واتە: "سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە زیندووی کردینەوەو هێزو جووڵەی بۆ گەڕاندینەوە، دوای ئەوەی کە بەهۆی خەوەوە هێزو جووڵەی لێ بڕیبووینو، وەکو مردووی لێ کردبووین، گەڕانەوەشمان بۆ لێپرسینەوەو پاداشت هەر بۆ خزمەتی ئەوە".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ رَدَّ عَلَيَّ رُوْحِيْ، وَعَافَانِيْ فِيْ جَسَدِيْ، وَأَذِنَ لِيْ بِذِكْرِهِ».[2] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەخەو هەستا، با بڵێت: (سوپاسو ستایش بۆ ئەو

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٩٢ / بە هەردوو ژمارە: ٦٩٥٩ و ٦٩٦٠.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨ / بە ژمارە: ٩. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)ش ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردوە، ئیتر نازانم بۆچی ئیمامی نەوەوی حەدیسەکەی لەڕێگەی ئەوانەوە نەهێناوەو، تەنها لە ڕێگەی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە هێناویەتی!!! هەروەها فەرموشێتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ـە، نەك (صَحِيْح). بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١١٣.

خوایەی، ڕۆح و گیانی بۆ گەڕاندمەوەو، لەشساغو دوور لە بەلاَو نەخۆشی کردمو، ڕێگەشی پێدام زیکری ئەو بکەم)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ، عِنْدَ رَدِّ اللهُ تَعَالَى رُوْحَهُ عَلَيْهِ: (لاَ إِلَهَ أَلا اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمَلِكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) إِلاَّ غَفَرَ اللهُ تَعَالَى لَهُ ذُنُوبَهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».[1] واتە: "هەر بەندەیەك لەو کاتەی خوای گەورە ڕۆح و گیانی بۆ دەگەڕێنێتەوەو خەبەری دەکاتەوە، ئەگەر بلێت: (لاَ إِلَهَ أَلا اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمَلِكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، ئەگەرچی لە زۆریدا وەکو کەفی دەریا وابن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا مِنْ رَجُلٍ يَنْتَبِهُ مِنْ نَوْمِهِ، فَيَقُوْلُ: (الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ خَلَقَ النَّوْمَ وَالْيَقَظَةَ، الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ بَعَثَنِيْ سَالِماً سَوِيّاً، أَشْهَدُ أَنَّ اللهَ يُحْيِي الْمَوْتَى، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) إِلاّ قَالَ اللهُ تَعَالَى: صَدَقَ عَبْدِيْ».[2] واتە: "هەر کەسێك لە خەو هەستێت و، بلێت: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، خەوو خەبەربوونەوەی درووست کردوە، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، بە سەلامەتی و بە ڕێك و پێکی زیندووی کردمەوە، شایەتی دەدەم، کە ئەو خوایە مردوەکان زیندوو

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨ – ٩ / بە ژمارە: ١٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ١ / ١١٤ – ١١٥.
(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠ / بە ژمارە: ١٣. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ١ / ١١٧ – ١١٨.

دەکاتەوەو، تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە)، خـوای گـەورەش دەفـەرموێت: (بەندەکەم ڕاستی وت)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُـنَن)ی (أَبُـو دَاوُد)دا، لـە (عَائِشَـةَ)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەرپێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، شەو لـە خەو هەستایە، دە جار (اللهُ أكْبَر)ی دەکردو، دە جاریش (الْحَمْدُ لِلّهِ)ی دەکردو، دە جـاریش دەیفـەرموو: «سُـبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْـدِهِ»و، دە جـاریش دەیفـەرموو: «سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ»و، دە جـاریش (أَسْـتَغْفِرُ الله) دەکـردو، دە جاریش (لا إلَهَ إلاّ الله)ی دەکردو، پاشانیش دە جار دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إنِّي أَعُـوذُ بِكَ مِنْ ضِيْقِ الدُّنْيَا وَضِيْقِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ» واتە: "خوایە، پەنات پێ دەگرم لـە تەنگانـەو نارەحەتیـەکانی دنیـاو تەنگانـەو نارەحەتیـەکانی ڕۆژی قیامـەت"و، پاشـان نوێـژی دادەبەست.[1]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، لـە (عَائِشَـةَ)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێت)، شەو لـە خەو هەستایە، دەیفەرموو: «لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ سُـبْحَانَكَ. اللَّهُـمَّ، أَسْـتَغْفِرُكَ لِذَنْبِي، وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ. اللَّهُمَّ، زِدْنِي عِلْماً، وَلاَ تُزِغْ قَلْبِي بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِي، وَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً، إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ».[2] واتە: "خوایە، هیچ پەرستراوێکی ڕاسـتەقینە نیـە بێجگـە لــە جـەنابت، تـۆ پـاكو بێگـەردیت. خوایـە، داوای لێخۆشـبوونی تاوانەکانمو، داوای سۆزو میهرەبانیت لێ دەکەم. خوایە زانستو زانیـاریم بـۆ زیـاد بکەو، دڵیشم لە ڕێگەی ڕاست لامەدە، دوای ئەوەی کە ڕێگـەی ڕاسـتت پیشـان

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٤ / بە ژمارە: ٥٠٨٥. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٢٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٥ / بە ژمارە: ٥٠٦١. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١١٨.

**دامو، لە گانگای لوتفو میهرت سۆزو میهرەبانیم پیٚ ببەخشە، بەڕاستی جەنابت زاتێکی زۆر بەخشندەیت".**

## زیکری کاتی پۆشینی جل و بەرگ

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لە کاتی پۆشینی جلو جلو بەرگدا بڵێت: (بِسْمِ اللهِ). بە هەمان شێوە وتنی (بِسْمِ اللهِ) لە سەرەتای دەست پێکردنی هەموو کردەوەیەکدا هەر سونەتە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، -کە ناوی (سَعْد)ی کوڕی (مَالِك)ی کوڕی (سِنَان)ـە-، ئەو فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، جلو بەرگێکی بپۆشیایە (ناوی دەهێنا، ئیتر کراس بوایە، یان عابا، یان مێزەرە)، ئەوجا دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا هُوَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا هُوَ لَهُ».[1] واتە: "خوایە، من داوای خەیری ئەم پۆشاکەت لێ دەکەمو، خەیری ئەوەش کە بۆی بەکاردێت، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕی ئەم پۆشاکەو، لە شەڕی ئەوەش کە بۆی بەکاردێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەر کەسێك پۆشاكو بەرگێك لەبەر بکاتو، بڵێت «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ كَسَانِي هَذَا، وَرَزَقَنِيْهِ، مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلا قُوَّةٍ» واتە: "سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم جلو بەرگەی کردە پۆشاکی بەرمو پێی

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٠ - ١١ / بە ژمارە: ١٤. حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە، وەکو ئیمامی نەوەوی لە سەرەتای باسەکەی دواترەوە فەرموویەتی.

خەلاّت کردم، بێ ئەوەی هیچ هێزو توانایەکی خۆمی تێدابێت"، خوای گەورە لەو تاوانانەی خۆش دەبێت، کە پێشتر کردوونی.[1]

## زیکری کاتی پۆشینی جل و بەرگی تازە، یان نەعل، یان لەو جۆرە

سونەتە لەکاتی پۆشینی ئەمانیشدا هەر ئەوە بڵێت، کە لە سەرەتای باسەکەی پێشوودا وتمان. {واتە: بڵێت: (بِسْمِ اللهِ) }.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، جلو بەرگێکی تازەی دەستکەوتایە، ناوی دەهێنا (ئیتر مێزەرە بوایە، یان کراس، یان عابا)، پاشان دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ كَسَوْتَنِيْهِ، أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ». واتە: "خوایە، سوپاس و ستایش هەر شایانی تۆیە، تۆ ئەم جلو بەرگەت کردۆتە پۆشاکی بەرم و پێت بەخشیوم، داوای خەیری ئەم پۆشاکەو خەیری ئەوەشت لێ دەکەم، کە بۆی درووستکراوە، پەناشت پێدەگرم لە خراپەی ئەم پۆشاکەو لە خراپەی ئەوەش بۆی درووستکراوە".

حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە، ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ) لە (سُنَن)ـەکانیاندا ڕیوایەتیان کردوە. {(أَبُو دَاوُد) ناوی (سُلَيْمَان)ی کوڕی (أَشْعَث)ی (سِجِسْتَانِيّ)ـەو، (تِرْمِذِيّ)ش کونیەکەی (أَبُو عِيْسَى)یەو، ناویشی (مُحَمَّد)ی کوڕی (عِيْسَى)ی کوڕی (سَوْرَة)یەو، (نَسَائِيّ)ش کونیەکەی (أَبُو عَبْدِالرَّحْمَن)ـەو، ناویشی (أَحْمَد)ی کوڕی (شُعَيْب)ـە}.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٤ - ١٣٥ / بە ژمارە: ٢٧١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٢٢ - ١٢٣.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عُمَــر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك پۆشاکێکی تازە لەبەر بکات‌و، ئەوجا بڵێت: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ كَسَانِي مَا أُوَارِي بِهِ عَوْرَتِي، وَأَتَجَمَّلُ بِــهِ فِــي حَيَــاتِي». واتە: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، پۆشاکێکی وای پـێ بەخشیوم، کـە عـەورەت‌و شەرمگای خۆمی پێ داپۆشم‌و، لە ماوەی ژیانیشمدا خۆمی پێ بڕازێنمەوە"و، پاشان بچێت پۆشاکە کۆنەکەی بکاتە خەیر، ئیتر ئەو کەسە بە زیندوویی‌و بە مردوویی (لە دنیاو لە قیامەتدا) لە ژێر پارێزگاری‌و چاودێری خوای گەورەدا دەبێت.[2] خـواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەوەی کەسێك دەیڵێت بە هاوڕێیەکی خۆی، کاتێك جل‌و بەرگێکی تازەی لە بەردا دەبینێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە ژنـەهاوەڵی خۆشەویسـت (أُمّ خَالِد)ی کچی (خَالِد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هەندێك پۆشـاکێکیان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پۆشاکێکی بچـوکی ڕەشـیان تێـدا بوو، ئەویش فەرمووی: «مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُوهَا هَذِهِ الْخَمِيصَةَ؟» واتە: "ئێوە کێتـان پـێ باشە ئەم پۆشاکەی لەبەرکەین؟" خەڵکەکەش بێدەنگ بوون. پاشان پێغەمبەری خوا

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٣٩ / بە ژمـارە: ٤٠٢٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٣٩ / بـە ژمارە: ١٧٦٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ٨٥ / بە ژمارە: ١٠١٤١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٨ / بە ژمارە: ٣٥٦٠. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٢٧.

فەرمووی: (أمُّ خَالِد)م بۆ بهێنن. ئەوجا منیان هێنایە خزمەتیو، بە دەستی خۆی لەبەری کردمو، دوو جار فەرمووی: «أَبْلِي وَأَخْلِقِي».[1] واتە: "کۆنی بکەیتو بیتورکێنیت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و، کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پۆشاکێکی لەبەر ئیمامی (عُمَر)دا بینیو، پرسیاری لێ کردو پێی فەرموو: «أَجَدِيْدٌ هَذَا أَمْ غَسِيْلٌ؟» واتە: "ئەمە تازەیە، یان تازە شرۆردراوە؟" ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "بەڵکو تازە شۆردراوە". پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «الْبَسْ جَدِيداً، وَعِشْ حَمِيداً، وَمُتْ شَهِيداً سَعِيْداً».[2] واتە: "یاخوا هەر پۆشاکی تازە لەبەر بکەیتو، بە ڕێزو حورمەتەوە بژیتو، بە شەهیدیو بە بەختەوەریش بمریت". خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## چۆنێتی لەبەرکردنو داکەندنی پۆشاکو نەعل( و پێڵاو)

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان بۆ لەبەر کردنی پۆشاکو نەعلو شەرواڵو هاووێنەکانیان بە قۆڵو قاچی ڕاست دەست پێ بکاتو، لای چەپی دابکەنێ ئەوجا لای ڕاستی.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٩٨ / بە ژمارە: ٥٥٠٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٧٨ / بە ژمارە: ٣٥٥٨، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٣ / بە ژمارە: ٢٦٨. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (حَسَن)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٣٦ – ١٣٧.

به هەمان شێوە: چاوڕەشتن‌و، سیواك كردن‌و، نینۆك كردن‌و، بەرسمێڵ قاچین‌و، هەڵكێشانی مووی بن باڵو، سەر چاك كردن‌و، سڵاودانەوە لە نوێژو، چوونە ژوورەوەی مزگەوت‌و، هاتنە دەرەوە لە سەرئاوو، دەستنوێژ گرتن‌و، خۆ شۆردن‌و، خواردن‌و، خواردنەوەو، تەوقە كردن‌و، دەست هێنان بە بەردە ڕەشەكەو، وەرگرتنی پێویستیەك لە كەسێك‌و، پێدانی شتێك بە كەسێك‌و....... هەر كارێكی تری هاوشێوەی ئەمانە، سونەتە هەموویان بە لای ڕاست ئەنجام بدات‌و، پێچەوانەكەشیان بە لای چەپ.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) پێی خۆش بوو لە هەموو كاروبارێكیدا بە لای ڕاست دەست پێ بكات: لە دەستنوێژو خۆ شۆردن‌و، لە قژ داهێنان‌و، لە نەعل لەپێ كردندا.(١)

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبـو دَاوُد)و، لە غەیری ئەویشدا، بە ڕشتەیەكی (صَحِيْح)، لە (عَائِشَة)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەستی ڕاستی بۆ دەستنوێژ گرتن‌و خۆ شۆردن‌و بۆ خواردن‌و خواردنەوە بەكار دەهێناو، دەستی چەپیشی بۆ تارات‌و، لادانی شتە قێزەونەكانی تر(ی وەكو لووت سڕین‌و، لادانی بەڵغەم) بەكار دەهێنا.(٢)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٦٥ / بە ژمارە: ٤١٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٢٦ / بە ژمارە: ٢٦٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥٥ / بە ژمارە: ٣٣، ومُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٤٣ / ٣١٧ / بە ژمارە: ٢٦٢٨٣.

بۆشمان ڕیوایەت کـراوە لـە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و، (سُـنَن)ی (بَيْهَقِـيّ)دا، لـە (حَفْصَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، دەستی ڕاستی بۆ خواردنو خواردنـەوەو پۆشـاك لەبـەر کـردن بـەکار دەهێناو، دەستی چەپیشی بۆ شتی تر بەکار دەهێنا.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْـرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە فەرموویـەتی: «إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ، فَابْدَءُوا بِأَيَامِنِكُمْ».[2] واتە: "ئەگەر جلو بەرگێکتان پۆشی، یان دەستنوێژتان گرت، بەلای ڕاستان دەست پێ بکەن".

حەدیسێکی (حَسَن)ـە، ئیمامی (أَبو دَاوُد)و، (تِرْمِذِيّ)و، (ابْنُ مَاجَهْ)و (بَيْهَقِـيّ) ڕیوایەتیان کردوە. {(ابْنُ مَاجَهْ) کونیەکـەی (أَبو عَبْدِالله)یـەو ناویشـی (مُحَمَّـد)ی کوڕی (يَزِيْدَ)ە-و، (بَيْهَقِيّ)ش کونیەکەی (أَبو بَكْر)ەو ناویشـی (أَحْمَـد)ی کـوڕی (حُسَيْن)ـە}.

چەندین حەدیسی تریش سەبارەت بەم باسە هاتوون. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥٥ / بە ژمارە: ٣٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ١ / ١١٢ / بە ژمارە: ٥٤٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٤٥ - ١٤٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٦٨ / بە ژمـارە: ٤١٤١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٢٣٨ / بـە ژمارە: ١٧٦٦، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ١٤١ / بە ژمارە: ٤٠٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ١ / ٨٦ / بە ژمارە: ٤٠٩.

## زیکری کاتی داکەندنی جل و بەرگ بۆ شۆردن، یان بۆ خەوتن، یان بۆ کارێکی لەو جۆرە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «سِتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ، أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ، إِذَا أَرَادَ أَنْ يَطْرَحَ ثِيَابَهُ: بِسْمِ اللهِ الَّذِيْ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ».[1] واتە: "پەردەی نێوان چاوی جنۆکەکان و عەورەت و شەرمگای ئادەمیزادەکان ئەوەیە، کە ئەگەر کەسێکی موسوڵمان ویستی پۆشاک و جل و بەرگەکەی دابکەنێت، بڵێت: (بەناوی ئەو خوایەی، کە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە بوونی نیە)".

## زیکری کاتی چوونەدەرەوە لە ماڵ

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت) – ناوی (هِنْد)ە–، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لە ماڵی خۆی بچوایەتە دەرەوە، دەیفەرموو: «باسْمِ اللَّهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضِلَّ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزِلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ». واتە: "بەناوی خواوە، پشتم بەخوا بەستوە. خوایە، من پەنات پێ دەگرم لەوەی کە خۆم لە ڕێگە دەربچم، یان کەسێك لە ڕێگە دەرکەم (یان لە ڕێگە دەربکرێم)، یان تووشی پێخزان ببم، یان کەس تووشی پێخزان بکەم (یان تووشی پێخزان بکرێم)،

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٣٥ – ١٣٦ / بە ژمارە: ٢٧٣. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی لاوازی داناوەو، پاشان فەرمووشێتی: هیچ حەدیسێك لەم بارەوە سابت نەبوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٥١ – ١٥٥.

یان زوڵم و ستەم بکەم، یان زوڵم و ستەمم لێ بکرێت، یان هەڵەو نەفامی بەرامبەر کەسێك بکەم، یان هەڵەو نەفامیم بەرامبەر بکرێت".

حەدیسێکی (صَحِیْح)ـە، ئیمامی (أَبو دَاوُد)و، (تِرْمِذِيّ)و، (نَسَائِي)و، (ابْنُ مَاجَهْ) ڕیوایەتیان کردوە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا بە صیغەی تاكو بەم جۆرە هاتوە: (أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ.....). {واتە: پێغەمبەری خوا تەنها بەناوی خۆیەوە پاڕاوەتەوە}.

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شدا بە صیغەی کۆ و بەم جۆرە هاتوە: (أَعُوذُ بِكَ أَنْ نَزِلَّ......نَضِلَّ....... نَظْلِمَ.......نَجْهَلَ). {واتە: پێغەمبەری خوا بەناوی خۆی و کەسانی تریشەوە پاڕاوەتەوە}.

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا حەدیسەکە بەم جۆرە هاتوە: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کە لە ماڵی من دەردەچوو، تەماشای ئاسمانی دەکردو، دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ......هتد».

لە ڕیوایەتی غەیری ئەویشدا بەم جۆرە هاتوە: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەگەر لە ماڵی خۆی بچوایەتە دەرەوە، دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ......هتد». خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٦ / بە ژمارە: ٥٠٩٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٠ / بە ژمارە: ٣٤٢٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٨ / ٢٦٨ / بە ژمارە: ٥٤٨٦، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٨ / بە ژمارە: ٣٨٨٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و، لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ -يَعْنِي إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ-: "بِسْمِ اللَّهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ" يُقَالُ لَهُ: كُفِيتَ، وَوُقِيتَ، وَهُدِيْتَ، وَتَنَحَّى عَنْهُ الشَّيْطَانُ». واتە: "ئەو کەسەی لەماڵ دەربچێتو، بڵێت: (بِسْمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)، لەلایەن فریشتەیەکەوە پێی دەوترێت: (بێنیاز کرایتو پارێزرایتو ڕێنموویی کرایت)و، شەیتانیش خۆی لێ لادەدات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

ئیمامی (أَبو دَاوُد) لە ڕیوایەتەکەی خۆیدا ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: «فَيَقُولُ -يَعْنِيْ الشَّيْطَانَ- لِشَيْطَانٍ آخَرَ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ؟». واتە: "شەیتانێك بە شەیتانێکی تر دەڵێت: (تۆ دەتەوێت چی بکەیت لە پیاوێك، کە ڕێنموویی کراوەو، بێنیاز کراوەو، پارێزراوە؟)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی (ابْنُ مَاجَه)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ماڵی خۆی تەشریفی ببردایەتە دەرەوە، دەیفەرموو: «بِسْمِ اللهِ، التُّكْلانُ عَلَى اللهِ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ».[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٦ / بە ژمارە: ٥٠٩٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٠ / بە ژمارە: ٣٤٢٦، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ٢٦ / بە ژمارە: ٩٩١٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٨ / بە ژمارە: ٣٨٨٥، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٩٢ - ٩٣ / بە ژمارە: ١٧٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٦٦.

# زیکری کاتی هاتنەژورەوە بۆ ماڵ

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)و، زیکری خوای گەورەش زۆر بکاتو، سڵاویش بکات، ئیتر کەس لەماڵەوە بێت، یان نا. چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾ [النُّوْر: ٦١]. واتە: {ئەگەر چوونە ناو خانوویەکەوە، سڵاوێکی پیرۆزو خاوێنی خوایی لەخۆتان بکەن}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَا بُنَيَّ، إِذَا دَخَلْتَ عَلَى أَهْلِكَ؛ فَسَلِّمْ، يَكُنْ بَرَكَةً عَلَيْكَ وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِكَ». واتە: "کوڕی خۆم، ئەگەر چوویتەوە بۆ ناو کەسوکارو خێزانەکەت، سڵاو بکە، چونکە ئەو سڵاوە دەبێتە فەڕو بەرەکەت بۆ خۆتو بۆ کەسوکارو خێزانەکەشت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو مَالِك)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) -ناوی (حَارِث)ـەو، وتراوە ناوی (عُبَيْد)ەو، وتراویشە (كَعْب)و، وتراویشە (عَمْرو)- کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا وَلَجَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلِجِ، وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ. بِسْمِ اللهِ وَلَجْنَا، وَبِسْمِ اللهِ خَرَجْنَا، وَعَلَى اللهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا. ثُمَّ لِيُسَلِّمْ عَلَى أَهْلِهِ».[2] واتە: "ئەگەر پیاوێك چوە ژوورەوە بۆ ماڵی خۆی، با بڵێت: (خوایە من داوای باشترین چوونە ژوورەوەو باشترین هاتنە دەرەوەت لێ دەکەم. بەناوی خواوە چووینە ژوورەوەو، بەناوی خوایشەوە چووینە دەرەوەو،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٩ / بە ژمارە: ٢٦٩٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٧ / بە ژمارە: ٥٠٩٦.

پشتیشمان بە خوای پەروەردگارمان بەستوە)، ئەوجا با سڵاو لە کەسوکارو خێزنەکەی بکات".

ئیمامی (أَبُو دَاوُد) ئەم حەدیسەی بە (ضَعِيف) دانەناوە.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أُمَامَة)ی (بَاهِلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) –ناوی (صُدَيّ)ی کوڕی (عَجْلَان)ـە–، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ –عَزَّ وَجَلَّ–: رَجُلٌ خَرَجَ غَازِياً فِيْ سَبِيلِ اللهِ –عَزَّ وَجَلَّ–، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ –عَزَّ وَجَلَّ–، حَتَّى يَتَوَفَّاهُ، فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيْمَةٍ؛ وَرَجُلٌ رَاحَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ تَعَالَى، حَتَّى يَتَوَفَّاهُ، فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيْمَةٍ؛ وَرَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلَامٍ، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى». واتە: "سێ کەس هەن، هەموویان لەژێر چاودێریو لوتفی خوای گەورەدان: (پیاوێك لە ماڵی خۆی دەرچوە بۆ غەزاو جەنگ لە ڕێگەی خوادا، ئەم پیاوە لەژێر چاودێریو لوتفی خوای گەورەدایە، هەتا دەیباتەوە بۆلای خۆیو گیانی دەسێنێتو، ئەوجا دەیخاتە بەهەشتەوە، یان بە زیندووییو بە پاداشتو دەستکەوتێکی باشەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناو کەسوکارەکەی). (پیاوێکیش ڕۆیشتوە بۆ مزگەوت، ئەمیش لەژێر چاودێریو لوتفی خوای گەورەدایە هەتا دەیباتەوە بۆلای خۆیو گیانی

---

(١) واتە: بەلای ئەوەوە بۆ پشت پێ بەستنو بەڵگە هێنانەوە دەشێت. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕاستە ئیمامی (أَبُو دَاوُد) لە (سُنَن)ـەکەیدا ئەم حەدیسەی بە لاواز دانەناوە. بەڵام لە وەڵامی پرسیارەکانی شێخی (آجُرِّيّ)دا (مُحَمَّد)ی کوڕی (إِسْمَاعِيل)ی کوڕی (عَيَّاش)ی بە لاواز داناوە، کە یەکێك لە ڕاویەکانی ئەم حەدیسە. پاشان شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەی ئەم حەدیسە نەخۆشیەکی تریشی تێدایە، ئەویش ئەوەیە، کە ئەو کەسەی حەدیسەکەی لە (أَبُو مَالِك)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە ڕیوایەت کردوە، خۆی حەدیسەکەی لە ئەو نەبیستوە، بەڵکو کەسێك لە نێوانیاندا داکەوتوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٧٢ – ١٧٣.

دەسێنێت‌و، ئەوجا دەیخاتە بەهەشتەوە، یان بە زیندوویی‌و بەپاداشت‌و دەستکەوتێکی باشەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناو کەسوکارەکەی). (پیاوێکیش بە سڵاو کردنەوە بچێتەوە ماڵی خۆی[1]، ئەمیش لەژێر چاودێری‌و لوتفی خوای گەورەدایە)".

حەدیسێکی (حَسَن)ـە. ئیمامی (أبو دَاوُد) بە ڕشتەیەکی (حَسَـن) ڕیوایەتی کردوەو، زانایانی تریش ڕیوایەتیان کردوە.[2]

مانای (ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ) واتە: خاوەنی (ضَمَان)ـە. (ضَمَان)یش بریتیە لە: چاودێری‌و ئاگالێبوون. وەکو چۆن دەوترێت (تَامِر)و (لاَبِن) بۆ خاوەن خورماو، خاوەن شیر. کەواتە مانای (ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ) ئەوەیە، کە لەژێر چاودێری خوای گەورەدا دەبێت. ئای ئەم خەڵاتە چەندە گەورەیە! خوایە بیکەیت بە ئێمەشی ببەخشیت. (آمِيْن، يَا رَبَّ الْعَالَمِيْن).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ تَعَالَى عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ، فَلَمْ يَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ:

---

(١) دەبێت حەدیسەکە بەم جۆرە مانا بکرێت، ئەوجا دەبێت بە بەڵگە بۆ ئەوەی، کە سونەتە لەکاتی چوونە ژوورەوە بۆ ماڵەوە سڵاو بکرێت. بەڵام ئەگەر بەم جۆرەیان مانا بکرێت – کە ئەمیش هەر ڕاستە–: {پیاوێك لەبەر سەلامەتی‌و خۆلادان لە ئاشووب‌و کێشە بچێتە ماڵی خۆیەوەو، نەیەتە دەرەوە}، ئەوا پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نامێنێت.

جا بۆ لێکدانەوەی مانای حەدیسەکە بە هەردوو جۆرەکە بڕوانە: مِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْحِ شَـرْحُ مِشْكَاةِ الْمَصَابِيْحِ (الْمُلاَّ عَلِيِّ الْقَارِي) / ٢ / ٦١١ – ٦١٢، وفَيْضُ الْقَدِيْرِ شَـرْحُ الْجَامِعِ الصَّغِيْرِ (الْمُنَاوِيّ) / ٣ / ٣١٩ / لەسەر حەدیسی ژمارە: ٥٣٦٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ١٠ / بە ژمارە: ٢٤٩٤، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٩ / ١٦٦ / بە ژمارە: ١٨٣١٩.

أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ». ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.(١) واتە: "ئەگەر پیاوێك بچێتە ماڵی خۆیەوەو، لەکاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نانخواردنیشدا زیکری خوا بکات، شەیتان (بە دەس و دائیرەکەی) خۆی دەڵێت: (نە جێگەی مانەوەتان دەستکەوت، نە نانو خوانیش). خۆ ئەگەر بچێتە ژوورەوەو، لەکاتی چوونە ژوورەوەدا زیکری خوا نەکات، شەیتان دەڵێت: (جێگەی مانەوەتان دەستکەوت). ئەگەر لەکاتی خواردنیشدا زیکری خوا نەکات، شەیتان دەڵێت: (جێگەی مانەوەو خواردنیشتان دەستکەوت)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە ڕۆژدا بگەڕایەتەوە بۆ ماڵی خۆی، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ كَفَانِي وَآوَانِي، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ أَطْعَمَنِي وَسَقَانِي، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ مَنَّ عَلَيَّ (فَأَفْضَلَ)، أَسْأَلُكَ أَنْ تُجِيْرَنِيْ مِنَ النَّارِ».(٢) واتە: "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە بێنیازی کردووم لە خەڵکیو، جێگەی حەوانەوەی بۆ دابین کردووم. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە خواردنو خواردنەوەی پێ بەخشیوم. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی نازو نیعمەتێکی زۆری بەسەردا ڕشتووم. خوایە داوات لێ دەکەم لە ئاگر بمپارێزیت".

ڕشتەکەی (ضَعِيْف)ـە.(٣)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٨ / بە ژمارە: ٢٠١٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨١ – ٨٢ / بە ژمارە: ١٥٨.

(٣) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: من حەدیسێکم بینیوە، بۆ پاڵپشتی ئەم حەدیسە دەشێت و، هەردوو زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ شَيْبَة)و (بَزَّار) لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (عَوْف)ـەوە ڕیوایەتیان کردوە. بۆیە حەدیسەکە دەبێت بە حەدیسێکی (حَسَن). بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٧٨ – ١٧٩.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە ئەو پێی گەیشتوە: ئەگەر مرۆڤی موسوڵمان چوە ناو خانوویەکی چۆڵەوە، سونەتە بڵێت: (السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ).[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ٢ / ٩٦٢ / بە ژمارە: ١٧٢٨. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئیمامی بوخاری لە کتێبی (الْأَدَبُ الْمُفْرَد)داو، شێخی (ابْنُ أَبِي شَيْبَة)ش بە ڕشتەیەکی (حَسَن) ڕیوایەتیان کردوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك چوە خانوویەکی چۆڵەوە، سونەتە بڵێت: (السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ). پاشان شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: هەروەها ئیمامی (طَبَرِيّ)ش لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە ڕیوایەتی کردوەو، لە ڕێگەی هەریەکە لە (عَلْقَمَة)و (عَطَاء)و (مُجَاهِد)یشەوە فەرمایشتی لەم جۆرەی نقلّ کردوە. بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي شَرْحُ صَحِيْحِ الْبُخَارِيّ / ١١ / ٢٠.

منیش دەڵێم: بۆ فەرمایشتی زانایان لەو بارەوە بڕوانە تەفسیری ئایەتی (٦١)ی سورەتی (النُّوْر): ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾ لە تەفسیری (جَامِعُ الْبَيَانِ فِيْ تَأْوِيْلِ الْقُرْآن)، ناسراو بە تەفسیری (طَبَرِيّ).

## زیکری خەبەربوونەوە لە شەوداو، چوونەدەرەوە لە ماڵ لەو کاتەدا

ئەگەر کەسێکی موسوڵمان شەو خەبەری بوویەوەو، لە ماڵ چوە دەرەوە، سونەتە تەماشای ئاسمان بکاتو، ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (آل عِمْرَان) بخوێنێت. لە ئایەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ.......﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە.[1]

لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) وەهای دەکرد، تەنها تەماشا کردنی ئاسمانەکە نەبێت، کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، نەك لە صەحیحی موسلیم.[2]

---

(١) واتە: ئایەتەکانی (١٩٠ – ٢٠٠)، کە بریتین لە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِيْنَ يَذْكُرُونَ اللهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١) رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ (١٩٢) رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِياً يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ (١٩٣) رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ (١٩٤) فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِيْنَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَاباً مِنْ عِنْدِ اللهِ وَاللهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ (١٩٥) لا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِيْنَ كَفَرُوا فِي الْبِلادِ (١٩٦) مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ (١٩٧) لَكِنِ الَّذِيْنَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلاً مِنْ عِنْدِ اللهِ وَمَا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِلْأَبْرَارِ (١٩٨) وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَنْ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللهِ ثَمَناً قَلِيلاً أُولَئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (١٩٩) يَا أَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٢٠٠)﴾.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٦٥ / بە ژمارە: ٤٢٩٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٧٦٣.

هـەروەها لــە هــەردوو صــەحیحی بوخــاریو موســلیمدا هــاتوە، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَبَّاس)ــەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێـت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێـت)، بە شــەودا هەسـتایە بـۆ شــەونوێژ کــردن، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَــنْ فِــيهِنَّ. وَلَــكَ الْحَمْدُ، لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ. وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّــمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ. وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُــكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- حَــقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ، لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ». واتە: "خوایە، سوپاسو ستایش تــەنها شایســتەی تۆیــە، چــونکە تــۆ سەرپەرشــتیارو هەڵســوڕێنەری ئاسمانــەکانو زەویو ئەوەشــی کــە لــە ناویاندایــە. ســوپاسو ســتایش تــەنها شایســتەی تۆیــە، چــونکە خاوەنداریتی ئاسمانەکانو زەویو ئــەوەش لەناویاندایــە تــەنها هــی تۆیــە. ســوپاسو ستایش تەنها شایستەی تۆیە، چونکە تــۆ سەرچــاوەی نــورو ڕوونــاکی ئاسمانــەکانو زەویو ئەوەشی کە لــە ناویاندایــە. ســوپاسو ســتایش تــەنها شایســتەی تۆیــە، تــۆ خوایەکی ڕاستو ڕاستەقینەیت، بەڵێنیشت حەقو ڕاســتە، بەخزمەتگەیشتنەوەشــت حەقو ڕاستە، فەرمایشتیشت حــەقو ڕاســتە، بەهەشــتیش حــەقو ڕاســتە، ئــاگری دۆزەخیش حەقو ڕاستە، پێغەمبەرانیش حەقو ڕاستن، (مُحَمَّـــد)یــش پێغەمبــەرێکی حەقو ڕاستەو، قیامەتو دواڕۆژیــش حــەقو ڕاســتە. خوایــە، مــن فەرمانبــەردارو تەسلیمی فەرمایشــتەکانی تــۆمو، ئیمانیشــم بــەتۆ هێنــاوەو، پشتیشــم تــەنها بــە تــۆ بەستوەو، بۆلای تۆش دەگەڕێمەوەو هانــا بــۆ تــۆ دەهێــنم، بــە بەڵگــەو بــە هێــزی پشتیوانی تۆ دەچم بە گژی دوژمنانداو، لە ناکۆکی نێوان خــۆمو ناحەزەکانمــدا تــۆ دەکەم بە دادوەرو بــە بڕیــاردەر، دەی تــۆش لــە تــاوانی لەمــەوپێشو لەمەوپاشــم خۆشبەو، لەوانەی بە نهێنیو بە پەنهانی ئەنجامم داونو، لەوانــەش کــە بــە ئاشــکرا کردوومن. تــۆ بــە حیکمــەتی خــۆت دۆســتو خۆشەویســتەکانت پێشــدەخەیتو

بـــەرزیان دەکەیتـــەوەو هێـــزو دەســـەڵاتیان دەدەیتـــێ، دوژمـــنو ناحەزەکانیشـــت دوادەخەیتو نەویو سەرشۆڕو ڕیسوایان دەکەیت، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە، بێجگە لە تۆ".

هەندێك لە ڕاویەکان ئەمەشیان بۆ زیاد کردوە: «وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاّ بِاللهِ».[1]

## زیکری کاتی چوونە سەرئاو

لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسـلیمدا هـاتوە، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لـە کـاتی چونە سەرئاودا دەیفـەرموو: «اللّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ».[2] واتـە: "خوایە، من پەنا بەتۆ دەگرم لە شەیتانە نێرینەو مێیینەکان".

بائی وشەی (خُبُث) بە (مَضْمُوْم)یو بە (سَاكِن)یش دەخوێنرێتـەوەو، بۆچـوونی ئەو کەسەش ڕاست نیە، کە نکوڵی لەوە دەکات، بە (سَاكِن)ی بخوێنرێتەوە.

لە غـەیری صـەحیحی بوخـاریو موسلیمیشـدا بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە، کـە پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا دەیفەرموو: «بِسْمِ اللهِ، اللّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُـثِ وَالْخَبَائِثِ». [3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٧٣ / بە ژمارە: ١٠٦٩، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٥٣٢ / بە ژمارە: ٧٦٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٦٦ / بە ژمارە: ١٤٢، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٢٨٣ / بـە ژمارە: ٣٧٥.

(٣) بڕوانـە: الْمُصَنَّفُ فِيْ الْأحَادِيْثِ وَالْآثَارِ / كِتَابُ الطَّهَارَة / مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ / ١ / ١١ / بە ژمارە: ٥، والدُّعَاءُ لِلطَّبَرَانِيّ (تَحْقِيْق: مُصْطَفَى عَبْدُالْقَادِرِ عَطَـا) / ١٣٢ / بـە

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هاوەڵی خۆشەویست‌و خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەرو پێشەوای موسوڵمانان ئیمامی (عَلِيّ) كوڕی (أَبُو طَالِب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «سِتْرُ مَا بَيْنَ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ الْكَنِيفَ أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّهِ».[1] واتە: "پەردەی نێوان جنۆكەكان‌و عەورەت‌و شەرمگای ئادەمیزادەكان ئەوەیە، كە ئەگەر كەسێك بچێتە جێگەی سەرئاو كردن، بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) ڕیوایەتی كردوەو، فەرمووشێتی: ڕشتەكەی بەهێز نیەو، ئێمەش لە باسەكاندا پێشتر وتمان: لە كردەوە چاكەكاندا كار بە حەدیسی (ضَعِيف) دەكرێت.[2]

---

ژمارە: ٣٥٧. جیاوازی نێوان ئەم ڕیوایەتەو ڕیوایەتەكەی ئیمامی بوخاری‌و موسلیم تەنها بریتیە لە هەبوونی (بِسْمِ الله) لەم ڕیوایەتەداو، نەبوونی لە ڕیوایەتەكەی ئەواندا. جا ئەگەرچی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكە لەم دوو كتێبەدا جێگەی سەرنج‌و تێبینیە، بەڵام وەكو زانای پایەبەرز (وَلِيُّ الدِّيْن)ی كوڕی حافظی عێراقی‌و، شێخی عەسقەلانی‌و، شێخی (عَيْنِيّ) فەرموویانە: لە ڕێگەی ترەوە بە ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەت كراوە، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلْتُمُ الْخَلَاءَ فَقُولُوا: بِسْمِ الله، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ». بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٩٥ – ١٩٦، وفَتْحُ الْبَارِي / ١ / ٢٤٤، وعُمْدَةُ الْقَارِيْ شَرْحُ صَحِيْحِ الْبُخَارِيِّ / ٢ / ٢٧٢، وفَيْضُ الْقَدِيْر / ٥ / ١٢٧. بۆیە دەتوانین بڵێین: وتنی (بِسْم الله) لەكاتی چوونەسەرئاودا سونەتە.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٥٠٣ / بە ژمارە: ٦٠٦.

(٢) شێخی (مُنَاوِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (سُيُوْطِيّ) ئاماژەی كردوە بە صەحیحی ئەم حەدیسەو، هەر واشە كە ئەو فەرموویەتی. ئەوجا فەرمایشتێكی شێخی (مُغُلْطَاي) هێناوە لەسەر فەرمایشتەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و، فەرموویەتی: نازانم چی وای كردوە كە ڕشتەكەی بەهێز نەبێت، چونكە تەواوی ئەو كەسانەی لە ڕشتەكەیدان لە هیچ ڕوویەكەوە تانەیان لەسەر نیە، بەڵكو ئەگەر كەسێك بڵێت: ڕشتەكەی صەحیحە، بۆچوونەكەی ڕاستەو پێكاویێتی. بڕوانە: فَيْضُ الْقَدِيْر / ٤ / ٩٦ – ٩٧ / لەسەر حەدیسی ژمارە: ٤٦٦٢. بۆ فەرمایشتەكەی

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە ئەم زیکرە بکرێت، ئیتر سەرئاو کردنەکە لە ناو بینادا بێت، یان لە دەشتو دەردا.

هەروەها هاوەڵانمان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: سونەتە یەکەم جار بوترێت: (بِسْمِ اللَّهِ). پاشان بوترێت: (اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کاتێك دەچوە سەرئاو، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الرِّجْسِ النَّجِسِ الْخَبِيثِ الْمُخْبِثِ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». واتە: "خوایە، من پەنا بەتۆ دەگرم لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خۆت، کە پیسو چەپەڵو چەپەڵکەریشە".

شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ڕیوایەتی کردوەو، ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ش لە کتێبی (الدُّعَاء)دا ڕیوایەتی کردوە.(١)

## نەهی کردن لە زیکرو قسە کردن لە سەرئاودا

زیکر کردنو قسە کردن لەکاتی سەرئاو کردندا ناپەسەندە، ئیتر لە بینادا بێت یان لە دەشتدا، وە هەموو جۆرەکانی زیکر کردنو قسە کردن لەم ناپەسەندیەدا یەکسانن، مەگەر قسە کردنەکە لەبەر ناچاری بێت.

---

شێخی (مُغُلْطَاي)یش بڕوانە: شَرْحُ سُنَنِ ابْنِ مَاجَه (عَلاءُ الدِّيْنِ مُغُلْطَاي) بِتَحْقِيْق: كَامِل عُوَيْضَة / ١ / ٧٢.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٥ / بە ژمارە: ٢٥، والدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ١٣٥ / بە ژمارە: ٣٦٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازە، بەڵام لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە پاڵپشت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ١٩٧ - ١٩٨.

هەر بۆیە هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك لـە کـاتی سـەرئاو کردندا پژمی، با (الْحَمْدُ لِلّهِ) نەکات‌و، با لەو کاتەشدا وەڵامی (الْحَمْدُ لِلّهِ) کەسـی پژمیو نەداتەوەو، وەڵامی سڵاویش نەداتەوەو، وەڵامی بانگخوێنیش نەداتەوەو، ئـەو کەسەش سڵاوی لەم کـردوە بـە کەسـێکی کەمتەرخـەم دادەنرێـت، بۆیـە شـایانی وەڵامدانەوە نیە.

جا ئەم کردنی جۆرە زیکرانە ناپەسەندە، نەوەك حەرام. بۆیە ئەگەر پـژمی‌و، بـە دڵ (الْحَمْدُ لِلّهِ) کردو، زمانی نەجولاند، ئەوە قەیناکات‌و، خراپەیەکیشی تێـدا نیـە. بە هەمان شێوە لە کاتی جوتبوون‌و سەرجێگەیی نێوان ژن‌و مێردیشدا، با زیکرەکان هەر بە دڵ بن‌و، بە زمان نەبن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پاوێك بـەلای پێغەمبـەری خـوادا تێپـەڕی (دروودی خـوای لەسەر بێت)و، ئەویش لەو کاتـەدا دەسـتی بـە ئـاو دەگەیانـدو، کـابراش سـڵاوی لێ کردو، ئەویش وەڵامی نەدایەوە. ئیمامی موسلیم ئەم حەدیسەی لە صـەحیحەکەیدا ڕیوایەت کردوە.[1]

لە هاوەڵی خۆشەویست (مُهَاجِر)ی کـوڕی (قُنْفُذ)یشـەوە هـاتوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، لەو کاتەدا دەستی بە ئاو دەگەیاندو، منیش سڵاوم لێ کردو، ئەویش وەڵامـی نەدامەوەو، پاشان پۆزش (عُذْر)ی بۆ هێنامەوەو، فەرمووی: «أَنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُـرَ اللّهَ إِلاَّ عَلَى طُهْرٍ (أَوْ عَلَى طَهَارَةٍ)». واتە: "من پێم ناخۆشـبوو زیکـری خـوا بکـەم، هەتا پاك‌و خاوێن‌و دەستبەدەستنوێژ نەبم".

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨١ / ٣٧٠.

حەدیسێکی (صَحِیْح)ـە، ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَــە) بـە چـەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح) ڕیوایەتیان کردوە.[1]

## نەهی کردن لە سلاّو کردن لەو کەسەی، کە دانیشتوە بۆ سەرئاو کردن

هاوەڵاّنمـان فەرموویانـە: ناپەسـەندە سـلاّو بکرێـت لـەو کەسـەی لـە سـەرئاو دانیشتوە، خۆ ئەگەر کەسێك سلاّوی لێ کرد، ئەوە شـایەنی وەڵاّمدانـەوە نیـە، بـە بەڵگەی ئەو دوو حەدیسەی هەردوو هاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ عُمَر)و (مُهَـاجِر) (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە لـە باسەکەی پێشوودا هێنران.

## زیکری کاتی هاتنە دەرەوە لە سەرئاو

با مرۆڤی موسوڵمان لەکاتی هاتنە دەرەوە لـە سـەرئاو بڵێـت: «غُفْرَانَكَ، الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ أَذْهَبَ عَنِّيْ الْأَذَى وَعَافَانِيْ».

لـە حەدیسی (صَحِیْح)یشدا هاتوە لـە (سُنَن)ی (أَبـو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)دا، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) لـەدوای سـەرئاو کـردن دەیفـەرموو: «غُفْرَانَكَ».[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥١ / بە ژمـارە: ١٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ١ / ٣٧ / بـە ژمـارە: ٣٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ١٢٦ / بە ژمارە: ٣٥٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٥٥ / بە ژمارە: ٣٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ١ / ١٢ / بـە ژمـارە: ٧.

ئیمامی (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَهْ)ش بەشەکەی تریان (واتە: الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ أذْهَبَ عَنِّيْ الْأَذَى وَعَافَانِيْ) ڕیوایەت کردوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە سەرئاو دەهاتە دەرەوە، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ أذَاقَنِيْ لَذَّتَهُ، وأَبْقَى فِيَّ قُوَّتَهُ، وَدَفَعَ (فِيْ رِوَايَة ابْنِ السُّنِّيّ: وَأذْهَبَ) عَنِّي أَذَاهُ». واتە: "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە لەزەت و چێژی ئەو خواردنەی پێ بەخشیمو، هێزو قوەتەکەشی تێدا هێشتمەوەو، زیانو پیسیەکەشی لەکۆڵ کردمەوە".

هەردوو زانای پایەبەرز (ابْنُ السُّنِّيّ)و (طَبَرَانِيّ) ڕیوایەتیان کردوە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ١١٠ / بە ژمارە: ٣٠١. ئەم فەرمایشتە دوو سەرنجو تێبینی لەسەرە:

- ئەگەرچی ئیمامی نەوەوی‌و هەندێك لە زانایانی تریش فەرموویانە: ئیمامی (نَسَائِيّ) بەشی دوەمی حەدیسەکەی ڕیوایەت کردوە، بەڵام من بەخزمەتی ڕیوایەتەکەی ئیمامی نەسائی نەگەیشتوم لە نوسخەی کتێبە چاپکراوەکانی خۆیدا!!!! ئەگەرچی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) لە کتێبەکەی خۆیدا لە ڕێگەی ئەوەوە ڕیوایەتی کردوە.
- بەشی دوەمی حەدیسەکە (واتە: الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ أذْهَبَ عَنِّيْ الْأَذَى وَعَافَانِيْ) بە ڕشتەی صەحیح لە پێغەمبەری خواوە نەهاتوە، بەڵکو وەکو ئیمامی نەوەوی خۆی‌و شێخی (ابْنُ الْمُلَقِّن)یش فەرموویانە: حەدیسێکی (ضَعِيْف)ـە، بەڵام لەبەرئەوەی باسی کردەوە چاکەکانە (فَضَائِلُ الْأعْمَال)، دەکرێت کاری پێ بکرێت. سەرەڕای ئەوەی کە شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: لە حەدیسێکی (حَسَن)دا هاتوە، کە فەرمایشتی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ـە. بڕوانە: خُلاصَةُ الْأحْكَامِ مِنْ مُهِمَّاتِ السُّنَنِ وَقَوَاعِدِ الْإسْلامِ (النَّوَوِيّ) / ١ / ١٧١ – ١٧٢، وتُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ إِلَى أدِلَّةِ الْمِنْهَاجِ (ابْنُ الْمُلَقِّن) / ١ / ١٦٧ – ١٦٨، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ١ / ٢١٦.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٥ / بە ژمارە: ٢٥، والدُّعَاءُ لِلطَّبَرَانِيّ / ١٣٦ / بە ژمارە: ٣٧٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەی ئەم حەدیسە بچڕانیشی تێدایەو،

کەسی لاوازیشی تێدایە، بەڵام لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە پاڵپشت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢١٨ - ٢١٩.

## زیکری کاتی بەردانەوەی ئاو یان هەڵگۆزینی بۆ دەستنوێژ گرتن

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لەکاتی بەردانەوەی ئاودا، یان لەکاتی هەڵگۆزینیدا بۆ دەستنوێژ گردتن بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)، وەکو پێتشر باسمان کرد {کە سونەتە بۆ هەموو کارێك (بِسْمِ اللهِ) بکرێت}.

## زیکری کاتی دەستنوێژ گرتن

سونەتە لە سەرەتای دەستنوێژەوە بڵێت: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ). خۆ ئەگەر تەنها بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)، ئەوە هەر بەسە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر لە سەرەتای دەستنوێژەکەوە (بِسْمِ اللهِ) نەکرد، ئەوا با لە ناوەندەکەیدا بیکات. خۆ ئەگەر نەیکرد، هەتا لێبوویەوە، ئەوە ئیتر جێگەی کردنی نەماوە، بۆیە ناکرێتو، دەستنوێژەکەشی درووستە، ئیتر بە دەستی ئەنقەست وازی لێ هێنابێت، یان بە هەڵە لەبیری چووبێت.

ئەمە مەزهەبی ئێمەیەو، مەزهەبی زۆرینەی زانایانیشە.

جا لەبارەی کردنی (بِسْمِ اللهِ)یەوە چەند حەدیسێکی (ضَعِيْف) هاتوەو، لە ئیمامی (أحْمَد)ی کوڕی (حَنْبَل)یشەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: من ئاگام لەوە نیە، کە سەبارەت بە (بِسْمِ اللهِ) کردن لە کاتی دەستنوێژدا حەدیسێکی سابت هاتبێت.[1]

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەگەر ئیمامی (أحْمَد) لەوبارەوە ئاگای لە حەدیسی سابت نەبێت، ئەوە وای لێوە لازم نایەت، کە حەدیسی سابت لەوبارەوە نەهاتبێت، خۆ ئەگەر بشڵێین: حەدیسی سابتی لەبارەوە نەهاتوە، ئەوا لێیەوە لازم نایەت، کە حەدیسەکان (ضَعِيْف)بن، چونکە دەکرێت مەبەست بە حەدیسی سابت حەدیسی (صَحِيْح) بێت، بەمەش دەگونجێت حەدیسی (حَسَن)ی لەبارەوە هاتبێت، خۆ ئەگەر بڵێین یەکە بەیەکەی

ئەوجا یەکێك لەو حەدیسانەی کە لەبارەی کردنی (بِسْمِ اللهِ)یەوە هاتوە لە کاتی دەستنوێژدا، بریتیە لە حەدیسێکی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لاَ وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ». واتە: "دەستنوێژەکەی (لەڕووی پاداشتەوە) بە تەواو دانانرێت، بۆ ئەو کەسەی لە سەرەتاکەیەوە (بِسْمِ اللهِ) نەکردبێت".

ئیمامی (أَبو دَاوُد)و، غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردوە.(١)

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعِيْد)ی کوڕی (زَيْـد)و، (أَبُوْ سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)و، دایکە (عَائِشَة)و، (سَـهْل)ی کوڕی (سَـعْد)یشەوە بۆ ڕیوایەت کراوە (خوا لە هەموویان لێ ڕازی بێت).

هەموو ڕیوایەتەکانیشمان لە (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)و، لە غەیری ئەویشدا بۆ ڕیوایەت کراوەو، ئیمامی (بَيْهَقِيّ)و غەیری ئەویش بە (ضَعِيْف)یان داناون.(٢)

---

حەدیسەکان (ضَعِيْف)ن، ئەوا لێیەوە لازم نایەت، کە کۆی حەدیسەکان بۆ بەڵگە ناەشێن {واتە: دەکرێت بە هەموویانەوە بەهێز بنو، بۆ پشت پێ بەستن بشێن. سەرەڕای ئەوەش وەکو لە پەراوێزی داهاتووتردا باسی دەکەین، یەکێك لە حەدیسەکان پلەی (حَسَن)ی هەیە}. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٢٩ - ٢٣٠.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٧٣ / بە ژمارە: ١٠١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ١٤٠ / بە ژمارە: ٣٩٩٩٩.

(٢) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕیوایەتەکەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ) حەدیسێکی (حَسَن)ەو، ئیمامی (أَحْمَد)و (تِرْمِذِيّ)و (دَارِمِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (حَاكِم) بە (صَحِيْح)یشی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٢٩ - ٢٣٠. بەمەش حەدیسەکە بۆ پشت پێ بەستنو بەبەڵگەبوون دەشێت.

## زیکری دوای (بِسْمِ اللهِ) کردن لە سەرەتای دەستنوێژ گرتن

زاناو خواناسی پایەبەرز (أَبو الْفَتْحِ نَصْر)ی (مَقْدِسِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان- فەرموویەتی: سونەتە کەسی دەستنوێژگر لەدوای (بِسْمِ اللهِ) کردنەوە، بڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

جا ئەمەی کە ئەو زانا پایەبەرزە فەرموویەتی هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە لە حەدیسدا ئەصڵێکی نیەو، واش نازانین کە هیچکام لە هاوەڵانمانو، لە زانایانی تریش فەرمایشتی لەو جۆرەیان هەبێت. خواش لە هەموو کەس زاناترە.[1]

---

(١) بەڵێ ئەو زیکرە حەدیسی (لاوازی) لەبارەوە هاتوەو، بەر لەو زانا پایەبەرزەش چەند زانایەکی تریش هەمان فەرمایشتیان کردوە.

حەدیسەکە بریتیە لەو حەدیسەی، کە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب) (خوای لێ ڕازی بێت) ڕیوایەتی کردوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێك لەکاتی دەستنوێژ گرتندا (بِسْمِ اللهِ) بکاتو، ئەوجا بۆ هەموو ئەندامەکانیشی بڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، پاشان کە لە دەستنوێژەکەی بوویەوە، بڵێت: (اللَّهُمَّ، اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ)، هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوەو، لە هەرکامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە.

شێخی عەسقەلانی لەبارەی ئەم حەدیسەوە فەرموویەتی: ئەمە ئەگەرچی حەدیسێکی لاوازە، بەڵام دەکرێت وەکو سەرنج لەسەر ئەو فەرمایشتەی ئیمامی نەوەوی بهێنرێت، کە فەرموویەتی: وتنی ئەو زیکرە لەدوای (بِسْمِ اللهِ)یەوە لە حەدیسدا ئەصڵێکی نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ١ / ٢٤٤.

ئیمامی (سُيُوْطِيّ)ش فەرموویەتی: ئیمامی (زَرْكَشِيّ) لە کتێبی (الْخَادِم)دا فەرموویەتی: بەرلە شێخ (نَصْر)ی (مَقْدِسِيّ) مامۆستاکەشی، کە بریتیە لە شێخ (سُلَيْم)ی (رَازِيّ) هەر وای فەرمووەو، بەرلە هەردووکیشیان شێخی (صَيْمَرِيّ)ش هەر وای فەرمووە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأبْرَار بِنُكَتِ الْأذْكَار (تَحْقِيق: مُحْيِي الدِّيْن مُسْتُو) / ٣٧.

# زیکری دوای دەستنوێژ گرتن

با مرۆڤی موسوڵمان لەدوای تەواوبوونی دەستنوێژەکەی بڵێت: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ، اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ، سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ». واتە: (شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای تاکو تەنهای بێ هاوتاو، شایەتیش دەدەم، کە (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە. خوایە بمگێڕە بە یەکێك لە تەوبەکارانو، بە یەکێك لەو کەسانەی خۆیان پاكوخاوێن ڕادەگرن. خوایە پاكوبێگەردیو سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەمو، بە تەوبەو پەشیمانیەوە دێمەوە خزمەتت).

بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ تَوَضَّأَ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ، فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ». واتە: ئەو کەسەی دەستنوێژ بگرێتو، بە شوێنیدا بڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوەو، لە هەرکامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە.

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش ڕیوایەتی کردووەو، ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: «اللَّهُمَّ، اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ».[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٠٩ / ٢٣٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ١ / ٧٨ / بە ژمارە: ٥٥.

ئیمامی (نَسَائِيّ)یش لە کتێبی {عَمَلُ (الْيَوْمِ وَاللَّيْلَــةِ)}داو، زانایانی تریش بە ڕشتەی (ضَعِيْف) ئەم بەشەی زیکرەکەیان ڕیوایەت کردوە: (سُــبْحَانَكَ اللّهُــمَّ وَبِحَمْدِكَ، أشْهَدُ أنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أنْتَ، أسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوْبُ إِلَيْكَ).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (دَارَقُطْنِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت‌و، بەر لەوەی قسە بکات، بڵێت: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، ئەوا لە تاوانی نێوان دوو دەستنوێژی دەبوردرێت.[2] ڕشتەکەی (ضَعِيْف)ـە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (أحْمَــد)ی کوڕی (حَنْبَــل)و، (سُنَن)ی (ابْنُ مَاجَه)و، کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: ئەو کەسەی دەستنوێژێکی باش بگرێت‌و، پاشان سێ جار بڵێت: «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، ئەوا

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَــةِ (النَّسَــائِيّ) / ١٧٣ – ١٧٤ / بە ژمارەکانی: ٨١ – ٨٣، والدُّعَاء لِلطَّبَرَانِيّ / ١٤٠ / ٣٨٨، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٥٢ / بە ژمارە: ٢٠٧٢. سەیرە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: ئەم زیکرە لە حەدیسێکدا هاتوە، کە ڕشتەکەی لاوازە!!! کەچی ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.

هەروەها شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ئەو فەرمایشتەی ئیمامی نەوەوی جێگەی سەرنج‌و تێبینیە. ئەوجا خۆی هاتوە حەدیسەکەی تەخریج کردوەو، لە کۆتاییشدا فەرموویەتی: گومانی تێدا نیە، کە ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٤٤ – ٢٤٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارَقُطْنِيّ / ١ / ٩٢ / بە ژمارە: ٥. بەڵکو ڕشتەکەی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی زۆر لاوازی تێدایە، پێی دەوترێت: (ابْنُ الْبَيْلَمَانِيِّ). بڕوانە: نَتَــائِجُ الْأَفْكَــار / ١ / ٢٤٨.

هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە هەرکامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە.[1] ڕشتەکەی (ضَعِیْف)ـە.

هەروەها سێبارەکردنەوەی «أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ»مان لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بە ڕشتەی (ضَعِیْف) بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست و خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەرو پێشەوای موسوڵمانان ئیمامی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَفَّان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت).[2]

زانای پایەبەرز شێخ (نَصْر)ی (مَقْدِسِيّ) فەرموویەتی: با لەگەڵ ئەم زیکرانەشدا بڵێت: (اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ).

هەروەها با (وَسَلِّم)یشی پێوە بلکێنێت.

هاوەڵانمان فەرموویانە: با ئەو کەسەی دەستنوێژەکەی گرتوە ئەم زیکرانە ڕوو بە قیبلە بکات و، دوابەدوای دەستنوێژەکەش بیانکات.

---

(١) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٢١ / ٣٠٧ / بە ژمارە: ١٣٧٩٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ١٥٩ / بە ژمارە: ٤٦٩، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٩ - ٢٠ / بە ژمارە: ٣٣.

(٢) کە گوایە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِينَ يَفْرَغُ مِنْ وُضُوئِهِ: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ" ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَمْ يَقُمْ حَتَّى تُمْحَى عَنْهُ ذُنُوبُهُ، حَتَّى يَصِيرَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ». بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٧ / بە ژمارە: ٢٩. جا ئەو کەسەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لێوە ڕیوایەت کردوە، تۆمەتی درۆکردنی لەسەرە. بۆیە ئەگەر حەدیسەکە هەڵبەستراویش نەبێت، هەر زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٥٠.

## باسێك: {نزاو پاڕانەوەكانی ئەندامەكانی دەستنوێژ}

هیچ شتێك لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)نەهاتوە، سەبارەت بە كردنی نزاو پاڕانەوە لەسەر ئەندامەكانی دەستنوێژ.

- شەرعزانان فەرموویانە: سونەتە ئەو نزاو پاڕانەوانە بكرێت، كە لە زانایانی (سَلَف)ـەوە هاتون، ئەوانیش زیادو كەمیان تێدا كردوە. جا پوختەی فەرمایشتەكانیان ئەمەیە:
- لەدوای وتنی (بِسْمِ اللهِ)، با بڵێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ جَعَلَ الْمَاءَ طَهُوراً) واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، كە ئاوی بە پاك و پاكەوەكەر درووست كردوە).
- لەكاتی ئاو لە دەم ڕادانیشدا بڵێت: (اللّهُمَّ، اسْقِنِي مِنْ حَوْضِ نَبِيِّكَ كَأْساً لا ظَمَأَ بَعْدَهُ). واتە: (خوایە، لە حەوزەكەی پێغەمبەرەكەت (دروودی خوای لەسەر بێت) پەرداغێك ئاومان بدەیتێ، كە هەتاهەتایە تینوێتی بەشوێندا نەیەت).
- لەكاتی ئاو لە لوت ڕادانیشدا بڵێت: (اللّهُمَّ، لا تَحْرِمْنِيْ رَائِحَةَ جِنَانِكَ وَنَعِيْمِكَ). واتە: (خوایە، لە بۆن و بەرامی بەهەشت و باخاتەكانی خۆت بێبەشم مەكە).
- لەكاتی شۆردنی دەم و دەم و چچاویدا بڵێت: (اللّهُمَّ، بَيِّضْ وَجْهِي يَوْمَ تَبْيَضُّ فِيهِ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ). واتە: (خوایە، دەم و چاوم سپی و نورانی بكە، لەو ڕۆژەدا كە هەندێك لە دەم و چاوەكان دەدرەوشێنەوەو سپی و نورانی دەبن و، هەندێكیشیان ڕەشدادەگیرسێن و تاریك دەبن).
- لەكاتی شۆردنی دەستەكانیدا بڵێت: (اللّهُمَّ، أَعْطِنِي كِتَابِي بِيَمِينِي. اللّهُمَّ، لا تُعْطِنِي كِتَابِي بِشِمَالِي). واتە: (خوایە، كتێبی تۆماری كردەوەكانم بدەرە دەستی ڕاستم. خوایە، كتێبەكەم نەدەیتە دەستی چەپم).
- لەكاتی دەست هێنانی بە سەریدا بڵێت: (اللّهُمَّ، حَرِّمْ شَعْرِي وَبَشَرِي عَلَى النَّارِ، وَأَظِلَّنِي تَحْتَ عَرْشِكَ يَوْمَ لا ظِلَّ إلاّ ظِلُّكَ). واتە: (خوایە، قژو پێستیشم لە

ئاگر حەرام بکەو، بمخەرە ژێر سێبەری عەرشتەوە، لەو ڕۆژەدا، کە بێجگە لە سێبەری تۆ، هیچ سێبەرێکی تر نیە).

- لەکاتی دەست هێنانی بە گوێیەکانیدا بڵێت: (اللّهُمَّ، اجْعَلْنِي مِنْ الَّذِيْنَ يَسْتَمِعُوْنَ الْقَوْلَ، فَيَتَّبِعُوْنَ أَحْسَنَهُ). واتە: (خوایە، بمکە بە یەکێك لەو کەسانەی، کە گوێ لە قسەکان دەگرن‌و، شوێنی چاکترینیان دەکەون).
- لەکاتی شۆردنی قاچەکانیدا بڵێت: (اللّهُمَّ، ثَبِّتْ قَدَمِي عَلَى الصِّرَاطِ). واتە: (خوایە، هەردوو قاچم لەسەر پردی (صِرَاط) ڕاگیرو جێگیر بکە). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

ئیمامی (نَسَائِيّ)و قوتابیەکەشی (کە بریتیە لە شێخی: ابْنُ السُّنِّيّ) لە کتێبەکانیاندا (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة)، بە ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەتیان کردوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئاوی دەستنوێژ گرتنم هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش دەستنوێژی گرت‌و، گوێم لێبوو دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ ذَنْبِيْ، وَوَسِّعْ لِيْ فِي دَارِيْ، وَبَارِكْ لِيْ فِيْ رِزْقِيْ». واتە: "خوایە، لە تاوانم خۆشبەو، ماڵو نشینگەم بۆ گوشادو فراوان بکەو، فەڕو بەرەکەت بخەرە ڕزق‌و ڕۆزیمەوە". منیش عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، گوێم لێ بوو، فلانە دوعات دەکرد. ئەویش فەرمووی: «وَهَلْ تَرَكْنَ مِنْ شَيْءٍ».[1] واتە: "ئایا ئەو سێ نزاو پاڕانەوەیە هیچیان بەجێهێشتوە کە لەخۆیانی نەگرن‌و داگرەوە نەبن بۆی؟".

شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لە بابێکدا هێناوە، بە ناونیشانی (بَابُ مَا يَقُوْلُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ وُضُوْئِهِ). واتە: (باسی ئەوەی دەیڵێت لەکاتی دەستنوێژ گرتندا).

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيّ) / ١٧٢ – ١٧٣ / بە ژمارە: ٨٠، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٦ – ١٧ / بە ژمارە: ٢٨. بەڵام لە هەردووکیاندا (أَبُو مُوْسَى) تەنها ئەوەندەی فەرموە: (هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، ئەویش دەستنوێژی گرت‌و، گوێم لێبوو فەرمووی:......هتد). ئیتر باسی ئەوەی تێدا نیە، کە ئاوی دەستنوێژی بۆ ئامادە کردبێت!

ئیمامی (نَسَائِيّ)ش لـه (بَابُ مَا يَقُوْلُ بَعْدَ فَرَاغِهِ مِنْ وُضُوْئِهِ). واتـه: (باسـی ئـەوەی لەدوای لێبوونەوەی لە دەستنوێژ دەیڵێت). جا هەردوکیشیان دەگونجێن.[1]

## زیکری کاتی خۆشۆردن

هەموو ئەو زیکرانەی لە دەستنوێژدا باسمان کردن، بە (بِسْمِ اللهِ)و ئەوانی تریشەوە، بۆ کەسی خۆشۆریش سونەتن، ئیتر جیاوازی نیە لە نێوان کەسی لەش گرانو، ئافرەت (حَائِض)و، کەسانی تریشدا.

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك لەشی گران بوو، یان ئافرەتێك لە سوڕی مانگانەدا بوو، ئەوا با (بِسْمِ اللهِ) نەکەن.

بۆچوونی مەشهور لەسەر ئەوەیە، کە کردنی (بِسْمِ اللهِ) بۆ ئەمانیش هەر سونەتە، وەکو چۆن بۆ کەسانی تر سونەتە. بەڵام درووست نیە مەبەستیان پێی قورئان بێت.

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئیمامی (طَبَرَانِيّ) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی سێ کەسەوە ڕیوایەت کردووەو، ئەوانیش لە (مُعْتَمِر)ەوە ڕیوایەتیان کردوە. لە ڕیوایەتی حەدیسەکەشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا دەستنوێژی گرتو، پاشان نوێژی کردو، ئەوجا ئەو زیکرەی کرد. بەمەش ناونیشانی باسەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) لەجێگەی خۆیدا نیە، چونکە لەو ڕیوایەتەدا بەڕاشکاوی هاتوە، کە پێغەمبەری خوا لەدوای نوێژەکەوە زیکرەکەی کردوە. دیسان ئەوەش دەردەکەوێت کە زیکرەکە لەنێوان دەستنوێژو نوێژەکەدا نەبوە. هەروەها بەلای شێخی عەسقەلانیەوە ڕشتەی حەدیسەکەش (صَحِيْح) نیە، بەڵکو بچڕانی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٦٣.

## زیکری (تَيَمُّمْ) کردن

سونەتە لە سەرەتاکەیەوە بڵێت: (بِسْمِ اللهِ). خۆ ئەگەر کەسێکی لەش گران بوو، یان ئافرەتێك بوو لە سوڕی مانگانەدا، ئەوا هەر بەو جۆرەیە، کە لە خۆشۆردنەکەیاندا باسمان کرد.

سەبارەت بە وتنی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)و، ئەو زیکرو نزاو پاڕانەوانەش، کە لە باسی دەستنوێژدا باسمان کردن، ئەوە من هیچێکم لەبارەیەوە نەبینیوە، نە لە فەرمایشتی هاوەڵانداو، نە لە فەرمایشتی زانایانی تریشدا. بەڵام وا دەردەکەوێت، کە حوکمی ئەمیش هەر بەو جۆرە بێت، کە لە دەستنوێژدا باسمان کرد. چونکە ئەمیش هەر وەکو دەستنوێژ وەهایەو، ڕێگایەکی پاکبوونەوەیە.

## زیکری کاتی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت

پێشتر باسمان کرد، کە مرۆڤی موسوڵمان کاتێك لە ماڵ دەردەچێت چی زیکرێك دەکات، ئیتر گرنگ نیە بۆ کوێ دەڕوات.

بەڵام ئەگەر بۆ مزگەوت بڕوات، ئەوا سونەتە سەرەڕای ئەو زیکرانەی باسمان کردن، ئەم زیکرەشیان پێوە بلکێنێت، کە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە حەدیسێکی درێژی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)دا (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە سەبارەت بە مانەوەی شەوێکی لە ماڵی پوورە (مَيْمُوْنَة)یدا (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوەو، حەدیسەکەش لەبارەی شەونوێژ کردنی پێغەمبەری خواوەیە (دروودی خوای لەسەر بێت). (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: بانگخوێن بانگی بەیانی داو، پێغەمبەریش تەشریفی برد بۆ نوێژی بەیانیو، بە دەم ڕێگەوە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، وَفِيْ لِسَانِيْ نُوراً، وَاجْعَلْ فِيْ سَمْعِيْ نُوراً، وَاجْعَلْ فِيْ بَصَرِيْ

نُوراً، وَاجْعَلْ مِنْ خَلْفِيْ نُوراً، وَمِنْ أَمَامِيْ نُوراً، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِيْ نُوراً، وَمِـــنْ تَحْتِـــيْ نُوراً؛ اللّهُمَّ، أَعْطِنِيْ نُوراً».[1] واتـه: "خوایـه، نـوورێکی گـەوره بخەیتـه دڵـمـەوه، نوورێکی گەورەش بخەره توانای قسه کردنو زمانمەوه، نـوورێکی گـەورەش بخـەره هێـزی بیسـتنو گوێمـەوه، نـوورێکی گـەورەش بخـەره هێـزی بیـنینو چـاومەوه، نوورێکیش لەپشـتمەوه دابنـێو، نـوورێکیش لـه بەردەمـمـەوه دابنـێو، نـوورێکیش لەسەرمەوه دابنێو، نوورێکیش لەژێرمـەوه دابنـێ. خوایـه نـوورێکی گـەورەم پـێ ببەخشه".

بۆمان ڕیوایەت کراوه لـه کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـه هـاوەڵی خۆشەویست (بلال)ـەوه (خوای لێ ڕازی بێت)، که فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی ببردایه بۆ نوێـژ کـردن، دەیفـەرموو: «بِسْـمِ اللهِ، آمَنْتُ بِاللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ. اللّهُمَّ، بِحَقِّ السَّائِلِيْنَ عَلَيْكَ، وَبِحَقِّ مَخْرَجِيْ هذَا، فَإِنِّيْ لَمْ أَخْرُجْ أَشَراً وَلا بَطَراً وَلاَ رِيَاءً وَلا سُمْعَةً، خَرَجْتُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِكَ، وَاتِّقَاءَ سَخَطِكَ، أَسْأَلُكَ أَنْ تُعِيْذَنِيْ مِنَ النَّارِ، وَأَنْ تُدْخِلَنِيْ الْجَنَّةَ».[2] واته: "بەناوی خواوه، ئیمانم بەخوا هێناوەو، پشتم بەخوا بەستوه، هیچ هێـزو توانایـەکیش نیه بۆ خۆلادان لـه خراپەو، بۆ کردنی چاکه بێجگـه لـه هێـزی لوتـفو پشـتیوانی خوا. خوایه، بۆ خاتری ئەو کەسـانەی داوات لێ دەکـەنو لێـت دەپاڕێنـەوەو، بـۆ خاتری ئەم دەرچوونەی خۆشم، که بۆ شانازی کردنو خۆ هەڵکێشانو ڕووپامایی‌و ناوبانگ دەرکردن دەرنەچووم، بەڵکو به مەبەستی دەستخسـتنی ڕەزامەنـدی تـۆو، خۆپاراستن لـه خەشمو تووڕەیی تۆ دەرچووم. لێـت دەپاڕێمـەوەو داوات لێ دەکـەم پەنام بدەیت لـه ئاگری دۆزەخو، بمخەیته بەهەشتەوه".

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٠ / به ژماره: ٧٦٣.

(٢) بڕوانه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٢ – ٤٣ / به ژماره: ٨٤.

حەدیسێکی (ضَعِیف)ـە. یەکێك لە ڕاویەکانی بریتیە لە (وَازِع)ی کوڕی (نَافِع)ی (عُقَیْلِيّ)، کە زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کەسێکی لاوازەو، کەسێکی (مُنْکَرُ الْحَدِیْث)ـە.

هەروەها حەدیسێکیشمان بە هەمان مانا بۆ ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە ڕێگەی (عَطِیَّة)ی (عَوْفِيّ)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ سَعِیْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).[1] جا (عَطِیَّة)ش دیسان کەسێکی (ضَعِیف)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٣ – ٤٤ / بە ژمارە: ٨٥. عَنْ عَطِیَّةَ الْعَوْفِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِیدٍ الْخُدْرِيِّ –رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ– قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ–: "مَا خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَیْتِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِحَقِّ السَّائِلِینَ عَلَیْكَ، وَبِحَقِّ مَمْشَايَ هَذَا، فَإِنِّي لَمْ أَخْرُجْ أَشَرًا، وَلَا بَطَرًا، وَلَا رِیَاءً، وَلَا سُمْعَةً، خَرَجْتُ اتِّقَاءَ سَخَطِكَ، وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِكَ، أَسْأَلُكَ أَنْ تُنْقِذَنِي مِنَ النَّارِ، وَأَنْ تَغْفِرَ لِيْ ذُنُوبِي، إِنَّهُ لَا یَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ)، إِلَّا وُكِّلَ بِهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ یَسْتَغْفِرُونَ لَهُ، وَأَقْبَلَ اللَّهُ –عَزَّ وَجَلَّ– عَلَیْهِ بِوَجْهِهِ حَتَّى یَقْضِيَ صَلَاتَهُ".

(٢) بەپێی ئەم فەرمایشتەبێت حەدیسەکە بە هەردوو ڕیوایەتەکە لاوازە. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسەکە بە ڕیوایەتی دووەم حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، ئیمامی (أَحْمَد)و (ابْنُ مَاجَه)و (ابْنُ خُزَیْمَة)و (أَبُو نُعَیْم) ڕیوایەتیان کردوەو، سەیریشە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی تەنها ڕیوایەتەکەی (بلال)ی هێناوەو، ڕیوایەتەکەی (أَبُو سَعِیْد)ی نەهێناوە. سەیریشە بەلامەوە کە ڕیوایەتەکەی (أَبُو سَعِیْد)ی تەنها نیسبەت داوەتە پاڵ کتێبەکەی (ابْنُ السُّنِّيّ)و، نیسبەتی نەداوەتە پاڵ کتێبەکەی (ابْنُ مَاجَه)و زانایانی تر!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْکَار / ١ / ٢٦٨ – ٢٦٩. منیش دەڵێم: هەروەها چەند زانایەکی تریش ئەم حەدیسەیان بە (حَسَن) داناوە. لەوانە:

- زانای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (مَقْدِسِيّ)، وەکو شێخی (مُنْذِرِيّ) لە کتێبی (التَّرْغِیْبُ وَالتَّرْهِیْب)دا باسی کردوە. بڕوانە: التَّرْغِیْبُ والتَّرْهِیْب / ٢ / ٣٠٤ – ٣٠٥ / بە ژمارە: ٢٤٨٦.

# زیکری کاتی چوونە ژوورەوە بۆ مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێی

سونەتە لەکاتی چوونە ژوورەوەدا بڵێت: (أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ؛ الْحَمْدُ لِلَّهِ، اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ؛ اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِي ذُنُوبِيْ، وَافْتَحْ لِيْ أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە: (پەنا دەگرم بە خوای گەورەو، بە زاتی میهرەبانیو، بە دەسەڵاتی بێ سەرەتاو بێ کۆتای، لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا. سوپاسو ستایش بۆ خوا. خوایە، ڕەحمەتو سەلامی خۆت بڕژێنە بەسەر پێغەمبەری خواو خزمو کەسوکارەکەیدا. خوایە، لە تاوانەکانم خۆشبەو، دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە).

پاشان بڵێت: (بِسْمِ اللهِ)و، قاچی ڕاستی پێش بخات لە چوونە ژوورەوەیداو، قاچی چەپیشی پێش بخات لە هاتنە دەرەوەیداو، هەموو ئەمانە بڵێتەوە، کە باسمان کرد، بەڵام لە بریتی (أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) بڵێت: (أَبْوَابَ فَضْلِكَ).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو حُمَيْد یان أَبو أُسَيْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- ثُمَّ لْيَقُلْ: اللَّهُمَّ، افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ. وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ». واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە چوە ناو مزگەوتەوە، با سڵاو لە پێغەمبەری

---

- زانای پایەبەرز حافظی عێراقی لە تەخریجی حەدیسەکانی کتێبی (إِحْيَاءُ عُلُوْمِ الدِّيْنِ)دا. بڕوانە: الْمُغْنِيْ عَنْ حَمْلِ الْأَسْفَار / ٢٨٩ / بە ژمارە: ١١٠٠.
- شێخی (بُوْصِيْرِيّ) خۆی ئەم حەدیسەی بە لاواز داناوە، بەڵام فەرموویەتی: شێخی (ابْنُ خُزَيْمَة) لە صەحیحەکەی خۆیدا ڕیوایەتی کردوە، بەمەش حەدیسەکە بەلای ئەوەوە (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: إِتْحَافُ الْخِيْرَةِ الْمَهَرَة / ٢ / ٣٢ / بە ژمارە: ٩٧٩.

خوا بكاتو، پاشان بلێت: (اللّهُمَّ، افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). جا ئەگەر هاتەدەرەوە، با بلێت: (اللّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)".

ئیمامی موسلیم ئەم حەدیسەی لە صەحیحەكەیدا ڕیوایەت كردووە، ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)و (نَسَائِيّ)و غەیری ئەوانیش بە چەند ڕشتەیەكی (صَحِيْح) ڕیوایەتیان كردوە. بەڵام لە ڕیوایەتەكەی ئیمامی موسلیمدا (فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ)ی تێدا نیەو، لە ڕیوایەتی زانایانی تردا تێیدایەتی.[1]

شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) لە ڕیوایەتێكی خۆیدا ئەمەشی بۆ زیاد كردوە: «وَإِذَا خَرَجَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ، أَعِذْنِيْ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ».[2] واتە: "ئەگەر هاتە دەرەوە، با سڵاو لە پێغەمبەری خوا بكاتو، بلێت: (اللَّهُمَّ، أَعِذْنِيْ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ)".

جا ئەم زیادەیە (ابْنُ مَاجَه)ش ڕیوایەتی كردووە، (ابْنُ خُزَيْمَةَ)و (ابْنُ حِبَّان)یش لە صەحیحەكانیاندا ڕیوایەتیان كردوە.[3]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوكیشی ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، كە هەركاتێك تەشریفی ببردایەتە ناو مزگەوتەوە، دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ». جا پێغەمبەری خوا فەرمووی «فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ، قَالَ الشَّيْطَانُ: حُفِظَ مِنِّي

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٩٤ / بە ژمارە: ٧١٣، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ١٨٠ / بە ژمارە: ٤٦٥، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ٥٣ / بە ژمارە: ٧٢٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٥٤ / بە ژمارە: ٧٧٢، ومُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٣٩ / ٢١ / بە ژمارە: ٢٣٦٠٧.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٤ / بە ژمارە: ٨٦.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٥٤ / بە ژمارە: ٧٧٣، وصَحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَة / ١ / ٢٣١ / بە ژمارە: ٤٥٢، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٥ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ٢٠٤٧.

سَائِرَ الْيَوْمِ». واته: "ئەگەر ئەوەی وت، شەیتان دەڵێت: باقی ڕۆژەکە لەمن پارێزراو دەبێت".

حەدیسێکی (حَسَن)ـە، ئیمامی (أَبو دَاوُد) بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد) ڕیوایەتی کردوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەگـەر تەشـریفی ببردایەتـە نـاو مزگەوتـەوە، دەیفـەرموو: «بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ». ئەگەر بشهاتایەتە دەرەوە، دەیفەرموو: «بِسْـمِ اللهِ، اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ».[2]

هەروەها لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە حەدیسـێکمان بـۆ ڕیوایـەت کـراوە دەربـارەی صـەلاواتدان لەسـەر پێغەمبەری خوا لەکاتی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە لە مزگەوت.[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە (عَبْـدُاللهِ)ی کوڕی (حَسَن) {ی کوڕی (حَسَن)ی کـوڕی ئیمـامی (عَلِـيّ)ـەوە}، ئـەویش لـە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ١٨٠ / بە ژمارە: ٤٦٦.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٤٥ / بـە ژمـارە: ٨٨. شـێخی عەسـقەلانی بـە لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٧٨ - ٢٧٩.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٥ - ٤٦ / بە ژمـارە: ٨٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا- قَالَ: عَلَّمَ النَّبِيُّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا- إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَـا، وَافْتَحْ لَنَا أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ». وَإِذَا خَرَجَ صَلَّى عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ- وَيَقُـولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا، وَافْتَحْ لَنَا أَبْوَابَ فَضْلِكَ». شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٧٩.

دایکیەوە {کە بریتیە لە: (فَاطِمَة)ی کچی (حُسَـیْن)ی کـوڕی ئیمـامی (عَلِـيّ)}، ئەویش لە نەنکیەوە {کە بریتیـە لـە: (فَاطِمَـة)ی کچـی پێغەمبـەری خـوا}، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەگەر تەشریفی ببردایەتـە نـاو مزگەوتەوە، سوپاس و ستایشی خوای دەکـردو، (بِسْـمِ اللهِ)دەکـردو، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِي، وَافْتَحْ لِيْ أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ». ئەگەر تەشریفیشـی بهێنایەتـە دەرەوە، بە هەمان شێوە سوپاس و ستایشی خوای دەکردو، (بِسْمِ اللهِ)دەکردو، دەشـیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِي، وَافْتَحْ لِيْ أَبْوَابَ فَضْلِكَ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خـواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویـەتی: «إنّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِـنَ الْمَسْـجِدِ، تَداعَتْ جُنُوْدُ إِبْلِيسَ، وَأَجْلَبَتْ، وَاجْتَمَعتْ كما تَجْتَمِعُ النَّحْلُ عَلَى يَعْسُوبها! فإذَا قَامَ أَحَدُكُمْ عَلَى بَاب الْمَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: "اللّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوذِ بِكَ مِنْ إِبْلِيسَ وَجُنُوْدِهِ"؛ فَإِنَّـهُ إِذَا قَالَهَا لَمْ يَضُرَّهُ».[2] واتە: "ئەگەر یـەکێك لـە ئێـوە ویسـتی لـە مزگـەوت بێتـە دەرەوە، سـەربازەکانی شـەیتان یـەکتر بـانگ دەکـەن و کۆدەبنـەوە، وەکـو چـۆن مێشهەنگ لەدەوری شاهەنگەکەیان کۆدەبنەوە. بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە گەیشتە

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٥ / بـە ژمـارە: ٨٧. ئەگەرچـی ڕشـتەی ئـەم حەدیسە بچڕانی تێدایەو، (فَاطِمَة)ی کچی (حُسَيْن) بە خزمەتی (فَاطِمَة)ی کچی پێغەمبـەری خوا نەگەیشتوە، چونکە (فَاطِمَة)ی کچی پێغەمبەری خوا دوای چـەند مانگێـك لـە وەفـاتی باوکی، ئەویش وەفاتی کردوەو، تەمەنی (حُسَيْن)ی کوڕیشی لـەو کاتـەدا لـەخوار هەشـت ساڵانەوە بوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)و شـێخی عەسـقەلانی بـە حەدیسـێکی (حَسَن)یان داناوە. بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ١٢٨ / بە ژمارە: ٣١٥، وئَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٨٠. هۆکاری ئەم بڕیارەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە حەدیسەکە لە چـەند ڕێگەیـەکی ترەوە پاڵپشت کراوە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٠ / بـە ژمـارە: ١٥٥. شـێخی عەسـقەلانی بـە لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٨٤.

دەرگـای مزگـەوت، بـا بڵێـت: (خوایـە، مـن پـەنات پـێ دەگـرم لـە شـەیتانو سەربازەکانی)، جا کە وای وت، ئیتر زیانی پێ ناگەیەنن".

(یَعْسُوب) بریتیە لە نێرەی مێشهەنگ، وتراویشە: بریتیە لە پاشاکەیان.

## ئەو زیکرانەی لەناو مزگەوتدا دەکرێن

سونەتە لەناو مزگەوتدا زیکری خوای گەورەو تەسـبیحاتو (لا إلـهَ إلاّ اللهُ)و (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (اللهُ أَكْبَرُ)و زیکرەکانی تر زۆر بکرێن.

سونەتیشە زۆر قورئـان بخوێنرێـتو، سونەتیشـە حەدیسـی پێغەمبـەرو، زانسـتی (فِقْه)و، هەموو زانستە شەرعیەکانی تری تێدا بخوێنرێتو بوترێتەوە.

خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ * رِجَالٌ...﴾ [النُّور: ٣٦ – ٣٧]. واتە: {ئەم نورە درەوشاوە لە مزگـەوتو ماڵانێكدایـە، كـە خـوای گـەورە ڕێگـەی داوە لـەڕووی بینـاوە بەرزبکرێنەوەو، لەڕووی ڕێزیشەوە بەرز ڕابگیرێنو، نـاوی خوایـان تێـدا ببرێـتو، بەیانیانو ئێواران پیاوانێك تەسبیحاتی خوای لەناودا بکەن}.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُـوبِ﴾ [الْحَـجّ: ٣٢]. واتە: {ئەو کەسەی شیعارو بڕیارەکانی خوای گەورە بەرزڕابگرێت، نیشـانەی ئەوەیە دڵی ترسی خوای تێدایە}.

هەروەها فەرموویـەتی: ﴿وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّـهِ﴾ [الْحَـجّ: ٣٠]. واتە: {ئەو کەسەی بەچاوی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای سنووری بڕیارەکـانی خوا بکات، ئەوە بـەلای خـوای پـەروەردگارەوە بەباشـترین هەڵوێسـت دادەنرێـت بۆی}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ». واتە: "مزگەوتەکان تەنها بۆ زیکری خواو نوێژ کردنو قورئان خوێندنو بڵاو کردنەوەی زانستو شتی لەو جۆرە دروستکراون". ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنس)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەو عەرەبە دەشتەکیەی فەرموو، کە لە مزگەوتدا میزی کرد: «إِنَّ هٰذِهِ الْمَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ، وَلاَ الْقَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللهِ -عَزَّ وَجَلَّ-، وَالصَّلاَةِ، وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ» (أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-). واتە: "ئەم مزگەوتانە بۆ هیچێك لەم میزو پیسیە دەست نادەنو ناگونجێن، بەڵکو تەنها بۆ زیکری خوای گەورەو، بۆ نوێژ کردنو، بۆ خوێندنی قورئان دروستکراون".

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.[2]

## باسێك: سەبارەت بە نیەتی مانەوە لە ناو مزگەوتدا

ئەو کەسەی دەیەوێت لە مزگەوتدا دابنیشێت، سونەتە نیەتی (اعْتِكَاف)و مانەوە بهێنێت. چونکە بەلای ئیمەوە (اعْتِكَاف) دروستە، باوەکو بۆ تەنها ساتێکیش لە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٩٧ / ٥٦٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٣٦ / بە ژمارە: ٢٨٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (أَبو مُوْسَى)ی (مَدِيْنِيّ) فەرموویەتی: ئەو عەرەبە دەشتەکیە پێی وتراوە (ذُو الْخُوَيْصِرَة)ی (يَمَانِيّ)، ئەمەش جیاوازە لە (ذُو الْخُوَيْصِرَة)ی (تَمِيْمِـيّ)، کە یەکێکە لە سەرکردەی (خَوَارِج)ـەکان. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٨٩.

مزگەوتدا بمێنێتەوە. بەڵکو یەکێك لە هاوەڵانمان فەرموویەتی: (اعْتِکَـاف)ی ئـەو کەسەش هەر دروستە، کە بە مزگەوتدا تێدەپەڕێت‌و، تێیدا نامێنێتەوە. بۆیە سونەتە بۆ ئەو کەسەش، کە بە مزگەوتدا تێدەپەڕێت، نیەتی (اعْتِکَاف) بهێنێـت، تـاوەکو – لەسەر فەرمایشتی ئەو زانایە– فەزڵو خەیری (اعْتِکَاف) دەست بکەوێت. جـا لـەم حاڵەتەدا باشتر وەهایە بۆ ساتێکی کەمیش بێت لە مزگەوتەکەدا بوەستێت‌و، ئـەوجا بڕوات.

سونەتیشە بۆ ئەو کەسەی لە مزگەوتدا دانشتوە، کە هەر فەرمان بە چـاکەیەکی بۆ هاتەپێش بیکات‌و، هەر نەهی لـە خراپەیەکیشـی بـۆ هاتـەپێش بیکـات. ئەمـەش ئەگەرچی مرۆڤی موسوڵمان لە دەرەوەی مزگەوتیشدا فـەرمانی پـێ کـراوە، بـەڵام ئەوەندە هەیە، کە لە مزگەوتدا زیاتر دەبێت بیانکات، ئـەویش لـە پێنـاو پاراسـتن‌و بەگەورە دانان‌و حورمەت‌و ڕێزی مزگەوتەکە.

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەو کەسەی بچێتە ناو مزگەوتەوەو، بـەهۆی بێ دەستنوێژیەوە، یان بەهۆی مەشغوڵیەوە، یان بە هەر هۆکارێکی تری لەم جۆرەوە نەتوانێت نوێژی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِد)ی تێـدا بکـات، سـونەتە چـوار (٤) جـار بڵێـت: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ). چـونکە یـەکێك لـە زانایـانی (سَلَف) فەرمایشتێکی لەم جۆرەی هەیەو، فەرمایشتەکەشی خراپەیەکی تێدا نیە.[1]

---

(١) ڕەنگە ئەو زانایەی ئیمامی نەوەوی فەرمایشتەکەی هێناوە بریتی بێت لە ئیمـامی (غَزَالِـيّ)، چونکە ئەو لە کتێبی (إحْيَاء)دا وای فەرموە، ئەگەرچی لـە ڕیـزی زانایـانی (سَـلَف)یشـدا حسێب ناکرێت، چونکە لە کۆتایی سەدەی چوارەم‌و سەرەتای سـەدەی پێنجـەمی کۆچیدا ژیاوە!!! بەڵام دەکرێت ئێمە بۆ پشتگیری کردن لەم فەرمایشتە بڵێین:

- لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا هـاتوە، کـە کردنـی ئـەو زیکـرە –بـەبێ ژمارەیـەکی دیاریکراو– لەناو مزگەوتـدا سـونەتە. وەکـو هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو هُرَيْـرَة) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ئەگەر بەلای باخچەکانی بەهەشـتدا تێپـەڕین، لادەن‌و خۆتـانی لێ تێر کـەن) منـیش عـەرزم کـرد: (قوربـان، باخچـەکانی بەهەشـت

## ئینکاری کردن و دوعا کردن لەو کەسەی، کە لەناو مزگەوتدا بانگەواز دەکات بۆ دۆزینەوەی شتێکی ونبوو، یان کڕین و فرۆشتن دەکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: "لاَ رَدَّهَا اللهُ عَلَيْكَ"، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا».[1] واتە: "ئەو کەسەی گوێی لێبوو پیاوێك لە مزگەوتدا بانگەوازی دەکرد بۆ دۆزینەوەی شتێکی ونبوو، با بڵێت: (خوا بۆتی نەگەڕێنێتەوە)، چونکە مزگەوت بۆ ئەمە درووست نەکراوە".

هەروەها بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێك بانگەوازی دەکرد لە مزگەوتداو، دەیوت: "کێ حوشترە سورەکەی منی دۆزیەوە، با ئاگادارم بکاتەوە؟"

---

کامانەن؟) ئەویش فەرمووی: (مزگەوتەکانن). منیش عەرزم کرد: (ئەی لادان و خۆ تێر کردن چۆن دەبێت؟) ئەویش فەرمووی: بەوە دەبێت بڵێیت: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ). ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (غَرِيْب)ـەو، ئیمامی (مُنْذِرِيّ)ش فەرموویەتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٢ / بە ژمارە: ٣٥٠٩، والتَّرْغِيْبُ وَالتَّرْهِيْب / ٢ / ٢٨٤ / بە ژمارە: ٢٤١٧.

- هەروەها زانای پایەبەرزەی شوێنکەوتوان (جَابِر)ی کوڕی (زَيْد)یش فەرموویەتی: ئەگەر چوویتە ناو مزگەوتەوە، نوێژی تێدا بکە. خۆ ئەگەر نوێژت تێدا نەکرد، زیکری خوای تێدا بکە، وەکو ئەوە وەهایە، کە نوێژت تێدا کردبێت. بڕوانە: شَرْحُ صَحِيْحِ الْبُخَارِيّ لِابْنِ بَطَّال (تَحْقِيْق: أَبُو تَمِيْم يَاسِرُ بْنُ إِبْرَاهِيْم) / ٢ / ٩٤، والاسْتِذْكَار الْجَامِعُ لِمَذَاهِبِ فُقَهَاءِ الْأَمْصَار (ابْنُ عَبْدِ الْبَرّ) / ٢ / ٣٠٥، ومِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْحِ / ٢ / ٥٩٧.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٩٧ / بە ژمارە: ٥٦٨.

پێغەمبەری خوایش (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «لاَ وَجَدْتَ، إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ». [1] واتە: "دەك نەیدۆزیتەوە، چونکە مزگەوتەکان بۆ زیکرو نوێژ کردنو قورئان خوێندنو خواپەرستیو دینداری درووست کراون".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کۆتایی (كِتَابُ الْبُيُوْعِ)ی کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقُولُوا: "لا أَرْبَحَ اللهُ تِجَارَتَكَ!" وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً، فَقُولُوا: "لا رَدَّ اللهُ عَلَيْكَ"». واتە: "ئەگەر کەسێکتان بینی لە مزگەوتدا شتی دەفرۆشت، یان شت دەکڕی، پێی بڵێن: (خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەتەوە). ئەگەر کەسێکیشتان بینی، بانگەوازی دەکرد بۆ دۆزینەوەی شتێکی ونبوو، پێی بڵێن: (خوا بۆتی نەگەڕێنێتەوە)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. [2]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٩٧ / بە ژمارە: ٥٦٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٦١٠ / بە ژمارە: ١٣٢١.

# دوعا کردن لەو کەسەی، لە مزگەوتدا شیعرێك دەڵێت، کە نە ستایشی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی تێدایەو، نە باسی دنیانەویستیو، نە باسی هەڵنان لەسەر ڕەوشتە بەرزەکانو، نە شتی لەو جۆرە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ثَوْبَان)ـەوە[1] (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ رَأَيْتُمُوهُ يَنْشُدُ شِعْراً فِي الْمَسْجِدِ، فَقُولُـوا لَهُ: "فَضَّ اللهُ فَاكَ!" ثَلاثَ مَرَّاتٍ».[2] واتـە: "هـەر کەسـێکتان بینـی لـە مزگەوتـدا شیعری دەوت، سێ جار پێی بڵێن: (خوا دەمو ددانت بشکێنێت)".

---

(١) ئەم (ثَوْبَان)ـە پێـی دەوترێـت (ثَوْبَـان)ی (أَنْصَـارِيّ)یو، بـاپیرەی (مُحَمَّـد)ی کـوڕی (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (ثَوْبَان)ـەو، جیاوازە لەو (ثَوْبَان)ـە بەناوبانگـەی، کـە خزمـەتکارو کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا بوەو، پێی دەوترێـت (ثَوْبَان مَوْلَى رَسُوْلِ الله). بڕوانـە: الْإِصَابَة فِيْ تَمْيِيْزِ الصَّحَابَة / ١ / ٥٢٧ – ٥٢٨ / بە هەردوو ژمارە: ٩٦٩ – ٩٧٠.

بەڵام من زۆر سەیرە بەلامەوە، کە شێخی (ابْنُ عَلاّن) فەرموویەتی: ئەم (ثَوْبَان)ـە بریتیـە لە خزمەتکارو کۆیلە ئازادکراوەکەی پێغەمبەری خوا!!! چونکە ئەو لە کتێبەکـەی خۆیـدا زۆر پشتی بە فەرمایشتی شـێخی عەسـقەلانی بەسـتوەو، شـێخی عەسـقەلانیش بەڕاشـکاوی فەرموویەتی: ئەم (ثَوْبَان)ـە خزمەتکارەکەی پێغەمبـەری خوا نیە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٩٧، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ٦٩.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٨٧ – ٨٨ / بـە ژمـارە: ١٥٣. لەڕاسـتیدا ئـەم حەدیسە بۆ بەڵگەی ئەم باسە ناشێت، چونکە زۆر لاوازەو، باسـەکەش جـۆرە تەفصـیلێکی دەوێت:

- لـە چەندین حەدیسی صەحیحدا هاتوە، کە هاوەڵی خۆشەویسـت (حَسَّـان)ی کـوڕی (ثَابِت) لـە مزگەوتدا شیعری فەرموە.
- لـە حەدیسی (حَسَن)یشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا نەهی کردوە لـە وتنـی شـیعر لـە مزگەوتدا.

جا زانایان بۆ یەکخستنەوەی ئەم حەدیسانە چەند فەرمایشتێکیان هەیە:

## باسی فەزڵو گەورەیی (بانگ)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ، لَاسْتَهَمُوا».

واتە: "ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە چی پاداشتو خەیرێك لە بانگدانو لە ڕیزی یەکەمی نوێژدا هەیەو، هیچ چارەیەکیشیان نەبوو بێجگە لەوەی تیرو پشکیان لەسەر بکەن، ئەوا تیرو پشکیان لەسەر دەکردن".

ئیمامی بوخاریو موسلیم لە هەردوو صەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردوە.(١)

---

- هەندێکیان فەرموویانە: نەهی کردنەکەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەیە، کە ناپەسەندەو باش نیە لە مزگەوتدا شیعر بوترێتو، ڕێگەپێدانەکەشی بۆ ئەوەیە، کە بزانرێت ئەو کارە کارێکی درووستە.
- هەندێکیشیان فەرموویانە: نەهیەکەی پێغەمبەری خوا لەو جۆرە شیعرانەیە، کە قسەی خراپو ناشیرینو زیانبەخشیان تێدایە بۆ موسوڵمانانو، ڕێگەپێدانەکەشی بۆ ئەو شیعرانەیە، کە وەسفو ستایشی پێغەمبەری خوا یان شتێکی لەو جۆرەی تێدایە. بێجگە لەمانەش ئەگەر کەسێك کردبووی بە عادەتو، بەزۆری لە مزگەوتدا شیعری دەوت، ئەوە هەر بەری نەهیەکە دەکەوێت، ئەگەر هەر جارجارێك بوو، ئەوە درووستەو هیچ خراپەیەکی تێدا نیە. بڕوانە: الْمَجْمُوْع شَرْحُ الْمُهَذَّب / ٢ / ١٧٧، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٢٩٧ – ٣٠١، ومِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْحِ / ٢ / ٦١٥.

منیش دەڵێم: شیعر هەر وەکو قسەی عادەتی وەهایە، چاکی هەیەو، خراپیشی هەیە. جا وەکو چۆن نابێت لە مزگەوتدا قسەی خراپ بکرێت، هەروا نابێت شیعری خراپیشی تێدا بوترێت. بەڵام ئەگەر شیعرەکە باش بوو لەڕووی واتاو ناوەڕۆکو مەبەستەوە، ئەوە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ١ / ٢٢٢ / بە ژمارە: ٥٩٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٢٥ / بە ژمارە: ٤٣٧.

له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَبُـو هُرَيْـرَةَ)شـه‌وه هـاتوه (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـه پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویـه‌تی: «إِذَا نُـودِيَ لِلصَّـلاةِ أَدْبَـرَ الشَّيْطَانُ، وَلَهُ ضُرَاطٌ، حَتَّى لا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ». واته: "ئه‌گه‌ر بانگدرا بۆ نوێژ، شه‌یتان پشت هه‌ڵده‌کات‌و، تڕ لێده‌دات، بۆ ئه‌وه‌ی گوێی له بانگه‌که نه‌بێت".

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم ڕیوایه‌تیان کردوه.(١)

له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (مُعَاوِيَةَ)شه‌وه هاتوه(خوای لێ ڕازی بێت)، که فه‌رموویه‌تی: له پێغه‌مبه‌ری خوام بیستوه (دروودی خوای له‌سه‌ر بێـت)، که فه‌رموویـه‌تی: «الْمُؤَذِّنُـونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقاً يَوْمَ الْقِيَامَـةِ». واتـه: "لـه ڕۆژی قیامه‌تـدا بانگخوێنـه‌کان مـل‌و گه‌ردنیان لـه هه‌موو که‌س به‌رزتره".

ئیمامی موسلیم ڕیوایه‌تی کردوه.(٢)

له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)شه‌وه هـاتوه (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـه فه‌رموویـه‌تی: لـه پێغه‌مبـه‌ری خـوام بیسـتوه (دروودی خـوای له‌سـه‌ر بێـت)، کـه فه‌رموویـه‌تی: «لا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلا إِنْسٌ وَلا شَيْءٌ، إِلاّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ». واته: "ئه‌وه‌ی گوێی له ده‌نگی بانگخوێن ده‌بێت، ئـیتر جنۆکـه بێـت یـان ئاده‌میزاد یان هه‌ر شتێکی تر، له ڕۆژی قیامه‌تدا شایه‌تی بۆ ده‌دات".

ئیمامی بوخاری ڕیوایه‌تی کردوه.(٣)

حه‌دیسه‌کانیش له‌باره‌ی فه‌زڵ‌و گه‌وره‌یی بانگه‌وه زۆرن.

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٢٠ / به ژماره: ٥٨٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩١ / بـه ژماره: ٣٨٩.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩٠ / به ژماره: ٣٨٧.

(٣) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٢١ / به ژماره: ٥٨٤.

هاوەڵانیشمان چوار بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە بانگدانو پێشنوێژی کردن، ئایا کامیان گەورەترو باشترن؟:

- ڕاسترینیان ئەوەیە، کە بانگدان گەورەترە.
- دوەمیش ئەوەیە، کە پێشنوێژی کردن گەورەترە.
- سێیەمیش ئەوەیە، کە هەردووکیان یەکسانن.
- چوارەمیش ئەوەیە، ئەگەر کەسەکە لەخۆی ڕادەبینی بە ئەرکەکانی پێشنوێژی کردن هەڵبسێتو، تەواوی سیفاتو تایبەتمەندیەکانیشی تێدابوو، ئەوە پێشنوێژی کردن باشترە، ئەگینا بانگدان باشترە.

## باسی شێوازی بانگدان

بزانە، کە وشەکانی بانگ مەشهورو زانراونو، بەلای ئێمەوە (تَرْجِيْع)یش سونەتە.

(تَرْجِيْع) ئەوەیە: ئەگەر بە دەنگی بەرز وتی: (اللهُ أكْبَرُ، اللهُ أكْبَرُ، اللهُ أكْبَرُ، اللهُ أكْبَرُ)، دواتر بە دەنگی نزم بڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ)، بە جۆرێك کە دەنگەکەی بگاتە گوێی خۆیو، کەسانی نزیکیش، ئەوجا بە دەنگی بەرز بڵێت: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ).

هەروەها بەلای ئێمەوە (تَثْوِيْب)یش سونەتە. ئەویش ئەوەیە: کە بانگخوێنەکە لە بانگی بەیانیدا لەدوای وتنی (حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ)ەوە دوو جار بڵێت: (الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ).

جا سەبارەت بە (تَرْجِيْع)و (تَثْوِيْب)یش چەند حەدیسێکی مەشهوور هاتون.[1]

بشزانە ئەگەر بانگخوێن (تَرْجِيْع)و (تَثْوِيْب)ی نەکرد، بانگەکەی هەر درووستە، بەڵام وازی لە کارێك هێناوە، کە باشتر وابوو بیکات.

بانگدانی منداڵی نەفامو، ئافرەتو، کافریش درووست نیە. بەڵام بانگدانی منالّی فامدار درووستە.

جا ئەگەر کەسێکی کافر بانگی داو، شایەتومانەکەی بەدەم هێنا، ئەوە بەلای بۆچوونی درووستەوە بە موسوڵمان دادەنرێت. بەڵام هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: بە موسوڵمان دانانرێت. ناکۆکیش لەوەدا نیە، کە بانگەکەی درووست نیە، چونکە سەرەتای بانگەکە لەپێش ئەوەوە بوە، کە حوکمی موسوڵمانبوونی بۆ بدرێت.

---

(١) ئیمامی نەوەوی لە کتێبی (الْمَجْمُوْع)دا فەرموویەتی:

- سەبارەت بەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویت (أَبُو مَحْذُوْرَة)، کە دەربارەی (تَرْجِيْع) هاتوە، ئەوە حەدیسێکی (صَحِيْح)ـەو، ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمدا تەنها دوو جار لە سەرەتای بانگەکەوە (اللهُ أَكْبَرُ)ی تێدایە. لە ڕیوایەتی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و غەیری ئەوانیشدا چوار جار (اللهُ أَكْبَرُ)ی تێدایەو، ڕشتەکەشی (صَحِيْح)ـەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.
- سەبارەت بەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویت (أَبُو مَحْذُوْرَة)، کە دەربارەی (تَثْوِيْب) هاتوە، ئەوە ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و غەیری ئەویش بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد) ڕیوایەتیان کردوە. هەروەها لە هاوەڵی خۆشەویت (أَنَس)یشەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: سوننەت وەهایە ئەگەر بانگخوێن لە بانگی بەیانیدا وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ)، ئیتر بڵێت: (الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ). ئیمامی (ابْنُ خُزَيْمَة) لە صەحیحەکەیداو ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ)و (بَيْهَقِيّ)ش ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (بَيْهَقِيّ) فەرمووشێتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْمَجْمُوْع شَرْحُ الْمُهَذَّب / ٣ / ٩٠ – ٩١.

جا هەر لەم باسەدا چەندین لقەباسی تریش هەن، کە لە کتێبە فیقهیەکاندا باس کراون‌و، ئێرە جێگەی هێنانیان نیە.

## باسی شێوازی قامەت کردن

مەزهەبی درووست‌و هەڵبژێردراو،قامەت کردن کە چەند حەدیسێکی (صَحِیْح)ی لەبارەوە هاتوە، ئەوەیە، کە قامەت یانزە ڕستەیە:

١. اللهُ أَكْبَرُ.
٢. اللهُ أَكْبَرُ.
٣. أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ.
٤. أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ.
٥. حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ.
٦. حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ.
٧. قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ.
٨. قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ.
٩. اللهُ أَكْبَرُ.
١٠. اللهُ أَكْبَرُ.
١١. لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ.

# چەند باسێك لەسەر هەندێك بڕیاری شەرعی لەبارەی بانگدان و قامەت کردنەوە

## باسی یەکەم: حوکمی شەرع لەبارەی بانگدان و قامەت کردنەوە

بزانە، کە بەلای ئێمەوە، لەسەر مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراو بانگدانو قامەت کردن هەردووکیان سونەتن، ئیتر بانگی جومعە بێت، یان بانگی ڕۆژێکی تر.

هەندێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: هەردووکیان (فَرْض)ی (کِفَایَة)ن.

هەندێکیشیان فەرموویانە: هەردووکیان تەنها لە ڕۆژی جومعەدا (فَرْض)ی (کِفَایَة)ن، نەك لە ڕۆژەکانی تردا.

جا ئەگەر بڵێین: (فَرْض)ی (کِفَایَة)ن، ئیتر ئەگەر خەڵکی شارێك یان گەڕەکێك وازیان لێ هێنانو نەیان کردن، (لەلایەن دەسەڵاتەوە) شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت. خۆ ئەگەر بڵێین: سونەتن، ئیتر شەڕیان لەگەڵدا ناکرێت، لەسەر مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراو، وەکو چۆن لەسەر سونەتی نوێژی نیوەڕۆو سونەتەکانی تردا شەڕیان لەگەڵدا ناکرێت.

هەندێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: لەم حاڵەتەشدا هەر شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت. چونکە هەردووکیان نیشانەو دروشمی دیارو ئاشکرای ئاینەکەمانن.

## باسی دوەم: هەندێك ئادابی بانگدان و قامەت كردن

سونەتە بانگ بە لەسەرخۆیی و بە دەنگی بەرز بخوێنرێت و، قامەتیش بە خێرایی و بە دەنگێکی نزمتر لە بانگ بخوێنرێت.

سونەتیشە بانگخوێن کەسێکی دەنگخۆشی متمانەداری ئەمینی شارەزا بە کاتی خۆبەخش بێت.

سونەتیشە بە ڕاوەستانەوەو، بە دەستنوێژەوەو، لە جێگەیەکی بەرزداو، ڕوو بە قیبلە بانگ بدات و قامەتیش بکات. خۆ ئەگەر پشتی کردبوە قیبلە، یان دانیشتبوو، یان ڕاکشابوو، یان بێ دەستنوێژ بوو، یان لەش گران بوو، ئەوا بانگەکەی دروستە، بەڵام ناپەسەندەو، ناپەسەندیەکەش بۆ کەسی لەش گران توند ترە وەك لە کەسی بێ دەستنوێژو، ناپەسەندی قامەت کردنیش توند ترە لە ناپەسەندی بانگدان.

## باسی سێیەم: بانگدان تەنها بۆ نوێژە فەرزەکانە

بانگدان تەنها بۆ پێنج نوێژە فەرزەکەی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسرو مەغریب و عیشایە، ئیتر نوێژی حازر، یان لەدەستچوو، لە ماڵدا بێت، یان لە سەفەردا، خۆی بە تەنها نوێژ بکات، یان بە جەماعەت.

جا ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یەکێکیان بانگی دا، ئیتر بۆ ئەوانی تر بەسە.

ئەگەر کەسێکیش چەند نوێژێکی لەدەستچووی لە یەك کاتدا دەگێڕایەوە، ئەوا با تەنها بۆ نوێژی یەکەمیان بانگ بدات. بەڵام قامەت بۆ هەموویان بکات. ئەگەر دوو نوێژیشی بەیەکەوە کۆکردەوە، ئەوا با تەنها بۆ یەکەمەکەیان بانگ بدات و، بۆ هەردووکیشیان قامەت بکات.

سەبارەت بە نوێژەکانی تریش -واتە: بێجگە لە نوێژە فەرزەکان- ناکۆکی لەوەدا نیە، کە هیچکامیان بانگیان بۆ نادرێت.

پاشان هەندێك لەم نوێژانە -وەکو نوێژی جەژنەکانو، نوێژی خۆر گیرانو مانگ گیرانو، نوێژە بارانە- ئەگەر بە جەماعەت کران، سونەتە بوترێت: (الصَّلاةُ جَامِعَةٌ). هەندێکیشیان -وەکو سونەتەکانی نوێژە فەرزەکانو، سونەتە ڕەهاکان- سونەت نیە ئەوەیان بۆ بوترێت. هەندێکیشیان -وەکو نوێژی تەراویحو، نوێژی جەنازە- ناکۆکیان لەسەرە، جا ڕاسترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، کە (الصَّلاةُ جَامِعَةٌ) بۆ نوێژی تەراویح دەوترێتو، بۆ نوێژی جەنازە ناوترێت.

## باسی چوارەم: کاتی بانگدانو قامەت کردن

قامەت کردن تەنها لە کاتی خۆیدا درووستە، کە دەویسترێت دەست بکرێت بە نوێژ.

بانگدانیش تەنها لەکاتی هاتنی نوێژەکەدا درووستە، تەنها نوێژی بەیانی نەبێت، کە درووستە بەر لە هاتنی کاتەکەی بانگ بدرێت.

جا زانایان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بەو کاتەی، کە درووستە بانگی بەیانی تێدا بدرێت:

- ڕاسترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، کە: لەدوای نیوەی شەوەوە درووستە.
- وتراویشە: لە کاتی بەرەبەیاندا درووستە.
- وتراویشە: لە تەواوی شەودا درووستە، کە ئەم بۆچوونەیان هیچ نیە.
- وتراویشە: دوای تێپەڕینی دووسێیەکی شەو درووستە.

بەڵام بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەی یەکەمیانە.

## باسی پێنجەم: بانگدان و قامەت کردنی ئافرەت و کەسی نێرەمووك

ئافرەت و کەسی نێرەمووکی سەرلێدەرنەچوو[1] بۆیان هەیە قامەت بکەن. بەلاّم بۆیان نیە بانگ بدەن. چونکە نەهیان لێ کراوە دەنگ بەرز بکەنەوە.

## ئەوەی لەکاتی بیستنی بانگ و قامەتدا دەوترێت

سونەتە ئەو کەسەی گوێی لە بانگخوێن و قامەتکەر دەبێت، ئەوەی ئەوان دەیلێن، ئەویش بیلێتەوە، تەنها ئەوە نەبێت، کە ئەوان دەڵێن: (حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ). سونەتە کەسی بیسەر لەدوای هەریەکە لەم دوو ڕستەوە بلێت: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ).

هەروەها لەدوای (الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ)یشەوە سونەتە بلێت: (صَدَقْتَ وَبَرَرْتَ). وتراویشە: سونەتە بلێت: (صَدَقَ رَسُوْلُ اللهِ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ).[1]

---

(١) نێرەمووك دوو جۆری هەیە:

- یەکەمیان، کەمەشهورترینیانە: ئەوەیە کە ئەندامی زاوزێی نێرینەو مێینەشی هەیە.
- دوەمیشیان ئەوەیە کە تەنها کونێکی هەیە، لە ئەندامی زاوزێی هیچکامیان ناچێت و، لەوێوە میز دەکات. جا ئەمەی دوەمیان پێی دەوترێت: نێرەمووکی سەرلێدەرنەچوو.

بڕوانە: الْمَجْمُوْع شَرْحُ الْمُهَذَّب / ٢ / ٤٦ - ٤٧.

هەروەها لەدوای وتنی هەردوو ڕستەی (قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاةُ)یشەوە سونەتە بڵێت: (أَقَامَهَا اللهُ وَأَدَامَهَا).[2]

هەروەها دوای ئەوەی کەسی بانگدەر وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ)، سونەتە ئەویش بڵێت: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ). پاشان بڵێت: (رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيْناً).

جا ئەگەر بەشوێن بانگخوێنەکەدا هەموو ڕستەکانی بانگەکەی وتەوە، ئیتر با صەلاتو سەلام بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پاشان بڵێت: (اللَّهُمَّ، رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِيْ وَعَدْتَهُ). واتە: (خوایە، ئەی پەروەردگاری ئەم دەعوەتو بانگەشە تێرو تەواوەو، ئەم نوێژە پایەدارە دابەستراوە، هەردوو پایەی بەرزی (وَسِيلَة)و (فَضِيلَة) ببەخشە بە حەزرەتی (مُحَمَّد)و، بیگەیەنەرە ئەو بارەگاو جێگە پەسەندو بەرێزەی کە خۆت بەڵێنت پێداوە).

پاشان چی شتێکی دنیا یان دوارۆژی دەوێت، با بۆی بپاڕێتەوەو داوای بکات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ». واتە: "ئەگەر گوێتان لە بانگەوە بوو، بانگخوێنەکە چی وت ئێوەش وەکو ئەو بیڵێنەوە".

ئیمامی بوخاریو موسلیم لە هەردوو صەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردوە.[1]

---

(١) ئەم دوو زیکرە ئەگەرچی لەڕووی ماناوە تەواون، بەڵام هیچکامیان لە حەدیسدا نەهاتوون. بڕوانە: كَشْفُ الْخَفَاءِ وَمُزِيْلُ الْإِلْبَاسِ عَمَّا اشْتَهَرَ مِنَ الْأَحَادِيْثِ عَلَى أَلْسِنَةِ النَّاس (إِسْمَاعِيل الْعَجْلُوْنِيّ) / ٢ / ٢٣ - ٢٤ / بە ژمارە: ١٥٩٢.

(٢) ئەم زیکرە لە حەدیسێکی لاوازدا هاتوە، وەکو دواتر ئیمامی نەوەوی دەیهێنێت.

**لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّە)ی کوڕی (عَمْرو)ی کـوڕی (عَــاص)یشـەوە هاتوە** (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، **کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بـوە** (دروودی خـوای لەسەر بێت)، **کە دەیفـەرموو:** «إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَـا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ، لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ»**. واتە: "ئەگەر گوێتان لە بانگخوێنــەوە بـوو، ئـەو چـی دەڵێت ئێوەش بیڵێنەوە، پاشان صەلاوات لەسەر من بدەن[2]، چونکە ئـەو کەسـەی صەلاواتێك لەسەر من بدات، خوای گـەورە بـەو صـەلاواتە دە ڕەحمـەتی بەسـەردا دەبارێنێت. ئەوجا داوای پایەی بەرزی (وَسِيلَة)م لە خوای گـەورە بـۆ بکـەن، کـە ئەویش پایەو جێگەیەکە لە بەهەشتدا، تەنها بۆ بەندەیەك لە بەندەکانی خوا دانراوە،**

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٢١ / بە ژمارە: ٥٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٨ / بـە ژمارە: ٣٨٣.

(٢) ئەم حەدیسە بەڵگەی ڕاشکاوانەو حاشاهەڵنەگرە لەسەر ئەوەی، کە صەلاواتدان لـەدوای بانگ سونەتە. جا ئایا بە دەنگی بـەرز بـدرێت یـان نـا، ئـەوە قسـەیەکی تـرە. خـۆ ئەگـەر موسوڵمانان بە تێکڕا کار بەم فەرمایشتە بکەن، ئەوا ئەگەر بە دەنگی بەرزیش نەدرێت هـەر دەبێت. بەڵام ئەگەر زۆربەیان ئاگایان لێی نەبوو، یان لەبیریان نەبوو، ئەوا گومانی تێدا نیـە، کە بۆ ئاگادار کردنەوەیانو بەبیرهێنانەوەیان بـە دەنگـی بـەرز بکرێـت باشـترە، وەکـو لـە زۆربەی مزگەوتەکانی وڵاتی خۆماندا دەکرێت.

ئەمەش شتێك نیە، کە مامۆستایانو زانایانی ئاینی کوردستانی خۆمان دایانهێنابێت، بەڵکو وەکو ئیمامی سەخاوی فەرموویەتی: لـە سـەردەمی پێشـەوای نـاودار (صَـلاحُ الـدِّيْن)ی (أَيُّوْبِيّ)ـەوە داهێنراوەو، وەکو ئـەویش فەرموویـەتی: داهێنراوێکـی بـاشو چـاکە. بڕوانـە: الْقَوْلُ الْبَدِيْعُ فِي الصَّلاةِ عَلَى الْحَبِيْبِ الشَّفِيْع / ٣٧٧.

هەروەها شێخی (ابْنُ عَلاّن)یش فەرمایشتێکی شێخی (ابْنُ حَجَر)ی (هَيْتَمِيّ) هێنـاوە، کـە فەرموویەتی: مامۆستاکەمان –کە بریتیە لە زانای پایەبەرز قـاضی (زَكَرِيَّا)ی (أَنْصَـارِيّ)–و غەیری ئەویش فەتوایان داوە، کە صەلاواتدان لەدوای بانگ بە دەنگی بەرز کارێکی باشـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ١١٣.

منيش هيوام وايه كه ئەو بەندەيە بم. جا ئەو كەسەی داوای (وَسِـيلَة)م بـۆ بكـات، شەفاعەت‌و تكای منی بۆ مسۆگەر دەبێت".

ئیمامی موسلیم لـە صەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردوە.(١)

لـە ئیمـامی (عُمَر)ی كـوڕی (خَطَّـاب)یشـەوە هـاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ. فَقَالَ أَحَدُكُمْ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ. قَـالَ: أَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ. ثُمَّ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ. قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، مِنْ قَلْبِهِ، دَخَلَ الْجَنَّـةَ». واتە: "ئەگەر بانگخوێن وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)و، یەكێكیش لـە ئێـوە وتـی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)، ئەوجا بانگخوێنەكە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و، ئـەویش وتـی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، پاشان بانگخوێنەكە وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُـولُ اللهِ)و، ئەویش وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ)، ئەوجا بانگخوێنەكە وتی: (حَـيَّ عَلَـى الصَّلاَةِ)و، ئەویش وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)، پاشان بانگخوێنەكە وتی: (حَـيَّ عَلَى الْفَلاحِ)و، ئەویش وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)، ئەوجا بانگخوێنەكـە وتـی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)و، ئەویش وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)، پاشان بانگخوێنەكە وتـی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)و، ئەویش لـە باوەڕێكی تەواوی ناو دڵیەوە وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، ئەو كەسە دەچێتە بەهەشتەوە".

ئیمامی موسلیم لـە صەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردوە.(٢)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٨ / ٣٨٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٩ / ٣٨٥.

لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)یشەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَــنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: "أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَــهُ، وَأَنَّ مُحَمَّــداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالْإِسْلاَمِ دِيناً" غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ». واتە: "ئەو کەسەی لەو کاتەدا گوێی لە بانگخوێن دەبێت، بڵێـت: (شـایەتی دەدەم، کـە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای تاکو بێ هاوتاو، شایەتیش دەدەم، کە (مُحَمَّد) بەنـدەو پێغەمبـەری ئـەوەو، ڕازیشـم کـە خـوا پـەروەردگارم بێـتو، (مُحَمَّد)یش پێغەمبەرم بێتو، ئیسلامیش ئاینم بێت)، خوای گـەورە لـە تاوانـەکانی خۆش دەبێت".

لە ڕیوایەتێکی تردا هـاتوە: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْــهَدُ». ئیمـامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.[١]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُــنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)دا، لـە (عَائِشَــة)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کاتێك گوێی لە بانگخوێن بوایە، کە بڵێـت: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَــهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ)، ئەویش دەیفـەرموو: «وَأَنَا، وَأَنَا» واتـە: "منـیش ئەو شایەتیە دەدەم".

لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)شەوە هاتوە (خوا لە هـەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَنْ قَالَ حِــينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: "اللّهُمَّ، رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِيْ وَعَدْتَهُ" حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ». واتـە: "ئەو کەسەی کاتێك گوێی لە بانگ دەبێت، بڵێت: (اللّهُمَّ، رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩٠ / ٣٨٦.

وَالصَّلاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِيْ وَعَدْتَهُ)، له ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتو تکای منی بۆ مسۆگەر دەبێت".

ئیمامی بوخاری له صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوه.[1]

بۆمان ڕیوایەت کراوه له کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـه هـاوەڵی خۆشەویست {(مُعَاوِيَة)ی کوڕی (أَبُو سُفْيَان)}ـەوه (خوای لێ ڕازی بێت)، کـه ئەگـەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، گوێی له بانگخوێن بوایه، بلێت: (حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ)، ئەویش دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، اجْعَلْنَا مُفْلِحِيْنَ».[2] واته: "خوایه بمانگێڕه لەو کەسانەی که براوەو سەرکەوتوون".

بۆمان ڕیوایەت کراوه لـه (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، لـه پیاوێکـەوه، ئـەویش لـه (شَهْر)ی کوڕی (حَوْشَب)ـەوه، ئەویش له هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو أُمَامَـة)ی (بَاهِلِيّ)ـەوه (خوای لێ ڕازی بێت) -یان لـه یـەکێك لـه هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـواوه (دروودی خوای لەسەر بێت)- که هاوەڵی خۆشەویست (بلال) دەستی کـرد بـه قامـەت کردنو، جا که فەرمووی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ)، پێغەمبەریش فەرمووی: «أَقَامَهَـا اللهُ وَأَدَامَهَا». واته: "خوای گەوره هەمیشـه ئـەم نوێـژه ڕاگـیراو بکـات". لـه هـەموو ڕستەکانی تری قامەتەکەشدا پێغەمبەری خوا هەر بەو جـۆرەی دەفـەرموو، کـه لـه حەدیسەکەی ئیمامی (عُمَر)دا سەبارەت به بانگدان هاتبوو.[3]

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٤٩ / به ژماره: ٤٤٤٢.

(٢) بڕوانـه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٦ - ٤٧ / بـه ژمـاره: ٩٢. حەدیسـێکی زۆر لاوازه، وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی. بڕوانه: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٥٧.

(٣) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٠٠ / به ژماره: ٥٢٨. حەدیسـێکی لاوازه، وەکـو ئیمـامی نەوەوی خۆیو شێخی عەسقەلانیش فەرموویانه. بڕوانـه: خُلاصَـةُ الْأَحْكَـام / ١ / ٢٩٥، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٥٧. چونکه کەسێکی نەناسراو له ڕشتەکەیدا هەیه.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـــنُ السُّـــنِّيِّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر گــوێی لێبوایــە بــانگخوێن قامەتی بکردایە، ئەویش دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ، رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَهَذِهِ الصَّـــلاةِ الْقَائِمَةِ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَآتِهِ سُؤْلَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).[1]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٥٣ / بە ژمارە: ١٠٥.

## باسێك: سەبارەت بە وەڵامدانەوەی بانگخوێن و قامەتكەر لە هەندێك حاڵەتی تایبەتیدا:

ئەگەر کەسێك نوێـژی دەکـردو، گوێیشـی لێـوو بـانگخوێن بـانگی دا، یـان قامەتکەر قامەتی کرد، با لەناو نوێژەکەدا وەڵامـی نەداتـەوە. خـۆ ئەگـەر سـڵاوی دایەوە لە نوێژەکەی، با ئەویش وەکو کەسانی تر وەڵامی بانگ‌و قامەتەکە بداتەوە.

جا ئەگەر لەناو نوێژەکەدا وەڵامی دایەوە، ئەوە ناپەسـەندەو، نوێژەکـەی بـەتاڵ نابێتەوە.

بە هەمان شێوە، ئەگەر لەسەرئاو بوو، گوێی لە بانگ یـان لـە قامەتـەوە بـوو، نابێت لەو کاتەدا وەڵامی بداتەوە. بەڵکو کەی هاتە دەرەوە، با وەڵامی بداتەوە.

ئەگەر کەسێك لەکاتی بانگدان یـان قامـەت کردنـدا قورئـانی دەخوێنـد، یـان تەسبیحاتی دەکرد، یان حەدیسی دەخوێندەوە، یان زانسـتێکی تـری دەخوێنـد، یـان هـەر شـتێکی تـری دەکـرد، ئـەوا دەبێـت واز لـە هـەموویان بهێنێـت‌و، وەڵامـی بانگخوێنەکـە بداتـەوەو، دواتـر بگەڕێتـەوە سـەر کارەکـەی خـۆی. چـونکە وەڵامدانەوەکە لەدەست دەچێت. بەڵام ئەوەی ئەو خەریکێتی، بـەزۆری لەدەسـت ناچێت.

جا ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك نەیتوانی بەشوێن بانگخوێنەکـەدا وەڵامـی بانگەکـە بداتەوە، هەتا بانگخوێنەکە لێبوویەوە، ئـەوا ئەگـەر ماوەکـە درێـژەی نەکێشـابوو، سونەتە وەڵامی بانگەکە بداتەوە.

## نزاو پاڕانەوەی دوای بانگ

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «لاَ يُـرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الْـأَذَانِ وَالْإِقَامَـةِ». واتـە: "نـزاو پاڕانـەوە لـە نێـوان بـانگ‌و قامەتـدا ڕەدناکرێتەوە".

ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِي)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و، کەسـانی تـریش ڕیوایـەتیان کـردوەو، ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ) فەرموویـەتی: حەدیسـێکی (حَسَـن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

جا ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لـە بەشی (كِتَابُ الدَّعَوَات)ی کتێبەکەی خۆیدا ئەمەشی بـۆ زیاد کردوە: هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد: "ئەی پێغەمبەری خـوا، جـا کەوایـە ئێمە بڵێین چی‌و، چی دوعایەك بکەین؟" ئەویش فەرمووی: «سَلُوا اللهَ الْعَافِيَـةَ فِـي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ».[2] واتە: "داوا لـە خوای گەورە بکەن سەلامەت‌و بێوەیتـان بکـات لـە دنیاو لـە دوارۆژدا".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ١٩٩ / بە ژمارە: ٥٢١، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ١ / ٤١٢ / بـە ژمارە: ٢١٥، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيّ) / ١٦٨ – ١٦٩ / بـە هـەردوو ژمـارە: ٦٩ و ٧١، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٥١ / بە ژمارە: ١٠٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٦ / بە ژمارە: ٣٥٩٤. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) ئەم زیادەیەی لـە ڕێگەی کەسێکەوە ڕیوایەت کردوە، کە پێی دەوترێت: (يَحْيَى)ی کـوڕی (يَمَـان). شـێخی عەسقەلانی لەبارەی ئەم کەسەوە فەرموویەتی: پیاوێکی چاك بوە، بەڵام فەرموودەناسان یـەك دەنگن لـەسەر ئەوەی، کە لـە گێڕانەوەی حەدیسدا هەڵەی زۆری کردوە، بەتایبـەتیش لـەو حەدیسانەی، کە لـە (سُفْيَان)ی (ثَوْرِيّ)ـەوە ڕیوایەتی کردوون. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٦٦. منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە یەکێکە لـەو حەدیسانەی، کە لـە (سُفْيَان)ی (ثَوْرِيّ)ـەوە ڕیوایەتی کردوون.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْــرو)ی کوڕی (عَاص)ــەوە (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێـت)، کە پیاوێـك عــەرزی پێغەمبــەری کــرد: "ئــەی پێغەمبــەری خــوا، بانگخوێنــەکان لــە ئێمــە زیــاتر خــەیریان دەسـت دەکەوێت!". پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «قُلْ كَمَا يَقُولُونَ، فَإِذَا انْتَهَيْتَ، فَسَلْ، تُعْطَهُ». واتە: "تۆش ئەوەی ئەوان بڵێرەوە، جا کـە لێبوویتــەوە، داوا بکەو بپاڕێرەوە، تا پێت بدرێت".

ئیمامی (أَبو دَاوُد) ڕیوایەتی کردوەو، بە (ضَعِيف)یشی دانەناوە.(١)

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (كِتَابُ الْجِهَاد)ی (سُنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)دا، بـە ڕشتەیەکی (صَحِيح)، لـە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کـوڕی (سَعْد)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویــەتی: «ثِنْتَانِ لاَ تُرَدَّانِ (أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ): الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ، حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ

---

جا ئەگەرچی کردنی ئەم زیکرە لە نێـوان بـانگ‌و قامەتـدا لــە حەدیسـێکی پشــت پــێ بەستراودا نەهاتوە، بەڵام بە ڕەهایی‌و بەبێ بەسـتنەوە بـە کـاتێکی دیـاریکراوەوە لــە چــەند حەدیسێکی پەسەندو پشت پێ بەستراودا هاتوە، وەکو ئیمامی نەوەویش لە ((**کتێبی دوعـاو پاڕانەوە گشتگیرەکان**))دا دەیانهێنێت. یەکێکیان ئەوەیە، کە ئیمامی (تِرْمِــذِيّ) لــە ڕێگــەی هاوەڵی خۆشـەویست (عَبَّــاس)ی مامــەی پێغەمبــەری خـواوە ڕیوایــەتی کــردوە، کــە ئــەو فەرموویەتی: عەرزی حەزرەتی پێغەمبەرم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، شـتێکم فێـر بکــە، بــا لەخوا بپاڕێمەوەو داوای لێ بکەم" پێغەمبەری خواش فەرمووی: "داوای لەشـاغی‌و بێـوەیی لەخوا بکە". ئەوجا چەند ڕۆژێك مامەوەو، دواتر هاتمەوە خزمەتی‌و، هــەمان قسـەم عــەرزم کرد، ئەویش فەرمووی: "ئەی (عَبَّاس)، ئەی مامەی پێغەمبەری خوا، داوا لە خـوای گــەورە بکەن سەلامەت‌و بێوەیتان بکات لە دنیاو لــە دواڕۆژدا". ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ) فەرموویــەتی: حەدیسـێکی (صَحِيح)ــە. بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٣٥١٤.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ١٩٩ / بە ژمـارە: ٥٢٤. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویــەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٦٨.

بَعْضـــاً».[1] واتــه: "دوو نــزاو پاڕانــەوە هــەن ڕەد ناکرێنــەوە، یــان بەکــەمی ڕەد دەکرێنەوە: نزاو پاڕانەوەی کاتی بانگ‌و، نزاو پاڕانەوەی کاتی جەنگ، کاتێـك کـە جەنگاوەرەکان دەچن بەناو یەکداو تێڕژان درووست دەبێت".

منیش دەڵێم: لـە هەندێك لـە نوسخە پشت پێ بەستراوەکاندا بـەم جـۆرە هـاتوە (یُلْحِمُ)، لـە هەندێکیشیاندا بەم جۆرە هاتوە (یُلْجِمُ). هەردووکیشیان درووستن.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٥ / بە ژمارە: ٢٥٤٠.

## زیكری دوای دوو ڕكاته سونەتەكەی پێش نوێژی بەیانی

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (أَبو الْمَلِيْح)ـەوە -كە ناوی (عَامِر)ی كوڕی (أُسَامَة)یە-، ئەویش لە باوكیەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە جارێك دوو ڕكات نوێژە سونەتەكەی پێش نوێژی بەیانی دەكردو، پێغەمبەری خوایش (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە نزیك ئەوەوە دوو ڕكات نوێژی كورتی كرد، پاشان گوێی لێبوو، كە پێغەمبەری خوا بە دانیشتنەوە سێ جار فەرمووی: «اللَّهُـمَّ، رَبَّ جِبْرِيلَ وَإِسْرَافِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَمُحَمَّدٍ النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- أَعُوْذُ بِكَ مِنَ النَّارِ».[(١)] واتە: "خوایە، ئەی پەروەردگاری جوبرەئیلو ئیسرافیلو میكائیلو پێغەمبەر (مُحَمَّد)، پەنات پێ دەگرم لە ئاگری سەختی دۆزەخ".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ صَبِيحَةَ يَوْمِ الْجُمُعَة قَبْلَ صَلاةِ الْغَـدَاةِ: "أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّومَ، وأَتُوبُ إِلَيْهِ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللهُ تَعَالَى ذُنُوبَهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».[(٢)] واتە: "ئەو كەسەی بەرەبەیانی ڕۆژی جومعە بەر لە نوێژی بەیانی سێ جار بڵێت: (داوای لێخۆشبوونو تەوبە لەو خوایە دەكەم، كە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیەو، زیندووەو چاودێرو پارێزەری هەمیشەییەو، خۆی بەخۆی بووەو هۆكاری بوونو مانەوەی غەیری خۆیشێتی)، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی خۆش دەبێت، ئەگەرچی لە زۆریدا وەكو كەفی دەریا وابن". خواش لە هەموو كەس زاناترە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٥٢ / بە ژمارە: ١٠٣. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٧٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّـنِّيّ) / ٤٢ / بە ژمارە: ٨٣. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەكەی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٧٥.

# ئەوەی لەکاتی هاتنەڕیزی نوێژی جەماعەتدا دەوترێت

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (سَـعْد)ی کـوڕی (أَبِـيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێـك هـات بـۆ نوێـژو، پێغەمبـەری خـوایش (دروودی خوای لەسەر بێت) لەو کاتەدا نوێژی دەکـرد. جـا کـە کـابرا گەیشـتە ڕیـزی جەماعەتەکە، وتی: (اللّهُمَّ، آتِنِي أَفْضَلَ مَا تُؤْتِي عِبَادَكَ الصَّـالِحِينَ). واتـە: (خوایـە گەورەترین‌و باشترینی ئەو پلەوپایانەم بدەیتێ، کـە دەیـدەیت بـە بەنـدە چـاکەکارو ڕاساڵەکانی خۆت). جا پێغەمبەری خوا لـە نوێژەکە بوویەوە، فەرمووی: "ئەوە کـێ بوو پێشتر قسەی کرد"؟ پیاوەکەش عەرزی کرد: "من بووم، ئەی پێغەمبەری خـوا"، پێغەمبەریش فـەرمووی: «إِذاً يُعْقَرُ جَوَادُكَ، وَتُسْتَشْهَدُ فِيْ سَـبِيْلِ اللهِ». واتـە: "دەی کەوابوو ئەسپ‌و ولاخەکەت بەسـەربڕین دەچـێت‌و، خۆشـت لـە ڕێگـەی خـوادا شەهید دەکرێیت".

ئیمامی (نَسَائِيِّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ) ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی بوخـاریش لـە تەئریخەکەیدا لە باسی (مُحَمَّد)ی کـوڕی (مُسْـلِم)ی کـوڕی (عَائِـذ)دا ڕیوایـەتی کردوە.(١)

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيِّ) / ١٨٠ / بە ژمـارە: ٩٣، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَـة (ابْـنُ السُّنِّيِّ) / ٥٣ – ٥٤ / بە ژمـارە: ١٠٦، والتَّأْرِيْخُ الْكَبِيْـر (لِلْبُخَـارِيِّ) / ١ / ٢٢٢ / بـە ژمارە: ٦٩٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٧٩.

# زیکری ئەو کاتەی کەسێك دەیەوێت هەستێت بۆ نوێژ کردن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە ژنــەهاوەڵی خۆشەویست (أُمُّ رَافِع)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویــەتی: "ئــەی پێغەمبــەری خوا، کارێکم پێ نیشــان بــدە، خــوای گــەورە پاداشــتم بداتــەوە لەســەر کردنــی". پێغەمبەری خوایش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فــەرمووی: «يَا أُمَّ رَافِعٍ، إِذَا قُمْتِ إِلَــى الصَّلَاةِ، فَسَبِّحِي اللهَ تَعَالَى عَشْراً، وَهَلِّلِيْهِ عَشْراً، واحْمَدِيْهِ عَشْراً، وَكَبِّرِيْــهِ عَشْــراً، واسْتَغْفِرِيْهِ عَشْراً؛ فَإِنَّكِ إذا سَبَّحْتِ، قَالَ: هذَا لِيْ، وَإِذَا هَلَّلْتِ، قَالَ: هذَا لِــيْ، وإذا حَمِدْتِ، قَالَ: هذَا لِيْ، وإذا كَبَّرْتِ، قَالَ: هذَا لِــيْ، وإذا اسْــتَغْفَرْتِ، قَــالَ: قَــدْ فَعَلْتُ».[1] واتە: "ئەی (أُمُّ رَافِع)، ئەگەر ویستت هەستیت بۆ نوێژ، دە جار (سُبْحَانَ

(١) بڕوانــە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّــنِّيّ) / ٥٤ / بــە ژمــارە: ١٠٧. شــێخی عەســقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٨٠.

شایانی باسە کە ئیمامی (سُيُوْطِيّ)و شــێخی (ابْــنُ عَــلَّان) نوســراوێکی تایبــەتی شــێخی عەسقەلانیان لەسەر ئەم حەدیســەی (أُمُّ رَافِع) هێناوە، کە تێیدا وەڵامــی پرســیاری کەســێکی داوەتەوە، کە: ئایا ئەو کارەی یەکێك لە زانایانی ئــەو ســەردەمە لــە مزگەوتەکــەی خۆیــدا لەگەڵ نوێژخوێنەکاندا دەیکەن‌و، ئەو زیکرانە بە دەنگی بــەرزو بــە کۆمــەڵ لــەپێش نوێــژە فەرزەکانەوە دەخوێنن، ئەصڵێکی لە سونەت‌و حەدیسی حەزرەتدا هەیە، یان نا؟ وە ئایا ئــەو کارەی ئەوان داهێنراوێکی باشەو، پاداشتی لەسەر وەردەگرن، یان داهێنراوێکی خراپە؟

شێخی عەســقەلانیش بــە وردی تــەخریجی حەدیســەکەی کــردووەو، باســی ئــەو کــات‌و جێگانەشی کردوە، کە ئەو زیکرانەیان تێدا دەکرێت‌و، لە کۆتاییشــدا فەرموویــەتی: بــەلای منەوە حەدیسەکە بۆ بەڵگەی ئەوە ناشێت، کــە ئــەو زیکرانــە لــەپێش نوێــژە فەرزەکانــەوە بکرێن.

پاشان فەرموویەتی: نابێت حەدیســەکە بکرێت بە بەڵگە بۆ کردنی ئــەو زیکرانــە لــەپێش نوێژە فەرزەکانەوە، بە کۆمەڵ لەلایەن نوێژخوێنەکانەوە، چــونکە لــە هیچــکام لــە زانایــانی (سَلَف)ــەوە نەهاتوە، کە بەو جۆرەیــان کردبێــت، نــە هــاوەڵان‌و، نــە شــوێنکەوتوان‌و، نــە شەرعزانان‌و نە زانایانی هیچ سەردەمێکیش. بۆیە باشتر وەهایە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت ئــەم

اللهُ) بكەو، دە جاریش (لا إِلَهَ إلاّ اللهُ) بكەو، دە جاریش (الْحَمْـدُ لِلّــهِ) بكـەو، دە جاریش (اللهُ أَكْبَرُ) بكەو، دە جاریش (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) بكە. چونكە ئەگـەر (سُبْحَانَ اللهِ) بكەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەمە بـۆ منـە)و، ئەگـەر (لا إِلَــهَ إلاّ اللهُ)یـش بكەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەمە بۆ منە)و، ئەگەر (الْحَمْدُ لِلّهِ)یش بكەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەمە بۆ منە)و، ئەگـەر (اللهُ أَكْبَر)یـش بكـەیت، خـوای گەورە دەفەرموێت: (ئەمە بۆ منە)و، ئەگەر (أَسْتَغْفِرُ اللهَ)یش بكەیت، خوای گـەورە دەفەرموێت: (وا لێت خۆشبووم)".

## نزاو پاڕانەوەی كاتی قامەت كردن

ئیمامی (شَافِعِيّ) بە ڕشتەی خۆی لە كتێبی (الْــأُمّ)دا حەدیسـێكی (مُرْسَــل)ی ڕیوایەت كردوە، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اطْلُبُــوا اسْتِجَابَةَ الدُّعَاءِ عِنْدَ: الْتِقَاءِ الْجُيُوْشِ، وَإِقَامَةِ الصَّلاةِ، وَنُــزُوْلِ الْغَيْــثِ».[1]. واتـە: "بەشـوێن گیرابـوونی نـزاو پاڕانـەوەدا بگـەڕێن لــەكاتی بەیـەك گەیشـتنو ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای موسوڵمانانو كافرانو، لەكاتی نوێژ دابەستنو، لەكاتی باران باریندا".

---

زیكرانە بكات، كە لە دڵی خۆیدا بیانكات، چونكە باشترین زیكر ئەوەیە كە بە پەنهانو بـە نهێنی بكرێت. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأبْرَار / ٥٢ – ٦٣، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ١٤٤ – ١٤٨.

منیش دەڵێم: ئەمە ئەگەر تەواوی نوێژخوێنەكان ئاگایان لەم حەدیسە هەبێتو، بەردەوام كاری پێ بكەنو، لەبیریان نەچێت. بەڵام ئەگەر ئاگایان لێی نەبوو، یان لەبیریان نەبوو، ئەوا باشتر وایە لەپێش هەموو نوێژە فەرزەكانەوە بە دەنگـی بـەرز بخرێتـەوە بیریـان. خـواش لـە هەموو كەس زانا ترە.

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٤٤.

هەروەها ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: فەرمایشتی زیاد لە کەسێکم لەلایە، کە نزاو پاڕانەوە لەکاتی باران بارین‌و، لە کاتی قامەت کردندا گیرا دەبێت.[1]

(١) شێخی عەسقەلانی چەند حەدیسێکی لەو بارەوە هێناوە لە ڕێگەی هەریەکە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أُمَامَة)ی (بَاهِلِيّ)و، (أَنَس)ی کوڕی (مَالِك)و، (عَبْدُالله)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)ەوە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت). جا ئەگەرچی ڕشتەی هەندێکیشیان لاوازە، بەڵام بۆ پشتگیری یەکتر دەشێن. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٨٣ - ٣٨٦.

## باسی ئەوەی لەناو نوێژدا دەوترێت

بزانە، کە ئەمە باسێکی زۆر فراوانەو، زۆرێك حەدیسی (صَحِيْح)یشی لە هەموو جۆرەکانی تێدا هاتوەو، زۆرێك لقەباسیشی تێدایە لە کتێبە فیقهیەکانـدا، کـە ئێمـە لێرە تەنها هۆشداری دەدەین لەسـەر بابەتـە سـەرەکیەکانو، مەبەستەکانیان، نـەك وردەکاریەکانو، باسە دەگمەنەکانی. وە بەڵگەی زۆربەی بابەتەکانیشی لادەبەم، بە مەبەستی کورت کردنەوە. چونکە ئەم کتێبە بـۆ باسـکردنی بەڵگـەکان دانـەنراوە. بەڵکو بۆ باسکردنی ئەو بابەتانە دانراوە، کە کاریان پـێ دەکرێـت. خـوای گـەورە تەوفیقی هەموو لایەك بدات.

## باسی (اللهُ أكبَر)ی نوێژ دابەستن

بزانە، کە نوێژ، چی فەرز بێت یان سونەت، بەبێ (اللهُ أَكْبَــر)ی نوێـژ دابەسـتن درووست نیە.

(اللهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستنیش بەلای ئیمـامی (شَــافِعِيّ)و زۆربـەی زانایانیشـەوە بەشێکە لـە نوێژو، پایەیەکە لـە پایەکانی. بەڵام بەلای ئیمـامی (أَبُو حَنِيْفَــة)وە تـەنها مەرجەو، بەشێك نیە لـە نوێژەکە.[1]

بزانە، کە بەلای ئیمـامی (شَافِعِيّ)و، ئیمـامی (أَبُو حَنِيْفَــة)و، هەنـدێکی تـر لـە زانایانەوە، دەکرێت بوترێت: (اللهُ أَكْبَر)و، دەشکرێت بوترێـت: (اللهُ الْأَكْبَر). بـەڵام

---

(١) ڕاستە کە پایە (رُكْن)و مەرج (شَرْط) هەردووکیان پێویستن بۆ درووسـتی عیبـادەت، بـەڵام جیاوازی سەرەکی لە نێوانیاندا ئەوەیە، کـە پایـە بەشـێکی سـەرەکی عیبادەتەکەیـە، وەکـو نیەتو پایەکانی تـری نوێـژ. بـەڵام مـەرج لـە دەرەوەی عیبادەتەکەیـە، وەکـو دەسـتنوێژو مەرجەکانی تری نوێژ. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ١٥٣.

ئیمامی (مَالِك) ڕێگەی بەوەی دوەم نەداوە. بۆیە ئیحتیات لەوەدایە، کە مرۆڤی موسوڵمان ئەوەی یەکەمیان بهێنێت، تاوەکو لە ناکۆکیەکە دەرچێت.[1]

جا درووست نیە بێجگە لەو دوانە هیچ تەعبیرێکی تر بەکار بهێنرێت. کەواتە ئەگەر بڵێت: (اللهُ الْعَظِيْمُ)، یان (اللهُ الْمُتَعَالِيْ)، یان (اللهُ أعْظَمُ)، یان (اللهُ أعَزُّ)، یان (اللهُ أجَلُّ)..... یان هەر تەعبیرێکی تری هاوشێوە، ئەوا بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)و زۆربەی زانایانەوە نوێژەکەی درووست نیە. بەڵام ئیمامی (أبُو حَنِيْفَة) فەرموویەتی: درووستە.

هەروەها ئەگەر بڵێت: (أكْبَرُ اللهُ)، ئەوا بەلای بۆچوونی درووستی ئێمەوە نوێژەکەی درووست نیە. بەڵام هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: درووستە. وەکو چۆن ئەگەر لە کۆتایی نوێژەکەیەوە بڵێت: (عَلَيْكُمُ السَّلامُ)، بەلای بۆچوونی ڕاستەوە نوێژەکەی هەر درووستە.

بشزانە، نە (اللهُ أكْبَر) کردنو، نە زیکرەکانی تریش درووست نین، هەتا بە زمان دەرنەبڕدرێن، بەجۆرێك دەنگی کەسەکە بگاتە گوێی خۆی، ئەگەر کێشەیەکی بیستنی نەبوو. وە پێشتریش ئەم باسەمان ڕوون کردەوە، لەو چەند باسەدا، کە لە سەرەتای کتێبەکەوە هێنامان.

---

(١) بەڵکو لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا خۆی بۆ سەرەتای دەست پێکردنی نوێژ تەعبیری (اللهُ أكْبَر)ی بەکارهێناوە (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ). بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٦٤ / بە ژمارە: ٨٠٣، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٥ / ١٨٧ / بە ژمارە: ١٨٧٠، ومُسْنَدُ الْبَزَّار (الْبَحْرُ الزَّخَّار) / ٢ / ١٦٨ / بە ژمارە: ٥٣٦، وخُلاصَةُ الْبَـدْرِ الْمُنِيْر / ١ / ١١٢ / بە ژمارە: ٣٥٨.

هەروەها لە حەدیسی (صَحِيْح)یشدا هاتوە، کە فەرموویەتی: (وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي). واتە: (ئێوەش بەو شێوە نوێژ بکەن، کە منتان دەبینی نوێژم دەکرد). بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٢٦ / بە ژمارە: ٦٠٥.

خۆ ئەگەر لـە زمانیـدا لاڵـی یـان عـەیبێك هـەبوو، ئـەوا بـا چـەندە بتوانێـت بیجوڵێنێتو، نوێژەکەشی دروستە.

بشزانە، کە هەر کەسێك بتوانێت (اللّٰهُ أكْبَر) بـەم شـێوەیەو بـە زمـانی عـەرەبی بڵێت، ئیتر دروست نیە بە زمانێکی تر بیڵێت (وەکو ئـەوەی بـە کـوردی بڵێـت: خوا لـە هەموو کەس گەورە ترە). سـەبارەت بـەو کەسـەش، کـە نـەتوانێت، ئـەوە دروستە، بەڵام پێویستە خۆی فێری عەرەبی بکات. خۆ ئەگەر کەمتەرخـەمی کـرد لـە فێربوونی عەرەبیدا، ئەوا نوێژەکـەی دروسـت نیـەو، پێویستیشـە هـەموو ئـەو نوێژانە دووبارە بکاتەوە، کە لـە ماوەی کەمتەرخەمیەکەیدا کردوونی.

بشزانە، کە مەزهەبی دروستی هەڵبژێردراو لـەسەر ئەوەیە، کـە (اللّٰهُ أكْبَـــر)ی نوێژ دابەستن درێژ ناکرێتەوەو، خـاویش ناکرێتـەوە. بـەڵکو بەسـەر یەکـەوەو، بـە خێرایی دەوترێت. وتراویشە: دەکرێت درێژ بکرێتەوە. بەڵام بۆچـوونە ڕاسـتەکەیان ئەوەی یەکەمیانە.

سەبارەت بە (اللّٰهُ أكْبَر)ەکانی تریش، مەزهەبی دروسـتی هەڵبـژێردراو لـەسـەر ئەوەیە، کە سونەتە درێژ بکرێنەوە، تا دەگەنە ڕوکنەکەی دواتریان. وتراویشە: درێژ ناکرێنەوە.

جا ئەگەر (اللّٰهُ أكْبَر)ی نوێژ دابەستنەکەی درێژ کـردەوە، کـە نـەدەبوو درێـژی بکاتەوە، یان (اللّٰهُ أكْبَر)ەکانی تری درێژ نەکردەوە، کە دەبوو درێژیان بکاتەوە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. بەڵام فەزیلـەتو چاکەیەکی لـەدەست دەرچوە.

ئەوجا بزانە، کە جێگـەی درێـژ کردنـەوەی (اللّٰهُ أكْبَـــر) تـەنها لـەدوای لامـی (اللّٰه)ەوەیەو، لـە جێگەی تردا درێژ کردنەوەی تێدا نیە.

## باسێك: {حوكمی درێژ كردنەوەی (اللهُ أكبَر)و كردنی بە دەنگی بەرز}

سونەتیشە پێشنوێژ بە دەنگی بەرز (اللهُ أكْبَر)ی نوێژ دابەستن‌و، (اللهُ أكْبَر)ەكـانی تریش بكـات، تـاوەكو شـوێنكەوتوەكان گوێیـان لێـی بێـت‌و، سونەتیشـە كەسـی شوێنكەوتوو بە دەنگی نزم بیانكات، بەجۆرێك تەنها دەنگی بگاتە گوێی خۆی. خـۆ ئەگەر كەسی شوێنكەوتوو بە دەنگی بەرز كردنیو، پێشنوێژیش بە دەنگی نزم، ئەوا نوێژەكەیان بەتاڵ نابێتەوە.

با نوێژخوێن زۆر سور بێت لـەسەر بە درووستی وتنی (اللهُ أكْبَر)، بەجۆرێك كـە لـەجێگەی خۆیدا نەبێت درێژی نەكاتەوە. خۆ ئەگەر هـەمزەی نـاوی (الله) ی درێـژ كردەوە، یان فەتحەی بائی (أكْبَر)ی درێژ كردەوە، بە جۆرێك، كە لـە دەربڕیندا بـوو بە (أكْبَار)، ئەوە نوێژەكەی درووست نیە.[1]

## باسێك: {ژمارەی (اللهُ أكبَر)ەكانی ناو نوێژو، حوكمی شەرع لەبارەیانەوە}

بزانە، كە ئەو نوێژەی لـە دوو ڕكات پێكهاتوە، یانزە (١١) (اللهُ أكْبَر)ی تێدایـە. ئەوەش لـە سێ ڕكات پێكهاتوە، حەڤدە (١٧) (اللهُ أكْبَـــر)ی تێدایـەو، ئـەوەش لـە چوار ڕكات پێكهاتوە، بیست‌ودوو (٢٢) (اللهُ أكْبَر)ی تێدایە. چونكە هەر ڕكاتێـك پێـنج (اللهُ أكْبَر)ی تێدایـە، یـەكێك بـۆ ڕكـوع‌و، چـواریش بـۆ دوو كڕنووشـەكە

---

(١) چونكە درێژ كردنەوەی هەمزەی ناوی (الله) مانای ڕشتەكە دەگۆڕێـت لـە خەبەریـەوە بـۆ پرسیاری. هەروەها كردنی وشەی (أكْبَر)یش بە (أكْبَار) ماناكـە بـەجۆرێك دەگۆڕێـت، كـە ئەگەر ئەو كەسەی وای لێ دەكات لە ماناكەی تێبكـات، لـە دیـن دەچـێتە دەرەوەو كـافر دەبێت. چونكە وشەی (أكْبَار) كۆیەو تاكەكەی (كَبَــر)ەو، بـەمانای تـەپڵ دێـت. بڕوانـە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ١٦٣.

(سُجُوْد)و، بۆ هەستانەوە لێیانو، یەکێکیش بۆ دەست کردن بە نوێـژو، یـەکێکیش بۆ هەستانەوە لـە تەحیاتی یەکەم.

پاشان بزانە، کە هەموو ئەم (اللهُ أَكْبَر)انە سونەتنو، ئەگەر نوێژخوێن بە دەستی ئەنقەست یان بە هەڵە وازی لێ هێنان، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، لێیشی ناچێتە دەرەوەو، سەجدەی سەهویش نابات. تەنها (اللهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستن نـەبێت، کـە بەیەك دەنگی زانایان نوێژەکە بەبێ ئەو دانامەزرێت. خواش لـە هـەموو کـەس زانـا ترە.

## ئەوەی نوێژخوێن لەدوای (اللهُ أكبَر)ی نوێژ دابەستنەوە دەیڵێت

بزانە، کە چەندین حەدیس لـەوبارەوە هاتون، تێکڕای حەدیسـەکان وا دەخـوازن کە نوێژخوێن بڵێت:

- (اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً).[1] واتە: (خوا لـە هەموو گەورەیەك گەورەترەو، سوپاسو ستایشی زۆریش هـەر شایسـتەی ئەوەو، پاکیو بێگەردیش لـە بەیانیانو لـە ئێوارانداهەر بۆ ئەوە).

(١) هاوەڵی خۆشەویسـت (ابْنُ عُمَر) فەرموویـەتی: (جارێـك لـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا نوێژمان دەکرد، ئەوەبوو پیاوێك لـە نوێژخوێنەکان وتـی: "اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا". پێغەمبەری خوا فـەرمووی: "ئـەوە کـێ بـوو فلانـە شـتی وت؟" پیاوەکەش عەرزی کرد: "من بووم، ئەی پێغەمبەری خوا". پێغەمبـەریش فـەرمووی: "سـەرم لێی سوڕما، دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوە" جا (ابْنُ عُمَـر) دەفـەرموێت: لـەدوای ئـەوەی پێغەمبەری خوا وای فەرموو، ئیتر من ئەو زیکرمە وازلێنەهێناوە). بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٢٠ / بە ژمارە: ٦٠١.

• (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ. إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ. اللَّهُمَّ، أَنْتَ الْمَلِكُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. أَنْتَ رَبِّي، وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي، وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعاً، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلاَقِ، لاَ يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا، لاَ يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ، وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ، وَأَتُوبُ إِلَيْكَ).[1] واته: (ڕووم کرده ئەو زاتەی، کە ئاسمانەکانو زەوی درووست کردوه، خۆم لە هەموو بیروباوەڕێکی پڕوپووچ لاداوەو تەسلیمی بەرنامەو فەرمانی ئەومو، لەو کەسانەش نیم، کە هاوبەشیان بۆ بڕیارداوە. نوێژو دینداریو بەندایەتیو ژیانو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری عالەمە، کە هیچ هاوبەشێکی نیە، منیش بەمە فەرمانم پێکراوەو، یەکێکیشم لە موسوڵمانانە گوێڕایەڵە ملکەچەکان. خوایە تۆ پاشاو دەسەڵاتداریتو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ. تۆ پەروەردگاری منیت، منیش بەندەی تۆم، ستەمم لە خۆم کردوەو، دانیشم بە تاوانەکەمدا ناوە، دەی تۆش لە هەموو تاوانەکانم خۆشبە، چونکە بێجگە لە تۆ کەس لە

---

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی (نَسَائِي)شدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "دوانزە فریشتە پێشپێشانیان بوو، کە کامیان زووتر هەڵیبگرێتو، بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان". بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ١٢٥ / بە ژمارە: ٨٨٥.

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ حِبَّان)و (حَاكِم)و غەیری ئەوانیشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا خۆی ئەو زیکرەی کردوەو، سێ جاریش کردوویەتی. بڕوانە: سُنَنُ أَبِي دَاوُد / ١ / ٢٦٢ / بە ژمارە: ٧٦٤، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٥ / ٨٠ / بە ژمارە: ١٧٨٠، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣٦٠ / بە ژمارە: ٨٥٨. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٧١.

تاوانەکان خۆش نابێت. ڕێنموییشم بکە بۆ جوانترین خورەوشت، چونکە بێجگە لە تۆ کەس ڕێنموویی ناکات بۆ جوانترین خورەوشت. خورەوشتە خراپەکانیشم لێ لادە، چونکە بێجگە لە تۆ کەس خورەوشتە خراپەکانم لێ لانادات. من بەردەوام وەڵامی بانگەوازو بەرنامەکەت دەدەمەوەو، هەمیشە خۆشم بە بەختەوەر دەزانم، کە شوێنی ئاینەکەت کەوتوومەو، هەموو خەیرو بێرێکیش بەدەستی تۆیەو، خراپەش نادرێتە پاڵ تۆ، من پشتو پەنام هەر تۆیەو، بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە، پاکو بێگەردو، بەرزو باڵایت، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەمو، بە تەوبەو پەشیمانیەوە دەگەڕێمەوە بۆ خزمەتت).

- هەروەها بڵێت: (اللَّهُمَّ، بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. اللَّهُمَّ، نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ، كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ. اللَّهُمَّ، اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ).[1] واتە: (خوایە ماوەی نێوان خۆمو تاوانو هەڵەکانم دووربخەرەوە، هەروەکو چۆن ماوەی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوات دوورخستۆتەوە. خوایە لە تاوانەکانم پاکم بکەرەوە، هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی لە چڵکو چەپەڵی پاك دەکرێتەوە. خوایە لە تاوانەکانم بمشۆ بە بەفرو بە ئاوو بە تەرزە).

جا هەموو ئەمانەی باسمان کردن لە حەدیسی (صَحِيْح)ی پێغەمبەری خوادا هاتون (دروودی خوای لەسەر بێت).

هەروەها لەم بارەوە چەند حەدیسێکی تریش هاتون. لەوانە:

---

(١) هاوەڵی خۆشەویست (أبو هُرَيْرَة) فەرموویەتی: (پێغەمبەری خوا لە نێوان (اللهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستنو قورئان خوێندنەکەدا کەمێك دەوەستا، منیش عەرزم کرد: "باوكو دایکم بەقوربانت بن، لەو ڕاوەستانەتدا چی دەفەرموویت؟" ئەویش فەرمووی: "ئاوا دەڵێم"). بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٥٩ / بە ژمارە: ٧١١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٩ / بە ژمارە: ٥٩٨.

حەدیسێکی (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی دابەستایە، دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ، وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ».[1] واتە: "خوایە پاكو بێگەردی بۆ تۆیەو، سوپاسو ستایشیش هەر بۆ تۆیە، ناوت زۆر پیرۆزەو، گەورەییت بەرزو بڵندەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە بێجگە لە تۆ".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَە) بە چەند ڕشتەیەکی (ضَعِیْف) ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (بَیْهَقِيّ)و، کەسانی تریش بە (ضَعِیْف)یان داناوە.

هەروەها ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَە)و (بَیْهَقِيّ) لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبوْ سَعِیْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە ڕیوایەتیان کردوەو، بە (ضَعِیْف)یشیان داناوە.[2]

ئیمامی (بَیْهَقِيّ) فەرموویەتی: هەروەها دەست پێکردنی نوێژ بە (سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ، وَبِحَمْدِكَ)، وەکو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)و (أَنَس)یشەوە ڕیوایەت کراوەو، هەموویشی (ضَعِیْف)ـە.

پاشان فەرموویەتی: صەحیحترین حەدیس لەم بارەوە ئەوەیە، کە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب) ئەو زیکرەی کردوە (خوای لێ ڕازی بێت).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ٧٧٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ١١ / بە ژمارە: ٢٤٣، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ٨٠٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ٧٧٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٩ / بە ژمارە: ٢٤٢، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ١٣٢ / بە ژمارە: ٨٩٩، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ١ / ٢٦٤ / بە ژمارە: ٨٠٤، وَسُنَنُ الْبَیْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ٣٤ / ٢١٧٩. بەڵام شێخی عەسقەلانی پێی وایە حەدیسەکە لاواز نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٣٩٧ – ٤٠٥.

ئەوجا ئیمامی (بَیْهَقِيّ) بە ڕشتەی خۆی حەدیسەکەی لە ئیمامی (عُمَـر)ەوە ڕیوایەت کردوە، کە ئەو (خوای لێ ڕازی بێت) (اللهُ أَکْبَـرُ)ی کردوەو، پاشان فەرموویەتی: (سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَـهَ غَيْرُكَ).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (بَیْهَقِيّ)دا، لە (حَـارِث)ی (أَعْـوَر)ەوە، ئەویش لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، نوێژی دابەستایە، دەیفەرموو: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، سُبْحَانَكَ، ظَلَمْـتُ نَفْسِي، وَعَمِلْتُ سُوءاً، فَاغْفِرْ لِـي، إِنَّـهُ لاَ يَغْفِـرُ الـذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْـتَ، وَجَّهْـتُ وَجْهِيَ......هتد».[2] واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، پاكو بێگەردی هەر بۆ تۆیە، من ستەمم لە نەفسی خۆم کردوەو، کاری خراپم ئەنجام داوە، تۆش لێم خۆشبە، چونکە بێجگە لە تۆ کەس لە تاوانەکان خۆش نابێت، ڕووی خۆم کردە ئەو زاتەی......هتد".

جا ئەمە حەدیسێکی (ضَعِیْف)ـە. چونکە (حَارِث)ی (أَعْوَر) زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە کەسێکی (ضَعِیْف)ـەو، ئیمامی (شَعْبِيّ)ش فەرموویەتی: (حَارِث) کەسێکی درۆزنە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## سەبارەت بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایش، کە فەرموویەتی: (وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ):

بزانە، کە مەزهەبی ئەهلی حەقو ڕاستی لە فەرموودەناسانو، شەرعزانانو، (مُتَکَلِّمِیْن)، لە هاوەڵانو شوێنکەوتوانو زانایانی دواتری موسوڵمانانیش لەسەر

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَیْهَقِيّ الْکُبْرَی / ٢ / ٣٤ / ٢١٨٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الْبَیْهَقِيّ الْکُبْرَی / ٢ / ٣٣ / ٢١٧٥.

ئەوەیە، کــە هــەموو ئــەوەی ڕوو دەدات، لــە چــاکەو لــە خراپــە، ســوودبەخش و زیانبەخشی، هەمووی لەلایەن خوای گەورەوەیەو، بە ویست و بڕیاری ئەوە.

جا کە ئەمە سابت بوو، ئیتر پێویستە ئەم حەدیسە تەئویل بکرێـت. بۆیـە زانایـان چەند وەڵامێکیان داوەتەوە:

یەکێکیان، کە مەشهورترینیانە، ئەوەیە، کــە زانــای پایەبــەرز (نَضْــر)ی کــوڕی (شُمَیْل)و، پێشەوایانی دوای ئەو فەرموویانە: مانای حەدیسەکە ئەوەیــە، کــە خراپــە ڕێگەی نزیکبوونەوە نیە لە تۆ.

دوەمیشیان ئەوەیە، کە خراپە بۆلای تۆ بــەرز ناکرێتــەوە. بــەڵکو تــەنها قســەی چاکە بەرز دەبێتەوە.

سێیەمیشیان ئەوەیە، کە لەڕووی ئەدەبەوە خراپە نادرێتە پاڵ تۆ. بۆیــە ناوترێــت: (یَا خَالِقَ الشَّرِّ)، ئەگەرچی ئەویش خــالقێتی. وەکــو چــۆن ناوترێــت: (یَــا خَــالِقَ الْخَنَازِیْرِ)، ئەگەرچی ئەویش خالقێتی.

چوارەمیش ئەوەیە، خراپەش بە نیسبەت کاربەجێیی و حیکمەتی تــۆ خراپــە نیــە. چونکە تۆ هیچ شتێك لەخۆوەو بەبێهوودە درووست ناکــەیت. خــواش لــە هــەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {خوێندنی زیکری (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ....هتد)}

ئەمە ئەو زیکرانە بوون، کە سەبارەت بە دوعای پاش (اللّٰهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستن هاتبوون.

جا ئەو کەسەی کە بە تەنها نوێژ دەکات، سونەتە هەموویان بکـات. بـە هـەمان شێوە ئەو پێشنوێژەش، کە شوێنکەوتوەکانی ڕێگەیان پێداوە. بەڵام ئەگـەر ڕێگـەیان پێنەدابوو، ئەوا نابێت نوێژەکەیان لـەسـەر درێـژ بکاتـەوە. بـەڵکو تـەنها یـەکێکیان بخوێنێت‌و، باشتریشە تەنها (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ....) هەتا (...مِنَ الْمُسْلِمِينَ) بخوێنێت.

بە هەمان شێوە ئەو کەسەش، کە بە تەنها نوێژ دەکات، ئەگەر خـۆی پێـی بـاش بوو نوێژەکەی کورت بێت، ئەویش با تـەنها (وَجَّهْتُ وَجْهِـيَ....) هـەتا (...مِـنَ الْمُسْلِمِينَ) بخوێنێت.(1)

بشزانە، کە ئەم زیکرانە لـە نوێژی فەرزو نوێژی سونەتیشدا هـەر سـونەتن. جـا ئەگەر نوێژخوێن لـە ڕکاتی یەکەمدا نەیکردن، ئیتر بـە دەسـتی ئەنقەسـت، یـان بـە هەڵـەو لـەبیرچوون، ئەوا نابێت دواتـر بیانکـات، چـونکە جێگەکـەی نـەماوە. خـۆ ئەگەر کردنی، ئەوە ناپەسەندەو، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

هەروەها ئەگەر لـەدوای (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستنەکە نەیکردن، هەتا دەستی بـە خوێندنی قورئان، یان بە (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الـرَّجِيمِ) کـرد، ئـەوە جێگەکـەی لـەدەست داوە. بۆیە نایانکاتەوە. خۆ ئەگەر کردنی، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

هەروەها ئەگەر نوێژخوێن دواکەوت‌و، لـە یەکێك لـە ڕکاتەکانـدا گەیشـت بـە پێشنوێژ، ئەوا با زیکرەکان بکات، مەگـەر بترسـێت لـەوەی، کـە بـەهۆی کردنـی زیکرەکەوە سورەتی (الْفَاتِحَة)ی لـەدەسـت دەربچـێت، ئەوکاتـە دەبێـت خـۆی بـە

---

(1) باشێتی ئەم زیکرە لەوەدایە ـوەکو شێخی (ابْنُ عَلَّان)یش فەرموویـەتی-: لـە ئایەتـەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتوە. خوای گەورە فەرموویەتی:

- ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِـنَ الْمُشْـرِكِينَ﴾. [الأنعام: ٧٩].
- ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾. [الأنعام: ١٦٢ - ١٦٣].

سورەتەکەوە خەریك بکات، چونکە ئەو گرنگترەو، واجبە بخوێنرێت، بەلاّم زیکرەکە سونەتە.

هەروەها ئەگەر کەسی دواکەوتوو لە کاتێکدا گەیشت بە پێشنوێژەکە، کە ئەو لە ڕاوەستاندا نەبوو، ئیتر لە ڕکوعدا بوو، یان لە سەجدەدا، یان لە تەحیاتدا، ئەوا با (اللهُ أَکْبَرُ) بکاتو، ئەو زیکرە بکات، کە پێشنوێژەکە دەیکاتو، با نە لەو کاتەو، نە دواتریش، دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژ نەخوێنێت.

هاوەڵانیشمان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی کە دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژ لە نوێژی مردوودا سونەتە یان نا، ڕاستترین بۆچوون ئەوەیە کە سونەت نیە. چونکە نوێژی مردوو بە کورتی دەکرێت.

بشزانە، کە دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژ سونەتە، نەك واجب. بۆیە ئەگەر نوێژخوێن نەیکرد، ئەوا سەجدەی سەهو ناباتو، سونەتیشە بە دەنگی نزم بیخوێنێت. خۆ ئەگەر بە دەنگی بەرز خوێندی ئەوا ناپەسەندەو، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) لەدوای دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژەوە

بزانە، کە وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) لەدوای دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژەوە سونەتەو، پێشەکیشە بۆ خوێندنی قورئان (واتە: بۆ خوێندنی سورەتی: الْفَاتِحَة). خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ [النَّحل: ٩٨]. مانای ئەم ئایەتە بەلای زۆربەی زانایانەوە ئەوەیە، کە ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیت، (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) بکە.

بشزانه، كه تەعبیری هەڵبژێردراو بەلای زانایانەوە بریتیە لـە (أَعُوذُ بِـالله مِـنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ). هەروەها بەم جۆرەش هاتوە (أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيْعِ الْعَلِيْمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، وە هیچ خراپەیەكیشی تێدا نیـە. بـەڵام تـەعبیری مەشـهورو هەڵبـژێردراو بریتیە لـەوەی یەكەمیان.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَـائِيّ)و (ابْـنُ مَاجَه)و (بَيْهَقِيّ)و لـە غەیری ئەوانیشدا، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بەرلـە دەست پێكردن بە خوێندنی قورئان لـەناو نوێژدا دەیفەرموو: «أَعُوذُ بِاللهِ مِـنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ نَفْخِهِ وَنَفْثِهِ وَهَمْزِهِ».[1]

لـە ڕیوایەتێكیشدا هاتوە، كە دەیفـەرموو: «أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيْعِ الْعَلِيْمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ».

جا تەفسیری هەریەكە لـەم وشانە لـەناو حەدیسدا هاتوە، كـە (هَمْزِهِ) بریتیـە لـە شێتیو، (نَفْخِهِ)یش بریتیە لـە خۆبەگەورەزانینو، (نَفْثِهِ)یش بریتیە لـە شـیعر. خـواش لـە هەموو كەس زاناترە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٦٢ / بە ژمارە: ٧٦٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٩ / بە ژمارە: ٢٤٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٦٥ / بە ژمـارە: ٨٠٧، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٣٤ / ٢١٧٩. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم حەدیسە حەدیسێكی (حَسَن)ـەو، لـە چـەند ڕێگەیەكی تریشەوە پاڵپشتی لێ كراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَـار / ١ / ٤١٢ - ٤١٣. بـەڵام من دەقی حەدیسەكەم لـە هیچكام لـە كتێبە چاپكراوەكانی ئیمامی نەسائیدا نەبینیەوە!!!

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٦٢ / بە ژمـارە: ٧٦٤، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣٢٥ / بە ژمارە: ٧٤٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ٨٠٧.

## باسێك: {حوكمی وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ)}

بزانە، کـە وتنـی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) سـونەتەو، واجـب نیـە. بۆیـە ئەگەر نوێـژخوێن نـەیڵێت، گوناهبـار نابێـتو، نوێژەکەشـی بـەتاڵ نابێتـەوە، ئـیتر نەوتنەکەی بە دەستی ئەنقەست بێت، یان بە هەڵەو، سەجدەی سەهویشی بۆ نابات.

هەروەها وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) لـە هەموو نوێژەکانیشدا سـونەتە، چی فەرزەکان یان سونەتەکان. وە بەپێی ڕاستترین بۆچـوون لـە نوێـژی مردووشـدا هەر سونەتە.

هەروەها زانایان کۆدەنگن لـەسەر ئەوەی، کە وتنـی (أَعُوذُ بِاللهِ مِـنَ الشَّـيْطَانِ الرَّجِيمِ) بۆ کەسی قورئانخوێن لە دەرەوەی نوێژیشدا هەر سونەتە.

## باسێك: {کاتو شوێنو شێوازی وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ)}

بشزانە، کە زانایان یەك دەنگن لـەسەر ئەوەی، کە وتنـی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) لە ڕکاتی یەکەمدا سونەتە. جا ئەگەر نوێژخوێن لە ڕکاتی یەکەمدا نەیکرد، ئەوا با لە ڕکاتی دوەمدا بیکات، خۆ ئەگەر لەویشدا نـەیکرد، بـا لـەوەی دواتـردا بیکات.

جا ئەگەر لە ڕکاتی یەکەمدا کردی، ئایا لـە دوەمیشدا سـونەتە، یـان نـا؟ ئـەوە دوو بۆچوونی هاوەڵانمانی لـەسەرە: ڕاستترینیان ئەوەیە، کە سونەتە، بەڵام لە ڕکـاتی یەکەمدا زیاتر سونەتە.

جا ئەگەر نوێژەکە لەو نوێژانە بوو، کە بە دەنگی نزم قورئـانی تێـدا دەخـوێنرا، ئەوا با نوێژخوێنەکە (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)ـەکەش بە دەنگی نزم بخوێنێت. بەڵام ئەگەر لـەو نوێژانە بوو، کە بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا دەخـوێنرا، ئایـا (أَعُوذُ

بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)ـەکەش بـە دەنگـی بـەرز بخوێنرێـت، یـان نـا؟ ئـەوە ڕای جیاوازی لەسەرە:

١) هەندێك لـە هاوەڵانمان فەرموویانە: با بە دەنگی نزم بیخوێنێت.
٢) زۆربەی زانایانیش فەرموویانە: ئیمامی (شَافِعِيّ) لـەم مەسـەلـەدا دوو بۆچـوونی هەیە: یـەکێکیان ئەوەیـە، کـە دەنگـی بـەرزو دەنگـی نـزم یەکسـانن‌و، ئـەم فەرمایشتە لـە کتێبی (الْأُمّ)دا هاتوە. دوەمیش ئەوەیە، کـە سـونەتە بـە دەنگـی بەرز بخوێنرێت‌و، ئەمەشیان لـە کتێبی (الْإِمْلاء)دا هاتوە.
٣) هەندێکیش لـە زانایان فەرموویانە: دوو بۆچوونی لەسەرە:

- یەکێکیان ئەوەیە، کە بە دەنگـی بـەرز بخوێنرێـت. زانـای پایەبـەرز (أَبُـو حَامِد)ی (إِسْفَرَايِيْنِيّ) –پێشەوای هاوەڵە عێراقیەکانمان–و، قوتابیەکەشی – واتە: شێخی (مَحَامِلِيّ)–و کەسانی تریش ئـەم بۆچـوونەیان بـە درووسـت داناوەو، هاوەڵـی خۆشەویسـت (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)ش (خوای لێ ڕازی بێت) هـەر بـە دەنگی بەرز خوێندوویەتی.
- بەڵام هاوەڵـی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) بە دەنگی نزم خوێندوویـەتی‌و، بـەلای زۆربـەی هاوەڵانیشـمانەوە ئـەم بۆچـوونەیان ڕاستترەو، هەر ئەمیش هەڵبژێردراوە. خواش لـە هەموو کەس زاناترە.

## خوێندنی قورئان لە پاش وتنی (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)

بزانە، کە زانایان کۆدەنگن لەسـەر ئـەوەی، کـە قورئـان خوێنـدن لـە نوێـژدا واجبەو، چەندین بەڵگەی ئاشکراو بەهێزیش لەمبارەوە هاتوون.

جا مەزهەبی ئێمەو مەزهەبی زۆرینەی زانایانیش لەسـەر ئەوەیـە، کـە خوێنـدنی سورەتی (الْفَاتِحَة) واجبەو، بۆ کەسێکیش توانای خوێندنی ئـەو سـورەتەی هـەبێت،

هیچ ئایەتو سورەتێکی تر جێگەی ئەو ناگرێتەوە. چونکە حەدیسی (صَحِيْح) هەیە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تُجْزِئُ صَلاةٌ لا يُقْرَأُ فِيْهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ». واتە: "هەر نوێژێك سورەتی (الْفَاتِحَة)ی تێدا نەخوێنرێت جێگە ناگرێتو درووست نیە".

هەردوو زانای پایەبەرز (ابْنُ خُزَيْمَة)و (ابْنُ حِبَّان) لە صەحیحەکانیاندا بە ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەتیان کردوەو، حوکمیشیان داوە بە (صَحِيْح)ی حەدیسەکە.[1]

لە هەردوو صەحیحەکە(ی ئیمامی بوخاریو موسلیمیش)دا هاتوە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «لا صَلاةَ إلاّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ».[2]

هەروەها واجبە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ)یش بخوێنرێتو، ئەویش ئایەتێکی تەواوە لە سەرەتای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە.

هەروەها واجبە تەواوی سورەتەکە بە هەموو شەدەکانیەوە بخوێنرێتەوە، کە بریتین لە چواردە (١٤) شەدە: سیانیان لە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيْمِ)دایەو، ئەوانی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَة / ١ / ٢٤٨ / بە ژمارە: ٤٩٠، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٥ / ٩١ / بە ژمارە: ١٧٨٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٦٣ / بە ژمارە: ٧٢٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩٥ / بە ژمارە: ٣٩٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: من ئەم دەقەم لە هیچکام لە دوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا نەبینیوە، بەڵکو ئەوەی لەواندا هاتوە بریتیە لە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (عُبَادَة)ی کوڕی (صَامِت)، کە ئەمە دەقەکەیەتی: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ». بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٤٢٢.

تریشیان لە ئایەتەکانی تردان. خۆ ئەگەر یەکێك لەو شەدانە نەخوێنێتەوە، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.[1]

هەروەها واجبە نوێژخوێن ئایەتەکانی سورەتەکە بە ڕیزو بەشوێن یەکدا بخوێنێتەوە. خۆ ئەگەر بە هەمان ڕیزبەندی نەیخوێندەوەو، تەرتیبی ئایەتەکانی تێکدا، یان بەشوێن یەکدا نەیخوێندەوە (واتە: ماوەیەکی زۆری خستە نێوانیانەوە)، ئەوا قورئان خوێندنەکەی درووست نیە. بەڵام لە ڕاوەستانی نێوان ئایەتەکاندا بە ئەندازەی هەناسەدانێك قەیناکات‌و چاوپۆشی لێ کراوە.

ئەگەر کەسێك نوێژی بە جەماعەت دەکردو، لەو کاتەی خەریکی خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة) بوو، پێشنوێژەکە سەجدەی (تِلاوَة)ی بردو، ئەویش وازی لە قورئان خوێندنەکەی هێناو، لەگەڵ پێشنوێژەکەدا سەجدەی برد، یان ئەگەر گوێی لە (آمِیْن) کردنی پێشنوێژەکە بوو، ئەویش (آمِیْن)ی کرد، یان داوای سۆزو بەزەیی خوای گەورەی کرد، یان پەنای بە خوای گەورە گرت لە ئاگر، بەهۆی ئەوەی، کە پێشنوێژەکە ئایەتێکی وەهای خوێند، ئەوە بخوازێت، ئەوا بەپێی ڕاستترینی ئەو دوو بۆچوونەی لەم مەسەلەدا هەن، قورئان خوێندنەکەی بچڕانی تێ ناکەوێت، چونکە عوزرو بەهانەی هەیە.

(١) بەڵام ئەگەر شەدەی (إِيَّاكَ) نەخوێنێتەوەو، بشزانێت ماناکەی بەبێ شەدەکە بریتیە لە ڕووناکی خۆر، ئەوا وەکو زانایان فەرموویانە: لەدین دەردەچێت‌و کافر دەبێت. چونکە ئەو کاتە ماناکەی بەم جۆرەی لێدێت: (ڕووناکی خۆرەکەت دەپەرستین). بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ١٩٤. هەروەها بڕوانە: هەرسێ شەرحی (تُحْفَة)و (نِهَايَة)و (مُغْنِي) لەسەر ئەم باسە لە (مِنْهَاج)ەکەی ئیمامی نەوەویدا.

## باسێك: {هەڵەكردن لە خوێندنەوەی سورەتی (الْفَاتِحَة)دا}

ئەگەر كەسی نوێژخوێن لە خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَـــة)دا هەڵەیەكی وەهای كرد، كە مانای دەگۆڕی، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر مانای نەدەگۆڕی، ئەوە قورئان خوێندنەكەی درووستە. جا ئەو هەڵەیەی، كە مانا دەگۆڕێت، وەكو ئەوەی كە بڵێت (أنْعَمْتُ) یان (أنْعَمْتِ)، یان بڵێت: (إِيَّاكِ نَعْبُدُ). ئەوەش كە مانا ناگۆڕێت، وەكو ئەوەی كە بڵێت (رَبَّ الْعَالَمِيْنَ) یان (رَبُّ الْعَالَمِيْنَ)، یان بڵێت: (نَسْتَعِيْنَ) یان (نَسْتَعِيْنِ). بەڵام ئەگەر وتی: (وَلا الظَّالِّيْنَ) بە (ظَاء)، ئەوا بەپێی بەهێزترینی ئەو دوو بۆچوونەی كە لەم مەسەلەدا هەیە، نوێژەكەی بەتاڵ دەبێتەوە، تەنها مەگەر نەتوانێت فێری دەربڕینی پیتی (ضَاد) ببێت، ئەویش لەپاش ئەوەی كە هەوڵی تەواوی لەگەڵدا دا، ئەوكاتە بەهانەی هەیەو، چاوپۆشی لێ دەكرێت.

## باسێك: {حوكمی ئەو كەسەی نازانێت بەجوانی سورەتی (الْفَاتِحَة) بخوێنێتەوە}

ئەگەر كەسێك نەیتوانی بە ڕاستیو درووستی سورەتی (الْفَاتِحَة) بخوێنێت، با بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەكانی ئەو لە سورەتەكانی تر قورئان بخوێنێت. خۆ ئەگەر هیچ ئایەتێكی قورئانی بە درووستی نەدەزانی، ئەوا با بە ئەندازەی ئایەتەكانی سورەتی (الْفَاتِحَة) زیكری وەكو تەسبیحاتو (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ)و هاووێنەكانیان بخوێنێت. خۆ ئەگەر هیچ زیكرێكیشی بە درووستی نەدەزانیو، كاتەكەش ئەوەندە نەبوو تا فێری ببێت، ئەوا با بە ئەندازەی سورەتەكە بەبێدەنگی ڕابوەستێتو، پاشان ڕكوع بباتو، نوێژەكەشی درووستە، بە مەرجێك كەمتەرخەمی نەكردبێت لە فێربووندا. خۆ ئەگەر كەمتەرخەمی كردبوو، ئەوا پێویستە لەسەری نوێژەكەی دووبارە بكاتەوە.

جا هەرچۆنێك بێت، ئەگەر بتوانێت، دەبێت خۆی فێری خوێندنـەوەی سـورەتی (الْفَاتِحَة) بكات.

بەلاّم ئەگەر بە زمانی غەیرە عەرەبی دەیزانی مانای سورەتی (الْفَاتِحَة) بخوێنێتو، بە عەرەبی نەیدەزانی، ئەوا درووست نیە بە غەیری عەرەبی بیخوێنێـت، بـەڵكو بـە كەستێكی نەتوانكار دادەنرێتو، ئەو كاتەش با شتێكی تـر بخوێنێـت، وەكـو باسمـان كرد.

## باسێك: {حوكمی خوێندنی سورەتێك لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە}

با نوێژخوێن لـەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتێكی تر ، یان بەشـە سـورەتێك بخوێنێتو، ئەوەش سونەتە. ئەگـەر نەشـی خوێنێـت، نوێژەكـەی هـەر درووسـتەو، سەجدەی سەهویش نابات، ئیتر نوێژی فەرز بكات یان سونەت.

بەپێی ڕاستترینی ئەو دوو بۆچوونەی كە لـەم مەسەلـەدا هاتوون، سونەت نیە لـە نوێژی مردوودا سورەتی تر بخوێنرێت، چونكە نوێژی مردوو وا دانراوە كـە كـورت بێت.

پاشان كەسی نوێژخوێن خۆی سەرپشكە: ئەگەر ویسـتی بـا سـورەتێكی تـەواو بخوێنێتو، ئەگەر ویستیشی با بەشە سورەتێك بخوێنێت. بەلاّم خوێنـدنی سـورەتێكی كورت باشترە لـەوەی كە بە ئەندازەی ئەو سورەتە لـە سورەتێكی درێژ بخوێنرێت.

سونەتیشە ئەو سورەتەی كە دەیخوێنێت، بەپێی ڕیزبەنـدی سـورەتەكانی قورئـان بێت. واتە: با لـە ڕكاتی دوەمدا سورەتێك بخوێنێت، كە لـە ڕیزبەنـدی سـورەتەكاندا لـەدوای سورەتەكەی ڕكـاتی یەكەمـەوە بێـت. خـۆ ئەگـەر وایشـی نـەكرد، هـەر درووستە.

سونەتیشە سورەتەکە لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە بخوێنێت. خۆ ئەگەر لەپێش ئەوەوە خوێندی، ئەوا خوێندنی سورەتەکەی بۆ حسێب ناکرێت.

ئەوجا بزانە، ئەوەی باسمان کرد، کە سونەتە سورەتێك لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە بخوێنرێت، ئەوە تەنها بۆ کەسی پێشنوێژەو، بۆ کەسێکیشە کە بە تەنها نوێژ بکاتو، بۆ کەسی شوێنکەوتووشە لەو نوێژانەی، کە پێشنوێژەکە بە دەنگی نزم قورئانیان تێدا دەخوێنێت. بەڵام ئەو نوێژانەی کە پێشنوێژەکە بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێنێت، ئەگەر شوێنکەوتوەکە گوێی لە دەنگی قورئان خوێندنی پێشنوێژەکەوە بوو، ئەوا با زیاد لە سورەتی (الْفَاتِحَة) هیچی تر نەخوێنێت. بەڵام ئەگەر گوێی لێوە نەبوو، یان گوێی لە هەمهەمەیەکەوە بوو، لێی تێ نەدەگەیشت، ئەوا بەلای ڕاستترین بۆچوونەوە سونەتە ئەو شوێنکەوتوە سورەتەکە بخوێنێت، بەڵام بە جۆرێك، کە تەشویش بۆ کەسی تر دروست نەکات.

سونەتە ئەو سورەتەی لە نوێژی بەیانیو نیوەڕۆدا دەخوێنرێت یەکێك بێت لە سورەتە درێژەکانی (سورەتی الْحُجُرَات بەدواوە). لە نوێژی عەسرو عیشاشدا، لە سورەتە مامناوەندەکانی ئەو سورەتانە بێتو، لە نوێژی مەغریبیشدا لە سورەتە کورتەکانی ئەو سورەتانە بێت. خۆ ئەگەر پێشنوێژ بوو، ئەوا با کەم بخوێنێت، مەگەر بزانێت، کە شوێنکەوتوەکان سورەتە درێژەکانیان پێ خۆشترە.

سونەتە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سورەتی {(الم * تَنْزِيلُ) واتە: سورەتی: السَّجْدَةَ} بخوێنێتو، لە ڕکاتی دوەمیشدا (هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ) (واتە: سورەتی: الْإِنْسَان) بخوێنێت[1]و، بە تەواوەتیش بیانخوێنێتو، ئەوەش کە هەندێك خەڵك دەیکەنو، بەشێکی ئەو دوو سورەتە دەخوێنن، ئەوە پێچەوانەی سونەتە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٠٣ / بە ژمارە: ٨٥١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٩٩ / بە ژمارە: ٨٨٠.

سونەتیشە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جەژنو نوێژە بارانەدا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتی (ق) بخوێنێتو، لە ڕکاتی دوەمیشدا (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ) (واتە: سورەتی: الْقَمَر) بخوێنێت.[1] خۆ ئەگەر بیەوێت، دەتوانێت لە ڕکاتی یەکەمدا (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) (واتە: سورەتی: الْأَعْلَى)و، لە ڕکاتی دوەمیشدا (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) (واتە: سورەتی: الْغَاشِيَة) بخوێنێت.[2] چونکە هەردووکیان سونەتن.

سونەتیشە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جومعەدا سورەتی (الْجُمُعَة) بخوێنێتو، لە ڕکاتی دوەمیشدا سورەتی (الْمُنَافِقُوْن) بخوێنێت. خۆ ئەگەر بیەوێت، دەتوانێت لە ڕکاتی یەکەمدا (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى)و، لە ڕکاتی دوەمیشدا (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) بخوێنێت [3] چونکە هەردووکیان سونەتن.

ئەوجا با نوێژخوێن خۆی لەوە بپارێزێت، کە بەشێك لەو سورەتانە لەو نوێژانەدا بخوێنێت. خۆ ئەگەر ویستی کەمی پێ بچێت، دەتوانێت ئایەتەکان بەسەریەکەوە بخوێنێتو، زۆریش پەلەی لێ نەکات.

سونەتیشە لە دوو ڕکاتە سونەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لە ڕکاتی یەکەمیاندا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە ئایەتی ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٠٧ / بە ژمارە: ٨٩١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەوەی کە ئیمامی نەوەوی دەربارەی نوێژە بارانە فەرموویەتی، من بەڕاشکاوانە لە حەدیسدا نەمبینیوە. ئەوجا خۆی حەدیسێکی (حَسَن) لەبارەی نوێژە بارانەوە ڕیوایەت دەکات لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا نوێژی بۆ کردین، هەروەکو چۆن نوێژی جەژنمان بۆ بکات. بەمەش دەکرێت بوترێت: ئەوەی لە نوێژی جەژندا سونەتبێت بخوێنرێت، لە نوێژە بارانەشدا هەر سونەتە بخوێنرێت. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٤٧٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٩٨ / بە ژمارە: ٨٧٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٩٨ / بە ژمارە: ٨٧٨.

النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ [الْبَقَرَة: ١٣٦] بخوێنێت‌و، لە ڕکاتی دووەمیشدا ئایەتی ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ [آل عِمْرَان: ٦٤] بخوێنێت. ئەگەر بیشیەوێت، دەتوانێت لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)و، لە ڕکاتی دووەمیشدا سورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) بخوێنێت. چونکە هەردووکیان لە صەحیحی موسلیمدا هاتون، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کردوونی.(١)

سونەتیشە لە دوو ڕکاتە سونەتەکەی دوای نوێژی مەغریب‌و، لە دوو ڕکاتەکەی (طَوَاف)و سووڕانەوە بە دەوری کەعبەی پیرۆزو، لە دوو ڕکاتەکەی نوێژی (اسْتِخَارَة)دا، لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)و، لە ڕکاتی دووەمیشدا سورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) بخوێنێت.(٢)

سەبارەت بە نوێژی (وِتْر)یش، ئەگەر سێ ڕکاتی کرد، ئەوە لە ڕکاتی یەکەمدا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾و، لە دووەمیشدا سورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾و، لە سێیەمیشدا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٠٢ / بە هەردوو ژمارە: ٧٢٦ - ٧٢٧.

(٢) سەبارەت بە دوو ڕکاتە سونەتەکەی دوای نوێژی مەغریب ئیمامی (أَحْمَد) حەدیسێکی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە ڕیوایەت کردوەو، لێکۆڵەرەوەکانیش فەرموویانە: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیم. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَام أَحْمَد / ٨ / ٥٠٩ / بە ژمارە: ٤٩٠٩.

سەبارەت بە دوو ڕکاتەکەی (طَوَاف)یش بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٨٨٦ - ٨٩١ / بە ژمارە: ١٢١٨.

سەبارەت بە دوو ڕکاتەکەی نوێژی (اسْتِخَارَة)ش حافظی عێراقی‌و شێخی عەسقەلانی فەرموویانە: لە حەدیسدا هیچمان لەبارەیەوە نەبینیوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٤٩٥.

لەگەڵ سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بخوێنێت.[1]

جا هەموو ئەمانەی باسمان کردن، حەدیسی مەشهوریان لەبارەوە هاتوە، چی لە کتێبە صەحیحەکانداو، چی لە کتێبەکانی تردا، ئێمەش لەبەر مەشهووریەکەیان باسمان نەکردن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.[2]

## باسێك: {نەخوێندن و لەدەست دەرچوونی سورەتە سونەتەکەی ڕکاتی یەکەم و، خوێندنەوەی لە ڕکاتی دوەمدا}

ئەگەر لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جومعەدا سورەتی (الْجُمُعَة)ی نەخوێند، ئەوا با لە ڕکاتی دوەمدا لەگەڵ سورەتی (الْمُنَافِقُوْن)دا بیانخوێنێت. بە هەمان شێوە لە نوێژی جەژن و نوێژە بارانەو، نوێژی (وِتْر)و سونەتی نوێژی بەیانی و نوێژەکانی

(١) ئەو حەدیسەی باسی خوێندنی ئەم سوورەتانە دەکات لە نوێژی (وِتْر)دا دایکە (عَائِشَة) ڕیوایەتی کردوەو، شێخی (ابْنُ الْمُلَقِّن)یش فەرموویەتی: ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)و (تِرْمِذِيّ)و (دَارَقُطْنِيّ)و (ابْنُ حِبَّان) ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (غَرِيْب)ەو، ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم. بڕوانە: خُلاصَةُ الْبَدْرِ الْمُنِيْر / ١ / ١٧٩ / بە ژمارە: ٦١٠.

(٢) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: تەنها سێ مەسئەلەیان نەبێت، کە من لە حەدیسدا هیچم لەبارەیانەوە نەبینیوە. ئەوانیش:

- خوێندنی سورەتێکی دیاریکراو لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة) لە نوێژی (اسْتِخَارَة)دا.
- قورئانی زۆر خوێندن لەلایەن پێشنوێژەوە، ئەگەر شوێنکەوتوەکانی پێیان خۆشبوو.
- خۆپاراستن لە خوێندنی چەند ئایەتێك لەو سورەتانەی، کە سونەتبوو لە هەندێك نوێژدا بخوێنرێن. بڕوانە: نَتَائِجُ الأفْكَار / ١ / ٥٠١.

تریش، که باسمان کـردن، ئەگـەر لـە ڕکـاتی یەکەمـدا ئـەوەی کـە سـونەت بـوو نەخوێنرا، ئەوا با لـە ڕکاتی دوەمدا ئەوەی یەکەمو دوەمـیش بخوێنێـت، بـۆ ئـەوەی نوێژەکەی هەردوو سورەتەکەی تێدابێت.

ئەگەر لـە ڕکاتی یەکەمی نوێژی جومعەدا سورەتی (الْمُنَافِقُوْن)ی خوێند، ئەوا بـا لـە ڕکاتی دوەمدا سورەتی (الْجُمُعَة) بخوێنێتو، سورەتی (الْمُنَـــافِقُوْن)یـش دووبـارە نەکاتەوە.

جا بەڵگەی ئەمانەم بە درێژی لـە ڕوون کردنەوەی کتێبـی (الْمُهَـــذَّب)دا بـاس کردوە.[1]

## باسێك: {درێژ کردنەوەی خوێندنی قورئان لە ڕکاتی یەکەمدا}

لـە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (درووودی خـوای لەسـەر بێـت) ڕکاتی یەکـەمی نوێـژی بـەیانیو نوێـژەکانی تریشـی لــە ڕکـاتی دوەم زیـاتر درێـژ دەکردەوە.[2]

جا زۆربەی هاوەڵانمان ئەم حەدیسەیان تەئویل کردوەو، فەرموویانە: (لَا يُطَـــوِّلُ الْأُولَى عَلَى الثَّانِيَةِ. واتە: ڕکاتی یەکەمی لە ڕکاتی دوەم درێژتر نەدەکردەوە!) بـەڵام

(١) وەکو شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: من بەڵگـەکانی ئـەم باسـەم لــە ڕوون کردنـەوەی کتێبی (الْمُهَذَّب)دا نەبینیەوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٥٠١.

(٢) وەکو هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو قَتَادَة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (أَنَّ النَّبِيَّ –صَـــلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ– كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ فِي الْأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَاب وَسُـــورَتَيْنِ، وَفِـــي الـــرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَاب، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ، وَيُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مَا لَا يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، وَهَكَذَا فِي الْعَصْرِ، وَهَكَذَا فِي الصُّبْحِ). بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَـــارِيّ / ١ / ٢٦٩ / بـە ژمـارە: ٧٤٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٣٣ / بە ژمارە: ٤٥١.

موحەقیقەکانیان وای بۆ چوون، کە سونەتە ڕکاتی یەکـەم لـە ڕکـاتی دوەم درێـژتر بێت، لەبەر ئەم حەدیسە (صَحِیْح)ـە.

هەروەها یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە ڕکـاتی سـێیەمو چـوارەم لـە درێـژیو کورتیدا وەکو یەکن، لەگەڵ ئەوەی، کە لە ڕکاتی یەکەمو دوەم کورتترن.

ڕاستترین بۆچوونیش لەسەر ئەوەیە، کـە لـە سـونەت نیـە لـە ڕکـاتی سـێیەمو چوارەمدا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە هیچ ئایەتێك بخوێنرێت. خـۆ ئەگـەر بڵـێین: لەوانیشدا سونەتە، ئەوە ڕاستترین بۆچوون لەسەر ئەوەیـە، کـە هـەردوو ڕکاتەکـە وەکو یەك درێژ دەکرێنەوە، وتراویشە: ڕکـاتی سـێیەم لـە ڕکـاتی چـوارەم درێـژتر دەکرێتەوە.

## باسێك: {جێگاکانی بەرز کردنەوەو نزم کردنەوەی دەنگ لەناو نوێژدا}

زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە قورئـان لـە نوێـژی بـەیانیو، لـە هـەردوو ڕکاتی یەکەمو دوەمی نوێژی مەغریبو نوێژی عیشادا بە دەنگی بەرز دەخوێنرێت.

هەروەها کۆدەنگیشن لەسەر ئەوەی، کە لە نوێـژی نیـوەڕۆو عەسـرو، سـێیەم ڕکـاتی نوێـژی مـەغریبو، سـێیەمو چـوارەمی نوێـژی عیشـادا بـە دەنگـی نـزم دەخوێنرێت.

هەروەها کۆدەنگیشن لەسەر ئەوەی، کە لە نوێژی جومعەو هەردوو جەژنەکەو تەراویحو (وِتْر)ی دوای تەراویحیشدا بە دەنگی بەرز دەخوێنرێت.

جا ئەمە بۆ پێشنوێژ سونەتەو، بۆ کەسـی تـەنهاش هـەر سـونەتە، تایبـەت لـەو نوێژانەی، کە بە تەنها دەکرێن.

سەبارەت بە شوێنکەوتووش زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە لە هیچکام لەو نوێژانەدا دەنگ بەرز ناکاتەوە.

سونەتیشە لە نوێژی مانگ گیراندا قورئان بە دەنگی بەرز بخوێنرێتو، لە نوێژی خۆر گیرانیشدا بە دەنگی نزم بخوێنرێتو، لە نوێژە بارانەشدا بە دەنگی بەرز بخوێنرێتو، لە نوێژی مردووشدا بە دەنگی نزم بخوێنرێت، ئەگەر لە ڕۆژدا نوێژی لەسەر کرا، بە هەمان شێوە ئەگەر لە شەویشدا نوێژی لەسەر کرا، هەر بەلای بۆچوونی ڕاستی هەڵبژێردراوەوە سونەتە بە دەنگی نزم بخوێنرێت.

لە هیچ نوێژێکی سونەتی ڕۆژیشدا قورئان بە دەنگی بەرز ناخوێنرێت، بێجگە لە نوێژی جەژنو نوێژە بارانە، کە باسمان کردن.

هاوەڵانیشمان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بەو نوێژە سونەتانەی لە شەودا دەکرێن:

- وتراوە: بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا ناخوێنرێت.
- وتراویشە: بە دەنگی بەرز دەخوێنرێت.
- بۆچوونی سێیەمیش -کە ڕاسترینیانەو، قاضی حوسەینو ئیمامی (بَغَوِيّ)یش فەرموویانە هەر ئەمە ڕاستە-: ئەوەیە، کە بە دەنگێکی مامناوەند -نە بەرزو نە نزم- قورئانیان تێدا دەخوێنرێت.[1]

---

(١) لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کە شەوێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریف دەهێنێت بۆ مزگەوت، دەبینێت وا ئیمامی (أَبُو بَكْر) (خوای لێ ڕازی بێت) بە دەنگی نزم نوێژ دەکاتو، ئیمامی (عُمَر)یش (خوای لێ ڕازی بێت) بە دەنگی بەرز نوێژ دەکات. جا کە دواتر هاتن بۆ خزمەتی، بە ئیمامی (أَبُو بَكْر)ی فەرموو: "بەلاتدا تێپەڕیم، بە دەنگی نزم نوێژت دەکرد!" ئەویش عەرزی کرد: "ئەو کەسەی لەخزمەتیدا قسەم دەکرد گوێی لێمبوو -مەبەستی خوای گەورە بوە-". ئەوجا بە ئیمامی (عُمَر)یشی فەرموو: "بەلاتدا تێپەڕیم، بە دەنگی بەرز نوێژت دەکرد!" ئەویش عەرزی کرد: "قوربان، هەم کەسی خەولێکەوتوو

جا ئەگەر نوێـژێکی لـە شـەودا لەدەسـت دەرچـوو، دواتـر لـە ڕۆژدا قـەزای کردەوە، یان نوێـژێکی لـە ڕۆژدا لەدەسـت دەرچـوو، دواتـر لـە شـەودا قـەزای کـردەوە، ئایـا سـەبارەت بـە دەنگـی بـەرزو دەنگـی نـزم، حیسـاب بـۆ کـاتی لەدەستچوونی نوێژەکە بکرێت، یان بۆ کاتی قەزاکردنـەوەی؟ ئـەوە دوو بۆچـوونی لەسەرە:

- بەهێزترینیان ئەوەیە، کە حیساب بۆ کاتی قەزاکردنەوەی نوێژەکە دەکرێـت. (واتە: ئەگەر نوێژی ڕۆژی لە شەودا قەزاکردەوە، بە دەنگی نزم دەکرێتو، بە پێچەوانەشەوە بە دەنگی بەرز).
- وتراویشە: هەرچۆنێك بێت هەر بە دەنگی نزم دەکرێت.

بشزانە، کە خوێندنی قورئان بەدەنگی بـەرز لـەو جێگایانـەی باسمـان کـردنو، خوێندنیشی بە دەنگی نزم لەو جێگایانەی باسمان کردن، کارێکی سـونەتەو، واجـب نیە. بۆیە ئەگەر لەو جێگەی کە دەبوو بە دەنگی نزم بخوێنرێـت، نوێژخوێنەکـە بـە دەنگی بەرز خوێندی، یان لەو جێگەی کە دەبوو بە دەنگی بەرز بخوێنرێت، ئەو بـە دەنگی نزم خوێندی، ئەوە نوێژەکەی هـەر درووسـتە، بـەڵام کـارێکی ناپەسـەندی کردوەو، سەجدەی سەهویش نابات.

جا پێشتریش باسمان کرد، کە خوێندنی قورئانو زیکرەکانی ناو نوێژ بـە دەنگـی نزم دەبێت بەجۆرێکی وەهابێت، کە نوێژخوێنەکە گوێی لە دەنگی خۆی بێت. بۆیە

---

خەبەردەکەمەوەو، هەم شەیتانیش دەردەکەم". جا پێغەمبەری خوا بە ئیمامی (أَبُـــو بَكْـــر)ی فەرموو: "تۆ کەمێك دەنگت بەرز بکەرەوە"و، بە ئیمامی (عُمَر)یشی فەرموو: "تۆش کەمێك دەنگت نزم بکەرەوە". بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٢٣ / بە ژمـارە: ١٣٢٩، وصَـــحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَةَ / ٢ / ١٨٩ / بە ژمارە: ١١٦١، وصَحِيْحُ ابْـــنِ حِبَّـــان / ٣ / ٦ / بـە ژمـارە: ٧٣٣، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٤٥٤ / بـە ژمـارە: ١١٦٨. ئیمـامی (حَـاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.

ئەگەر گوێی لە دەنگی خۆی نەبوو -بێ ئەوەی هیچ خەلەلو نوقسانیەك لە هێزی بیستنیدا هەبێت- ئەوا قورئانەكەو زیكرەكەشی درووست نیە.

## باسێك: {ئەو جێگایانەی پێشنوێژ بۆ ماوەیەكی كەم تێیاندا بێدەنگ دەبێت}

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە بۆ پێشنوێژ لەو نوێژانەدا كە بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێنێت، لە چوار جێگەدا بۆ ماوەیەك بە بێدەنگی ڕاوەستێت (واتە: ئەگەر زیكریشی كرد بە دەنگی نزم بیكات):

- یەكەمیان: لەدوای (اللّٰهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستن، بۆئەوەی دوعای سەرەتای دەست پێكردنی نوێژ بخوێنێت.
- دوەمیش: لەدوای لێبوونەوە لە سورەتی (الْفَاتِحَة)، بۆ ماوەیەكی زۆر كورت بێدەنگ دەبێت لە نێوان كۆتایی سورەتەكەو (آمِيْن) كردندا، تاوەكو بزانرێت، كە (آمِيْن)ـەكە بەشێك نیە لە سورەتی (الْفَاتِحَة).[1]

---

(١) جا ئەندازەی وەستانەكە با ئەوەندە بێت، كە تێیدا بڵێت: (رَبِّ اغْفِرْ لِي). چونكە لە هاوەڵی خۆشەویست (وَائِل)ی كوڕی (حُجْر)ەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە گوێی لێبوە پێغەمبەری خوا لەدوای خوێندنی ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ فەرموویەتی: (رَبِّ اغْفِرْ لِي آمِينَ). بڕوانە: الْمُعْجَمُ الْكَبِيْر / ٢٢ / ٤٢ / بە ژمارە: ١٠٧، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٥٨ / بە ژمارە: ٢٢٨١. شێخی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: (أَحْمَد)ی كوڕی (عَبْدُالْجَبَّار)ی (عُطَارِدِيّ) لە ڕشتەكەیدایە، ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ) بە كەسێكی متمانەداری داناوەو، (أَبُو كُرَيْب)یش وەسفو سەنای باشی كردوەو، كۆمەڵێكیش لە زانایان بە لاوازیان داناوە. بڕوانە: مجمع الزوائد / ٢ / ١١٣ / بە ژمارە: ٢٦٦٨. شێخی (ابْنُ حَجَر)ی (هَيْتَمِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْمُحْتَاج فِيْ شَرْحِ الْمِنْهَاج / ٢ / ٤٩.

- سێیەمیش: لەدوای (آمِيْن) کردنـەوە بـۆ ماوەیـەکی درێـژی وەهـا بێـدەنگ دەبێت، کە شوێنکەوتوو فریا بکەوێت سورەتی (الْفَاتِحَة)ی تێدا بخوێنێت.
- چوارەمیش: لـەدوای لێبوونەوە لـە سورەتەکەی دوای سـورەتی (الْفَاتِحَة)وە، بۆ جیاکردنەوەی قورئانەکە لـە (اللهُ أكْبَر)ی دابەزین بۆ ڕکوع.[1]

## باسێك: {حوكمی وتنی (آمِيْن)و، شێوازەكانی خوێندنەوەكەی}

**ئەگەر لـە سورەتی (الْفَاتِحَة) بوویەوە، سونەتە بڵێت: (آمِيْن).**

ئەو حەدیسە صەحیحانەی لـەم بـارەوە هـاتوون زۆرنو، مەشـهورن، کـە وتنـی (آمِيْن) فەزڵو پاداشتی گەورەی هەیە.

جا وتنی (آمِيْن) لـە دوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە بۆ هەموو قورئانخوێنێك سـونەتە، ئیتر لـەناو نوێژدا بێت، یان لـە دەرەوەی نوێژدا بێت.

(آمِيْن)یش لـەڕووی زمانەوانیەوە بە چوار جۆر دەخوێنرێتەوە:

---

(١) هاوەڵی خۆشەویسـت (سَـمُرَة)ی کـوڕی (جُنْـدُب) (خـوای لێ ڕازی بێـت) فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا لـە دوو جێگەدا بێـدەنگ دەبـوو: (یەکـەم): ئەگـەر سـەرەتا بچـوایەتە نـاو نوێژەوە. (دووەم): ئەگەر لـە قورئان خوێندن بوایەتەوە. جا هاوەڵی خۆشـەویسـت (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَيْن) (خـوای لێ ڕازی بێـت) ئینکـاری ئـەم فەرمایشـتەی (سَـمُرَة)ی کـرد، بۆیـە نامەیەکیان نارد بۆ هاوەڵی خۆشەویست (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش وەڵامەکەی بۆ ناردنەوەو، تێیدا نوسیبووی: (سَمُرَة) ڕاست دەکات. بڕوانە: مُسْـنَدُ الْإِمَـامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٣٣ / ٣٧٧ – ٣٧٨ / بە ژمارە: ٢٠٢٢٨، وسُنَنُ الدَّارِمِيّ / ١ / ٣١٣ / بە ژمارە: ١٢٤٣، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٦٦ / بە ژمارە: ٧٧٨.

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. پاشـان فەرموویـەتی: دەکرێـت مەبەست بـە جێگـەی دووەم دوای سـورەتی (الْفَاتِحَـة) بێـتو، دەشـکرێت دوای سـورەتە سونەتەکە بێت. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٢٣ – ٢٥.

- فەصیحترینیانو مەشهورترینیان بریتیە لە (آمِیْن).
- دوەمیشیان بریتیە لە (أمِیْن).
- سێیەمیشیان بریتیە لە بە (إمَالَـــة) خوێندنـەوەی ئەلفەکـە. (واتـە: بوترێـت: ئێمین).
- چوارەمیش بریتیە لە (آمِّیْن).

جا یەکەمو دوەم هەردووکیان مەشهورنو، سێیەمو چوارەمیش شێخی (وَاحِدِيّ) لە سەرەتای کتێبی (الْبَسِيْط)دا هێناونیو، یەکەم دانەشیان هەڵبژێردراوەکەیانە.[1]

ئەوجا منیش لە کتێبی (تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَات)دا بە درێژی باسـی ئـەم چـوار شـێوازە خوێندنەوەیـەم کـردوەو، ماناکانیشـیانم لێکداوەتـەوەو، ڕوون کردنـەوەم لەسەر داونو، ئەوەش پەیوەندی پێیانەوە هەبێت، باسم کردوە.

هەروەها وتنی (آمِیْن) لە نوێژدا بۆ هەموو کەسێك سونەتە، چی پێشـنوێژ بێـت، یان شوێنکەوتوو، یان کەسی تەنها. جا پێشنوێژو کەسی تەنها (آمِیْن)ـەکە بە دەنگی بەرز دەکەن، لەو نوێژانەدا، کە بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێنرێـت (وەکـو: نوێـژی بـەیانیو مـەغریبو عیشـا). بۆچـوونی ڕاسـتیش لەسـەر ئەوەیـە، کـە شوێنکەوتووش هەر بە دەنگی بەرز دەیکات، ئیتر جەماعەتەکە کەم بێت یان زۆر.

هەروەها سونەتە پێشنوێژو شـوێنکەوتوو بەیەکـەوەو لـە یـەك کاتـدا (آمِـــیْن) بکەنو، پێشوپاش نەکەون.

---

(١) چونکە حەدیسێکی (صَحِيْح)ی لەبارەوە هاتوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویسـت (وَائِل)ی کوڕی (حُجْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو گوێی لێبوە پێغەمبەری خوا لەدوای خوێندنی ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ فەرموویـەتی: (آمِینَ)و، ئەلفەکەشـی درێژکردۆتـەوە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٣١ / ١٣٦ / بە ژمارە: ١٨٨٤٢، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٢٧ / بە ژمارە: ٢٤٨، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ١ / ٣٠٧ / بە ژمـارە: ٩٥٣، وسُنَنُ الدَّارَقُطْنِيّ / ١ / ٣٣٣ / بە ژمارە: ١. ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.

ئەوجا بێجگە لەم زیکرە، لە ناو نوێژدا هیچ زیکرێکی تر نیە، کە سونەت بێت پێشنوێژو شوێنکەوتوو بەیەکەوەو لەیەك کاتدا بیانکەن. بەڵام زیکرەکانی تر، دەبێت شوێنکەوتوو لەدوای پێشنوێژەوە بیانکات.

## باسێك: {ئەگەر لەنوێژدا گەیشت بە ئایەتێك، کە باسی سۆزو میهرەبانی خوای تێدابوو، یان گەیشت بە ئایەتێك، کە باسی سزاو تۆڵەی تێدابوو}

ئەگەر کەسێك لەناو نوێژدا یان لە دەرەوەی نوێژدا قورئان بخوێنێت‌و، بگات بە ئایەتێك، کە باسی سۆزو ڕەحمەتی خوای گەورەی تێدابێت، سونەتە داوای فەزڵ‌و میهرەبانی لە خوای گەورە بکات. وە ئەگەر بگات بە ئایەتێك، کە باسی سزای تێدا بێت، سونەتە پەنا بە خوای گەورە بگرێت لە ئاگری دۆزەخ، یان لە سزا، یان لە شەڕ، یان لە نارەحەتی، یان بڵێت: "اللَّهُمَّ، إِنِّى أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ" واتە: خوایە من داوای سەلامەتی‌و بێوەییت لێ دەکەم... یان شتێکی لەو شێوە.

هەروەها ئەگەر بگات بە ئایەتێك، کە باسی پاکی‌و بێگەردی خوای گەورەی تێدابێت، سونەتە بڵێت: "سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى" واتە: پاکی‌و بێگەردی بۆ خوای گەورەیە، یان بڵێت: "تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ" واتە: بەرزی‌و پیرۆزی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، یان بڵێت: "جَلَّتْ عَظَمَةُ رَبِّنَا" واتە: گەورەیی بۆ پەروەردگارمانە... یان شتێکی لەو جۆرە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)ی کوڕی (يَمَان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: شەوێك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لەسەر بێت) نوێژم کرد، ئەویش دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة)، منیش (لە دڵی خۆمدا) وتم: لە ئایەتی سەدەمدا دەچێتە ڕکوع. پاشان هەر بەردەوام بوو،

ئیتر وتم: هەموو نوێژەکەی پێ تەواو دەکات (واتە: دەیکات بە دوو بەشەوە: نیوەی لە ڕکاتی یەکەمو نیوەکەی تریشی لە ڕکاتی دوەم). پاشان هەر بەردەوام بوو، ئیتر وتم: هەمووی لەم ڕکاتەدا تەواو دەکاتو، ئەوجا دەچێتە ڕکوع. پاشان هەر لەو ڕکاتەدا دەستی کرد بە سورەتی (النِّسَاء)و، ئەویشی خوێند. پاشان دەستی کرد بە سورەتی (آل عِمْرَان)و، ئەویشی خوێندو، بە لەسەرخۆییش قورئانی دەخوێند: جا ئەگەر بگەیشتایە بە ئایەتێك، تەسبیحاتی تێدا بوایە، ئەویش تەسبیحاتی دەکردو، ئەگەر بگەیشتایە بە ئایەتێك، نزاو پاڕانەوەی تێدا بوایە، ئەویش نزای دەکردو دەپاڕایەوەو، ئەگەر بگەیشتایە بە ئایەتێك، کە پەنابەخواگرتنی تێدا بوایە، ئەویش پەنای بەخوا دەگرت. ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.(١)

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەم تەسبیحاتو نزاو پاڕانەوەو پەنابەخواگرتنە بۆ قورئانخوێن لە نوێژداو لە دەرەوەی نوێژیشدا هەر سونەتە. ئیتر نوێژخوێنەکە پێشنوێژ بێت، یان شوێنکەوتوو، یان نوێژخوێنی تەنها. چونکە ئەوانە دوعان، بۆیە هەموو ئەو کەسانە لە کردنیاندا یەکسانن، هەروەکو چۆن هەموویان لە (آمِيْن) کردندا یەکسانن.

هەروەها بۆ هەموو کەسێکیش سونەتە، کە:

- ئەگەر ئایەتی ﴿أَلَيْسَ اللهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ [التِّين: ٨]ی خوێند، واتە: {ئایا خوای گەورە لە هەموو فەرمانڕاوەیەك کاربەجێتر نیە؟}، ئەویش بڵێت: (بَلَى،

(١) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٦ / ٧٧٢. ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە دروستە لە خوێندنی قورئاندا تەرتیبو ڕیزبەندی سورەتەکان ڕەچاو نەکرێت، چونکە ئەگەر دروست نەبوایە، پێغەمبەری خوا سورەتی (النِّسَاء)ی لەپێش سورەتی (آل عِمْرَان)ەوە نەدەخوێند. ئەگەرچی زۆرێك لە زانایان پێیان وایە، سونەتە ڕیزبەندی سورەتەکان ڕەچاو بکرێتو، پاشوپێشخستنیان کارێکی ناپەسەندە. بروانە: شَرْحُ النَّوَوِيّ عَلَى صَحِيْح مُسْلِم / ٦ / ٦١ – ٦٢، والتِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن (تَحْقِيْق: مُحَمَّد الْحَجَّار) / ٩٨ – ٩٩.

وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ). واته: (بەڵێ لەهەموویان کاربەجێترەو، ئێمەش یەکێکین لەوانەی شایەتی لەسەر ئەوە دەدەین).

- ئەگەر ئایەتی ﴿أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ [الْقِيَامَة: ٤٠]ی خوێند، واته: {ئایا ئەو خوایە توانای ئەوەی نیە، کە مردووەکان زیندوو بکاتەوە؟}، ئەویش بڵێت: (بَلَى، أشْهَدُ). واتە: (بەڵێ شایەتی دەدەم، کە توانی ئەوەی هەیە).
- ئەگەر ئایەتی ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ [الْمُرْسَلات: ٥٠]ی خوێند، واته: {ئیتر ئەوانە لەدوای قورئان باوەڕ بە چی فەرمایشتێکی تر دەکەن؟}، ئەویش بڵێت: (آمَنْتُ بِاللَّهِ). واته: (باوەڕی تەواوم بەخوای گەورە هەیە).[1]
- ئەگەر ئایەتی ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ [الْأعْلَى: ١]ی خوێند، واتە: {ناوی پەروەردگاری بەرزو بالای خۆت پاكو خاوێن ڕابگرە}، ئەویش بڵێت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى).[2]

---

(١) ئیمامی (أحْمَد)و (أَبُوْ دَاوُد)و (بَيْهَقِيّ)و غەیری ئەوانیش حەدیسێکیان ڕیوایەت کردوە لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا فەرمانی کردوە بە کردنی ئەم سێ زیکرە لەکاتی خوێندنی ئەو ئایەتانەدا. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإمَامِ أحْمَد / ١٢ / ٣٥٥ / بە ژمارە: ٧٣٩١، وسُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٧ / بە ژمارە: ٨٨٧، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ٣١٠ / بە ژمارە: ٣٥٠٨.

جا لەبەرئەوەی لە ڕشتەی گێڕانەوەی ئەم حەدیسەدا کەسێکی نەناسراو هەیە، بۆیە زۆرێك لە زانایان بە حەدیسێکی لاوازیان داناوە. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. چونکە لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە پاڵپشت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٤٢.

(٢) هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) گێڕاویتیەوە لە پێغەمبەری خواوە، کە ئەگەر ئەو ئایەتەی بخوێندایە، وای دەفەرموو. ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ٩٧٠.

جا لە نوێژداو لە دەرەوەی نوێژیشدا سونەتە هەموو ئەمانە بڵێت.

بەڵگەی ئەمانەشم لە کتێبی (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآنِ)دا بە ڕوونی باس کردوە.[1]

## زیکرەکانی ناو ڕکوع

چەندین حەدیسی (صَحِيْح) لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتوە، کە کاتێك دەیویست بچێتە ڕکوع (اللهُ أَكْبَرُ)ی دەکرد.

جا کردنی ئەو (اللهُ أَكْبَرُ)ەش سونەتە. خۆ ئەگەر نەیکرد ئەوە ناپەسەندەو، نوێژەکەشی بەتاڵ نابێتەوەو، سەجدەی سەهویش نابات.

بە هەمان شێوە هەموو (اللهُ أَكْبَرُ)ەکانی تری ناو نوێژیش هەر سونەتن، بێجگە لە (اللهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستن نەبێت، کە پایەو ڕوکنی نوێژەکەیەو، نوێژەکەش بەو نەبێت دانامەزرێت.

جا پێشتر لە باسی سەرەتای چوونە ناو نوێژەدا باسی ژمارەی (اللهُ أَكْبَرُ)ەکانی ناو نوێژمان کرد.

لە ئیمامی (أَحْمَد)یشەوە ڕیوایەتێك هاتوە، کە هەموو ئەو (اللهُ أَكْبَرُ)انە واجبن.

جا ئایا سونەتە ئەم (اللهُ أَكْبَـــرُ)ی ڕکوعە درێژ بکرێتەوە یان نا؟ ئەوە دوو فەرمایشتی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەسەرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

---

(١) بڕوانە: التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآنِ / ١٢١.

ڕاستڕینیان، کە فەرمایشتە تازەکەیەتی، ئەوەیە کە: سونەتە درێژ بکرێتەوە تا نوێژخوێنەکە خۆی دەچەمێنێتەوەو دەگاتە ئاستی ڕکوع‌و، پاشان تەسبیحاتەکەی ناو ڕکوع بکات.

جا ئەم درێژ کردنەوەش بۆ ئەوەیە، کە هیچ بەشێکی نوێژەکە لە زیکر خاڵی نەبێت. ئەمیش بەپێچەوانەی (اللهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستنەوە، کە بۆچوونی ڕاست لەسەر ئەوەیە درێژ ناکرێتەوە، چونکە نوێژخوێنەکە پێویستی بەوە هەیە، کە نیەتی نوێژەکەی لەگەڵدا بهێنێت. بۆیە ئەگەر درێژی بکاتەوە، ئیتر نیەتهێنانەکەی لەسەر قورس‌و گران دەبێت. بەڵام ئەگەر بەکورتی بیڵێت‌و درێژی نەکاتەوە، ئەوا نیەتەکەی لەسەر ئاسان دەبێت.

بە هەمان شێوە هەموو (اللهُ أَكْبَرُ)ەکانی تریش هەر هەمان حوکمیان هەیەو، سونەتە درێژ بکرێنەوەو، پێشتریش لە {**باسی (اللهُ أَكْبَرُ)ی نوێژ دابەستن**} دا ئەمەمان ڕوون کردەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {تەسبیحاتی ناو ڕکوع}

ئەگەر کەسی نوێژخوێن خۆی چەماندەوەو گەیشتە ئاستی ڕکوع، ئیتر با خۆی بە زیکرەکانی ڕکوعەوە خەریك بکات‌و، بڵێت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ رَبِّي الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) واتە: (پاك‌و بێگەردی بۆ پەروەردگاری گەورەو مەزنی خۆم).

لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، لە حەدیسێکی هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەو ڕکوعە درێژەی، کە لەدوای خوێندنی سورەتەکانی (الْبَقَرَة)و (النِّسَاء)و (آل عِمْرَان)دا بردی،

دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ).[1] واتە سێ جار وای دەفەرموو، وەکو لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا بەڕوونی هاتوە.[2]

لە کتێبی (سُنَن)ەکاندا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا قَالَ أَحَدُكُمْ: "سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ"، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَدْ تَمَّ رُكُوعُهُ».[3] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە سێ جار وتی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، ئەوا ڕکوعەکەی تەواوە".

لە هەردوو صەحیحەکەشدا لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ڕکوع‌و لە سجودیشدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي».[4]

لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە، لە ئیمامی (عَلِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەگەر ڕکوعی ببردایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَمُخِّي،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٦ / بە ژمارە: ٧٧٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٦ / بە ژمارە: ٨٨٦، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ٢٢٤ / بە ژمارە: ١١٣٣. هەروەها لە چەند ڕێگەیەکیشەوە سابت بوە، کە (وَبِحَمْدِهِ)شی بۆ زیاد کراوە. بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْر / ٣ / ٦٠٨ – ٦١٢، والتَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ١ / ٤٣٨ – ٤٣٩.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٦ / بە ژمارە: ٨٨٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٤٦ / بە ژمارە: ٢٦١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٨٧ / بە ژمارە: ٨٩٠، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٨٦ / ٢٣٩١. حەدیسێکی لاوازە، چونکە ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْر / ٣ / ٦٠٦ – ٧١٢، والتَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ١ / ٤٣٧ – ٤٣٨، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ٢٤٢ – ٢٤٣.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧٤ / بە ژمارە: ٧٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٤٨٤.

وَعَظْمِي، وَعَصَبِي».[1] واته: "خوایه من تەنها بۆ تۆ ڕکوعم بردوەو، ئیمانیشم بە تـۆ هێناوەو، تەسلیمی بەرنامەو فەرمانی تۆشم، هێزی بیستن‌و بینینی‌و مـۆخ‌و ئێسـقان‌و دەمارم ملکەچی تۆن".

لـە (سُنَن)ـەکانیشدا هاتوە، کە فەرموویەتی: «خَشَعَ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَمُخِّـي، وَعَظْمِي، وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ».[2] واتـە: "هێـزی بیسـتن‌و بیـنین‌و مۆخ‌و ئێسقانم‌و ئەوەیش قاچم هەڵیگرتوە ملکەچی پەروەردگاری عالـەمن".

لـە صەحیحی موسلیمیشدا لـە (عَائِشَةَ)ی دایکـی ئیماندارانـەوە هـاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لـە ڕکـوع‌و لـە سجودیشـدا دەیفەرموو: «سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ».[3] واتە: "خـوای گـەورە پـاك‌و بێگەردە لـە هەموو عەیب‌و نوقسانیەك‌و، پەروەردگاری فریشتەو جوبرەئیلیشە".

زمانزانان فەرموویانە: (سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ)و (سَبُّوحٌ قَدُّوسٌ)یش هاتوە. جا باشـترین‌و مەشهورترین‌و زۆرترینیان ئەوەی یەکەمیانە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە هاوەڵی خۆشەویست (عَوْفُ)ی کـوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: شەوێك لـە خزمەتی پێغەمبـەری خـوادا (دروودی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٧١.
(٢) ئەم حەدیسە بەم دەقە (وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي) لـە (سُنَن)ـەکاندا نـەهاتوە! بـەڵکو ئیمـامی (شَافِعِيّ)و (أَحْمَد)و (ابْنُ خُزَيْمَة)و (ابْنُ حِبَّان)و (طَحَاوِيّ)و (دَارَقُطْنِيّ)و (طَبَرَانِيّ)و (بَيْهَقِيّ) ڕیوایەتیان کردوە. بڕوانە: مُسْنَدُ الشَّافِعِيِّ / ١ / ٣٨ / بە ژمـارە: ١٥٤، ومُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَد / ٢ / ٢٦٨ / بە ژمـارە: ٩٦٠، وصَحِيْحُ ابْـنِ خُزَيْمَـة / ٢ / ٣٠٦ / بـە ژمـارە: ٦٠٧، وصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٥ / ٢٢٨ / بە ژمـارە: ١٩٠١، وشَرْحُ مَعَانِي الْآثَار / ١ / ٢٣٣ / بـە ژمارە: ١٣٩٩، وسُنَنُ الدَّارَقُطْنِيّ / ١ / ٣٤٢ / بە ژمـارە: ٣، والْمُعْجَمُ الْأَوْسَط / ٥ / ١٧ – ١٨/ بە ژمارە: ٤٥٥٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٨٧ / بە ژمارە: ٢٣٩٧.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٣ / بە ژمارە: ٤٨٧.

خوای لەسەر بێت) هەستام بۆ شەونوێژ کردن، ئەویش دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة) لە سەرەتاوە، جا کە بگەیشتایە بە ئایەتێك، باسی سۆزو ڕەحمی خوای تێدا بوایە، ڕادەوەستاو داوای سۆزو ڕەحمەتی دەکردو دەپاڕایەوە. وە ئەگەر بگەیشتایە بە ئایەتێك، کە باسی سزای تێدا بوایە، ڕادەوەستاو پەنای بەخوا دەگرت. پاشان بە ئەندازەی ڕاوەستانەکەشی ڕکوعی بردو، تێیدا فەرمووی: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ». واتە: "پاکو بێگەردە ئەو خوایەی کە خاوەنی هێزو دەسەلاَتو موڵكو گەورەیيو مەزنیە". پاشان لە سجودیشدا هەمان شتی فەرموو.

ئەمە حەدیسێکی (صَحِيْح)ە، ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ) لە (سُنَن)ەکانیانداو، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش لە کتێبی (الشَّمَائِل)دا بە ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەتیان کردوە.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «فَأَمَّا الرُّكُوعُ، فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ».(٢) واتە: "سەبارەت بە ڕکوع، ئێوە باسی گەورەیی خوای تێدا بکەن (بۆ نموونە بڵێن: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)".

ئەوجا بزانە، کە ئەم حەدیسە دواهەمینە مەبەستی سەرەکی باسەکەمانە. مەبەستەکەش ئەوەیە، کە لە ڕکوعدا باسی گەورەیيو مەزنيو شکۆمەندی خوای گەورە بکرێت، ئیتر بە هەر تەعبیرێك بێت. بەلاَم باشتر وایە، کە ئەگەر بتوانێت، تەواوی ئەم زیکرانە بەیەکەوە کۆبکاتەوە، بە جۆرێك بارقورسيو زەحمەت بۆ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٣ / بە ژمارە: ٨٧٣، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ٢٢٣ / بە ژمارە: ١١٣٢، والشَّمَائِلُ الْمُحَمَّدِيَّةُ وَالْخَصَائِلُ الْمُصْطَفَوِيَّة (تَحْقِيْق: سَيِّدُ بْنُ عَبَّاسٍ الْجُمَيْلِيّ) / ٢٥٦ / بە ژمارە: ٣١٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٨ / بە ژمارە: ٤٧٩.

کەسانی تر درووست نەکاتو، تەسبیحاتەکەش پێش بخات. خۆ ئەگەر ویستی تەنها یەکێکیان بکات، ئەوە تەسبیحاتەکە سونەتەو، کەمترین تەسبیحاتی تەواویش بریتیە لە سێ جار تەسبیحات کردن. جا ئەگەر تەنها یەك جار کردی، ئەوە ئەصڵی تەسبیحاتەکەی بەجێهێناوە.

هەروەها ئەگەر لە کاتێکدا هەندێك لەم زیکرانەی کرد، ئەوا سونەتە لە کاتێکی تردا هەندێکی تریان بکاتو، لە کاتێکی تریشدا هەندێکی تریان، ئیتر هەر بەم شێوە، هەتا هەموویان دەکات. بە هەمان شێوە، لە تەواوی زیکرەکانی باسەکانی تریشدا هەر سونەتە وا بکات.

بشزانە، کە زیکر کردن لە ڕکوعدا بەلای ئێمەو بەلای زۆربەی زانایانیشەوە سونەتە. بۆیە ئەگەر بە دەستی ئەنقەست یان بە هەڵە نەیکرد، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، تاوانباریش نابێتو، سەجدەی سەهویش نابات. بەڵام ئیمامی (أَحْمَـــد)و کۆمەڵێکیش وای بۆچوون، کە واجبە.

بۆیە باشتر وایە نوێژخوێن پارێزگاری لە زیکری ناو ڕکوع بکاتو نەیفەوتێنێت، لەبەر ئەو حەدیسە (صَحِیْح)انەی کە بە ڕاشکاوی فەرمانیان پێ کردوە، وەکو حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت): «أَمَّـــا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ»و، غەیری ئەویش، لەو حەدیسانەی باسمان کردن. هەروەها لەبەر دەرچوونیش لە ناکۆکی زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {حوکمی خوێندنی قورئان لە ڕکوعدا}

خوێندنی قورئان لە ڕکوعو لە سەجدەدا ناپەسەندە. جا ئەگەر کەسێك بێجگە لە سورەتی (الْفَاتِحَة) هەر شتێکی تری خوێند، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. بە

**هەمان شێوە، بەلای ڕاستترین بۆچوونەوە، ئەگەر سورەتی (الْفَاتِحَةَ)شی خوێند، هەر نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. بەڵام هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.**

**بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نەهی لێ کردم، کە لە ڕکوعو لە سەجدەدا قورئان بخوێنم.[1]**

**دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَلا وَإِنِّي نُهِيْتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعاً أَوْ سَاجِداً».[2] واتە: "ئاگادار بن، کە من نەهیم لێکراوە کاتێك لە ڕکوعدام یان لە سەجدەدام قورئان بخوێنم".**

## ئەوەی نوێژخوێن لە کاتی سەر بەرز کردنەوە لە ڕکوعو لە کاتی هەستانەوەدا دەیڵێت

**سونەتە نوێژخوێن لە کاتی سەر بەرز کردنەوەی لە ڕکوع بڵێت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: "خوای گەورە ستایشی ئەو کەسەی بیستو وەریگرت، کە**

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٨ / بە ژمارە: ٤٨٠.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٨ / بە ژمارە: ٤٧٩.

ستایشی کرد". خۆ ئەگەر بڵێت: (مَنْ حَمِدَ اللهَ سَمِعَ لَهُ)، ئەوا وەکو (شَافِعِيّ)ش لە کتێبی (الْأُمّ)دا فەرموویەتی: هەر درووستە.[1]

جا ئەگەر تەواو هەستایەوە، با بڵێت: (رَبَّنَا، لَكَ الْحَمْدُ، حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا بيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ). واتە: (پەروەردگارمان، سوپاس و ستایش هەر شایانی تۆیە، سوپاس و ستایشێکی زۆری پاکی پیرۆز، پڕ بە ئاسمانەکان و، پڕ بە زەوی و، پڕ بە نێوانیان و، پڕ بە هەر شتێکی تریش کە تۆ بتەوێت، ئەی کەسی شایستە بە ستایش و ڕێز، ڕاستترین قسەیەك، کە بەندەی تۆ بیکات و، هەمووشمان بەندەی تۆین، ئەوەیە کە: ڕێگرێك نیە لەوەی تۆ دەیبەخشیت و، بەخشەرێکیش نیە بۆ ئەوەی تۆ ڕێگریت لێ کردوە، دەوڵەمەندی و هەبوون و بەخت و دەسەڵاتیش سوود بە خاوەنەکەیان ناگەیەنن لەلای تۆو، لە سزای تۆش ڕزگاری ناکەن، "بەڵکو ئەوەی کە سوودی هەیە، تەنها بریتیە لە لوتفی تۆو، لە کردەوەی چاکی کەسەکە خۆی").

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کاتێك سەری لە ڕکوع بەرزدەکردەوە، دەیفەرموو: «سَمِعَ

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٢٥٧. چونکە لەڕوویماناوە هەر هەمان مانا دەگەیەنێت. بەڵام گومانی گومانی تێدا نیە کە ڕستەی (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) باشترە. چونکە هەر بەو جۆرە لە پێغەمبەری خواوە هاتوە. بۆیە ئیمامی (شَافِعِيّ) خۆیشی فەرموویەتی: من ئەمەیانم پێخۆشترە.

اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». ئەوجا کە تـەواو ڕاسـت دەبوویـەوە، دەیفـەرموو: «رَبَّنَـــا، لَــكَ الْحَمْدُ».[1]

لە چەند ڕیوایەتێکیشدا «وَلَكَ الْحَمْدُ» لەگەڵ (وَاو)دا هـاتوە. هەردووکیشـیان هەر جوانن.

هەروەها حەدیسی تری لـەم شێوەمان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە بۆ ڕیوایەت کراوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمـامی (عَلِـيّ)و هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ أَبِيْ أَوْفَى)وە (خـوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کاتێك سەری لە ڕکوع بەرزدەکردەوە، دەیفەرموو: «سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا، لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ».[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێت)، سەری لە ڕکوع بەرز بکردایەتەوە، دەیفەرموو: «اللَّهُـمَّ، رَبَّنَـــا، لَــكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْــدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، اللَّهُمَّ، لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ، مِنْكَ الْجَدُّ».[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧٢ / بە ژمارە: ٧٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩٣ / بـە ژمارە: ٣٩٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٦ / بە ژمارە: ٤٧٦، وە / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٧١.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٧ / بە ژمارە: ٤٧٧.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا دەیفەرموو: «رَبَّنَا، لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ».(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (رِفَاعَة)ی کوڕی (رَافِع)ی (زُرَقِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ڕۆژێک لەدوای پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژمان دەکرد، جا کە سەری لە ڕکوع بەرز کردەوە، فەرمووی: «سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ». پیاوێکیش لەدوایەوە وتی: (رَبَّنَا، وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ). ئەوجا کە پێغەمبەری خوا لە نوێژەکەی بویەوە، فەرمووی: ئەوە کێ بوو وای وت؟ پاوەکەش عەرزی کرد: من بووم. پێغەمبەریش فەرمووی: «رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلاثِينَ مَلَكاً يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلُ». واتە: "سی و ئەوەندە فریشتەم بینی پێشپێشانیان دەکردو، پەلەپەلیان بوو، تا بزانن کامیان یەکەم کەس بینوسێتەوە".(٢)

## باسێك: {کۆکردنەوەی ئەم زیکرانە بەیەکەوە}

بزانە، کە سونەتە هەموو ئەم زیکرانە بەیەکەوە بکات، بەو جۆرەی لە زیکرەکانی ڕکوعدا باسمان کرد. خۆ ئەگەر ویستی تەنها یەکێکیان بکات، ئەوا با ئەمەیان بێت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا، لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ). جا ئەگەر ویستی کورتتریش

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٧ / بە ژمارە: ٤٧٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧٥ / بە ژمارە: ٧٦٦.

بێت، ئەوا با ئەمەیان بێت‌و، لەمە کەمتر نەبێت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا، لَكَ الْحَمْدُ).

بشزانە، کە هەموو ئەم زیکرانە بۆ پێشنوێژو بۆ شوێنکەوتوو بۆ کەسی تەنهاش هەر سونەتن. بەڵام ئەوەندە هەیە، کە پێشنوێژ نابێت هەموویان بکات، تاوەکو نەزانێت، کە شوێنکەوتوەکانی پێیان خۆشە نوێژەکە درێژبێت.

بشزانە، کە ئەم زیکرەی کاتی هەستانەوە لە ڕکوع سونەتەو، واجب نیە. جا ئەگەر نوێژخوێنەکە نەیکرد، ئەوە ناپەسەندەو، سەجدەی سەهویش نابات.

هەروەها خوێندنی قورئانیش لەم هەستانەوەدا ناپەسەندە، هەروەکو چۆن لەکاتی ڕکوع‌و سجودیشدا ناپەسەندە.

## زیکرەکانی ناو سەجدە

ئەگەر لێبوویەوە لە زیکرەکانی هەستانەوە لە ڕکوع، ئیتر (اللهُ أَكْبَرُ) دەکات‌و دادەنوێت بەرەو سەجدە بردن‌و، (اللهُ أَكْبَر)ەکەش درێژ دەکاتەوە، تا تەوێڵی دەخاتە سەر زەوی.

پێشتریش باسی ئەم (اللهُ أَكْبَر)ەمان کرد، کە سونەتەو، ئەگەر نەشیکات، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، سەجدەی سەهویش نابات.

جا کە سەجدەی برد، ئەو کاتە زیکرەکانی سەجدە بردن دەخوێنێت، کە ئەوانیش زۆرن:

یەکێکیان ئەو حەدیسەیە، کە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە ڕیوایەتی هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێشتریش لە

باسی ڕکوعدا هێنامان، سەبارەت بە سیفەتی نوێژ کردنی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کاتێك سورەتەکانی (الْبَقَرَةَ)و (النِّسَاء)و (آل عِمْرَان)ی لە ڕکاتێکدا خوێندو، بشگەیشتایە بە ئایەتێك، کە باسی سۆزو ڕەحمی خوای تێدا بوایە، داوای دەکردو دەپاڕایەوەو، بشگەیشتایە بە ئایەتێك، کە باسی سزای تێدا بوایە، پەنای بەخوا دەگرت لێی. پاشان پێغەمبەری خوا سەجدەی بردو، فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى). ئەندازەی ماوەی سەجدەکەشی نزیك بوو لە ئەندازەی بەپێوەڕاوەستانەکەی.(1)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، زۆر جار لە ڕکوعو لە سەجدەدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ، رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِيْ».(2)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، وەکو لە باسی ڕکوعدا هێنامان، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لە ڕکوعو لە سەجدەدا دەیفەرموو: «سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ».(3)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، سەجدەی ببردایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٦ / بە ژمارە: ٧٧٢.

(2) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٧٤ / بە ژمارە: ٧٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٤٨٤.

(3) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٣ / بە ژمارە: ٤٨٧.

خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ».[1] واته: "خوایه، مـن کڕنوشم بۆ تۆ بردوەو، ئیمانم بـه تـۆ هێنـاوەو، تەسـلیمی بەرنامـەو فـەرمانی تـۆم، نێوچاوانم کڕنووشی برد بۆ ئەو زاتەی، کە درووسـتی کـردوەو وێنـەی کێشـاوەو، ڕێگای بیستن‌و بینینی بۆ کردۆتەوە، جـا پـاك‌و بێگـەردی بـۆ خـوای گـەورە، کـە باشترینی بەدیهێنەرەکانە".

لە حەدیسی (صَحِيْح)یشدا لە (سُنَن)ـەکاندا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَوْف)ی کوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێشـتریش لـە باسی ڕکوعدا هێنامان، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێت) ڕکـوعێکی درێـژی بردو، تێیدا فەرمووی: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَـاءِ وَالْعَظَمَـةِ». پاشان لە سەجدەکەشیدا هەمان شتی دەفەرموو.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ـەکاندا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «وَإِذَا سَجَدَ (أَيْ: أَحَدُكُم) فَلْيَقُلْ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَـى) ثَلاثـاً، وَذَلِكَ أَدْنَاهُ».[2] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە چوە سـەجدە، بـا سـێ جـار بڵێـت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى)، کە ئەم سێ جارە کەمترین ئاستی بەتەواوەتی جێبەجێ کردنـی سونەتەکەیە".

بۆشـمان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە (عَائِشَـة)ی دایکـی ئیماندارانـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: شـەوێك وام هەسـت کـرد پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دیارنەماوە، جا کە دەستم گێـڕا بەشـوێنیدا،

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٧١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٦ / بە ژمارە: ٨٨٦، وسُـنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٢ / ٤٦ / بـە ژمارە: ٢٦١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٨٧ / بە ژمارە: ٨٩٠، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ٨٦ / ٢٣٩١. ئیمـامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (بَيْهَقِـيّ) فەرموویانـە: ڕشـتەکەی بچـڕانی تێدایە.

هەستم کرد لە ڕکوعادایە یان لە سەجدەدایەو، دەفەرمویێت: «سُبْحَانَكَ، وَبِحَمْدِكَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْت».[1]

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا هاتوە، کە دایکە (عَائِشَة) فەرموویەتی: دەستم بەری ژێرپێی پێغەمبەری خوا کەوت‌و، لەو کاتەدا لە سەجدەدا بوو (یان لە جێگەی نوێژ کردنیدا بوو)، هەردوو پێیەکانی دانابوون‌و، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ».[2] واتە: "خوایە، پەنا دەگرم بە ڕازیبوونت لە تووڕەییت، پەناش دەگرم بە لێبوردنت لە سزادانت، پەناش دەگرم بە سۆزو میهرت لە خەشم‌و تووڕەییت، من ناتوانم ستایشی تۆ بکەم، تۆ بەو جۆرەیت، کە خۆت ستایشی خۆتت کردوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «فَأَمَّا الرُّكُوعُ، فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ، فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ».[3] واتە: "سەبارەت بە ڕکوع، ئێوە باسی گەورەیی خوای تێدا بکەن‌و، سەبارەت بە سەجدەش، ئێوە نزاو پاڕانەوەی زۆری تێدا بکەن، چونکە ئەم کاتە شایانی ئەوەیە کە نزاو پاڕانەوەکانتانی تێدا وەربگیرێت‌و قبوڵ بکرێت".

وشەی (قَمِن) بە (قَمَن)و بە (قَمِيْن)یش هاتوە. ماناکەشی بریتیە لە: شایەن‌و شایستە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥١ / بە ژمارە: ٤٨٥.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٢ / بە ژمارە: ٤٨٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٤٨ / بە ژمارە: ٤٧٩.

فەرموویەتی: «أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ».[1] واتە: "نزیکترین کاتی بەندە لە خوای پەروەردگاریەوە، ئەو کاتەیە کە لە کڕنوشدایە، دەی ئێوەش لەو کاتەدا دوعا زۆر بکەن".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە سەجدەدا دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ».[2] واتە: "خوایە لە هەموو تاوانەکانم خۆشبە، کەمو زۆری (وردو درشتی)و، یەکەمینو دواهەمینیو، ئاشکراو پەنهانی".

(دِقَّهُ وَجِلَّهُ) هەردووکیان سەرەتاکەیان (مَکْسُوْر)ەو، بە مانای: (کەمو زۆری) دێن.

بشزانە، کە سونەتە لە سەجدەدا هەموو ئەم زیکرانە بەیەکەوە بکات، کە باسمان کردن. جا ئەگەر لە کاتێکدا نەیتوانی هەموویان بکات، با لە چەند کاتێکی تردا بیانکات، وەکو لە باسەکانی پێشودا باسمان کرد.

هەروەها ئەگەر ویستی هەندێك لە زیکرەکان بکات، ئەوا با تەنها تەسبیحاتەکەو، کەمێك دوعا بکاتو، تەسبیحاتەکەش پێش بخات.

هەروەها وەکو لە باسی زیکرەکانی ڕکوعیشدا وتمان، ناپەسەندە لە سەجدەدا قورئان بخوێنرێت. بە هەمان شێوە سەرجەم لقە باسەکانی تریش.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٤٨٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٤٨٣.

## باسێك: {كامیان باشترەو خەیری زۆرترە: ڕاوەستان بە پێوە، یان سەجدە بردن؟}

زانایان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە سەجدەی ناو نوێژو ڕاوەستانی ناو نوێژ، کە کامیان گەورەترو باشترە؟

مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوبۆچوونەکانی ئەوەیە، کە ڕاوەستان باشترە، لەبەر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە: «أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ».[1] واتە: "باشترین نوێژ ئەوەیە کە ڕاوەستانەکەی درێژ بێت". هەروەها لەبەر ئەوەی کە زیکری ڕاوەستان بریتیە لە قورئان خوێندنو، زیکری سەجدەش بریتیە لە تەسبیحاتو، قورئانیش لە تەسبیحات گەورەترو باشترە. بۆیە هەر کارێکیش بە قورئان درێژبکرێتەوە لەو کارە باشترە، کە بە زیکرێکی تر درێژدەکرێتەوە.

هەندێك لە زانایانیش وای بۆچوون، کە سەجدە باشترە، لەبەر ئەو فەرمایشتەی، کە پێشتر هێنامان: «أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ».

ئیمامی پایەبەرز (أَبو عِيْسَى)ی (تِرْمِذِيّ) لە کتێبەکەی خۆیدا فەرموویەتی: زانایان لەم مەسەلەدا ڕای جیاوازیان هەیە:

- هەندێکیان فەرموویانە: زۆر ڕاوەستان لە نوێژدا لە ڕکوعو سەجدەی زۆر باشترە.
- هەندێکیشیان فەرموویانە: ڕکوعو سەجدەی زۆر لە زۆر ڕاوەستان باشترە.
- ئیمامی (أَحْمَد)ی کوڕی (حَنْبَل)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: دوو حەدیس لەمبارەوە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕیوایەت کراوە، ئیتر خۆی {واتە: ئیمامی (أَحْمَد)} هیچی لەبارەوە نەفەرموە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٢٠ / بە ژمارە: ٧٥٦.

• زانای پایەبەرز (إِسْـحَاق)ی کوڕی (رَاهَوَیْـهِ)ش فەرموویـەتی: لـە ڕۆژدا ڕکـوع‌و سـەجدەی زۆر لـە زۆر ڕاوەسـتان باشـترەو، لـە شەویشـدا زۆر ڕاوەستان لەوان باشترە، مەگەر پیاوێك بەشێکی دیاریکراو قورئانی هەبێت‌و، لە شەودا بیخوێنێت، بۆ ئەم کەسـە بـەلای منـەوە ڕکـوع‌و سـەجدەی زۆر باشترە، چونکە هەم بەشە قورئانەکـەی خـۆی دەخوێنێـت‌و، هـەم ڕکـوع‌و سەجدە زۆرەکەش قازانج دەکات.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: جا بۆیە زانای پایەبەرز (إِسْـحَاق) وای فـەرموە، چونکە هەر بەو جۆرە باسی نوێژی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کراوە لە شەوداو، باسی ئەوەش کراوە، کە زۆر تێیدا ڕاوەستاوە. بەڵام لە ڕۆژدا، بەو جـۆرە باسی درێژی ڕاوەستانی نەکراوە، وەك لە شەودا باس کراوە.[1]

## باسێك: {زیکرەکانی سەجدەی (تِلاوَة)}

ئەگەر کەسێك سەجدەی (تِلاوَة)ی بـرد، سـونەتە لـە سـەجدەکەدا هـەر ئـەوە بڵێت، کە لە باسی سەجدەی نوێژدا باسمان کردو، سونەتە ئەمەشی لەگەڵدا بڵێت: (اللَّهُمَّ، اجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْراً، وَأَعْظِمْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْراً، وَضَعْ عَنِّـي بِهَـا وِزْراً، وَتَقَبَّلْ مِنِّي كَمَا تَقَبَّلْتَ مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ). واتە: (خوایە لای خـۆت بیکـە بە توێشوو بۆم‌و، پاداشتی گەورەشم لە بەرامبەری بـدەرەوەو، بەهۆیـەوە تاوانیشـم لەسەر لاببەو، لێشـمی وەرگـرە، هـەروەکو لـە بەندەکـەت (دَاوُد)ت وەرگرتـوە (سەلامی خوای لێ بێت)".

---

(١) بروانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٢٣١.

سونەتیشە بڵێت: ﴿سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً﴾. واتە: {پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگارمان، بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگارمان ڕاستەو دێتەجێ}. ئیمامی (شَافِعِيّ) ئەم زیکرەی باسکردوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە سەجدەی قورئان خوێندندا دەیفەرموو: «سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[2]

ئیمامی (حَاكِم) ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: «فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ». پاشان فەرموویەتی: ئەم زیادەیە (صَحِيْح)ـەو، لەسەر مەرجی هەردوو صەحیحەکەی بوخاری‌و موسلیمە.[3]

سەبارەت بە (اللَّهُمَّ، اجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْراً،..... هتد)، ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) بە ڕشتەیەکی

---

(١) وەکو بڵێیت لەم دوو ئایەتەی سورەتی (الْإِسْرَاء)ی وەرگرتوە: ﴿قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِيْنَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا * وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾ [١٠٧ - ١٠٨].

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٤٩ / بە ژمارە: ١٤١٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٤٧٤ / بە ژمارە: ٥٨٠، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ٢٢٢ / بە ژمارە: ١١٢٩.

(٣) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣٤٢ / بە ژمارە: ٨٠٢.

(حَسَن) ڕیوایەتی کردوە، کە فەرمایشتی پێغەمبەرە.[1] ئیمامی (حَاکِم)یش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِیْح)ـە.[2]

## ئەوەی نوێژخوێن لەکاتی سەر بەرز کردنەوە لە سەجدەو، لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا دەیڵێت

سونەتە نوێژخوێن لە سەرەتای سەر بەرز کردنەوەیدا (اللّٰهُ أكْبَرُ) بکات و، درێژیشی بکاتەوە تا بەرێکی دادەنیشێت.

پێشتریش باسی ژمارەی (اللّٰهُ أكْبَر)ەکانمان کردو، باسی ئەوەشمان کرد، کە ناکۆکی هەیە لە درێژ کردنەوەیانداو، باسی ئەو درێژ کردنەوەشمان کرد، کە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٨٩ / بە ژمارە: ٣٤٢٤.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣٤١ / بە ژمارە: ٧٩٩. هەروەها شێخی (ابْنُ خُزَيْمَة)و شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش لە صەحیحەکانی خۆیاندا ڕیوایەتیان کردوەو، پوختەی حەدیسەکە ئەوەیە، کە پیاوێك هاتوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کردوە: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمشەو لە خەودا وام زانی لە پشتی دارێکەوە نوێژ دەکەم، جا کە سەجدەم برد، دارەکەش وەکو من سەجدەی بردو، گوێم لێبوو دەیوت: (اللَّهُمَّ اكْتُبْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْرًا، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَاجْعَلْهَا لِـي عِنْـدَكَ ذُخْرًا، وَتَقَبَّلْهَا مِنِّي كَمَا تَقَبَّلْتَهَا مِنْ عَبْـدِكَ دَاوُدَ). هاوەڵی خۆشەویست (ابْـنُ عَبَّـاس) دەفەرموێت: منیش بینیم کە پێغەمبەری خوا ئایەتێکی سەجدەی خوێندەوەو، سەجدەی بردو، گوێم لێبوو ئەو زیکرەی کرد، کە پیاوەکە گێڕایەوە، کە دارەکە کردوویەتی. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَة / ١ / ٢٨٢ / بە ژمارە: ٥٦٢، وصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّـان / ٦ / ٤٧٣ / بە ژمارە: ٢٧٦٨.

جا ئەگەر لە (اللهُ أكْبَر)ەكە بوويەوەو، بەڕێكی دانیشت، ئیتر سونەتە ئەو زیكرو نزاو پاڕانەوانە بكات، كە:

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)و (نَسَـائِيّ)و (بَيْهَقِيّ)و، لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، لەو حەدیسەی پێشوو لەبارەی صیفەتی نوێژ كردنی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە شەوداو، ڕاوەستانە درێژەكەی بە خوێندنی سورەتەكانی (الْبَقَرَة)و، (النِّسَاء)و، (آل عِمْرَان)و، ڕكوعەكەشی بە ئەندازەی ڕاوەستانەكەیو، سەجدەكەشی بە هەمان ئەندازە. جا (حُذَيْفَة) فەرمووی: پێغەمبەری خوا لە نێوان دوو سەجدەكەدا دەیفەرموو: «رَبِّ، اغْفِرْ لِي، رَبِّ، اغْفِرْ لِي»و، بە ئەندازەی سەجدەكەشی دادەنیشت.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، لە حەدیسی شەومانەوەكەی لە ماڵی پوورە (مَيْمُونَة)یدا (خوای لێ ڕازی بێت)و، چۆنێتی نوێژ كردنی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت). جا (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا سەری لە سەجدە بەرز بكردایەتەوە، دەیفەرموو: «رَبِّ، اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وَارْفَعْنِي، وَارْزُقْنِي، وَاهْدِنِي». واتە: "پەروەردگارم، لێم خۆشبەو، ڕەحم پێ بكەو، كەموكورتیم مەهێڵەو، پلەم بەرز بكەرەوەو، ڕزقو ڕۆزی حەلاڵم پێ بدەو، ڕێنموویيم بكە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٩٣ / بە ژمارە: ٨٧٤، والشَّمَائِلُ الْمُحَمَّدِيَّـة / ٢٢٩ / بە ژمارە: ٢٧٦، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٢ / ٢٣١ / بە ژمارە: ١١٤٥، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ١ / ٢٦٧ / ٤٣١. حەدیسەكەم لە (سُنَن)ـەكەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا نەبینیەوە، بۆیە لە (شَمَائِل)ـەوە تەخریجم كردو، حەدیسێكی (صَحِيْح)یشە.

لە ڕیوایەتی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا «وَعَافِنِي»یش هاتوە[1] واتە: "لە بەلاّی هەردوو دنیا پاریزراوو سەلامەتم بکە".

ڕشتەکەی (حَسَن)ـەو، خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {حوکمی دانیشتنی پشوودان و، کردنی (اللَّهُ أَكْبَر) لەگەڵیدا}

ئەگەر نوێژخوێن سەجدەی دوەمیشی برد، ئەوا هەر ئەو زیکرەی تێدا دەکات، کە پێشتر باسمان کرد.

جا ئەگەر سەری لە سەجدە بەرز کردەوە، ئەوە بە (اللَّهُ أَكْبَر)ەوە سەر بەرز دەکاتەوەو، دانیشتنێکی کەم دەکات، بەجۆرێك بە ئاشکرا لە جوولّە بکەوێت، پاشان هەڵدەسێتەوە بۆ ڕکاتی دوەمو، (اللَّهُ أَكْبَر)ی سەر بەرز کردنەوەکەی لە سەجدەکە درێژ دەکاتەوە، تا تەواو ڕاست دەبێتەوەو، درێژ کردنەوەکەش لەدوای لامی (اللّٰه)وە دەبێت. کە ئەمە ڕاستترین بۆچوونی هاوەڵەکانمانە.

هەروەها بۆچوونێکی تریشیان هەیە، کە دەفەرموێت: سەرەتا بەبێ (اللَّهُ أَكْبَر) سەر بەرز دەکاتەوەو، کەمێك دادەنیشێت، جا کە هەستایەوە (اللَّهُ أَكْبَر) دەکات.

هەروەها بۆچوونێکی سێیەمیش هەیە، کە دەفەرموێت: بە (اللَّهُ أَكْبَر)ەوە سەر لە سەجدە بەرز دەکاتەوە، جا کە دانیشت، (اللَّهُ أَكْبَر)ەکە دەبچڕێنێت، پاشان بەبێ (اللَّهُ أَكْبَر) هەڵدەسێتەوە. ناکۆکیش لەوەدا نیە، کە لەم جێگەیەدا دوو جار (اللَّهُ أَكْبَر) ناکات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٨٦ / بە ژمارە: ٨٥٠، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٢٢ / ٢٥٨٣.

جا بۆیە هاوەڵانمان فەرموویان: بۆچوونی یەکەم ڕاستترینیانە، تاوەکو هیچ بەشێك لە نوێژەکە لە زیکر خاڵی نەبێت.

بشزانە، کە دانیشتنی دوای سەجدەی دوەم (کە پێی دەوترێت: جَلْسَةُ الِاسْتِرَاحَة) سونەتێکی صەحیحەو، لە صەحیحی بوخاریو لە کتێبەکانی تریشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) کردوویەتی.[1] مەزهەبی ئێمەش لەسەر ئەوەیە کە ئەو دانیشتنە سونەتە، لەبەر ئەو حەدیسە (صَحِيْح)انە.

پاشان ئەو دانیشتنە لەدوای سەجدەی دوەمی هەموو ڕکاتێکەوە سونەتە، کە نوێژخوێن لێی هەستێتەوە. بەڵام لە سەجدەی قورئان خوێندندا لەناو نوێژدا سونەت نیە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٣ / بە ژمارە: ٧٩٠. زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (أَبُو قِلاَبَة) دەفەرموێت: هاوەڵی خۆشەویست (مالِك)ی کوڕی (حُـوَيْرِث) تەشریفی هێنا بۆلامانو، لەم مزگەوتەی (شاری بەصرە)دا نوێژی بۆ کردینو، فەرمووی: من نوێژتان بۆ دەکەمو، مەبەستیشم نوێژ کردنەکە نیە، بەڵکو دەمەوێت پیشانتانی بدەم، کە پێغەمبەری خوا چۆن نوێژی دەکرد. جا ڕاوی ئەم حەدیسە {کە بریتیە لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (أَيُّوب)ی (سِخْتِيَانِيّ)} دەفەرموێت: منیش لە (أَبُـو قِلاَبَـة)م پرسی: دەی نوێژەکەی چۆن بوو؟ ئەویش فەرمووی: هەر وەکو نوێژی ئەم مامۆستایەی خۆمان وابوو {مەبەستی (عَمْرو)ی کوڕی (سَلِمَة) بوە}. ئەوجا ڕاویەکە (واتە: أَيُّـوب) دەفەرموێت: مامۆستاکەشمان بەم جۆرە نوێژی دەکرد: (اللهُ أَكْبَـر)ی دەکردو، ئەگەر سەریشی لە سەجدەی دوەم بەرزبکردایەتەوە، دادەنیشتو، ئەوجا دەستەکانی دەخستە سەر زەویو، هەڵدەسایەوە سەرپێ.

## زیکرەکانی ڕکاتی دوەم

بزانە، کە ئەو زیکرانەی لە ڕکاتی یەکەمدا باسمان کرد، نوێژخوێن هەموویان لە ڕکاتی دوەمیشدا هەر بەو جۆرە دەکات، کە لە ڕکاتی یەکەمدا دەیکردن، چی فەرزو، چی سونەت‌و، چی ئەو لقەباسانەش کە باسمان کردن، تەنها لە چەند شتێکدا نەبێت، کە جیاوازیان هەیە:

- یەکەم: ڕکاتی یەکەم (اللّٰهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستنی تێدا بوو، کە ڕوکن‌و پایەی نوێژەکە بوو، بەلاّم ڕکاتی دوەم وا نیەو، لە سەرەتاکەیەوە (اللّٰهُ أَكْبَر) ناکرێت. بەڵکو ئەو (اللّٰهُ أَكْبَر)ەش، کە لە سەرەتاکەیەوە هەیە بۆ هەستانەوەیە لە سەجدەی ڕکاتی یەکەم‌و، لەگەڵ ئەوەشدا کردنەکەی سونەتە.
- دوەم: دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژ لە ڕکاتی دوەمدا نیە، بە پێچەوانەی ڕکاتی یەکەمەوە.
- سێیەم: وەکو باسمان کرد ناکۆکی لەوەدا نیە، کە نوێژخوێن لە ڕکاتی یەکەمدا (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) دەکات. بەلاّم لە ڕکاتی دوەمدا ناکۆکی لەسەرە. ڕاستترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، کە لەمیشدا هەر دەیکات.
- چوارەم: بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە لە ڕکاتی دوەمدا قورئان کەمتر دەخوێنرێت لە ڕکاتی یەکەم. ئەو ناکۆکیەشی تێیدایە، کە پێشتر باسمان کرد. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

# خوێندنی (قُنُوت) له نوێژی بەیانیدا

بزانه، که خوێندنی (قُنُوْت) له نوێژی بەیانیدا سونەته، لەبەر ئەو حەدیسە صەحیحەی، که لەوبارەوە هاتوە له هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، که پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تا دنیای بەجێهێشت له نوێژی بەیانیدا (قُنُوْت)ی دەخوێند. ئیمامی (حَاكِم) له کتێبی (الْأَرْبَعِيْن)دا ڕیوایەتی کردوەو، فەرموشێتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[1]

---

(١) ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: ئەم حەدیسە کۆمەڵێك له فەرموودەناسان ڕیوایەتیان کردوەو، به (صَحِيْح)یشیان داناوە. لەوانە: زانای پایەبەرز (أَبُو عَبْدِالله مُحَمَّدُ)ی کوڕی (عَلِيّ)ی (بَلْخِيّ)و، ئیمامی (حَاكِم) له کتێبی (مُسْتَدْرَك)و، چەند جێگەیەکی کتێبەکانی تری‌و، ئیمامی (بَيْهَقِيّ)ش.

ئیمامی (دَارَقُطْنِيّ)ش له چەند ڕێگەیەکەوە بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيح) ڕیوایەتی کردوە.

ئەوجا ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەو زانایانەی کە سابتبوونی خوێندنی (قُنُوْت)یان ڕیوایەت کردوە زۆرترن‌و، زیادە زانیاریەکیشیان لایە، بۆیە ڕیوایەتەکەی ئەوان پێشدەخرێت بەسەر ڕیوایەتی کەسانی بەرامبەردا. بڕوانە: خُلَاصَةُ الْأَحْكَام / ٢ / ١٣٦ – ١٣٧.

زانای پایەبەرز شێخ (أَبُو بَكْر)ی (حَازِمِيّ)ش فەرموویەتی: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت به خوێندنی (قُنُوْت) له نوێژی بەیانیدا:

زۆربەی هاوەڵان‌و شوێنکەوتوان‌و زانایانی دواتریش وای بۆچوون، کە (قُنُوْت) لە نوێژی بەیانیدا هەیەو سونەتە:

- لەو هاوەڵانەی کە ئەم بۆچوونەمان لێوە ڕیوایەت کردوون: خەلیفەکانی ڕاشیدین: (أَبُو بَكْر)و (عُمَر)و (عُثْمَان)و (عَلِيّ). لە هاوەڵانیش: (عَمَّار)ی کوڕی (يَاسِر)و، (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب)و، (أَبُو مُوسَى)ی (أَشْعَرِيّ)و، (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی ئیمامی (أَبُو بَكْر)و، (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (عَبَّاس)و، (أَبُو هُرَيْرَة)و، (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)و، (أَنَس)ی کوڕی (مَالِك)و، (مُعَاذ)ی کوڕی (حَارِث)ی (أَنْصَارِيّ)و، (خُفَاف)ی کوڕی (إِيمَاء)ی کوڕی (رَحَضَة)و، (أَهْبَان)ی کوڕی (صَيْفِيّ)و، (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ی (سَاعِدِيّ)و،

بشزانه، كه بەلای ئیمەوە (قُنُوْت) لە نوێژی بەیانیدا دەخوێنرێـتو، سـونەتێکی دوپاتکراوەشەو، ئەگەر نوێژخوێن نەشیخوێنێت، نوێژەکـەی بـەتاڵ نابێتـەوە، بـەڵام سەجدەی سەهو دەبات، ئیتر بە دەستی ئەنقەست نەیخوێندبێت، یان بە هەڵە.

سەبارەت بە چوار نوێژەکانی تریش، کە ئایا (قُنُوْت)یان تێدا دەخوێنێت، یان نـا؟ ئەوە سێ بۆچوونی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەسەرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت):

- ڕاسترین‌و مەشهورترینیان ئەوەیە، کە ئەگەر ناڕەحـەتی‌و نەهامەتیـەك بەسـەر موسوڵماناندا هـات، ئـەوا موسـوڵمانان لـە هـەموو نوێژەکانـدا (قُنُـوْت) دەخوێنن، ئەگینا نایخوێنن.
- دوەمیش ئەوەیە، کە لە هەموو کاتێکدا (قُنُوْت) دەخوێنن.
- سێیەمیش ئەوەیە، کە لە هیچ کاتێکدا (قُنُوْت) ناخوێنن. خـواش لـە هـەموو کەس زانا ترە.

---

(عَرْفَجَة)ی کوڕی (شُرَيْح)ی (أَشْجَعِيّ)و، (مُعَاوِيَة)ی کـوڕی (أَبُـو سُـفْيَان)و، دایکـە (عَائِشَة).

- لە (مُخَضْرَم)ـەکانیش: (أَبُو رَجَاء)ی (عُطَارِدِيّ)و، (سُوَيْد)ی کـوڕی (غَفَلَـة)و، (أَبُـو عُثْمَان)ی (نَهْدِيّ)و، (أَبُو رَافِع)ی (صَائِغ).
- لە شوێنکەوتوانیش: (سَعِيد)ی کوڕی (مُسَيِّب)و، (حَسَن)ی کوڕی (أَبُـو الْحَسَـن)و، (مُحَمَّد)ی کوڕی (سِيْرِيْن)و، (أَبَان)ی کوڕی (عُثْمَان)و، (قَتَادَة)و، (طَاوُس)و، (عُبَيْد)ی کوڕی (عُمَيْر)و، (رَبِيْع)ی کوڕی (خُثَـيْم)و، (أَيُّـوْب)ی (سَـخْتِيَانِيّ)و، (عَبِيـدَة)ی (سَلْمَانِيّ)و، (عُرْوَة)ی کوڕی (زُبَيْر)و، (زِيَاد)ی کـوڕی (عُثْمَـان)و، (عَبْـدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبُو لَيْلَى)و، (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيز)و، (حَمِيْد)ی (طَوِيْل).
- لە پێشەوا شەرعزانەکانیش: (أَبُو إِسْحَاق)و، (أَبُو بَكْر)ی کوڕی (مُحَمَّد)و، (حَكَـم)ی کوڕی (عُتَيْبَة)و، (حَمَّاد)و، ئیمامی (مَالِك)ی کوڕی (أَنَس)و خەڵکی حیجازو، ئیمـامی (أَوْزَاعِيّ)و زۆربەی خەڵکی شامو، ئیمـامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵـەکانی‌و، لـە (سُـفْيَان)ی (ثَوْرِيّ)شەوە دوو ڕیوایەت هاتوەو، لە زۆرێك لـە زانایـانی تریشـەوە بێجگـە لەمانـە. بڕوانە: الاعْتِبَارُ فِي النَّاسِخِ وَالْمَنْسُوْخِ مِنَ الْآثَار (أَبُو بَكْرِ الْحَازِمِيّ) / ٩٠ – ٩١.

هەروەها بەلای ئێمەوە لە نیوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزانیشدا، سونەتە لە ڕکاتی کۆتایی نوێژی (وِتْر)دا (قُنُوْت) بخوێنرێت.

بۆچوونێکی تریشمان هەیە، کە لە ڕکاتی کۆتایی نوێژی (وِتْـر)دا لـە تـەواوی مانگەکەدا (قُنُوْت) دەخوێنرێت.

بۆچوونێکیشمان هەیە، کە لە تەواوی ساڵدا دەخوێنرێت. ئەمە مەزهەبی ئیمامی (أَبُو حَنِيْفَة)شە.

جا بۆچوونی ناسراو لە مەزهەبی ئێمەدا بریتیە لەوەی یەکەم. خواش لە هـەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {جێگەی خوێندنی (قُنُوْت)و، ئەو دەقانەی لەبارەیەوە هاتوون}

بزانە، کە جێگەی خوێندنی (قُنُوْت) بـەلای ئێمـەوە لـە نوێـژی بەیانیـدا بریتیـە لەدوای هەستانەوە لە ڕکوعی ڕکاتی دووەم. ئیمامی (مَالِك)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: لەپێش ڕکوع (قُنُوْت) دەخوێنرێت.(١)

هاوەڵانیشمان فەرموویانە: ئەگـەر کەسێکی شـوێنکەوتووی مەزهـەبی ئیمـامی (شَافِعِيّ) لەپێش ڕکوعەوە (قُنُوْت)ی خوێند، ئەوە بـەپێی ڕاسـترین بۆچـوون بـۆی حسێب ناکرێت‌و، بۆچوونێکیشمان هەیە، کە بـۆی حسـێب دەکرێـت. جـا بـەپێی بۆچوونە ڕاسـترینەکە، (قُنُـوْت)ـەکە لـەدوای ڕکوعـەوە دووبـارە دەکاتـەوەو، سەجدەی سەهو دەبات. وتراویشە: سەجدە نابات.

---

(١) ئیمامی (بَيْهَقِيّ) فەرموویەتی: لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە، کـە پێغەمبـەری خـوا لـەپێش ڕکوعەوە (قُنُوْت)ی خوێندوە، بەڵام ڕاویەکانی خوێنـدنی (قُنُوْت) لـەدوای ڕکـوع زۆرتـرو بیرتیژترن. بڕوانە: مِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْحِ / ٣ / ٩٥٨، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ٢٩٢.

سەبارەت بە دەقی (قُنُوْت)یش، بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە تێیدا ئەو حەدیسە (صَحِيْح)ـە بڵێت، کە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)و (بَيْهَقِـيّ)و، لـە غـەیری ئەوانیشـدا، بـە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە کچەزای خۆشەویستی پێغەمبەری خـوا، (حَسَن)ی کـوڕی ئیمامی (عَلِيّ) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) چەند وشەیەکی فێرکردم، لە نوێژی (وِتْـر)دا بیـانخوێنم: «اللَّهُـمَّ، اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَـارِكْ لِـي فِيمَـا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي، وَلا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّـهُ لاَ يَـذِلُّ مَـنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا، وَتَعَالَيْتَ». واتـە: "خوایـە ڕێنمـوویيم بکـە لەگـەڵ ئەوانـەی ڕێنموویيت کردوون، پارێزراوو سەلامەتم بکە لەگەڵ ئەوانەی پارێزراوو سەلامەتت کـردوون، چاودێری‌وپشـتگیریم بکـە لەگـەڵ ئەوانـەی چـاودێری‌و پشـتگیريت لێ کردوون، پیت‌و بەرەکەت بخەرە ئەوەی کە پێت بەخشیوم، بمپارێزە لە شەڕو زیـانی ئەوەی بڕیارت لەسەری داوە، چونکە بێگومان تۆ بڕیار دەدەیت‌و، بڕیار بەسەر تۆدا نادرێت، ئەوەش تۆ پشتیوانی بکەیت زەلیل‌و سەرکز نابێـت، ئـەی پـەروەردگارمان بەرەکەت‌و خەیرت زۆرەو، بڵندو باڵاو پایەبەرزیت".

ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ) فەرموویـەتی: ئەمـە حەدیسـێکی (حَسَـن)ـە. هـەروەها فەرمووشێتی: وانازانین لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، شـتێکی لـەمـە جوانتر لەبارەی (قُنُوْت)ـەوە هاتبێت.[1]

لە ڕیوایەتێکیشدا کە ئیمامی (بَيْهَقِـيّ) هێنـاویەتی، (مُحَمَّـد)ی کـوڕی ئیمـامی (عَلِيّ)ی کوڕی (أَبِيْ طَالِب) (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ناسـراوە بـە (ابْـنُ الْحَنَفِيَّـة)، فەرموویەتی: ئەمە ئەو دوعایەیە، کە باوکم لە (قُنُوْت) نوێژی بەیانیدا دەیکرد.[1]

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٥٢ / بە ژمـارە: ١٤٢٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٢٨ / بـە ژمارە: ٤٦٤، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٢٤٨ / بە ژمارە: ١٧٤٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٣٧٢ / بە ژمارە: ١١٧٨، وَسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ٢٠٩ / ٢٩٥٧.

سونەتیشە لەدوای ئەم نزاو پاڕانەوەیە بڵێت: (اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، وَسَلِّمْ). چونکە لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا بە ڕشتەیەکی (حَسَن) ئەمەش هاتوە: (وَصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ).[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٢٠٩ / ٢٩٥٨. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، پاشان فەرموویەتی: سەیرە بەلامەوە ئیمامی نەوەوی تەنها ئەم ڕیوایەتەی هێناوە، کە ئیمامی (عَلِيّ) لە نوێژی بەیانیدا ئەو دوعایەی کردوە. کەچی هەر ئیمامی (بَيْهَقِيّ) خۆی لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەتی کردوە، کە پێغەمبەری خوا ئەو دوعایەی فێری هاوەڵانی کردوە، تا لە نوێژی بەیانیدا بیکەن. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٥١. بۆ دەقی حەدیسەکەش بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٢١٠ / ٢٩٦٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٢٤٨ / بە ژمارە: ١٧٤٦. ئەم فەرمایشتەی ئیمامی نەوەوی وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: لە دوو لایەنەوە جێگەی سەرنجە:

- ڕشتەی حەدیسەکە (حَسَن) نیە، بەڵکو یان بچڕانی تێدایە، یان کەسێکی نەناسراوی تێدایە، سەرەڕای ئەوەی، کە حەدیسێکی (شَاذّ)یشە.
- دەقی حەدیسەکە لای ئیمامی (نَسَائِيّ) تەنها ئەمەیە: (وَصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ)، ئیتر (وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ وَسَلَّم)ی تێدا نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٥٣ - ١٥٤.

بەڵام دەکرێت بوترێت:

- به ڕشتەی (صَحِيْح) لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (حَارِث)ی (أَنْصَارِيّ)و، هەندێکی تر لە زانایانی (سَلَف)ـەوە هاتوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە لە کۆتایی (قُنُوْت)ـەوە صەلاواتیان داوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٥٦ - ١٥٧، والْقَوْلُ الْبَدِيْع / ٣٥٨ - ٣٥٩، والدُّرُّ الْمَنْضُوْد فِي الصَّلاةِ وَالسَّلامِ عَلَى صَاحِبِ الْمَقَامِ الْمَحْمُوْد (ابْنُ حَجَر الْهَيْتَمِيّ) / ٢٠١ - ٢٠٢، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ٣٠٠ - ٣٠١.
- ڕاستە دەقی حەدیسەکە تەنها ئەوەندەیە: (وَصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ). بەڵام لەلایەك صەلاواتدان لەسەر ئالوبەیتی پێغەمبەری خواش هەر سونەتە -ئەگەرچی لەم جێگەدا لە دەقی حەدیسەکەشدا نەهاتبێت-و، لە لایەکی تریشەوە وەکو لەمەولا -لە باسی صەلاواتداندا- ئیمامی نەوەوی باسی دەکات، باشتر وایە لە صەلاواتداندا هەردوو تەعبیری (صَلاة)و (سَلام) بە یەکەوە بەکاربهێنرێن‌و، یەکەیەکەو بە تەنها

هاوەڵانمان فەرموویانە: شتێکی باشە، کە لە (قُنُوْت)دا ئەو زیکرە بخوێنێت، کە لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو لە نوێژی بەیانیدا لەدوای ڕکوعدا (قُنُوْت)ی خوێندوەو، فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ، إنَّا نَسْتَعِيْنُكَ، وَنَسْتَغْفِرُكَ، وَلاَ نَكْفُرُكَ، وَنُؤْمِنُ بِكَ، وَنَخْلَعُ مَنْ يَفْجُرُكَ. اللَّهُمَّ، إيَّاكَ نَعْبُد، ولَكَ نُصَلِّي، وَنَسْجُد، وَإِلَيْكَ نَسْعَى، وَنَحْفِدُ، نَرْجُو رَحْمَتَكَ، وَنَخْشَى عَذَابَكَ، إنَّ عَذَابَكَ الْجِدَّ بالكُفَّارِ مُلْحِقٌ. اللَّهُمَّ، عَذِّبِ الْكَفَرَةَ الَّذِيْنَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَيُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، وَيُقاتِلُونَ أَوْلِيَاءَكَ. اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، وَالْمُسْلِمِيْنَ وَالْمُسْلِماتِ، وأَصْلِح ذَاتَ بَيْنِهِمْ، وَأَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ، وَاجْعَلْ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيْمَانَ وَالْحِكْمَةَ، وَثَبِّتْهُمْ عَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ -صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، وَأَوْزِعْهُمْ أَنْ يُوفُوا بِعَهْدِكَ الَّذِيْ عَاهَدْتَهُمْ عَلَيْهِ، وَانْصُرْهُمْ عَلَى عَدُوِّكَ وَعَدُوِّهِمْ، إلهَ الْحَقِّ، وَاجْعَلْنَا مِنْهُمْ). [1]

واتە: (خوایە، ئێمە داوای کۆمەکی و لێخۆشبوون لە تۆ دەکەین و، بێبڕوا نابین و باوەڕت پێ دەهێنین و، واز لەو کەسەش دەهێنین، کە باوەڕی بە صیفەتە جوانەکانی تۆ نیە (بۆیە بێگوێیی و نافەرمانیت دەکات). خوایە، تەنها تۆ دەپەرستین و، نوێژیش بۆ تۆ دەکەین و، سەجدەش بۆ تۆ دەبەین و، بۆ خزمەتی تۆش تێدەکۆشین و، پەلەش دەکەین لە گوێڕایەڵی تۆدا، ئومێدمان بە سۆزو ڕەحمەتی تۆ هەیەو، لە سزاشت دەترسین، سزای ڕاستەقینەی تۆش دەگات بە بێ باوەڕان. خوایە، سزای ئەو کافرانە بدە، کە پشت دەکەنە ڕێگەکەی تۆو، پێغەمبەرەکانت بە درۆ دەخەنەوەو، شەڕ

---

بەکارنەهێنرێن. واتە: نەوترێت: (صَلَّى اللّهُ عَلَى النَّبِيِّ)، یان (عَلَيْهِ السَّلامُ). بەڵکو بوترێت: (صَلَّى اللّهُ وَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ)، یان (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ).

(١) ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە ئەم (قُنُوْت)ـەی ئیمامی (عُمَر) لەچی سەرچاوەیەکدا هاتوە!!! بەڵام وەکو شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ئیمامی (بَيْهَقِيّ) بە دوو ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٢ / ٢١٠ - ٢١١ / بە هەردوو ژمارە: ٢٩٦٢ و ٢٩٦٣، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٥٧ - ١٥٩.

لەگەڵ دۆستەکانتدا دەکەن. خوایە لـە پیـاوانو ژنـانی بـاوەڕداران‌و موسـوڵمانان خۆش ببەو، کاروبارو پەیوەندیەکانیان باش بکەو، دڵـەکانیان ببەسـتە بەیەکـەوەو، ئیمان‌و حیکمەت بخەرە ناو دڵەکانیانەوەو، ڕاگیراویان بکـە لەسـەر شـەریعەتەکەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بیخەرە دڵیانەوەو پێشانیان بدە، کە بـەوەفا بن بەرامبەر ئەو پەیمانەی، کە لەگەڵیاندا بەستوتەو، سـەریان بخـە بەسـەر دوژمنـی خۆت‌و ئەوانیشدا، ئەی خوای حەق‌و ڕاستی، ئێمـەش بگێـڕە لـەو کەسـانەی ئـەم صیفەتانەیان هەیە.

بشزانە، ئەوەی لە ئیمامی (عُمَر)ەوە نقڵ کراوە، کە فەرموویـەتی: (عَذِّبِ کَفَرَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ) لەبەر ئەوە بوە، کە جەنگ‌و شەڕ لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەواندا بوە. بەڵام بۆ ئەمڕۆ، وا پەسەندە کە بوترێت: (عَذِّبِ الْكَفَرَةَ). چونکە گشتگیرترە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە نوێژخوێن (قُنُوْت)ـەکەی ئیمامی (عُمَر)و، ئەوەی پێشـتر بەیەکـەوە کۆبکاتـەوە. جـا ئەگـەر هـەردووکیانی بەیەکـەوە خوێنـد، ئـەوا ڕاسترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، کە (قُنُوْت)ـەکەی ئیمامی (عُمَر) دوابخـات. خـۆ ئەگەر تەنها یەکێکیانی خوێند، ئەوا با ئەوەی یەکەمیان بێت.

ئەوجا لەکاتێکیشدا سونەتە هەردوکیان بەیەکەوە کۆبکاتەوە، کە نوێژخوێنەکـە خۆی بەتەنها بێت، یان پێشنوێژی کۆمەڵێکی دیاریکراوی وەها بێت، کـە ڕازی بـن بە درێژ کردنەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بشزانە، کە بەلای مەزهەبی هەڵبژێردراوەوە نزاو پاڕانەوەیەکی دیـاریکراو نیـە، کە لە (قُنُوْت)دا بخوێنرێت. بۆیە بە هەر پاڕانەوەیەك بپاڕێتەوە، (قُنُوْت)ـەکەی هـەر دەست دەکەوێت. کەواتە ئەگەر (قُنُوْت)ی بە ئایەتێك، یان بـە چـەند ئایـەتێك لـە قورئانی پیرۆز خوێند، کـە پاڕانـەوەیان تێـدا بـوو، ئـەوا (قُنُـوْت)ـەکەی دەسـت دەکەوێت. بەڵام باشترین صیغە ئەوەیە، کە حەدیس لەبارەیەوە هاتوە. کۆمـەڵێکیش

لە هاوەڵانمان پێیان وایە: دەبێت هەر ئەوە بخوێنێت، کە حەدیس لەبارەیەوە هاتوەو، هیچ شتێکی تر جێگەی ئەو ناگرێتەوە.

بشزانە، کە ئەگەر پێشنوێژ (قُنُوْت)ی خوێند، ئەوا سونەتە بڵێت: (اللَّهُمَّ، اهْدِنَا) بەشێوەی کۆ، بە هەمان شێوە صیغەکانی تریش. خۆ ئەگەر بڵێت: (اللَّهُمَّ، اهْـدِنِي) بەشێوەی تاك، ئـەوا هـەر (قُنُـوْت)ـەکەی دەسـت دەکـەوێت‌و، بـەڵام کـارێکی ناپەسەندە. چونکە بۆ پێشنوێژ ناپەسەندە، کە تەنها بۆ خۆی بپارێتەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُـو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ثَوْبَان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لاَ يَؤُمُّ عَبْدٌ قَوْماً، فَيَخُصُّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ! فَإِنْ فَعَلَ، فَقَدْ خَانَهُمْ». واتە: "با هیچ کەسێك پێشـنوێژی بـۆ خـەڵکێك نـەکات‌و، تەنها دوعا بۆ خـۆی بکـات‌و، بـۆ ئـەوانی نـەکات، خـۆ ئەگـەر وای کـرد، ئـەوە خیانەت‌و ناپاکی لەگەڵدا کردوون".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٧٠ / بە ژمارە: ٩٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ١٨٩ / بە ژمارە: ٣٥٧.

## باسێك: {بەرز کردنەوەی دەستەکان لەکاتی دوعای (قُنُوت)داو، هێنانیان بە دەمو چاوداو، خوێندنی (قُنُوت) بە دەنگی بەرز}

هاوەڵانمان سێ بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە بەرز کردنەوەی دەستەکانو هێنانیان بە دەمو چاودا لە (قُنُوْت)دا:

- ڕاستترینیان ئەوەیە، کە سونەتە بەرز بکرێنەوەو، نەهێنرێن بە دەمو چاودا.
- دوەمیش ئەوەیە، کە بەرزیان بکاتەوەو، بیشیانهێنێت بە دەمو چاودا.
- سێیەمیش ئەوەیە، کە نە بەرزیان بکاتەوەو، نە بیشیانهێنێت بە دەمو چاودا.

هاوەڵانیشمان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە نابێت دەستەکان بهێنرێن بە سینگو شوێنی تری لاشەدا، بەڵکو فەرموویانە: ئەوە کارێکی ناپەسەندە.

سەبارەت بە بەرز کردنەوەو نزم کردنەوەی دەنگیش لەکاتی خوێندنی (قُنُوْت)دا، هاوەڵانمان فەرموویانە:

١) ئەگەر نوێژخوێن بە تەنها بوو، ئەوە با بە دەنگی نزم بیخوێنێت.

٢) بەڵام ئەگەر پێشنوێژ بوو، ئەوە:

- بەپێی مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراو، کە زۆربەی زانایانی لەسەرە، با بە دەنگی بەرز بیخوێنێت.
- بۆچوونی دوەمیش لەسەر ئەوەیە، کە با ئەویش هەروەکو تێکڕای نزاو پاڕانەوەکانی تر بە دەنگی نزم بخوێنێت.

٣) سەبارەت بە کەسی شوێنکەوتووش:

- ئەگەر پێشنوێژەکەی بە دەنگی بەرز نەیدەخوێند، با ئەویش بە دەنگی بەرز نەیخوێنێت، وەکو تێکڕای نزاو پاڕانەوەکانی تر، لەمیشدا هەر وەکو پێشنوێژەکەی بکات.
- ئەگەر پێشنوێژەکەی بە دەنگی بەرز خوێندی، ئەوا:

١) ئەگەر شوێنکەوتوەکە دەنگی پێشنوێژەکەی دەبیست، با (آمِــيْن) لەسەر دوعاکانی ئەو بکاتو، لەگەڵیشیدا ستایشەکەی کۆتایی (قُنُــوْت)ــەکە بڵێتــەوە. (واتــە: فَإِنَّــكَ تَقْضِــي، وَلا يُقْضَــى عَلَيْكَ......هتد).
٢) ئەگەر دەنگی پێشنوێژەکەی نەدەبیست، ئەوا با خۆی بە دەنگی نـزم (قُنُوْت)ـەکە بخوێنێت. وتراویشە: تەنها (آمِــيْن) بکـات. وتراویشــە: ئەگەر دەنگی پێشـنوێژەکەش ببیسێت، هــەر بـۆی هەیـە لەگەڵیـدا (قُنُوْت)ـەکە بخوێنێت. جا بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەی یەکەمیانە.

سەبارەت بە نوێژەکانی تری غەیری نوێـژی بـەیانیش، ئەگـەر (قُنُــوْت)ی تێـدا خوێند، کاتێك پێی وابێت درووستە، ئەوا:

- ئەگەر نوێژەکە لەو نوێژانە بوو، کە بە دەنگی بەرز قورئانیان تێدا دەخوێنرا -کە بـریتین لــە نوێـژی مـەغریبو عیشـا- ئـەوە بـەرز کردنـەوەو نـزم کردنەوەی دەنگ لەمانیشدا هەر وەکو نوێژی بەیانی وەهایە، بـەو شـێوەی کە باسمان کرد.
- ئەگەر نوێژەکە نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر بوو، ئەوە وتراوە: بە دەنگی نـزم (قُنُوْت)یان تێدا بخوێنێتو، وتراویشە: ئەوانیش هەر وەکـو نوێـژی بـەیانی وەهان.

ئەو حەدیسە (صَحِيْح)ـەش کە سەبارەت بە (قُنُوْت)خوێنـدنی پێغەمبـەری خـوا هاتوە (دروودی خوای لەسەر بێت) لــە دژی ئـەو کەسـانەی، کـە قورئانزانـەکانی بـیری (مَعُوْنَة)یان شەهید کرد، ئەوە ڕواڵەتەکەی وا دەگەیەنێت، کـە (قُنُوْت) لــە هــەموو نوێژەکاندا بە دەنگی بەرز دەخوێنرێت. [١]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٥٦ / بە ژمارە: ٢٩٩٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤٦٩ / بە ژمارە: ٦٧٧.

له صەحیحی بوخاریشدا، له باسی تەفسیری ئایەتی ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ [آل عِمْرَان: ١٢٨]دا حەدیسێك له هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە هاتوه (خوای لێ ڕازی بێت)، كه پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەكاتی بەلاو نەهامەتیدا بە دەنگی بەرز (قُنُوْت)ی دەخوێند.(١)

## خوێندنی تەحیات له نوێژدا

بزانه، كه نوێژ ئەگەر تەنها دوو ڕكات بوو، وەكو نوێژی بەیانیو نوێژە سونەتەكان، ئەوه تەنها یەك تەحیاتی تێدایه. بەڵام ئەگەر سێ یان چوار ڕكات بوو، ئەوه دوو تەحیاتی تێدایه. دەشگونجێت بۆ كەسی دواكەوتوو له جەماعەت سێ تەحیاتی تێدا بێتو، دەشكرێت له نوێژی مەغریبدا چوار تەحیاتیشی تێدا بێت. وەكو ئەوەی كه لەدوای ڕكوعی ڕكاتی دوەمدا بگات بە پێشنوێژەكەو، بەشوێن ئەودا تەحیاتی یەكمو دوەم بخوێنێت، كه لەم حاڵەتەدا تەنها فریای یەك ڕكات كەوتوه. جا كه پێشنوێژەكه سلاوی دایەوه، ئەم هەڵدەستێتەوه، بۆئەوەی دوو ڕكاتەكەی تر بكاتەوه. بەمەش ڕكاتێك دەكاتو، تەحیاتی تێدا دەخوێنێت، چونكه بۆ ئەم دوەم ڕكاتەو، پاشان ڕكاتی سێیەمیش دەكاتو، تەحیات له ئەویشدا دەخوێنێت.

خۆ ئەگەر نوێژی سونەتی دەكردو، نیەتی زیاتر له چوار ڕكاتیشی هێنابوو، ئیتر باوەكو نیەتی سەد (١٠٠) ڕكاتیشی هێنابێت، ئەوا بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیه، كه تەنها دوو تەحیاتیان تێدا دەخوێنێت. جا نیەتی چەند ڕكاتی هێنابوو، تا دەگاته دوو ڕكاتەكەی كۆتایی، با بیانكاتو، تەحیاتی یەكەم بخوێنێتو، پاشان دوو ڕكاتەكەش بكاتو، تەحیاتی دوەمیش بخوێنێت، ئەوجا سلاو بداتەوه.

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦٦١ / به ژماره: ٤٢٨٤.

کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: درووست نیە لە هیچ نوێژێکدا زیاد لە دوو تەحیات بخوێنرێتو، درووستیش نیە لە نێوان تەحیاتی یەکەمو دوەمدا زیاد لە دوو ڕکات هەبێت، بەڵکو دەبێت تەنها یەك ڕکات لە نێوانیاندا هەبێت. جا ئەگەر لە دوو تەحیات زیاتری خوێند، یان لە دوو ڕکات زیاتر هەبوو لە نێوان دوو تەحیاتەکەدا، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

کۆمەڵێکی تریش فەرموویانە: درووستە لە هەموو ڕکاتێکدا یەك تەحیات بخوێنرێت.

بەڵام ڕاستترین بۆچوون ئەوەیە، کە درووستە لە هەموو دوو ڕکاتێکدا یەك تەحیات بخوێنرێت، نەك لە یەك ڕکاتدا یەك تەحیات. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بشزانە، کە تەحیاتی دوەم بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)و (أَحْمَد)و زۆربەی زانایانەوە واجبەو، بەلای ئیمامی (أَبُو حَنِيْفَة)و ئیمامی (مَالِك)ـەوە سونەتە.

تەحیاتی یەکەمیش، بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)و (مَالِك)و (أَبُو حَنِيْفَة)و زۆربەی زانایانەوە سونەتە. بۆیە ئەگەر نەیشیخوێنێت، بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە نوێژەکەی هەر درووستە. بەڵام سەجدەی سەهو دەبات، ئیتر بە دەستی ئەنقەست نەیخوێندبێت یان بە هەڵە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {ئەو دەقانەی لەبارەی تەحیاتەوە هاتوون}

سێ دەقی تەحیات لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت) سابت بوە[1]:

- یەكەمیان بریتیە لە: ڕیوایەتی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد) (خوای لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت): «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ». واتە: "هەموو جۆرە سڵاوەكانو نوێژەكانو وتەو كردەوە چاكو پاكەكان هەر شایستەی خوای گەورەیە، سڵاو لە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا، سڵاو لە ئێمەو، لە هەموو بەندە چاكەكارو ڕاساڵەكانی خواش بێت، شایەتی دەدەم، كە هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خواو، شایەتیش دەدەم، كە (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە". ئیمامی بوخاریو موسلیم لە صەحیحەكانیاندا ڕیوایەتیان كردوە.[2]
- دوەمیش بریتیە لە: ڕیوایەتی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت): «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ». ئیمامی موسلیم لە صەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردوە.[3]

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: مەبەستی ئەو دەقانەیە كە لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوون، ئەگینا بێجگە لەو سیانە دەقی تریش لە پێغەمبەری خواوە سابت بوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٦٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣١١ / بە ژمارە: ٥٩١٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٠٢ / بە ژمارە: ٤٠٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٠٢ / بە ژمارە: ٤٠٣.

• سێیەمیش بریتیە لە: ڕیوایەتی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت)، لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت): «التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ». ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)دا بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە {(قَاسِم)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی ئیمامی (أَبُو بَكْر)ەوە}، کە فەرموویەتی: (عَائِشَة)ی دایکی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێت)، فێری کردمو، فەرمووی: ئەمە تەحیاتی پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت): «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».(٢)

ئەم ڕیوایەتە سودو فائیدەیەکی جوانی تێدایە، ئەویش ئەوەیە، کە دەقی تەحیاتەکەی پێغەمبەری خوایش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەروەکو دەقی تەحیاتەکەی ئێمە وەهایە.(٣)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)و (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)و، لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٠٣ / بە ژمارە: ٤٠٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤٤ / بە ژمارە: ٢٦٦٧. بەلاّم بەلای شێخی عەسقەلانیەوە ڕشتەکەی لاوازە (چونکە کەسێکی نەناسراوی تێدایە). بۆیە فەرموویەتی: نازانم ئیمامی نەوەوی پشتی بەچی بەستوە بۆ ئەم ڕشتەیە، کە فەرموویەتی ڕشتەیەکی جوانە!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٧٤.

(٣) واتە: پێغەمبەری خوایش لە تەحیاتدا هەر فەرموویەتی: (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). وە نەیفەرموە: (وَأَشْهَدُ أَنِّي عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). کە لەڕووی دارشتنی زمانەوانیەوە دەبوو وای بفەرموایە.

(عَبْد)ی (قَارِيّ)ـەوە، کە گوێی لە ئیمامی (عُمَـر) بـوە (خوای لێ ڕازی بێت) لەسەر مینبەر خەڵکی فێری تەحیات دەکردو، دەیفەرموو: بڵێن: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).(١)

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمـامی (مَالِك)و (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)و، لە غەیری ئەوانیشدا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لـە (عَائِشَة)ی دایکـی ئیماندارانـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو ئەگەر تەحیاتی بخوێندایە دەیفەرموو: (التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَـاتُ الصَّلَوَاتُ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، السَّـلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ).(٢)

هەر لە ڕیوایەتێکی تری ئەو کتێبانەدا لە دایکـە (عَائِشَة)وە هـاتوە: (التَّحِيَّـاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَـرِيكَ لَـهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَـا، وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ).(٣)

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)و (سُنَن)ی (بَيْهَقِـيّ)دا، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِيْح)، لە ئیمامی (مَالِك)ـەوە، ئەویش لـە (نَـافِع)ـەوە، ئـەویش لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە ئـەو لـە تەحیاتـدا

(١) بروانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٩٠ / بە ژمـارە: ٢٠٣، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤٤ / بە ژمارە: ٢٦٦٣.

(٢) بروانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٩١ / بە ژمـارە: ٢٠٥، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤٤ / بە ژمارە: ٢٦٦٤.

(٣) بروانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٩١ / بە ژمارە: ٢٠٦. لەم نوسـخەدا جیاوازی نیە لە نێوان دەقی دوو حەدیسەکەدا، بەڵام لە کتێبـی (أَذْكَار)دا جیـاوازی هەیـە. وەکو لە سەرەوە دەبینرێت.

دەیفـەرموو: (بِسْمِ اللهِ، التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، الزَّاكِيَاتُ لِلَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، شَهِدْتُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، شَهِدْتُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ).[1] خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

جا ئەمە چـەند جـۆرێکی تـەحیات بـوو. ئیمـامی (بَيْهَقِـــيّ) فەرموویـەتی: سـێ حەدیسیان لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) سـابت بـوە: حەدیسـەکەی (ابْنُ مَسْعُوْد)و، حەدیسەکەی (ابْنُ عَبَّاس)و، حەدیسەکەی (أَبُـو مُوْسَـی) (خـوا لـە هەموویان ڕازی بێت).

ئەمە فەرمایشتی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)ـە.

زانایانی تریش فەرموویانە: هەرسێ حەدیسەکە (صَحِيْح)ن‌و، (صَحِيْح)ترینیشـیان بریتیە لـە حەدیسەکەی (ابْنُ مَسْعُوْد).[2]

بشزانە، کە درووستە تەحیات بە هـەرکام لـەمانـەی باسمـان کـردن بخوێنرێـت، وەکو ئیمامی (شَافِعِيّ)و زانایانی تریش (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویانـە. باشترینیشـیان بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە بریتیە لـە حەدیسـەکەی (ابْنُ عَبَّـــاس)، چـونکە وشـەی (الْمُبَارَكَات)یشی تێدایە، کە لـەوانی تردا نیە.[3]

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٩١ / بە ژمـارە: ٢٠٤، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤٢ / بە ژمارە: ٢٦٥٦.

(٢) چونکە ئیمامی بوخاری‌و موسلیم هەردووکیان ڕیوایەتیان کردوە. بەڵام دوانەکەی تر تەنها ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوون.

(٣) هەروەها لـەڕووی مێژووییەوە تەحیاتەکـەی (ابْـنُ عَبَّـــاس) لـەدوای تەحیاتەکـەی (ابْـنُ مَسْعُوْد)ەوە هاتوە. چونکە (ابْنُ مَسْعُوْد) یەکێکە لە هاوەڵە پێشینەکان، بـەڵام (ابْنُ عَبَّـــاس) یەکێکە لـە هاوەڵە منداڵە دواییینەکان. هەروەها (ابْنُ عَبَّاس) خۆی فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خوا فێری تەحیاتی دەکردین، هەروەکو چۆن فێری خوێندنی سورەتەکانی قورئانی دەکردین. بڕوانە: الْمَجْمُوْع شَرْحُ الْمُهَذَّب / ٣ / ٤٥٧.

ئیمامی (شَافِعِيّ)و زانایانی تریش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: لەبەر ئەوەی کە مەسەلەی خوێندنی تەحیات بواری فراوانو سەرپشکی تێدایە، بۆیە دەبینرێت دەقی حەدیسەکان لە نێوان ڕاویەکاندا جیاوازیان تێدایە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: {ئەو برە زیکرەی کە تەحیاتی پێ دادەمەزرێت}

بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە بۆ خوێندنی تەحیات کەسی نوێژخوێن یەکێك لە سێ تەحیاتە یەکەمینەکە بە تەواوەتی دەخوێنێت. جا ئەگەر بەشێکی لێ نەخوێند، ئایا تەحیاتەکەی درووستە، یان نا؟ ئەوە جۆرە تەفصیلێکی تێدایە:

بزانە، کە وشەکانی (الْمُبَارَكَاتُ)و (الصَّلَوَاتُ)و (الطَّيِّبَاتُ)و (الزَّاكِيَاتُ) سونەتن‌و، مەرجی دروستیو ڕاستێتی تەحیاتەکە نین. بۆیە ئەگەر هەموشیان لاببات‌و، تەنها بڵێت: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ.....هتد) ئەوە هەر دروستەو، ئەمەش بەلای ئێمەوە هیچ ناکۆکی تێدا نیە.

سەبارەت بە وشەکانی تریش، وەکو: (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ.....هتد) ئەوە هەموویان واجبن‌و، دروست نیە هیچکامیان لاببرێت، بێجگە لە (وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)، کە ئەمە سێ بۆچوونی هاوەڵانی لەسەرە:

- ڕاسترینیان ئەوەیە، کە دروست نیە هیچکامیان لاببرێت‌و، بەڵگەش وا دەخوازێت کە ئەم بۆچوونە ڕاست بێت، چونکە هەردووکیان لە دەقی هەموو حەدیسەکاندا هاتون.
- دوەمیش ئەوەیە، کە درووستە هەردووکیان لاببرێن.
- سێیەمیش ئەوەیە، کە درووستە (وَبَرَكَاتُهُ) لاببرێت، بەلام (وَرَحْمَةُ اللَّهِ) درووست نیە.

زانـای پایەبـەرز (أَبو الْعَبَّـاسِ ابْـنُ سُـرَيْج) -کـە یەکێکـە لـە هاوەڵانمـان- فەرموویەتی: درووستە تەنها بڵێت: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، سَلامٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ، سَلامٌ عَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّهِ).

سەبارەت بە وشەی (السَّلام)یش، لە زۆربەی ڕیوایەتەکاندا بە ئـەلف‌و لامـەوە هاتوە: (السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ)، (السَّلامُ عَلَيْنَا). لە هەندێکیشـیاندا بـەبێ ئـەلف‌و لام هاتوە: (سَلامٌ).

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانـە: هـەردووکیان درووسـتن. بـەڵام باشـترینیان ئەوەیە کە ئەلف‌و لامی هەبێت (السَّلامُ)، چونکە لـە زۆربـەی ڕیوایەتەکانـدا بـەو جۆرە هاتوە. هەروەها زیادەو ئیحتیاتیشی تێدایە.

سەبارەت بە کردنی (بِسْمِ اللهِ) لەپێش تەحیاتەوە، ئەوە حەدیسێکی پێغەمبـەرمان لە (سُنَن)ی (نَسَائِيّ)و (بَيْهَقِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، کـە (بِسْمِ اللهِ) تێدایە[1]و، پێشتریش لـە تەحیاتەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)دا هێنامان (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت). بەڵام ئیمامی بوخـاری‌و (نَسَائِيّ)و هەنـدێکی تـریش لـە پێشەوایانی حەدیس فەرموویانە: زیـادەی (بِسْمِ اللهِ) لـە پێغەمبـەری خـواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) بە صەحیحی نەهاتوە. بۆیە زۆربەی هاوەڵانمـان فەرموویانـە: (بِسْـمِ اللهِ) کـردن سـونەت نیـەو، هەندێکیشـیان فەرموویانـە: سـونەتەو، بۆچـوونی

---

(١) هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله) فەرموویـەتی: "كَانَ رَسُولُ اللهِ -صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنْ الْقُرْآنِ: بِاسْـمِ اللَّـهِ وَبِاللَّـهِ التَّحِيَّـاتُ لِلَّهِ.....هتد". بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٤٣ / بە ژمارە: ١٢٨١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ١ / ٢٩٢ / بە ژمارە: ٩٠٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤١ / بـە ژمـارە: ٢٦٥٣. شـێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانـە: نَتَـائِجُ الْأفْكَـار / ٢ / ١٨٩ – ١٩٠.

هەڵبژێردراویش ئەوەیە، کە (بِسْمِ اللهِ) ناکرێت، چونکە زۆربەی ئەو هاوەڵانەی تەحیاتیان ڕیوایەت کردوە، (بِسْمِ اللهِ)یان لەگەڵدا ڕیوایەت نەکردوە.[1]

## باسێك: {حوکمی تەرتیبی بڕگەو ڕستەکانی ناو تەحیات}

بزانە، کە تەرتیبی ڕستەو بڕگەکانی ناو تەحیات سونەتە، واجب نیە. بۆیە ئەگەر هەندێکیانی پێشخست لە هەندێکی تریان، ئەوە کارێکی درووستە بەپێی مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراو، کە زۆربەی زانایانی لەسەرەو، ئیمامی (شَافِعِيّ)ش لە کتێبی (الْأُمّ)دا هەر وای فەرمووە. وتراویشە: درووست نیە، هەر وەکو چۆن درووست نیە ڕیزبەندی ئایەتەکانی سورەتی (الْفَاتِحَة) بشێوێنرێت و، پاش وپێش بخرێن.

بەڵگەی درووستی ئەو کارەش بریتیە لە پێشخستنی (السَّلامُ) بەسەر (أَشْهَدُ أنْ لا إلَه إلاّ الله وأشْهَد أنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ الله)دا لە هەندێك ڕیوایەتداو، دواکەوتنیشی لە هەندێکی تریاندا، وەکو باسمان کرد.

بەڵام ڕیزبەندی وشەو ڕستەو ئایەتەکانی سورەتی (الْفَاتِحَة) دەستەوەستانکەرو (مُعْجِز)ن، بۆیە نابێت گۆڕانکاریان بەسەردا بهێنرێت.

هەروەها درووست نیە تەحیات بە غەیری زمانی عەرەبی بخوێنرێت، بۆ کەسێك توانای فێربوونی عەرەبی هەبێت. ئەو کەسەش توانای نەبێت، با بە زمانی خۆی

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: هەر ئەوەندە بەس نیە بۆ نەکردنی (بِسْمِ اللهِ)، کە بوترێت لە زۆربەی ڕیوایەتەکاندا نەهاتوە. چونکە ئەگەر ئەوە بەس بێت، ئەوا لە زۆربەی ڕیوایەتەکانیشدا وشەی (الْمُبَارَكَات) نەهاتوە. کەوابوو دەبێت ئەویش سونەت نەبێت!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ١٩١.

بیخوێنێت‌و، هەوڵی فێربوونیشی بە زمانی عەرەبی بدات، وەکو لە باسی (اللهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستندا باسمان کرد.

## باسێك: {خوێندنی تەحیات بە دەنگی نزم}

سونەتە تەحیات بە دەنگی نزم بخوێنرێت، چونکە زانایانی ئیسلام کۆدەنگن لەسەر ئەم مەسەلەیە.

بەڵگەش لەسەری لە حەدیسدا بریتیە لەو حەدیسەی، کە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (بَيْهَقِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفِيَ التَّشَهُّدَ). واتە: (سونەت وەهایە کە نوێژخوێن تەحیات بە دەنگی نزم بخوێنێت).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە.[1]

جا ئەگەر یەکێك لە هاوەڵان فەرمووی (مِنَ السُّنَّةِ كَذَا)، ئەوە بەمانای ئەوە دێت، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) وای فەرموە. ئەمەش بریتیە لەو مەزهەبە درووستە هەڵبژێردراوەی، کە زۆربەی شەرعزانان‌و فەرموودەناسان‌و زانا ئوصولیەکان‌و زانایانی کەلامی لەسەرە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٢٤ / بە ژمارە: ٩٨٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٨٤ / بە ژمارە: ٢٩١، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٢ / ١٤٦ / بە ژمارە: ٢٦٦٩، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٤٠٠ / بە ژمارە: ٩٨٦.

خۆ ئەگەر نوێژخوێن بە دەنگی بەرز تەحیات بخوێنێت، ئەوە کارێکی ناپەسەندەو، نوێژەکەشی بەتاڵ نابێتەوەو، سەجدەی سەهویش نابات.

## صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەدوای خوێندنی تەحیات

بزانە، کە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەلای ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەدوای تەحیاتی کۆتاییەوە واجبە. بۆیە ئەگەر وازی لێهێناو نەیکرد، ئیتر نوێژەکەی درووست نیە.

بەلای مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراویشەوە صەلاواتدان لەسەر ئالو خزمو کەسوکاری پێغەمبەری خوا لەو تەحیاتەدا واجب نیە، بەڵام سونەتە. هەندێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: واجبە.

باشتریش وەهایە کە بڵێت: (اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِه، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِيْ الْعَالَمِيْنَ إِنَّكَ حَمِيْدٌ مَجِيْدٌ). واتە: (خوایە، ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر (مُحَمَّد)ی بەندەو پێغەمبەرتدا، کە توانای نوسینو خوێندنەوەی نەبوەو، بیشی ڕژێنە بەسەر ئالو خزمو کەسوکارو هاوسەرەکانو منداڵەکانی پێغەمبەردا، وەکو چۆن ڕەحمەتی خۆت ڕژاندوە بەسەر حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)و ئالو خزمو کەسوکارەکەیدا. هەروەها بەرەکەتی خۆت بڕژێنە بەسەر (مُحَمَّد)ی پێغەمبەری خوادا، کە توانای نوسینو خوێندنەوەی نەبوەو، بیشیڕژێنە بەسەر ئالو خزمو کەسوکارو هاوسەرەکانو منداڵەکانی پێغەمبەردا، وەکو چۆن بەرەکەتی

خۆت ڕژاندوه بەسەر حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)و ئالو خزمو کەسوکارەکەیدا لەناو تەواوی خەڵکیدا، خوایە تۆ سوپاسکراوو شکۆداری).

ئەم جۆرە صەلاواتەمان لە صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (عُجْرَة)وە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، تەنها بەشێکی نەبێت، کە ئەویش هەر بە (صَـحِيْح)ی لە ڕێگەی کەسانی ترەوە هاتوە. جا ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، دواتر لە ((**کتێبی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا**))دا بە درێژی باسی دەکەین.[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

جا ئەوەی لە صەلاواتداندا پێویستە بوترێت بریتیە لە: (اللَّهُمَّ، صَلِّ على النَّبِيِّ). خۆ ئەگەر نوێژخوێنەکە بیەوێت دەتوانێت بڵێت: (اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ). ئەگەر بیشیەوێت دەتوانێت بڵێت: (صَلَّى اللهُ عَلَى رَسُوْلِهِ) یان (صَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ).

بۆچوونێکیشمان هەیە، کە تەنها ئەمەیان دروستە: (اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ).

بۆچوونێکیشمان هەیە، کە دروستە بڵێت: (وَصَلَّى اللهُ عَلَى أَحْمَدَ).

بۆچوونێکیشمان هەیە، کە دروستە بڵێت: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بەداخەوە ئیمامی نەوەوی دواتر لەبیری چوە، کە ئەم بابەتە بە درێژی باس بکاتو، حەدیسەکانی لەسەر بهێنێت!!! شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ئەو بەشەی کە ئیمامی نەوەوی جیایکردۆتەوەو هەڵاوێری کردوەو، فەرموویەتی: "لەڕێگەی کەسانی ترەوە بە (صَحِيْح)ی ڕیوایەت کراوە" بریتیە لەم چوارە: یەکەم:(عَبْدِكَ وَرَسُوْلِكَ). دوەم: (النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ). سێیەم: (وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ). چوارەم: (فِيْ الْعَالَمِيْن). ئەوجا یەکە بەیەکەی ئەم چوارەشی بە ڕشتەوە لە کەسەکانی ترەوە ڕیوایەت کردوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ١٩٨ – ٢٠٨. هەروەها بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٢ / ٣٥٥ – ٣٥٧.

سەبارەت بە تەحیاتی یەکەمیش، ڕاجیایی تێدا نیە کە واجب نیە صەلاواتی تێدا بدرێت لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت). بەلاَم ئایا سونەتە؟ ئەوە دوو بۆچوونی لەسەرە، ڕاستترینیان ئەوەیە، کە سونەتە.

هەروەها بۆچوونی درووست ئەوەیە کە صەلاواتدان لەسەر ئاڵو خزمو کەس وکاری پێغەمبەری خوا لە تەحیاتی دوەمدا سونەت نیە، بۆچوونێکیش هەیە، کە پێیوایە سونەتە.

هەروەها بەلای ئێمەوە نزاو پاڕانەوە لە تەحیاتی یەکەمدا سونەت نیە، بەڵکو هاوەڵانمان فەرموویانە: ناپەسەندە. چونکە تەحیاتی یەکەم دەبێت کورت بێت، ئەویش بە پێچەوانەی تەحیاتی کۆتاییەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## نزاو پاڕانەوە لەدوای تەحیاتی کۆتاییەوە

بزانە، کە هیچ ناکۆکیو ڕاجیاییەك لە نێوان زانایانەدا نیە، کە نزاو پاڕانەوە لەدوای تەحیاتی کۆتاییەوە درووستە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەحیاتی فێر کردنو، لە کۆتاییەکەیەوە فەرمووی: «ثُمَّ یَتَخَیَّرُ مِنَ الدُّعَاءِ». واتە: "پاشان بە ئارەزوی خۆی دوعا بکات".

لە ڕیوایەتی ئیمامی بوخاریدا هاتوە: «أعْجَبَهُ إلَیْهِ فَیَدْعُو». واتە: "چی دوعایەکی پێ باش بوو با بیکات".

لە چەند ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمیشدا هـاتوە: «ثُمَّ لْيَتَخَيَّرْ مِنَ الْمَسْـأَلَةِ مَـا شَاءَ». واتە: "پاشان هەر داوایەکی دەوێت با بیکات".[1]

بشزانە، کە ئەم نزاو پاڕانەوەی دوای تەحیات سونەتەو، واجب نیەو، سونەتیشە درێژ بکرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێك کە پێشنوێژ بێت.

جا کەسی نوێژخوێن بۆی هەیـە هەرچـی خـۆی پێـی خۆشـبێت لـە کاروبـاری دوارِۆژو دنیا داوای بکات، بۆیشی هەیە ئەو دوعایانـە بکـات، کـە لـە حەدیسـدا هاتونو، بۆیشی هەیە دوعایەك بکـات، کـە خـۆی دایهێنابێـت، بـەڵام ئـەوەی لـە حەدیسدا هاتوە باشترە.

پاشان ئەو نزاو پاڕانەوانەی کە لە حەدیسدا هـاتوون، هەنـدێکیان تایبـەتن بـەم جێگەو، هەندێکیشیان لـە جێگەی تردا هاتوون. جا باشترینیان لێرەدا، ئەوانەیانە کە تایبەتن بەم جێگەیەوە.

ئەوجا لـەم جێگەیەدا نزاو پاڕانەوەیەکی زۆر هاتون:

یەکێك لـەوانە ئەو حەدیسەیە، کە لـە هەردوو صەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لـە هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبو هُرَيْرَة)وە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا فَـرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ الْأَخِيرِ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِـنْ عَـذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَماتِ، وَمِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ». واتە: "ئەگـەر یـەکێك لە ئێوە لـە تەحیاتی کۆتایی بوویەوە، با پەنا بەخوا بگرێت لـە چوار شت: لـە سـزای دۆزەخو، لـە سزای گۆڕو، لـە فیتنەو ئاشووبی ژیانو مـردنو، لـە شـەڕو خراپـەی مەسیحی دەجال".

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / 1 / 287 / بە ژمارە: 800، وصَحِيْحُ مُسْلِم / 1 / 302 / بـە ژمارە: 402.

ئیمامی موسلیم لە چەند ڕێگەیەکەوە ڕیوایەتی کردوە.[1]

لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانیشدا بەم جۆرە هاتوە: «إِذَا تَشَهَّدَ أحَدُكُمْ، فَلْيَسْتَعِذْ باللهِ مِنْ أَرْبَعٍ، يَقُولُ: اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أعُوذُ بكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَماتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَة الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ».[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە نوێژدا ئەم دوعایە دەکرد: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أعُوذُ بكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأعُوذُ بكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأعُوذُ بكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَماتِ. اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أعُوذُ بكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ».[3] واتە: "خوایە پەنات پێ دەگرم لە تاوانباری‌و لە قەرزاری".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هەستایە بۆ نوێژ کردن، یەکێك لە دوایین ئەو نزاو پاڕانەوانەی کە لە نێوان تەحیات‌و سلاّودانەوەدا دەیکردن ئەمە بوو: «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ مَا قَدَّمْتُ، وَمَا أخَّرْتُ، وَمَا أسْرَرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أسْرَفْتُ، وَمَا أنْتَ أعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أنْتَ الْمُقَدِّمُ وأنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لا إِلهَ إلاَّ أنْتَ».[4] واتە: "خوایە لەو تاوانانەم خۆش ببیت، کە پێشتر کردوومن‌و، لەوانەش کە دەگونجێت لەمەولا بیانکەم‌و، لەوانەش کە بە پەنهان‌و لەوانەش کە

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦٣ / بە ژمارە: ١٣١١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٥٨٨.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٥٨٨.

(٣) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٦ / بە ژمارە: ٧٩٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٥٨٩.

(٤) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٣٤ / بە ژمارە: ٧٧١.

به ئاشكرا كردوومن‌و، لەوانەش كە زیادەڕەوی‌و سنووربەزێنیم تێدا كردوون‌و، لەوانەش كە خۆت باشتر لە من ئاگات لێیانەو پێیان دەزانیت، تۆ پێشخەرو بەرزكەرەوەی هەندێك لە بەندەكانیت‌و، تۆش دواخەرو نزمكەرەوەی هەندێكی تریانیت، هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست‌و خەلیفەی یەكەم‌و پێشەوای موسوڵمانان (أَبُوْ بَكْر)ی (صِدِّيْق)ـەوە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت)، كە عەرزی پێغەمبەری خوای كردوە (دروودی خوای لەسەر بێت): "دوعایەكم فێر بكە، تا لە نوێژەكەمدا بیخوێنم". پێغەمبەریش فەرموویەتی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِيْ مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِيْ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُوْرُ الرَّحِيْم».(١) واتە: "خوایە من ستەمێكی زۆرم لەخۆم كردوەو، كەسیش لە تاوانەكان خۆش نابێت بێجگە لە تۆ، دەی تۆش بەلێبووردەیی خۆت لێم خۆشبەو، بەزەییت پێمدا بێتەوە، چونكە تۆ لێبووردەو بەبەزەییت".

جا ئیمە لە زۆربەی ڕیوایەتەكاندا بەم جۆرە وەرمان گرتوە (ظُلْماً كَثِيراً). لە هەندێك لە ڕیوایەتەكانی ئیمامی موسلیمیشدا بەم جۆرە هاتوە (ظُلْماً كَبِيراً). هەردووكیشیان هەر جوانن. بۆیە باشتر وایە بەیەكەوە كۆبكرێنەوەو، بوترێت: (ظُلْماً كَثِيراً كَبِيراً).

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەكەیداو، ئیمامی (بَيْهَقِيّ)و پێشەوایانی تریش بەڵگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە بۆ درووستی نزاو پاڕانەوەی كۆتایی نوێژ، كە ئەوەش بەڵگە هێنانەوەیەكی ڕاست‌و درووستە. چونكە فەرمایشتی (لە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٦ / بە ژمارە: ٧٩٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٧ / بە ژمارە: ٢٧٠٥.

نوێژەکەمدا)ی ئیمامی (أَبُوْ بَكْـر) گشتگیرو داگرەوەیە بۆ هەموو نوێژەکەو، یەکێکیش لە جێگەکانی نزاو پاڕانەوەی ناو نوێژ بریتیە لەم جێگەیە (واتە: بریتیە لەدوای تەحیات).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە پێشەوای پایەبەرز {(ذَكْوَان)ی کوڕی (عَبْدُالله)ـەوە، کە بە (أَبو صَالِح)ی (سَمَّان) ناسراوە}، ئەویش لە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بە پیاوێکی فەرموو: «كَيْفَ تَقُولُ فِي الصَّلاةِ؟». واتە: "تۆ لە نوێژدا چی دەڵێیت؟" ئەویش عەرزی کرد: تەحیات دەخوێنمو، دەڵێم: (اللَّهُمَّ إِنِّيْ أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ) واتە: (خوایە من داوای بەهەشتت لێ دەکەمو، پەنات پێ دەگرم لە جەهەنەم)، ئەوجا عەرزی کرد: ئەوەش کە جەنابتو (مُعَاذ) بە دەنگی نزم دەیکەن، من باش نازانم چی دەفەرموون! پێغەمبەری خوایش فەرمووی: «حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ» واتە: "ئێمەش هەر بەدەوری ئەوەدا دێین، کە تۆ دەیڵێیت".

هەروەها یەکێکیش لەو دوعایانەی، کە لە هەموو جێگەیەکدا سونەتە، ئەوەیە کە بوترێت: (اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ. اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى). واتە: (خوایە، من داوای لێبوردنو سەلامەتیو بێوەییت لێ دەکەم. خوایە من داوای هیدایەتو ڕێنموویی‌و، تەقواو پارێزکاریو، داوێن پاکیو، بێنیازیت لێ دەکەم).

## سڵاودانەوە بۆ دەرچوون لە نوێژ

بزانە، کە سڵاودانەوە بۆ دەرچوون لە نوێژ ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی نوێژو، فەرزێکە لە فەرزەکانیو، نوێژەکەش بەبێ ئەو درووست نیە. ئەمە مەزهەبی ئیمامی

(شَافِعِيّ)و (مَالِك)و (أحْمَد)و زۆربەی زانایـانی (سَلَف)و (خَلَــف)ــەو، حەدیسـە (صَحِيْح)ـە مەشهورەکانیش بە ڕاشکاوانە وا دەفەرموون.

بشزانە، کە تەواوترین صیغەی سـلاٚودانەوە ئەوەیـە، کـە نوێژخوێنەکـە بـەلای ڕاستیدا بڵێـت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)و، بـەلای چەپیشـدا بڵێـت: (السَّــلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ). سونەت نیە لـەگەڵیدا بڵێت (وَبَرَكَاتُــهُ)، چـونکە پێچـەوانەی ئەوەیە کە مەشهورە لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت). ئەگەرچـی لـە ڕیوایەتێکی ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)یشـدا هـاتوەو، کۆمـەڵێکیش لـە هاوەڵاٚنمـان باسـیان کردوە، لـەوانە (إمَامُ الْحَرَمَيْن)و شێخ (زَاهِر)ی (سَرْخَسِيّ یان سَرَخْسِــيّ)و شـێخی (رُوْيَانِيّ) لە کتێبی (حِلْيَةُ الْمُؤْمِنِ)دا. بـەلاٚم ئەمـە بۆچـوونێکی نـامۆو (شَــاذّ)ەو، بۆچوونی مەشهوور ئەوەی تریانە. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.(۱)

جا ئیتر ئەگەر نوێژخۆێنەکە پێشنوێژ بێت، یان شوێنکەوتوو، یان خۆی بـە تـەنها بێت، وە لـە کۆمەڵێکی کەمدا بێت یان لە کۆمەڵێکی زۆردا، وە لـە نوێژی فـەرزدا بێت یان لـە سونەتدا، لـە هەموو ئەم حاڵـەتانەدا -بەو جۆرەی باسمان کرد- دوو جار سلاٚو دەداتەوە بەلای ڕاستو بەلای چەپدا.

ئەوجا ئەوەی کە واجبە، تەنها یەك سـلاٚودانەوەیەو، ئـەوەی دوەمیـان سـونەتە. بۆیە ئەگەر نەشیکات زیانی پیّ ناگەیەنێت.

پاشان، ئەوەی کە واجبە لـە صیغەی سلاٚودانەوەدا بوترێت ئەوەیـە کـە بڵێـت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ). بۆیە ئەگەر بڵێت: (سَلَامٌ عَلَيْكُمْ)، ئەوە بەپێی ڕاسـترین بۆچـوون

---

(۱) بەلاٚم وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: لە چەند ڕێگەیەکـەوە ڕیوایـەت کـراوە، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لـە سلاٚودانەوەیدا بەلای ڕاسـتو بـەلای چـەپیدا فەرموویەتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ). بۆیە زۆرێك لـە زانایـان پێیـان وایـە، کـە ئەو زیادەیەش سونەتە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ۲ / ۲۳۷ - ۲۳۸، وتُحْفَةُ الْــأَبْرَار / ۷۰ - ۷۱، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ۳ / ۲۱ - ۲۲.

درووست نیە. وە ئەگەر بڵێت: (عَلَيْكُمْ السَّلامُ) ئەوە بەپێی ڕاسترین بۆچوون درووستە. بەڵام ئەگەر بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْكَ)، یان (سَلامِيْ عَلَيْكَ)، یان (سَلامِيْ عَلَيْكُمْ)، یان (سَلامُ اللهِ عَلَيْكُمْ)، یان (سَلامُ عَلَيْكُمْ) بەبێ تەنوین، یان بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْهِمْ)، ئەوا -بەبێ ناکۆکی- هیچکامیان درووست نین‌و، نوێژەکەشی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر بە دەستی ئەنقەست بیڵێت‌و، بشزانێت کە وایە، تەنها لە (السَّلامُ عَلَيْهِمْ) نەبێت، کە نوێژەکەی پێ بەتاڵ نابێتەوە، چونکە دوعایە. بەڵام ئەگەر بە سەهو هەرکام لەوانە بڵێت، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوەو، بە هیچکامیشیان لە نوێژەکە ناچێتە دەرەوە. بەڵکو پێویستە جارێکی تر سڵاوێکی درووست بداتەوە.

جا ئەگەر پێشنوێژ تەنها یەك سڵاوی دایەوە، ئەوا با شوێنکەوتوەکان هەردوو سڵاوەکە بدەنەوە.

زانای پایەبەرز قاضی (أَبو الطَّيِّب)ی (طَبَرِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان-و کەسانی تریش فەرموویانە: ئەگەر پێشنوێژەکە سڵاوی دایەوە، ئەوا شوێنکەوتوەکە سەرپشکە، ئەگەر بیەوێت دەستبەجێ سڵاو دەداتەوەو، ئەگەر بیشیەوێت درێژە بە دانیشتنەکەی دەدات بۆ دوعا کردن‌و، چەندیشی بوێت دانیشتنەکەی درێژ دەکاتەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر کەسێك قسەی لەگەڵ نوێژخوێندا کرد، ئەو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا لە هاوەڵی خۆشەویست (سَهْل)ی کوڕی (سَعْد)ی (سَاعِدِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِـيْ صَلاتِهِ،

فَلْيَقُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ».[1] واته: "ئەو کەسەی لەناو نوێژدا شتێکی توشهات، با بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّهِ)".

لە ڕیوایەتێکی (صَحِيْح)یشدا هاتوە: «إِذَا نَابَكُمْ أمْرٌ، فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْتُصَفِّقِ النِّسَاءُ».[2] واته: "ئەگەر شتێکتان توشبوو، با پیاوان (سُبْحَانَ اللَّهِ) بکەن و، ئافرەتانیش بە لەپی دەستی ڕاستیان بدەن لە پشتی دەستی چەپیان".

لە ڕیوایەتێکی (صَحِيْح)یشدا هاتوە: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيْقُ لِلنِّسَاءِ».[3]

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٠٧ / بە ژمارە: ١١٦٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣١٦ / بە ژمارە: ٤٢١.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٢٩ / بە ژمارە: ٦٧٦٧.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٠٣ / بە ژمارە: ١١٤٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣١٨ / بە ژمارە: ٤٢٢.

## باسی زیکرەکانی دوای نوێژەکان

زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە زیکر کردن لـەدوای نوێـژە فەرزەکانـەوە سونەتەو، زۆرێك حەدیسی (صَحِیْح)یش سەبارەت بە جۆرەها زیکر هاتوە، کە ئێمە تەنها هەندێکیان باس دەکەین:

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عـەرزی پێغەمبـەری خوا کرا (دروودی خوای لەسەر بێت): کام نـزاو پاڕانەوەیـە زیـاتر وەردەگیرێـت و گـیرا دەبێت؟ ئەویش فەرمووی: «جَوْفَ اللَّيْلِ الْآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ». واتـە: "ئەو نزاو پاڕانەوەیەی، کە لە بەشی کۆتایی شەوو، لـە دوای نوێـژە فەرزەکانـەوە دەکرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "مـن بـە بیستنی (اللهُ أَكْبَر) کردندا دەمزانی پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) لەنوێـژ بوەتەوە".[2]

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی موسلیمدا بەم جۆرە هاتوە: (ئێمە بە بیستنی.....هتد).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٦ / بە ژمارە: ٣٤٩٩. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: فەرمایشتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ) جێگەی سەرنجو تێبینیە. چونکە حەدیسەکە سـێ نەخۆشـی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٢٤٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ٨٠٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٠ / بـە ژمارە: ٥٨٣.

لە ڕیوایەتێکیشدا لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە بەرز کردنەوەی دەنگ بە زیکر کردن لە کاتێکدا خەڵکی لە نوێژە فەرزەکان دەبوونەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) هەبوو. (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: من ئەگەر گوێم لە دەنگی خەڵکی بوایە، ئیتر دەمزانی لەنوێژ بوونەتەوە [1]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ثَوْبَان)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە نوێژ بوایەتەوە سێ جار داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە دەکردو، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالْإِكْرَامِ».[2] واتە: "خوایە تۆ خۆت سەلامیتو دووریت لە هەموو نەنگیو نوقسانیەك، سەلامیش هەر لە تۆوەیە، تۆش زۆر بەرزو پیرۆزیت، ئەی خاوەنی شکۆو بەخشندە".

پرسیارکراوە لە ئیمامی (أَوْزَاعِيّ)، کە یەکێکە لە ڕاویەکانی ئەم حەدیسە: "داوای لێخۆشبوون کردن چۆنە؟" ئەویش فەرموویەتی: ئەوەیە، کە بڵێیت: (اسْتَغْفِرُ اللهَ) (اسْتَغْفِرُ اللهَ).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُغِيْرَة)ی کوڕی (شُعْبَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنوێژ دەبوویەوەو، سڵاوی دەدایەوە، دەیفەرموو: «لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ.

---

(١) بروانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ٨٠٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٠ / بە ژمارە: ٥٨٣.

(٢) بروانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٤ / بە ژمارە: ٥٩١.

اللَّهُمَّ، لا مَانِعَ لِمَا أعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَـدُّ».[1]
واته: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای تاكو تەنهای بێ هاوتا، موڵكو سامان هی ئەوەو، سوپاسو ستایشیش بۆ ئەوەو، ئەویش توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. خوایە ڕێگرێك نیە لەوەی تۆ دەیبەخشیتو، بەخشەرێکیش نیە بۆ ئەوەی تۆ ڕێگریت لێ کردوە، دەوڵەمەندیو هەبوونو بەختو دەسەڵاتیش سوود بە خاوەنەکەیان ناگەیەنن لەلای تۆ، (بەڵکو ئەوەی کە سوودی هەیە، تەنها بریتیە لە لوتفی تۆو، لە کردەوەی چاکی کەسەکە خۆی)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (زُبَیْر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەو لەدوای هەموو نوێژێکەوە، کاتێك سلاوی دەدایەوە، دەیفەرموو: «لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحدَهُ، لا شَـرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. لا حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللّه، لا إلهَ إلاَّ اللّهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إلاَّ إيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ، ولَهُ الفَضْلُ، وَلَهُ الثَّناءُ الْحَسَنُ، لا إلهَ إلاَّ اللّـهُ، مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُوْنَ». واته: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای تاكو تەنهای بێ هاوتا، موڵكو سامان هی ئەوەو، سوپاسو ستایشیش بۆ ئەوەو، ئەویش توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. هیچ هێزو توانایەکیش نیە بۆ خۆلادان لە خراپەو، بۆ کردنی چاکە بێجگە لە هێزی لوتفو پشتیوانی خوا. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خواو، ئێمەش بێجگە لەو هیچ شتێکی تر ناپەرستین. هەموو نازو نیعمەتو فەزڵو وەسفو سەنایەك هەر بۆ ئەوە. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوا، ئێمە بە دڵسۆزیو ئیخلاصەوە دینداری بۆ دەکەین، باوەکو کافرەکانیش پێیان ناخۆشبێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٩ / بە ژمارە: ٨٠٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٤ / بە ژمارە: ٥٩٣.

(عَبْدُاللّه)ی کوڕی (زُبَیْر) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەدوای هەموو نوێژێکەوە ئەم تەلیلەو زیکرەی دەکرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَیْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کۆچبەرە هەژارەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خواو (دروودی خوای لەسەر بێت) عەرزیان کرد: دەوڵەمەندو پارەدارەکان هەموو پلەوپایە بەرزەکان‌و نازو نیعمەتە بەردەوام‌و نەبڕاوەکانیان بۆ خۆیان بردوە: ئەوانیش وەکو ئێمە نوێژ دەکەن‌و، وەکو ئێمەش ڕۆژوو دەگرن‌و، سەروەت‌و سامانی زیادەشیان هەیە، حەجی پێ دەکەن‌و، عومرەی پێ دەکەن‌و، جیهاد دەکەن‌و خێرو خێراتیش دەکەن! پێغەمبەریش فەرمووی: «ألا أُعَلِّمُکُمْ شَيْئاً تُدْرِکُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَکُمْ، وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَکُمْ، وَلاَ يَکُونُ أحَدٌ أفْضَلَ مِنْکُمْ، إلاَّ مَنْ صَنَعَ مِثْلَ ما صَنَعْتُمْ؟». واتە: "ئایا شتێکتان فێر نەکەم، کە پێی بگەنە ئەوانەی پێش خۆتان‌و، بشکەونە پێش ئەوانەی دوای خۆتانەوەو، هیچ کەسێکیش لە ئێوە باشتر نەبێت، مەگەر ئەو کەسەی هەمان ئەو کارە بکات کە ئێوە دەیکەن". ئەوانیش عەرزیان کرد: "بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فێرمان بکە". پێغەمبەریش فەرمووی: «تُسَبِّحُوْنَ وَتَحْمَدُوْنَ وَتُکَبِّرُوْنَ خَلْفَ کُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ».[2] لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە سی‌وسێ (٣٣) جار (سُبْحَانَ اللهِ)و، (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، (اللهُ أکْبَرُ) بکەن.

(أَبو صَالِح) کە لە (أَبو هُرَیْرَة)وە ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوە، کاتێك پرسیاری چۆنێتی زیکرەکانیانی لە (أَبو هُرَیْرَة) کردوە، ئەویش فەرموویەتی: بڵێت: (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَاللهُ أکْبَرُ)، هەتا لە هەموویان سی‌وسێ (٣٣) جار تەواو دەکات.

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٥ / بە ژمارە: ٥٩٤.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٨٩ / بە ژمارە: ٨٠٧، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٦ / بە ژمارە: ٥٩٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (عُجْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مُعَقِّباتٌ لاَ يَخِيبُ قائِلُهُنَّ -أوْ فَاعِلُهُنَّ- دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ: ثَلاثاً وَثَلاثِينَ تَسْبِيحَةً، وَثَلاثاً وَثَلاثِينَ تَحْمِيدَةً، وأرْبعاً وَثَلاثِينَ تَكْبِيرةً».[1] واتە: "چەند زیکرو تەسبیحاتێك هەن بەشوێن یەکدا لەدوای نوێژەکانەوە دەکرێن، ئەوکەسەی لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە بیانڵێت یان بیانکات نائومێد نابێت: سیوسێ (٣٣) جار (سُبْحَانَ اللهِ)و، سیوسێ (٣٣) جار (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، سیوچوار (٣٤) جار (اللهُ أكْبَرُ)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ سَبَّحَ اللهَ فِيْ دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وَحَمِدَ اللهَ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وكَبَّرَ اللهَ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وَقالَ تَمامَ الْمِئَةِ: "لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" غُفِرَتْ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».[2] واتە: "ئەو کەسەی لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە سیوسێ (٣٣) جار (سُبْحَانَ اللهِ)و، سیوسێ (٣٣) جار (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، سیوسێ (٣٣) جار (اللهُ أكْبَرُ) بکاتو، بۆ تەواو کردنی سەدەکەش یەك جار بڵێت: (لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، خوا لە تاوانو هەڵەکانی دەبورێت، ئەگەرچی لە زۆریدا وەکو کەفی دەریاش وابن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە سەرەتای (كِتَابُ الْجِهَاد)ی صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لەدوای نوێژەکانەوە بەم چوار وشەیە پەنای

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٨ / بە ژمارە: ٥٩٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٤١٨ / بە ژمارە: ٥٩٧.

بەخوا دەگرت: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ».[1] واتە: "خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە ترسنۆکیو، لەوەی کە بگەمە تەمەنی کەفتەکاریو پەککەوتەییو، پەنات پێ دەگرم لە فیتنەو ئاشووبی دنیاو، لە سزای ناو گۆڕ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «خَصْلَتَانِ – أَوْ خَلَّتَانِ– لا يُحافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ، هُمَا يَسيْرٌ، وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيْلٌ: يُسَبِّحُ اللهَ تَعَالَى دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ عَشْراً، وَيَحْمَدُ عَشْراً، وَيُكَبِّرُ عَشْراً، فَذلِكَ خَمْسُوْنَ وَمِئَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِئَةٍ فِيْ الْمِيزَانِ. وَيُكَبِّرُ أَرْبَعاً وَثَلاثِيْنَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ، وَيَحْمَدُ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وَيُسَبِّحُ ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، فَذلِكَ مِئَةٌ بِاللِّسَانِ، وَأَلْفٌ بِالْمِيْزَانِ». واتە: "دوو سیفەت هەن، هەر بەندەیەکی موسوڵمان پارێزگاریان لێ بکات، دەچێتە بەهەشتەوە. ئەوانیش ئاسانن، ئەوانەش کاریان پێ دەکەن کەمن: لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە دە (١٠) جار (سُبْحَانَ اللهِ)و، دە (١٠) جار (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، دە (١٠) جار (اللهُ أَكْبَرُ) بکات، ئەمانە بە زمان سەدوپەنجا (١٥٠) زیکرنو، لەسەر ترازووی کردەوەکانیش هەزارو پێنج سەد (١٥٠٠)ن. هەرکاتێکیش بچێتە سەر جێگەی خەو، با سیوچوار (٣٤) جار (اللهُ أَكْبَرُ)و، سیوسێ (٣٣) جار (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، سیوسێ (٣٣) جار (سُبْحَانَ اللهِ) بکات، ئەمانەش بە زمان سەد (١٠٠) زیکرنو، لەسەر ترازووش هەزار (١٠٠٠)ن".

(عَبْدُالله) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوام بینی، کە بە دەستی خۆی زیکرەکانی دەژمارد.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٠٣٨ / بە ژمارە: ٢٦٦٧.

ئەوجا هاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ئەوانە ئاسانن‌و، کەچی کەسانێکی کەمیش دەیانکەن؟!" ئەویش فەرمووی: «يَأْتِيْ أَحَدَكُمْ -يَعْنِيْ الشَّيْطَانَ- فِيْ مَنَامِهِ، فَيُنَوِّمُهُ قَبْلَ أنْ يَقُولَهُ، وَيَأْتِيْهِ فِيْ صَلاتِهِ، فَيُذَكِّرَهُ حَاجَتَهُ قَبْلَ أنْ يَقُوْلَهَا».[1] واتە: "شەیتان بەرلە خەوتن دێت بۆ یەکێك لە ئێوەو، خەوی لێ دەخات بەرلەوەی بیڵێت‌و بیکات. هەروەها لەکاتی نوێژیشدا دێت بۆی‌و، پێویستیەکی بەبیر دەهێنێتەوە بەرلەوەی بیڵێت‌و بیکات".

ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە، تەنها ئەوەندە هەیە، کە (عَطَاء)ی کوڕی (سَائِب)ی تێدایەو، ئەویش -بەهۆی تووشبوونیەوە بە لێتێکەڵبوون (اخْتِلاط)- ڕای جیاوازی لەسەرە.

زانای پایەبەرز (أَيُّوْب)ی (سَخْتِيَانِيّ)ش ئاماژەی بە (صَحِيْح)ێتی ئەم حەدیسە داوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُقْبَة)کوڕی (عَامِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی پێکردم، کە لەدوای هەموو نوێژێکەوە هەردوو سورەتی (مُعَوِّذَتَيْن) {واتە: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾} بخوێنم.[2]

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە سورەتەکانی (مُعَوِّذَات) {واتە: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾} بخوێنم.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٦ / بە ژمارە: ٥٠٦٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٨ / بە ژمارە: ٣٤١٠، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٧٤ / بە ژمارە: ١٣٤٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٧ / بە ژمارە: ١٥٢٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٧١ / بە ژمارە: ٢٩٠٣، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٦٨ / بە ژمارە: ١٣٣٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٢٩٠.

بۆیه پێویسته هەرسێ سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بخوێنێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُـو دَاوُد)و (نَسَـائِيّ)دا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەستی گرتوەو پێی فەرموە: «يَا مُعَـاذُ، وَاللهِ إِنِّيْ لَأُحِبُّكَ». واتە: "ئەی (مُعَاذ)، سوێند بەخوا من تۆم خۆش دەوێت". پاشان فەرموویەتی: «أُوْصِيْكَ يَا مُعَاذُ، لا تَدَعَنَّ فِيْ دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ تَقُولُ: "اللَّهُمَّ، أَعِنِّيْ عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبادَتِكَ"».[1] واتە: "ئەی (مُعَـاذ)، وەسێتت بۆ دەکەمو ئامۆژگاریت دەکەم، لەدوای هەموو نوێـژێکی فەرزەوە واز لەمە نەهێنیت، کە بڵێیت: (خوایە یارمەتیم بدەو هاوکاریم بکە لەسەر زیکری خۆتو، لەسەر شوکرانە بژێری نازو نیعمەتەکانتو، لەسەر بەندایەتی کردن بۆت بەشێوەیەکی جوانو ڕێکوپێک)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەنوێژ بوایەتەوە، دەستی ڕاستی دەهێنا بە دەمو چاویداو، پاشان دەیفەرموو: «أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ الرَّحْمنُ الرَّحِيْمُ. اللَّهُمَّ، أَذْهِبْ عَنِّيْ الْهَـمَّ وَالْحَزَنَ».[2] واتە: "شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای بەسۆزو میهرەبان. خوایە خەمو پەژارەو دڵتەنگیم لەکۆڵ بکەرەوە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ١٥٢٢، وسُنَنُ النَّسَـائِيّ / ٣ / ٥٣ / بە ژمارە: ١٣٠٣.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٥٩ / بە ژمارە: ١١٢. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٠٠ – ٣٠١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ أُمَامَـةَ)وە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: لـەدوای هـەر نوێـژێکی فـەرزو سـونەتەوە لـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) نزیـك بوومایەتەوە، گوێم لێی دەبوو، کە دەیفـەرموو: «اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ ذُنُوْبِيْ وَخَطَايَـايَ كُلَّهَا. اللّهُمَّ، أنْعِشْنِيْ، وَاجْبُرْنِيْ، وَاهْدِنِيْ لِصَالِحِ الْأعْمَالِ وَالْأخْلاقِ، إنَّـهُ لاَ يَهْـدِيْ لِصَالِحِهَا، وَلاَ يَصْرِفُ سَيِّئَهَا إلاَّ أَنْتَ».[1] واتە: "خوایە لە هەموو تـاوانو هەڵـەکانم خۆشبە. خوایە بەرزم بکەرەوەو هێزو تینم تێ بخەو، کەموکورتیم مەهێڵەو تەنگانەم بۆ پڕبکەرەوەو، ڕێنموویم بکە بۆ کردەوەی چاكو ڕەوشتی جوان، چـونکە بێجگـە لە تۆ کەس ڕێنموویی ناکات بۆلای کردەوەی چاكو ڕەوشـتی جـوانو، کەسـیش کردەوەی خراپو ڕەوشتی ناشیرین لانادات‌و دووریان ناخاتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە ئەگـەر پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لـەنوێژ بوایەتەوە -نازانم پێش ئەوەی سڵاو بداتەوە، یان دوای ئەوەی سڵاو بداتەوە- دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّـا يَصِـفُونَ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِيْنَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ».[2] واتە: "پـەروەردگاری تـۆ کـە بەهێزو دەسەڵاتدارە، پاكو بێگەردە لەوەی ئەو کافرو بێباوەڕانە دەیڵێن لەبارەیەوە، سەلامی خواش لـەسەر پێغەمبەرەکانو، سوپاسو ستایشیش بۆ خوای پـەروەردگاری هەموو عالـەم".

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦١ - ٦٢ / بە ژمارە: ١١٦. شێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی لاوازە. بەڵام لە ڕێگەی ترەوە پشتگیری کـراوە. بڕوانـە: نَتَـائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٣٠٢ - ٣٠٤.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦٣ / بـە ژمـارە: ١١٩. شـێخی عەسـقەلانی بـە حەدیسێکی زۆر لاوازی داناوە. بەڵام شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِـيّ)ی فەرموویـەتی: زانـای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى) ڕیوایەتی کردووەو، کەسەکانی ڕشتەکەشی متمانـەدارن. بڕوانـە: نَتَـائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٣٠٢ - ٣٠٤، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٢ / ١٤٧ - ١٤٨ / بە ژمارە: ٢٨٩١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەنوێژ بوایەتەوە، دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، اجْعَلْ خَيْـرَ عُمُـرِيْ آخِرَهُ، وَخَيْرَ عَمَلِيْ خَوَاتِمَهُ، وَاجْعَلْ خَيْرَ أَيَّامِيْ يَوْمَ أَلْقَاكَ».[1] واتە: "خوایە وا بکە کە باشترین کاتی تەمەنم کۆتاییەکەی بێت‌و، باشترین کردەوەشم دوایین کردەوە بێت‌و، باشترین ڕۆژیشم ڕۆژی بەخزمەتگەیشتنی تۆ بێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ بَكْرَة)وە {کە ناوی: (نُفَيْع)ی کوڕی (حَارِث)ـە} (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لەدوای نوێژەوە دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ».[2] واتە: "خوایە من پەنات پێ دەگرم لە کافربوون‌و، لە هەژاری‌و نەداری‌و، لە سزای ناو گۆڕ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز (ضَعِيْف)، لە هاوەڵی خۆشەویست (فَضَالَة)ی کوڕی (عُبَيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ (فَلْيَبْتَدِأْ) بِتَحْمِيدِ اللهِ تَعَالَى وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّيْ عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، ثُمَّ يَدْعُوْ (لِيَدْعُ) بِمَا شَاءَ».[3] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦٣ - ٦٤ / بە ژمارە: ١٢١. شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ)و شێخی عەسقەلانی فەرموویانە: کەسێکی لاواز لە ڕشتەی ئەم حەدیسەدایە بەناوی (أَبُو مَالِك)ی (نَخَعِيّ)ـەوە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِـد / ١٠ / ١١٠ / بە ژمارە: ١٦٩٧٤، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٠٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٥٩ / بە ژمارە: ١١١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٠٩.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦٠ / بە ژمارە: ١١٣. هێنانی ئەم حەدیسە بەم جۆرە دوو سەرنج‌و تێبینی لەسەرە:

کرد، با (دوای نوێژەکە سەرەتا) بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکات و، پاشان صەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدات و، ئەوجا هەر دوعایەکی دەوێت با بیکات".[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی هەڵنان لەسەر زیکر کردن لەدوای نوێژی بەیانی

بزانە، کە باشترین کاتەکانی زیکر کردن لە ڕۆژدا بریتیە لەدوای نوێژی بەیانی.

---

- یەکەم: حەدیسەکە لە زۆرێك لە کتێبە بەناوبانگەکانی حەدیسدا هاتووە، کەچی ئیمامی نەوەوی تەنها لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە هێناویەتی!!!
- دووەم: زۆریش سەیرە کە ئیمامی نەوەوی دواتر ئەم حەدیسە لەو کتێبە بەناوبانگانەوە دەهێنێت و، دەشفەرموێت: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـەو، کەچی لێرەدا بەم ڕشتە لاوازە هێناویەتی!!!

(١) هەروەها سونەتە لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکانەوە (آيَةُ الْكُرْسِيِّ) بخوێنرێت. چونکە لە حەدیسی پێغەمبەری خوادا هاتوە، کە: «مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ، لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ إِلاَّ أَنْ يَمُوتَ». واتە: "ئەو کەسەی لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکانەوە (آيَةُ الْكُرْسِيِّ) بخوێنێت، تەنها ئەوە ڕێگەی چوونە بەهەشتی لێ دەگرێت کە بمرێت". واتە: هەر بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە. هەروەها هاتوە کە: «مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ فِيْ دُبُرِ الصَّلاةِ الْمَكْتُوْبَةِ، كَانَ فِيْ ذِمَّةِ اللهِ إِلَى الصَّلاةِ الْأُخْرَى». واتە: "ئەو کەسەی لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە (آيَةُ الْكُرْسِيِّ) بخوێنێت، لەژێر چاودێری و پاراستنی خوادا دەبێت، هەتا دەگاتەوە بە نوێژی دواتر". شێخی عەسقەلانی سەبارەت بە حەدیسی یەکەم فەرموویەتی: ئیمامی (نَسَائِيّ) ڕیوایەتی کردووە، شێخی (ابْنُ حِبَّان)یش بە صەحیحی داناوە و، ئیمامی (طَبَرَانِيّ)یش سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)یشی بۆ زیاد کردوە. بڕوانە: بُلُوْغُ الْمَرَامِ مِنْ أدِلَّةِ الْأحْكَام / ٩٦ / بە ژمارە: ٣٢٤. سەبارەت بە هەردوو ڕیوایەتەکەش بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٠٢ / بە هەرسێ ژمارە: ١٦٩٢٢ و ١٦٩٢٣ و ١٦٩٢٤.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ــەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لـە غەیری ئەویشدا، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِيْ جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللهَ تَعَالَى حَتَّى تَطْلُعَ الشَمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تامَّـةٍ تامَّةٍ تامَّةٍ». واتە: "ئەو کەسەی نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات‌و، پاشان دانیشـێت زیکری خوای گەورە بکات، هەتا خۆر هەڵدێت‌و، ئەوجا دوو ڕکات نوێـژ بکـات، پاداشتی ئەو کارەی وەکو پاداشتی حەج‌و عومرەیەکی تەواو تەواو وەهایە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لــە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ ذَرّ)ەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ فِيْ دُبُرِ صَلاةِ الصُّبْحِ، وَهُوَ ثَانٍ رِجْلَيْهِ، قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِيْ وَيُمِيْتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" عَشْرَ مَرَّاتٍ، كُتِبَتْ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَمُحِيَ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ يَوْمَهُ ذَلِكَ فِي حِرْزٍ مِنْ كُلِّ مَكْــرُوهٍ، وَحُــرِسَ مِــنْ الشَّيْطَانِ، وَلَمْ يَنْبَغِ لِذَنْبٍ أَنْ يُدْرِكَهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ، إِلاَّ الشِّرْكَ بِاللَّـــهِ». واتـە: "ئـەو کەسەی لەدوای نوێژی بەیانیەوە، قاچەکانی لەسەریەك دانابێت‌و شێوازی دانیشتنی تەحیاتەکەی نەگۆڕیبێت‌و، بەرلەوەی قسە بکات، دە جـار بڵێـت: (لا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِيْ وَيُمِيْتُ، وَهُوَ عَلَى كُــلِّ شَــيْءٍ قَدِيرٌ)، ئەوا دە چاکەی بۆ دەنوسـرێت‌و، دە تاوانیشـی لێ دەسـڕێتەوەو، دە پلـەش پلەی بەرزدەکرێتەوەو، ئەو ڕۆژەش لە قەڵاو پەرژیندا پارێزراودا دەبێت لە هـەموو خراپەیـەك‌و، لـە شـەیتانیش دەپارێزرێـت‌و، هـیچ تـاوانێکیش بەهیلاکیـدا نابـات‌و کردەوەکانی پووچەڵ ناکاتەوە بێجگە لە هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٤٨١ / بە ژمارە: ٥٨٦.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، لە هەندێك نوسخەشدا هاتوە کە: حەدیسێکی (صَحِیْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)دا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (مُسْلِم)ی کوڕی (حَارِث)ی (تَمِیمِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە بە نهێنی پێی فـەرموو: «إِذَا انْصَرَفْتَ مِنْ صَـلاَةِ الْمَغْرِب، فَقُلْ: "اللَّهُمَّ، أَجِرْنِي مِنَ النَّار" سَبْعَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ، ثُمَّ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا. وَإِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ، فَقُلْ كَذَلِكَ؛ فَإِنَّكَ إِنْ مُـتَّ مِـنْ يَوْمِكَ، كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا».[2] واتە: "ئەگەر لە نوێژی مەغریب بوویتەوە، حەوت (٧) جار بڵێ: (خوایە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارم بکە)، چونکە ئەگـەر وا بڵێیـتو، پاشان لەو شەوەدا بمریت، خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت دەکات. ئەگەر نوێژی بەیانیشت کرد، بە هەمان شێوە حەوت جار بیڵێ، چونکە ئەگەر لەو ڕۆژەدا بمریت، خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت دەکات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (أَحْمَد)و (سُنَن)ی (ابْــنُ مَاجَــه)و کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی بـەیانی بکردایە، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً، وَرِزْقاً طَيِّباً».[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٥ / بە ژمارە: ٣٤٧٤. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: ئەو نوسخەیە هەڵەیە، کە تێیدا نوسراوە حەدیسێکی (صَحِیْح)ـە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٢٢. منیش دەڵێم: لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکاندا نوسـراوە: (هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ).

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤١ / بە ژمارە: ٥٠٧٩. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٢٦.

(٣) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٤٤ / ٢٢١ / بە ژمارە: ٢٦٦٠٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٢٨٩ / بە ژمـارە: ٩٢٥، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٢٩ / بـە ژمـارە: ٥٤.

واته: "خوایه من داوای زانستی بەسوودو کردەوەی وەرگیراوو ڕزقو ڕۆزی پاكو خاوێنت لێ دەکەم".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (صُهَيْب)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درروودی خوای لەسەر بێت)، لەدوای نوێژی بەیانی لێوەکانی دەجولاندو، شتێکی دەفەرموو. منیش عەرزم کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە چی دەفەرموویت؟" ئەویش فەرمووی: «اللّهُمَّ، بِكَ أُحَاوِلُ، وَبِكَ أُصَاوِلُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ».[1] واتە: "خوایە بە پشتیوانی تۆ تێدەکۆشمو بەرەو دوژمنان دەجولێمو، بە پشتیوانی تۆش پەلاماریان دەدەمو هێرش دەکەمە سەریانو لەڕووی هێرشەکانیاندا دەوەستمەوەو، بە پشتیوانی تۆش شەڕیان لەگەڵدا دەکەم".

جا زۆرێك حەدیسی تریش هەن بە هەمان مانای ئەوانەی باسم کردنو، ئەگەر خوای گەورەش بیەوێت، لەم باسەی دواتردا -کە باس لەو زیکرانە دەکات، لە سەرەتای ڕۆژەوە دەکرێنو دەوترێن- ئەوەندە حەدیسی تر دێت، کە چاوەکانی پێ ڕۆشن ببنەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە زانای پایەبەرز (أَبُو مُحَمَّد)ی (بَغَوِيّ)ەوە، لە کتێبی (شَرْحُ السُّنَّة)دا، کە فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (عَلْقَمَة)ی کوڕی (قَيْس) فەرموویەتی: "پێمان گەیشتوە، کە زەوی بە دەنگی بەرز هاوار دەباتە لای خوای

---

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٢٩ – ٣٣٠.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٦٢ / بە ژمارە: ١١٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٣٣.

گەورە لە خەوتنی کەسی زانا لەدوای نوێژی بەیانیەوە".[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەوەی لە بەیانیان و لە ئێواراندا دەوترێت

بزانە، کە ئەم باسە زۆر فراوانەو، لەم کتێبەشدا لەمە فراوانتری تێدا نیەو، منیش ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، چەند باسێکی کورت و پوختی لێ دەهێنم. خۆ ئەگەر خوای گەورە کەسێکی موەفەق کرد بۆ کار کردن بە هەمووی، ئەوە نازو نیعمەتێکی زۆری بەسەردا ڕژاندوەو، نیشانەی بەختەوەریەتی و، ئەگەر کەسێکیش توانای نەبوو هەمووی بکات، ئەوا با تەنها کورتەکانیان بکات –ئەوانەیان کە خۆی دەیوێت–، باوەکو تەنها یەك زیکریش بێت.

ئەصڵیش لەم باسەدا لە قورئانی پیرۆزدا بریتیە لە:

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾. [طه: ١٣٠]. واتە: {بەر لە هەڵهاتن و بەر لە ئاوابوونی خۆر تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾. [غافر: ٥٥]. واتە: {ئێواران و بەیانیان تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾. [الأعراف: ٢٠٥]. واتە: {لە بەیانیان و لە ئێواراندا بە ملکەچی و بە ترسەوە یادو زیکری خوا بکە لە نەفس و دەروونی خۆتداو، دەنگیشت با بەرز نەبێت}.

---

(١) بروانە: شَرْحُ السُّنَّة لِلْبَغَوِيّ (تَحْقِيق: شُعَيْب الْأَرْنَؤُوْط ومُحَمَّد زُهَيْر الشَّاوِيْش) / ٣ / ٢٢٢.

زانایانی زمان فەرموویانە: (آصَال) جەمعی (أصِيْل)ـەو، ئەویش بریتیە لە ماوەی نێوان عەسرو مەغریب.

- هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا تَطْرُدِ الَّذِيْنَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾. [الأنعام: ٥٢]. واتە: {ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو کەسانە لە کۆڕی خۆت دەرمەکە، کە بەیانیانو ئێواران لە خوا دەپاڕێنەوەو، مەبەستیان دەستخستنی ڕەزامەندی خوایە}.

زانایانی زمان فەرموویانە: (الْعَشِيِّ) بریتیە لە ماوەی نێوان لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانو، ئاوابوونی. (واتە: ماوەی نێوان نیوەڕۆو مەغریب)

- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ * رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ﴾. [النور: ٣٦ - ٣٧]. واتە: {لە ماڵانێکدا خوای گەورە ڕێگەی داوە درووستبکرێنو بەرزبکرێنەوەو، ناوی خوایان تێدا ببرێتو، بەیانیانو ئێواران پیاوانێک تەسبیحاتی خوای تێدا بکەن، کە نە بازرگانیو نە کڕینو فرۆشتن لە زیکرو یادی خواو لە نوێژ کردنو لە زەکاتدان بێئاگایان ناکاتو، لە ڕۆژێک دەترسن، کە دڵەکانو چاوەکان تێیدا نائارامو ناجێگیر دەبن}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾. [ص: ١٨]. واتە: {بەڕاستی ئێمە کەژو شاخەکانمان ڕام کردبوو، لەگەڵ حەزرەتی (دَاوُد)دا لە ئێوارانو لە بەیانیاندا تەسبیحاتی خوایان دەکرد}.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (شَدَّاد)ی کوڕی (أَوْس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «سَيِّدُ الاسْتِغْفَارِ: اللَّهُمَّ، أَنْتَ رَبِّيْ، لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ

مَا صَنَعْتُ، أَبُوْءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِيْ، فَاغْفِرْ لِيْ، فَإِنَّهُ لا يَغْفِرُ الـــذُّنُوبَ إِلاّ أَنْتَ». واته: باشترین صیغه بۆ داوای لێخۆشبوون کردن لـه خوای گەوره بریتیه لەمه: "خوایه تۆ پەروەردگاری منیت، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینه نیـه بێجگـه لــه تۆ، تۆ منت بەدیهێناوەو، منیش بەنـدەی تـۆمو، ئەوەنـدەش بتـوانم لەسـەر پـەیمانو بەڵێنی تۆ دەمێنمەوه، پەنات پێ دەگرم لـه شەڕو خراپەی ئـەوەی کردوومـەو، دان بەوەدا دەنێم، که نازو نیعمەتێکی زۆرت بەسەرمەوه هەیەو، دانـیش بـه تاوانـەکانی خۆمدا دەنێم، دەی تۆش لێم خۆشبه، چونکه بێجگه لـه تـۆ کـەس لـه تاوانـەکان خۆش نابێت".

ئەگەر کەسێك ئەمه لـه ئێواراندا بڵێتو، پاشان بمرێت، ئەوا دەچێته بەهەشـتەوه (یان کەسێکی بەهەشتی دەبێت). خۆ ئەگەر بەیانیانیش بیڵێتو، پاشان بمرێت، ئەوه هەر هەمان پلەوپایەی دەبێت.[1]

وشەی (أَبُوْءُ) واته: دانی پێدا دەنێم.

بۆمان ڕیوایەت کراوه لـه صەحیحی موسلیمدا، لـه هاوەڵی خۆشەویست (أَبُــوْ هُرَيْرَةَ)وه (خوای لێ ڕازی بێـت)، که فەرموویەتی: پێغەمبــەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: "سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ" مِئَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ القِيامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ أَحَدٌ قَــالَ مِثْــلَ مَــا قَــالَ، أَوْ زَادَ عَلَيْهِ».[2] واته: "ئەو کەسەی بەیانیانو ئێواران سەد (١٠٠) جار بڵێت: (سُــبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، هیچ کەسێك لـه ڕۆژی قیامەتدا شـتێکی لــەو باشـتر لەگـەڵ خۆیـدا ناهێنێت، مەگەر کەسێك بەقەدەر ئەو یان زیاتر لـه ئەو ئەو زیکرەی کردبێت".

لـه ڕیوایەتی ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)دا زیکرەکه بەم جۆره هــاتوه: «سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيْمِ وَبِحَمْدِهِ».

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٠ / بە ژمارە: ٥٩٦٤.

(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧١ / بە ژمارە: ٢٦٩٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّە)ی کوڕی (خُبَیْب)ەوە (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە شەوێکی باراناوی زۆر تاریکدا چووینە دەرەوەو، بەشوێن پێغەمبەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەگەڕاین، تاوەکو نوێژمان بۆ بکات، جا کە بە خزمەتی گەیشتین، بە منی فەرموو: (بڵێ). منیش هیچم نەوت. پاشان فەرمووی: (بڵێ). منیش هیچم نەوت. پاشان فەرمووی: (بڵێ). منیش عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، چی بڵێم؟ ئەویش فەرمووی: کاتی ئێواران‌و بەیانیان سێ جار ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بخوێنە، لە هەموو شتێك دەتپارێزن.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَە)و لە غەیری ئەوانیشدا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَیْرَة)وە (خوای لیّ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەو لە بەیانیاندا دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، بِكَ أَصْبَحْنا، وَبِكَ أَمْسَيْنا، وَبِكَ نَحْيا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ النُّشُورُ». لە ئێوارانیشدا دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، بِكَ أَمْسَيْنا، وَبِكَ أَصْبَحْنا، وَبِكَ نَحْيا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ النُّشُورُ». واتە: "خوایە بە ویستی تۆ ڕۆژمان کردوەو، بە ویستی تۆش شەومان کردەوەو، بە ویستی تۆش دەژین‌و، بە ویستی تۆش دەمرین‌و، بۆ خزمەتی تۆش دەگەڕێینەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٣ / بە ژمارە: ٥٠٨٢، وسُنَنُ التِّرمِذِيّ / ٥ / ٥٦٧ / بە ژمارە: ٣٥٧٥، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٨ / ٢٥٠ / بە ژمارە: ٥٤٢٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٧ / بە ژمارە: ٥٠٦٨، وسُنَنُ التِّرمِذِيّ / ٥ / ٤٦٦ / بە ژمارە: ٣٣٩١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ٢ / ١٢٧٢ / بە ژمارە: ٣٨٦٨.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لـە بەرەبەیاندا سەفەری بکردایە (یـان سـەفەرەکەی لـە بەرەبەیانـدا کۆتـایی بهاتایـە)، دەیفەرموو: «سَمَّعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللهِ وَحُسْنِ بَلاَئِهِ عَلَيْنَا. رَبَّنَا صَاحِبْنَا، وَأَفْضِلْ عَلَيْنَـا، عَائِذاً بِاللهِ مِنَ النَّارِ».[1] واتە: "با ئەو کەسەی ئەم قسەی ئێمە دەبیسێت بیگەیـەنێت بە کەسانی تر، یان با کەسی بیسەر گوێی لێبێت‌و، کەسـی ئامـادەش ئاگـای لـەوە بێت، کە ئێمە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەکەین‌و، دان بەوەدا دەنێین کە نازو نیعمەتێکی چاك‌و پـاکی ڕژانـدوە بەسـەرماندا. خوایـە، هاوکاریمـان بکـەو ئاگـات لێمانبێت‌و، بەردەوام نیعمەتی خۆت بڕژێنـە بەسـەرماندا، پـەنا بـەخوا دەگـرین لـە ئاگری دۆزەخ".

زانای پایەبەرز قاضي (عِيَاض)و، خـاوەنی کتێبـی {(مَطَالِعُ الْأَنْوَار عَلَى صِـحَاحِ الْآثَار)، کە ناسراوە بە (ابْنُ قُرْقُوْل)} و، کەسانی تریش فەرموویانە: میمـی (سَـمَّعَ) شەدەدارەو، بە مانای ئەوە دێت، کە کەسی بیسەر ئـەم قسـەی منـە بگەیـەنێت بـە کەسێکی تر، وەك ئاگادار کردنەوەیەك لەسەر کردنی زیکر لـە بەرەبەیانـدا. بـەڵام شێخی (خَطَّابِيّ)و کەسانی تر بە (سَمِعَ) خوێندویانەتەوە.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُوْ سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ) فەرموویـەتی: (سَمِعَ سَـامِعٌ) واتـە: کەسێکی ئامادە ئاگای لێبوو. بەمـەش حەقیقـەتی مانـای حەدیسـەکە بـەم جـۆرەی لێدێت: "با کەسی بیسەر گوێی لێبێت‌و، کەسی ئامادەش ئاگای لەوە بێت، کە ئێمە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەکەین‌و، دان بەوەدا دەنێین کـە نـازو نیعمـەتێکی چاك‌و پاکی ڕژاندوە بەسەرماندا".[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٦ / بە ژمارە: ٢٧١٨.
(٢) بڕوانە: مَعَالِمُ السُّنَن / ٤ / ١٤٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئێوارەی بەسەردا بهاتایە، دەیفەرموو: «أَمْسَيْنَا، وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ». واتە: "ئێوارەمان بەسەردا هات‌و، هەموو موڵك‌و سامانێکیش هی خوایە‌و، سوپاس‌و ستایشیش هەر شایستەی ئەوە‌و، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە بێجگە لە خوای تاك‌و تەنهای بێ هاوتا".

ڕاوی ئەم حەدیسە فەرموویەتی: وا دەزانم پێغەمبەری خوا ئەمەشی دەفەرموو: «لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. رَبِّ، أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ، وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هذِهِ اللَّيْلَةِ، وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا. رَبِّ، أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَسُوءِ الْكِبَرِ. رَبِّ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ». واتە: "هەموو موڵك‌و سامانێك هی ئەوە‌و، سوپاس‌و ستایشیش هەر شایستەی ئەوە‌و، تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پەروەردگارم، داوای ئەو خەیرو چاکەیەت لێ دەکەم، کە لەم شەوەدا هەیە‌و، ئەوەش کە لەدوای ئەم شەوەوە هەیە. پەناشت پێدەگرم لەو شەڕو خراپەیەی کە لەم شەوەدا هەیە‌و، لەو شەڕو خراپەیەش کە لەدوای ئەم شەوەوە هەیە. پەروەردگارم پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی‌و تەوەزەلی‌و، لە بەساڵاچوون‌و پیری خراپ. پەناشت پێ دەگرم لە سزای ناو ئاگری دۆزەخ‌و، لە سزای ناو گۆڕ".

هەروەها ئەگەر پێغەمبەری خوا ڕۆژیشی بکردایەتەوە دەیفەرموو: «أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ....هتد».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئازارێکی زۆرم

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٩ / بە ژمارە: ٢٧٢٣.

توشبوو بەهۆی دوپشكێكەوە، كە دوێنێ پێیوە دام! پێغەمبەریش فەرمووی: «أَمَا لَوْ قُلْتَ حِيْنَ أَمْسَيْتَ: أَعُوْذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ تَضُرَّكَ». واتە: "بزانە ئەگەر كاتێك ئێوارەت بەسەردا هات بتوتایە: (پەنا دەگرم بە فەرمایشت‌و سیفەتە تەواوەكانی خوای گەورە لە خراپەی ئەوەی خۆی دروستی كردوە)، زیانی پێ نەدەگەیاندیت".

ئیمامی موسلیم دەقی ئەم حەدیسەی لەدوای حەدیسێكی ژنەهاوەڵی خۆشەویست (خَوْلَة)ی كچی (حَكِيْم)ەوە بەم جۆرە هێناوە.[1]

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)شدا بۆ ڕیوایەت كراوە، كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەگەر سێ جار بیوتایە «أَعُوْذُ بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»، هیچ شتێك زیانی پێ نەدەگەیاند.[2]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا بە ڕشتەیەكی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە ئیمامی (أَبُوْ بَكْر)ی (صِدِّيْق) (خوای لێ ڕازی بێت) عەرزی پێغەمبەری كردوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، چەند وشەیەكم فێر بكە، تا بەیانیان‌و ئێواران بیانخوێنم". ئەویش فەرمووی: بڵێ: «اللَّهُمَّ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيْكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِيْ وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ (وَشَرَكِهِ)».
واتە: "خوایە، ئەی بەدیهێنەرو دروستكەری ئاسمانەكان‌و زەوی، ئەی زاناو ئاگادار بە نهێنی‌و پەنهانی‌و ئاشكراكان، ئەی پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٠ / بە ژمارە: ٢٧٠٨، وە / ٢٠٨١ / بە ژمارە: ٢٧٠٩.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٣٢ / بە ژمارە: ٧١٢. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٥٧ – ٣٥٨.

دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لـە تـۆ، پـەنات پـێ دەگـرم لـە خراپەی نەفسی خۆمو، لە خراپەی شەیتانو ئەو وەسوەسەی هاوبەشدانانەی کە ئەو بانگەشەی بۆ دەکات (یان ئەو تەڵەو داوانەی ئەو دایان دەنێت)". ئەوجا فەرمووی: «قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ، وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ». واتـە: "ئـەم وشـانە لـە بەیانیانو لە ئێوارانو لەکاتی چوونە سەر جێگەشدا بخوێنە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

هاووێنەیەکی ئەمەشمان لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگـەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە هـاوەڵان عەرزی پێغەمبەریان کردوە: ئەی پێغەمبەری خوا، قسەیەکمان فێر بکە، تا بـەیانیانو ئێواران کە ڕاکشاین بیخوێنین..... ئیتر حەدیسەکەی باس کردو، لـەدوای وشـەی (وَشِرْكِهِ) ئەمەشی بۆ زیاد کرد: «وَأَنْ نَقْتَرِفَ سُوءاً عَلَى أَنْفُسِـنَا، أَوْ نَجُـرَّهُ إِلَـى مُسْلِمٍ».[2] واتە: "پەنات پێ دەگرم لەوەش کە خراپەیەك تووشی خۆمان بکەین، یان خراپەیەك تووشی موسوڵمانێك بکەین".

وشەی (شِرْكِهِ) لـە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لەسەر بێت)، بـە دوو جۆر ڕیوایەت کراوە: درووستترینو مەشهورترینیان بریتیە لە (شِرْكِهِ)، کە لـە هاوبەشدانانەوە وەرگیراوە. واتە: وەسوەسەی هاوبەشدانان بۆ خـوای گـەورە، کـە شەیتان دەیخاتە دڵەوە. دووەمیشـیان بریتیـە لـە (شَـرَكِهِ)، واتـە: پـەتو داوەکـانی شەیتان. موفرەدەکەشی بریتیە لە (شَرَكَة).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٧ / بە ژمارە: ٥٠٦٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٧ / بـە ژمارە: ٣٣٩٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٣ / بە ژمارە: ٥٠٨٣. حەدیسێکی لاوازە لەم ڕێگەیەوە، بەڵام پاڵپشتی هەیە، بۆیە پلەی بەرز دەبێتەوە بۆ پلـەی حەدیسـی (حَسَن). بڕوانـە: نَتَـائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٦٤ - ٣٦٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُـنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)و (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە ئیمامی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَفَّان)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُوْلُ فِيْ صَباحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَـاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: "بِاسْمِ اللهِ الَّذِيْ لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِيْ الْأَرْضِ وَلا فِيْ السَّـمَاءِ، وَهُــوَ السَّمِيْعُ الْعَلِيْمُ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ». واتــە: "هــەر بەندەیــەك ســەرلەبەیانی هەموو ڕۆژێك‌و، سەرلەئێوارەی هەموو شــەوێك ســێ جــار بڵێــت: (بــەناوی ئــەو خوایەی، کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك نــە لــە زەوی‌و نــە لــە ئاسمانــدا زیــان ناگەیەنێت‌و، ئەو خوایەش بیسەرو زانایە)، ئیتر هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

جا ئەمە دەقی حەدیسەکەیە لای ئیمامی (تِرْمِذِيّ). لە ڕیوایەتەکەی ئیمــامی (أَبُو دَاوُد)یشدا بەم جــۆرە هــاتوە: «لَمْ تُصِبْهُ فَجْــأَةُ بَــلاءٍ». واتــە: "بــەڵای کوتــوپڕی تووشنابێت".

بۆمــان ڕیوایــەت کــراوە لــە کتێبەکــەی ئیمــامی (تِرْمِــذِيّ)دا، لــە هــاوەڵی خۆشەویست (ثَوْبَان)ــــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کــە فەرموویــەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «مَنْ قالَ حِيْنَ يُمْسِيْ: "رَضِــيْتُ بِــاللهِ رَبّــاً، وَبِالْإِسْلامِ دِيْناً، وَبِمُحَمَّدٍ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- نَبِيّاً" كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ تَعَــالَى أَنْ يُرْضِيَهُ».[2] واتە: "ئەو کەسەی ئێواران بڵێــت: (ڕازیــم بــەوەی خــوا پــەروەردگارم بێت‌و، ئیسلامیش ئاینم بێت‌و، (مُحَمَّد)یش پێغەمبەرم بێت)، خوای گەورە بە فەزڵ‌و بەخشندەیی خۆی ڕازی دەکات".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٤ / بە ژمــارە: ٥٠٨٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٥ / بــە ژمارە: ٣٣٨٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٥ / بە ژمارە: ٣٤٨٩.

لە ڕشتەی ئەم حەدیسەدا کەسێك هەیە بەناوی {(سَعِیْد)ی کوڕی (مَرْزُبَـــان)ی (کُوْفِيّ)، ناسراو بـە (أَبو سَعْد)ی (بَقَّال)} ، کـە (مَـــوْلَى)ی هـاوەڵی خۆشەویست (حُذَیْفَة)ی کوڕی (یَمَان) بوەو، بەیەك دەنگی فەرموودەناسان کەسێکی (ضَعِیْف)ـە. ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیْح)ی (غَرِیْب)ــە لەم ڕێگەیەوە.

جا ڕەنگە بەلای ئەوەوە لە ڕێگەیەکی ترەوە (صَحِیْح) بێت.

ئیمامی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)ش بە چەند ڕشتەیەکی جوان (جَیِّـــد) ڕیوایـەتیان کردوە، لە پیاوێکەوە، کە خزمەتی پێغەمبەری خـوای کـردوە، ئـەویش بـە هـەمان دەقی پێشوو لـە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتی کردوە. بەمەش –سوپاس بـۆ خـوا– ئەصـڵی حەدیسەکە سابتە.

ئیمامی (حَاکِم)یش لە کتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِیْحَیْن)دا ڕیوایەتی کـردوەو، فەرمووشێتی: ڕشتەکەی (صَحِیْح)ـە.[1]

ئەوجا بزانە کە لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)و هەندێکی تر لە زانایاندا بەم جۆرە هاتوە: (وَبِمُحَمَّدٍ رَسُوْلاً)و، لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شـدا بـەم جـۆرە هاتوە: (نَبِیّاً). بۆیە سونەتە مرۆڤی موسوڵمان هەردووکیان بەیەکـەوە کۆبکاتـەوەو، بڵێت: (نَبِیّاً وَرَسُوْلاً). خۆ ئەگەر تەنها یەکێکیشـیان بڵێـت، ئـەوا هـەر کـاری بـە حەدیسەکە کردوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی جوان، کە ئەو بە (ضَعِیْف)ی دانەناوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـــەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِیْنَ یُصْبِحُ أَوْ یُمْسِيْ: "اللّهُمَّ، إِنِّيْ أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ، وأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ، وَمَلائِكَتَكَ، وَجَمِیْـعَ خَلْقِــكَ،

---

(١) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِیْحَیْن / ١ / ٦٩٩ / بە ژمارە: ١٩٠٥.

أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، وأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ" أَعْتَقَ اللهُ رُبُعَهُ مِنَ النَّارِ، فَمَنْ قَالَهَا مَرَّتَيْنِ، أَعْتَقَ اللهُ نِصْفَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ قَالَها ثَلاثاً، أَعْتَقَ اللهُ تَعَالَى ثَلاثَةَ أَرْبَاعِهِ، فإِنْ قَالَهَا أَرْبَعاً، أَعْتَقَهُ اللهُ تَعَالَى مِنَ النَّارِ».[1] واته: "ئەو كەسەی بەيانيان يان ئێواران بڵێت: (خوايە من ئەم بەيانيە تۆو ئەوانەی عەرشەكەی تۆيان هەڵگرتووەو فريشتەكانی تۆو تەواوی درووستكراوەكانت دەكەم بە شايەت، كە بەڕاستی هەر تۆ خوايتو، هيچ پەرستراوێكی ڕاستەقينە نيە بێجگە لە تۆو، (مُحَمَّد)يش بەندەو پێغەمبەری تۆيە)، خوای گەورە چارەكێكی ئەو كەسە لە ئاگر ڕزگار دەكات. ئەو كەسەش دوو جار بيڵێت، خوای گەورە نيوەی لە ئاگر ڕزگار دەكات. ئەو كەسەش سێ جار بيڵێت، خوای گەورە سێ چارەكی لە ئاگر ڕزگار دەكات. ئەو كەسەش چوار جار بيڵێت، خوای گەورە بەتەواوەتی لە ئاگر ڕزگاری دەكات".

بۆشمان ڕيوايەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا بە ڕشتەيەكی جوان، كە ئەو بە (ضَعِيْف)ی دانەناوە، لە هاوەڵی خۆشەويست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (غَنَّام)ی (بَيَاضِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموويەتی: «مَنْ قَالَ حِيْنَ يُصْبِحُ: "اللَّهُمَّ، مَا أَصْبَحَ بِيْ مِنْ نِعْمَةٍ، فَمِنْكَ وَحْدَكَ، لا شَرِيْكَ لَكَ، لَكَ الْحَمْدُ، وَلَكَ الشُّكْرُ" فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ يَوْمِهِ. وَمَنْ قَالَ مِثْلَ ذلِكَ حِيْنَ يُمْسِيْ فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ لَيْلَتِهِ».[2] واته: "ئەو كەسەی بەيانيان بڵێت: (خوايە، ئەو نازو نيعمەتەی من لەم بەيانيەدا هەمە، تەنها لە تۆوەيە، كە هيچ هاوەڵو شەريكێكت نيە، سوپاسو ستايشيش هەر شايستەی تۆيە)، بەمە شوكرو سوپاسی ئەو ڕۆژەی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٨ / بە ژمارە: ٥٠٦٩. شێخی عەسقەلانی فەرموويەتی: وەسفدار كردنی ڕشتەی ئەم حەديسە بەوەی، كە ڕشتەيەكی جوانە، جێگەی سەرنجە، بەلاَم لەبەر ئەوەی لە ڕێگەيەكی ترەوە لە هاوەڵی خۆشەويست (أَنَس)ـەوە هاتوە، بۆيە من دەڵێم: حەديسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٧٥ – ٣٧٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٨ / بە ژمارە: ٥٠٧٣. شێخی عەسقەلانی فەرموويەتی: حەديسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٨٠.

بەجێهێناوە. ئەو کەسەش لە ئێوارانیدا هەمان شت بڵێت، ئەوا شوکرو سوپاسی ئەو شەوەی بەجێهێناوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە ئێواران‌و لە بەیانیاندا ئەم دوعایانەی لەبیر نەدەکرد: «اللَّهُمَّ، إِنِيْ أَسأَلُكَ (الْعَفْوَ) الْعَافِيَةَ فِيْ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. اللَّهُمَّ، إِنِيْ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِيْ دِيْنِيْ وَدُنْيَايَ وَأَهْلِيْ وَمَالِيْ. اللَّهُمَّ، اسْتُرْ عَوْرَاتِيْ، وَآمِنْ رَوْعَاتِيْ. اللَّهُمَّ، احْفَظْنِيْ مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِيْ، وَعَنْ يَمِيْنِيْ، وَعَنْ شِمَالِيْ، وَمِنْ فَوْقِيْ، وَأَعُوْذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِيْ».[1] واتە: "خوایە من داوای (لێبوردن‌و) سەلامەتی‌و بێوەییت لێ دەکەم لە دنیاو لە دوارۆژدا، خوایە من داوای لێبوردن‌و سەلامەتیت لێ دەکەم سەبارەت بە ئاینەکەم‌و دنیاکەم‌و خزم‌و کەس‌وکارەکەم‌و ماڵو سەروەتەکەم. خوایە عەیب‌و ناتەواوی‌و تاوانەکانم بپۆشەو، ترس‌و دڵەڕاوکێشم مەهێڵە. خوایە بمپارێزە لە پێشمەوەو لە دوامەوەو لەلای ڕاستمەوەو لەلای چەپمەوەو لە سەرمەوە، پەناش دەگرم بە گەورەیی‌و دەسەڵاتی تۆ لەوەی، کە لەژێرمەوە لەناوببرێم".

زانای پایەبەرز (وَكِيْع)ی کوڕی (جَرَّاح) فەرموویەتی: مەبەستی پێغەمبەری خوا بەوەی کە فەرموویەتی (لەژێرمەوە لەناوببرێم) ئەوەیە، کە بە ڕۆچوونی زەوی تیانەچێت.

ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.[2]

---

(١) بروانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٨ / بە ژمارە: ٥٠٧٤، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ١٤٥ / بە ژمارە: ١٠٤٠١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٣ / بە ژمارە: ٣٨٧١.

(٢) بروانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٩٨ / بە ژمارە: ١٩٠٢.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا بە ڕشتەی (صَحِیْح)، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لەکاتی ڕاکشانیدا دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إني أَعُوْذُ بوَجْهكَ الكَرِيمِ، وَبكَلِمَاتِكَ التَّامَّةِ، مِنْ شَرِّ مَا أَنْتَ آخِذٌ بنَاصِيَتِهِ. اللّهُمَّ، أَنْتَ تَكْشِفُ الْمَغْرَمَ وَالْمَأثَمَ. اللّهُمَّ، لا يُهْزَمُ جُنْدُكَ، وَلا يُخْلَفُ وَعْدُكَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ، مِنْكَ الْجَدُّ، سُبْحَانَكَ، وَبِحَمْدِكَ».[1] واتە: "خوایە من پەنا دەگرم بە زاتی پاكو بەڕێزت، پەناش دەگرم بە فەرمایشتو سیفەتە تەواوەكانت، لە خراپەو شەڕی ئەوەی لەژێر دەستی قودرەتی تۆدایە. خوایە تۆ قەرزاری‌و تاوانباری لادەدەیتو لەكۆڵ دەخەیت. خوایە سەربازەكانی تۆ تووشی دۆڕان نایەنو، كەس بەسەریاندا زاڵ نابێتو، بەڵێنەكەشت سەبارەت بە پاداشتی گوێڕایەڵانو سزای سەرپێچیكاران هەر دێتەدی‌و، دەوڵەمەندی‌و هەبوونو بەختو دەسەڵاتیش هیچ سوودێك بە خاوەنەكەیان ناگەیەنن لەلای تۆ، پاكو بێگەردی‌و سوپاس‌و ستایش هەر بۆ تۆیە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا بە چەند ڕشتەیەكی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ عَيَّاش)ی (زُرَقِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ: "لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ" كَانَ لَهُ عِدْلَ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَكُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَحُطَّ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجاتٍ، وَكَانَ فِيْ حِرْزٍ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُمْسِيَ. وَإِنْ قَالَهَا إِذَا أَمْسَى، كَانَ لَهُ مِثْلُ ذلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ».[2] واتە: "ئەو كەسەی بەیانیان بڵێت: (لا

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٢ / بە ژمارە: ٥٠٥٢، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٧٧٣٢. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٣٨٤ – ٣٨٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤١ / بە ژمارە: ٥٠٧٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٢ / بە ژمارە: ٣٨٦٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ـە. بەڵام ئەوەی

ـلمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ)، ـەوەکانی حەزرەتی (إسْمَاعِيْل)ی لە کۆیلایەتی ئازاد ـ بۆ دەنوسرێتو، دە خراپەشی لێ دادەوەرێنرێتو، دە پلەش پلەی بەرز دەکرێتەوەو، هەتا ئێوارەش لە شەیتان پارێزراو دەبێت. خۆ ئەگەر ئێوارانیش بیلێت، هەتا بەیانی هەمان پاداشتو خەلاتی دەست دەکەوێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)دا بـە ڕشـتەیەك، کـە ئـەو بـە (ضَعِيْف)ی دانەناوە، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مَالِك)ی (أَشْعَرِيّ)ــەوە (خـوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «إِذَا أَصْــبَحَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَقُلْ: "أَصْبَحْنَا وأصْبَحَ الْمُلْكُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ. اللّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْأَلُكَ خَيْــرَ هذَا الْيَوْمِ، فَتْحَهُ، وَنَصْرَهُ، وَنُورَهُ، وَبَرَكَتَهُ، وَهُدَاهُ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيْهِ، وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ" ثُمَّ إِذَا أَمْسَى، فَلْيَقُلْ مِثْلَ ذلِــكَ».[1] واتـە: "ئەگـەر یـەکێك لـە ئێـوە ڕۆژی کردەوە، با بلێت: (ڕۆژمان کـردەوەو، هـەموو موڵـكو سـامانێکیش هـی خـوای پەروەردگاری عالـەمە. خوایە من داوای خەیرو خۆشی ئەم ڕۆژەت لێ دەکەم، تێیـدا بە مەبەستو بە ئاواتم بگەیەنیتو، بەسەر دوژمناندا سەرم بخەیت، ڕێم لە زانستو کردەوەی باش بخەیتو، فەڕو بەرەکـەتو ڕزقو ڕۆزی پـاكو خـاوێنم بـە نصـیب بکەیتو، بەردەوامو ڕاگیراوم بکەیت لەسەر پەیڕەوی کردن لە ڕێگـەی ڕاسـتو، سەرپێچی کردن لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو. پەناشت پـێ دەگـرم لــە خراپـەو

---

کە ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: (بە چەند ڕشتەیەك ڕیوایـەت کـراوە)، جێگـەی سـەرنجو تێبینیە، چونکە لای هەردوو ئیمامەکە بە یەك ڕشتە ڕیوایەت کراوە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٣٨٥ – ٣٨٧.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٣ / بە ژمارە: ٥٠٨٤. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (ضَعِيْف)ــە. ئەوەش کە ئیمامی (أَبُو دَوُد) بـە (ضَعِيْف)ی دانـەناوە، واتـە لـەناو (سُنَن)ــەکەیدا، ئەگینا لە دەرەوەی (سُنَن)ــەکەیدا بە (ضَــعِيْف)ی دانـاوە. بڕوانـە: نَتَــائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٣٨٨ – ٣٨٩.

شەڕی ئەوەی لەم ڕۆژەدایەو، ئەوەش کە لەدوای ئـەم ڕۆژەوەیـە). ئـەوجا بـا لـە ئێوارانیشدا هەمان شت بڵێتو هەمان زیکر بکات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لـە (عَبْـدُالرَّحْمَن)ی کـوڕی (أَبو بَكْرَة)وە، کە پرسیاری کردوە لـە بـاوکی: باوکـە گیـان، گـوێم لێتـە هـەموو ڕۆژێك ئەم دوعایە دەخوێنیـت: (اللّهُمَّ، عَافِنِيْ فِيْ بَدَنِيْ، اللّهُمَّ، عَافِنِيْ فِيْ سَـمْعِيْ، اللّهُمَّ، عَافِنِيْ فِيْ بَصَرِيْ، اللّهُمَّ، إِنِيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ، اللّهُمَّ، إِنِيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ)، واتە: (خوایە بێوەیو سەلامەتم بکە لە لاشەمو لـە بیستنمو لە بینینمدا. خوایە من پـەنات پـێ دەگـرم لـە کـافربوونو لـە هـەژاریو نەداری. خوایە من پـەنات پـێ دەگـرم لـە سـزای نـاو گـۆڕ، هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ)، بەیانیانو ئێـوارانیش سـێبارەی دەکەیتـەوە. باوکیشـی فەرموویەتی: "من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (دروودی خوای لەسەر بێت)، کـە ئـەو دوعایانەی دەکرد. بۆیە پێم خۆشە شوێن سونەتەکەی ئەو بکەوم".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِيْنَ يُصْبِحُ: ﴿فَسُبْحَانَ اللهِ حِيْنَ تُمْسُوْنَ وَحِيْنَ تُصْبِحُوْنَ * وَلَهُ الْحَمْدُ فِيْ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيّاً وَحِيْنَ تُظْهِرُوْنَ * يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُوْنَ﴾ [الروم: ١٧ - ١٩] أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِيْ يَوْمِهِ ذلِكَ. وَمَنْ قَالَهُنَّ حِيْنَ يُمْسِيْ، أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِيْ لَيْلَتِهِ».[2] واتە: "ئەو کەسەی بەیانیان ئەم سێ ئایەتە بخوێنێت {کە ئەمە ڕاڤەو واتاکانیانە: کەواتە پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورە کاتێك ئێوارەتان بەسەردا دێتو، کاتێکیش ڕۆژ دەکەنەوەو بەیانیتان بەسەردا دێت. سوپاسو ستایشیش لە

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٥ / بە ژمارە: ٥٠٩٠. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٨٩ - ٣٩٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٠ / بە ژمارە: ٥٠٧٦.

ئاسمانەکانو لە زەویدا، لە شەوداو لە نیوەڕۆدا هەر شایستەی ئەوە. ئەو خوایەی، کە زیندوو لە مردوو دەردەهێنێتو، مردووش لە زیندوو دەردەهێنێتو، زەویش لەدوای مردنی زیندوو دەکاتەوەو دەیبووژێنێتەوە، جا ئێوەش هەر بەو جۆرە لە گۆڕەکانتان دەردەهێنرێنو زیندوو دەکرێنەوە}، هەموو ئەو خەیرو ویردانەی دەست دەکەوێتەوە، کە لەو ڕۆژەدا لەدەستی دەرچوون. ئەو کەسەش لە ئێواراندا بیانخوێنێت، ئەو خەیرو ویردانەی دەست دەکەوێتەوە، کە لەو شەوەدا لەدەستی دەرچوون".

ئیمامی (أَبو دَاوُد) ئەم حەدیسەی بە (ضَعِيْف) دانەناوە. بەڵام ئیمامی بوخاری لە هەردوو کتێبی (التَّأرِيْخُ الْكَبِيْر)و (كِتَابُ الضُّعَفَاء)دا بە (ضَعِيْف)ی داناوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فێری دەکردو، دەیفەرموو: «قُوْلِيْ حِيْنَ تُصْبِحِيْنَ: "سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، لا قُوَّةَ إلاَّ بِاللّهِ، مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُن، أَعْلَمُ أنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ، وَأَنَّ اللهَ قَدْ أحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً" فَإنَّهُ مَنْ قَالَهُنَّ حِيْنَ يُصْبِحُ، حُفِظَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَالَهُنَّ حِيْنَ يُمْسِيْ، حُفِظَ حَتَّى يُصْبِحَ». [1] واتە: "بەیانیان بڵێ: (پاكو بێگەردیو سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە، هیچ هێزێك نیە لەسەر کردنی چاکە مەگەر بە ویستو لوتفی خوا نەبێت، ئەوەی کە خوا ویستویەتی، بوەو دەشبێت، ئەوەش ئەو نەیویستوە، نەبوەو ناشبێت. دەزانم کە خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو، ئاگاشی لە هەموو شتێك هەیە)، جا ئەو کەسەی بەیانیان بیڵێت، پارێزراو دەبێت هەتا ئێوارەو، ئەو کەسەش ئێواران بیڵێت، پارێزراو دەبێت هەتا بەیانی".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٠ / بە ژمارە: ٥٠٧٥. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (ضَعِيْف)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٩٦ - ٣٩٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنایە ناو مزگەوتەوەو، گەیشت بە پیاوێك لە پشتیوانان، کە پێی دەوترا (أَبُوْ أُمَامَة)، جا پێی فەرموو: ئەی (أَبُوْ أُمَامَة)، چیە وا دەتبینم لە غەیری کاتی نوێژدا لە مزگەوتدا دانیشتویت؟! ئەویش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا خەمبارو قەرزارم! پێغەمبەریش فەرمووی: قسەیەکت فێر نەکەم، کە ئەگەر بیڵێیت، خوا خەمو خەفەتەکەت دەڕەوێنێتەوەو، قەرزەکەشت بۆ دەداتەوە؟ ئەویش عەرزی کرد: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا". پێغەمبەریش فەرمووی: بەیانیانو ئێواران بڵێ: «اللّٰهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجالِ». واتە: "خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە خەمو پەژارەو دڵتەنگیو، پەناشت پێ دەگرم لە نەتوانکاریو تەمبەڵی، پەناشت پێ دەگرم لە ترسنۆکیو ڕژدیو چرووکیو، پەناشت پێ دەگرم لە زۆربۆهێنانی قەرزو، زاڵبوونی پیاوانی خاوەن قەرز، یان خاوەن دەسەڵات".

جا (أَبُوْ أُمَامَة) دەفەرموێت: منیش وەهام کرد کە حەزرەت فەرمووی، ئیتر خوای گەورە خەمو خەفەتو قەرزەکەی لەسەر لابردم.(١)

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٤ / بە ژمارە: ١٥٥٥. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (ضَعِيْف)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٣٩٧ - ٣٩٨. بەڵام شێخ (عَبْدُالْقَادِر)ی (أَرْنَؤُوْط) لە تەحقیقەکەی خۆیدا بە حەدیسێکی (حَسَن)ی داناوە.

جا بێگومان حەدیسەکە لەم ڕێگەیەوەو بەم دەقە قسەی لەسەرە، کە ئایا (ضَعِيْف)ـە یان (حَسَن)ـە، ئەگینا دەقی دوعاکە لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە، بەڵام باسی ئەو چیرۆکەی تێدا نیەو، نەشبەستراوەتەوە بە بەیانیانو ئێوارانەوە. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٤٢ / بە ژمارە: ٦٠٠٨.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمن)[1]ی کوڕی (أَبْزَى)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەیانیان دەیفەرموو: «أصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الْإِسْلامِ، وَكَلِمَةِ الْإِخْلاصِ، وَدِيْنِ نبِيِّنَا مُحَمَّدٍ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، وَمِلَّةِ إِبْرَاهِيْمَ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- حَنِيْفاً مُسْلِماً، وَمَا أَنَا (كَانَ) مِنَ الْمُشْرِكِينَ».[2] واتە: "ڕۆژمان کردەوە لەسەر مانەوەو دەستگرتن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامو، لەسەر وتنی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)و، لەسەر ئاینی پێغەمبەرەکەمان (مُحَمَّد) (دروودی خوای لەسەر بێت)و، لەسەر ڕێبازو شەریعەتی حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم) (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە بریتی بوو لە لادان لە ئاینو بیروباوەڕی هەڵەو چەوت، بەرەو دینداری ڕاستەقینەو یەك خوا پەرستیو، تەسلیمبوون بە بڕیارەکانی خوای گەورە، منیش یەکێك نابم لە هاوبەشدانەران (یان ئەویش یەکێك نەبوە لە هاوبەشدانەران)".

منیش دەڵێم: فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بەم جۆرە هاتوە: (وَدِيْنِ نبِيِّنَا مُحَمَّدٍ)، کە ئەمەش یاساغو ڕێگەلێگیراو نیە

---

(١) لە زۆربەی نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی کتێبی (أَذْكَار)دا نوسراوە: (عَبْدُالله)ی کوڕی (أَبْزَى). بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە کە (عَبْدُالله) لە (عَبْدُالرَّحْمن)ی باوکیەوە ڕیوایەتی کردوەو، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە، وەکو لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بەو جۆرە هاتوە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٠ / بە ژمارە: ٣٤. شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (أَحْمَد)و (طَبَرَانِيّ)ش ڕیوایەتیان کردوەو، کەسەکانی ڕشتەی هەردووکیشیان هەمان ئەو کەسانەن، کە لە ڕشتەی حەدیسی (صَحِيْح)دا ناویان هاتوە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١١٦ / بە ژمارە: ١٧٠٠٣.

منیش دەڵێم: ئەم زیکرە لە ئێوارانیشدا هەر سونەتە، وەکو لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی (أَحْمَد)دا هاتوە. بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٢٤ / ٧٩ / بە ژمارە: ١٥٣٦٣.

(واته: نابێت بوترێت: چۆن پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ئاینی پێغەمبەرەکەمان؟!).
چونکە ڕەنگە پێغەمبەری خوا ئەوەی بە دەنگی بەرز فەرموویێت، تاوەکو کەسانی تر بیبیستن‌و، فێری ببن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (أَبِيْ أَوْفَى)وە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەیانیان دەیفەرموو: «أَصْبَحْنَا، وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلّهِ -عَزَّ وَجَلَّ-، وَالْحَمْدُ لِلّهِ، وَالْكِبْرِيَاءُ وَالْعَظَمَةُ لِلّهِ، وَالْخَلْقُ وَالْأَمْرُ وَاللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَمَا سَكَنَ فِيْهِمَا لِلّهِ تَعَالَى. اللّهُمَّ، اجْعَلْ أَوَّلَ هَذَا النَّهَارِ صَلاحاً، وَأَوْسَطَهُ نَجَاحاً، وَآخِرَهُ فَلاحاً، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ».[1] واتە: "ڕۆژمان کردەوە، هەموو موڵك‌و سامانێکیش هەر هی خوای گەورەیەو، سوپاس‌و ستایش‌و شکۆمەندی‌و مەزنی‌و بەدیهێنان‌و بڕیاردان‌و شەوو ڕۆژو ئەوەش لە شەوو ڕۆژدایە هەر بۆ خوای گەورەیە. خوایە سەرەتای ئەم ڕۆژەم بۆ بکە بە هۆکاری خەیرو چاکەی دین‌و دنیا، ناوەڕاستەکەشیم بۆ بکە بە هۆکاری سەرکەوتن‌و بەختەوەری هەردوو دنیاو، کۆتاییەکەشیم بۆ بکە بە هۆکاری بردنەوەو سەرفرازی دواڕۆژ، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەك، کە لاوازی تێدایە، لە هاوەڵی خۆشەویست (مَعْقِل)ی کوڕی (يَسَار)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِيْنَ يُصْبِحُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ: "أَعُوْذُ بِاللهِ السَّمِيْعِ الْعَلِيْمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ" وَقَرَأَ ثَلاثَ آيَاتٍ مِنْ سُوْرَةِ الْحَشْرِ، وَكَّلَ اللهُ تَعَالَى بِهِ سَبْعِيْنَ أَلْفَ مَلَكٍ، يُصَلُّوْنَ عَلَيْهِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ مَاتَ فِيْ ذَلِكَ الْيَوْمِ، مَاتَ شَهِيْداً. وَمَنْ

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢ / بە ژمارە: ٣٨. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (ضَعِيْف)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٠٢ - ٤٠٣.

قَالَهَا حِيْنَ يُمْسِيْ، كَانَ بِتِلْكَ الْمَنْزِلَةِ».[1] واته: "ئەو کەسەی بەیانیان سێ جار بڵێت: (أعُوْذُ بِاللهِ السَّمِيْعِ الْعَلِيْمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ)و، سێ ئایەتەکەی (کۆتایی) سورەتی (الْحَشْر)یش بخوێنێت {کە بریتین لە: ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ * هُوَ اللَّهُ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ * هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾}، خوای گەورە حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) فریشتە ڕادەسپێرێت، کە تاوەکو ئێوارە دوعای خەیری بۆ بکەن‌و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن. ئەگەر لەو ڕۆژەشدا بمرێت، بە شەهیدی دەمرێت. ئەو کەسەش لە ئێوارانیدا ئەم زیکرانە بکات، هەر هەمان پلەو پایەی دەست دەکەوێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (مُحَمَّد)ی کوڕی (إبْرَاهِيْم)ی (تَيْمِيّ)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، لەگەڵ کۆمەڵە چەکدارێکدا ناردینی بۆ جێگەیەک‌و، فەرمانی پێکردین، کە بەیانیان‌و ئێواران ئەم ئایەتە بخوێنین ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ﴾ [الْمُؤْمِنُوْن: ١١٥]. واتە: {بۆچی ئێوە گومانتان وایە، کە ئێمە ئێوەمان بێهوودە درووست کردوەو، ئێوەش بۆلای ئێمە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٨٢ / بە ژمارە: ٢٩٢٢، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٠ – ٤١ / بە ژمارە: ٨٠. شێخی عەسقەلانیش بە حەدیسێکی (ضَعِيْف)ی داناوەو، فەرمووشێتی: سەیرە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی هۆشداری داوە لەسەر لاوازی ئەم حەدیسەو، باسی لاوازی حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّـه)ی کوڕی (أبِـيْ أوْفَى)ی نەکردوە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە حەدیسەکەی ئەو لەم حەدیسە لاوازترە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٤٠٥ – ٤٠٦.

ناگەڕێنرێنەوە؟!}. جا ئێمەش خوێندمانو، دواتر دەستکەوتمان هێنایەوەو، سەلامەتیش بووین.[1]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەیانیانو ئێواران ئەم دوعایەی دەکرد: «اللّهُمَّ، أَسْأَلُكَ مِنْ فَجْأَةِ الْخَيْرِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ فَجْأَةِ الشَّرِّ».[2] واتە: "خوایە من داوای خەیری کوتوپڕو لەناکاوت لێ دەکەمو، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕی کوتوپڕو لەناکاو".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە (فَاطِمَة)ی کچی خۆی فەرموو (خوای لێ ڕازی بێت): «مَا يَمْنَعُكِ أَنْ تَسْمَعِيْ مَا أُوْصِيْكِ بِهِ؟ تَقُوْلِيْنَ إِذَا أَصْبَحْتِ وَإِذَا أَمْسَيْتِ: يَا حَيُّ، يَا قَيُّومُ، بِكَ أَسْتَغِيْثُ، فَأَصْلِحْ لِيْ شَأْنِيْ كُلَّهُ، وَلاَ تَكِلْنِيْ إِلَى نَفْسِيْ طَرْفَةَ عَيْنٍ».[3] واتە: "چی

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٩ / بە ژمارە: ٧٧. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (ضَعِيْف)ی داناوە. چونکە ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٠٦ – ٤٠٧.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢١ / بە ژمارە: ٣٩. شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)وە ڕیوایەت کردوە، ئەویش لە ڕێگەی کەسێکەوە بەناوی (يُوسُف)ی کوڕی (عَطِيَّة). جا شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئەو کەسە کەسێکی (مَتْرُوْك)ـەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: کەسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١١٥ / بە ژمارە: ١٧٠٠١، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٠٩ – ٤١٠.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٦ – ٢٧ / بە ژمارە: ٤٨. هەروەها ئیمامی (نَسَائِيّ)و ئیمامی (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوەو، ئیمامی (حَاكِم) فەرمووشێتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم. بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ١٤٧ / بە ژمارە: ١٠٤٠٥، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٣٠ / بە ژمارە: ٢٠٠٠. بۆیە

شتێك ڕێگریت لێ دەكات ئەم ئامۆژگاریەم لەگوێ بگریت؟ بەیانیان‌و ئێواران بڵێ: (ئەی ئەو كەسە زیندوەی كە هەر بوویت‌و هەر دەشبیت‌و، بەڕێوەبەرو چاودێرو ڕاپەڕێنەری كاروباری بوونەوەرانیت‌و، خۆت بەخۆت بویت‌و هۆكاری بوونی غەیری خۆشتی، داوای بەهاناوەهاتن‌و پشتیوانی تەنها لە تۆ دەكەم، هەموو كاروبارەكانم بۆ چاك‌و ڕێك‌وپێك بكەو، بە ئەندازەی چاوتروكانێكیش مەمسپێرە بە نەفسی خۆم)".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەكی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ــەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە پیاوێك سكاڵای هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە بەڵاو نەهامەتی ڕووی تێدەكات. پێغەمبەریش پێی فەرموو: «قُلْ إِذَا أَصْبَحْتَ: "بِاسْمِ اللهِ عَلَى نَفْسِيْ وَأَهْلِيْ وَمَالِيْ" فَإِنَّهُ لا يَذْهَبُ لَكَ شَيْءٌ». واتە: "ئەگەر ڕۆژت كردەوە، بڵێ: (بِاسْمِ اللهِ) لەسەر خۆم‌و خێزان‌و ماڵم، ئیتر هیچت لەدەست دەرناچێت‌و، هیچ زیانێك ناكەیت". جا پیاوەكەش وەهای وت، ئیتر بەڵاو نەهامەتیەكانی لەكۆڵ بوویەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (ابْنُ مَاجَه)و لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەیانیان دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إِنِيْ أَسْأَلُكَ عِلْماً نَافِعاً،

---

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: سەیرە بەلامەوە كە ئیمامی نەوەوی ئەم حەدیسەی تەنها لــە ڕێگەی (ابْنُ السُّنِّيّ)ــەوە هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئیمامی (نَسَائِيّ)و ئیمـامی (حَاكِم)یـش ڕیوایەتیان كردوە!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٠٧ – ٤٠٨.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٨ / بـە ژمـارە: ٥١. وەكـو ئیمـامی نـەوەویش فەرموویەتی: ڕشتەكەی لاوازە. چونكە كەسێكی نادیارو نەناسراوی تێدایە.

وَرِزْقاً طَيِّباً، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً».[(1)] واته: "خوایه من داوای زانستێكی بەسوودو، ڕزق‌و ڕۆزیەكی پاك‌و حەلاڵ‌و، كارو كردەوەیەكی وەرگیراوت لێ دەكەم".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ: "اللّهُمَّ، إِنِيْ أَصْبَحْتُ مِنْكَ فِيْ نِعْمَةٍ وَعافِيَةٍ وَسَتْرٍ، فَأَتِمَّ نِعْمَتَكَ عَلَيَّ وَعَافِيَتَكَ وَسَتْرَكَ فِيْ الدُّنْيا وَالْآخِرَةِ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، إِذَا أَصْبَحَ، وَإِذَا أَمْسَى، كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ تَعَالَى أَنْ يُتِمَّ عَلَيْهِ نِعْمَتَهُ)».[(2)] واته: "ئەو كەسەی بەیانیان‌و ئێواران سێ جار بڵێت: (خوایه من ئەم بەیانیە بە لوتف‌و پشتیوانی تۆ لەناو نازو نیعمەت‌و لەشساغی‌و پەردەی پاراستنی تۆدام، تۆش لە دنیاو لە دوارۆژدا نازو نیعمەتی تەواوم بەسەردا برێژەو، تەواو لەشساغ‌و پارێزراوم بكە)، خوای گەورە نازو نیعمەتی تەواوی بەسەردا دەڕژێنێت".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زُبَيْر)ی كوڕی (عَوَّام)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «مَا مِنْ صَبَاحٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ، إِلاَّ مُنَادٍ يُنَادِيْ: سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ». واته: "هەر بەیانیەك بەندەكانی خوا ڕۆژیان لێ ببێتەوە، بانگەرێك بانگ دەكات‌و دەڵێت: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ)".

---

(1) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / 1 / 298 / بە ژمارە: 925، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / 29 / بە ژمارە: 54. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / 2 / 411.

(2) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / 29 / بە ژمارە: 55. حەدیسێكی زۆر لاوازە. چونكە كەسێكی زۆر لاواز لە ڕشتەكەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / 2 / 411.

لە ڕیوایەتەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّي)دا بەم جۆرە هاتوە: «إلاَّ صَرَخَ صَارِخٌ: أَيُّهَا الْخَلائِقُ، سَبِّحُوا الْمَلِكَ الْقُدُّوْسَ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّي)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ إذَا أصْبَحَ، وَإذَا أمْسَى: "رَبِّيَ اللّٰهُ، تَوَكَّلْتُ عَلَيْهِ، لا إلَهَ إلاَّ هُوَ، عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ، وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيم، لا إلَهَ إلاَّ اللّٰهُ الْعَلِيُّ الْعَظِيْمُ، مَا شَاءَ اللّٰهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، أَعْلَمُ أنَّ اللّٰهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ، وَأنَّ اللّٰهَ قَدْ أحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً" ثُمَّ مَاتَ، دَخَلَ الْجَنَّةَ».[2] واتە: "ئەو کەسەی بەیانیانو ئێواران ئەم زیکرە بکاتو، پاشان بمرێت، دەچێتە بەهەشتەوە. زیکرەکەش ئەمەیە: (پەروەردگارم خوایەو، پشتم بەو بەستوەو، بێجگە لەویش هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، تەنها پشتم بەو بەستوەو، ئەویش پەروەردگاری عەرشی مەزنەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە خوای بالآدەستی مەزن. ئەوەی خوا ویستویەتی بوەو دەشبێت، ئەوەش ئەو نەیویستوە نەبوەو ناشبێت. بزانە کە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو، ئاگاداری هەموو شتێکیشە).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أيَعْجِزُ أحَدُكُمْ أنْ يَكُوْنَ كَأَبِيْ ضَمْضَمٍ؟». واتە: "ئایا یەکێك لە ئێوە ناتوانێت وەکو (أَبُو ضَمْضَم) وەهابێت؟". هاوەڵانیش عەرزیان کرد: "ئەی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٣ / بە ژمارە: ٣٥٦٩، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢ / بە ژمارە: ٦٢. حەدیسێکی لاوازە. چونکە کەسی لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٤١٣ – ٤١٤.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٤ / بە ژمارە: ٤٢. بەلاّم دەقی حەدیسەکە لای ئەم هەندێك جیاوازی هەیەو، حەدیسەکەش حەدیسێکی لاوازە. چونکە کەسی لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٢ / ٤١٤ – ٤١٥.

پێغەمبەری خوا، (أَبو ضَمْضَم) کێیەو چۆنیش بوە؟" پێغەمبەریش فەرمووی: «كَانَ إِذَا أَصْبَحَ قَالَ: "اللَّهُمَّ، إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي وَعِرْضِي لَكَ". فَلا يَشْتُمُ مَنْ شَتَمَهُ، وَلاَ يَظْلِمُ مَنْ ظَلَمَهُ، وَلا يَضْرِبُ مَنْ ضَرَبَهُ».[1] واته: "(أَبو ضَمْضَم) بەیانیان دەیوت: (خوایە من خۆمو ناموسو ئابڕووم پێشکەشی تۆ کردوە)، ئیتر جنێوی بەو کەسە نەدەدا، کە جنێوی پێدابوو، ستەمیشی لەو کەسە نەدەکرد، کە ستەمی لێ کردبوو، نەشیدەدا لەو کەسەی کە لێیدابوو".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ فِيْ كُلِّ يَوْمٍ حِيْنَ يُصْبِحُ وَحِيْنَ يُمْسِيْ: "حَسْبِيَ اللّهُ، لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ، عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ، وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ" سَبْعَ مَرَّاتٍ، كَفَاهُ اللهُ تَعَالَى مَا أَهَمَّهُ (هَمَّهُ) مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ».[2] واته: "ئەو کەسەی هەموو ڕۆژێك بەیانیانو ئێواران حەوت جار ئەم زیکرە بکات، هەر کارێکی دنیاو دوارۆژی بوێت، خوا بۆی جێبەجێ دەکات. زیکرەکەش ئەمەیە: (تەنها خوام بەسە، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە ئەو، تەنها پشتم بە ئەو بەستوەو، ئەویش پەروەردگاری عەرشی مەزنە)".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٣ - ٣٤ / بە ژمارە: ٦٥. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤١٧ - ٤١٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٦ - ٣٧ / بە ژمارە: ٧١. لێکۆڵەری ئەم نوسخەیە، کە بریتیە لە مامۆستای بەڕێز (بَشِيْر مُحَمَّد عُيُوْن) نوسیویتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ە. بەڵام مامۆستای بەڕێز (سَلِيْم الْهِلالِيّ) نوسیویتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ە. بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّيْ فِيْ تَخْرِيْجِ كِتَاب عَمَلِ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة لِابْنِ السُّنِّيّ / ١ / ١٢٢.

{حم} الْمُؤْمِن إِلَى: {إِلَيْهِ الْمَصِيْرُ}، وَآيَةَ الْكُرْسِيِّ حِيْنَ يُصْبِحُ، حُفِظَ بِهِمَا حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَرَأَهُمَا حِيْنَ يُمْسِيْ، حُفِظَ بِهِمَا حَتَّى يُصْبِحَ».[1] واته: "ئەو کەسەی بەیانیان (آيَةَ الْكُرْسِيّ)و ئەم ئایەتانەی سورەتی (غَافِر) بخوێنێت: ﴿حم * تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ * غَافِرِ الذَّنْبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾، {کە ئەمە ڕاڤەو واتاکانیانە: (حم). دابەزاندن‌و ناردنەخوارەوەی ئەم قورئانە پیرۆزە لەلایەن خوای دەسەڵاتداری زاناوەیە. گوناهبەخش‌و تۆبەوەرگرو سزاسەخت‌و خاوەن نازو نیعمەتی فراوانەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە ئەو، گەڕانەوەش هەر بۆلای ئەوە}، ئەوا تاکو ئێوارە پارێزراو دەبێت. ئەو کەسەش ئێواران بیانخوێنێت، تاکو بەیانی پارێزراو دەبێت".

جا ئەمانە کۆمەڵە حەدیسێك بوون، کە مەبەستمان بوو باسیان بکەین‌و، ئەوەندەش زیکریان تێدایە، کە بەس بێت بۆ ئەو کەسەی، خوای گەورە موەفەقی کردوە. داوا لە خوای گەورە دەکەین موەفەقمان بکات بۆ کار کردن بەم حەدیسانەو، بۆ سەرجەم ڕێگاکانی خەیرو چاکە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە خواناسی گەورە (طَلْق)ی کوڕی (حَبِيْب)ـەوە، کە فەرموویەتی: پیاوێك هات بۆ خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)و، عەرزی کرد: "(أَبُو الدَّرْدَاء)، ماڵەکەت ئاگری گرت". ئەویش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: "نەخێر ئاگری نەگرتوەو، خوای گەورە کاری وا ناکات. چونکە چەند وشەیەکم لە پێغەمبەری خوا بیستوە (درروودی خوای لەسەر بێت)، کە هەرکەسێك بەیانیان بیانخوێنێت، تا ئێوارە بەڵا ڕووی تێ ناکات‌و، هەرکەسێکیش ئێواران بیانخوێنێت، تا بەیانی بەڵا ڕووی تێ ناکات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٥٧ / بە ژمارە: ٢٨٧٩، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٩ / بە ژمارە: ٧٦.

وشەكانیش ئەمانەن: «اللّهُمَّ، أنْتَ رَبِيْ، لا إلهَ إلاَّ أَنْتَ، عَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَأنْتَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ، لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ باللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيْمِ، أعْلَمُ أنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ، وَأنَّ اللهَ قَدْ أحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً. اللّهُمَّ، إنِيْ أعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِيْ، وَمِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا، إنَّ رَبِّيْ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيْمٍ».[1] واتە: "خوایە تۆ پەروەردگاری منیت، بێجگە لە تۆش هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە، پشتم تەنها بە تۆ بەستوەو، تۆش پەروەردگاری عەرشی مەزنیت. ئەوەی خوا ویستویەتی بوەو دەشبێت، ئەوەش ئەو نەیویستوە نەبوەو ناشبێت. هیچ هێزو توانایەكیش نیە بۆ خۆلادان لە خراپەو، بۆ كردنی چاكە بێجگە لە هێزی لوتفو پشتیوانی خوای باڵادەستی مەزن. بزانە كە خوا توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەیەو، ئاگاداری هەموو شتێكیشە. خوایە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسی خۆمو، لە خراپەی هەموو گیانلەبەرێكیش، كە لەژێر دەسەڵاتی تۆدایە. بەڕاستی پەروەردگاری من ستەم لە هیچ كەسێك ناكاتو، بەپێی بەرنامەیەكی ڕێكو ڕاستو دادپەروەرانە مامەڵە دەكات".

هەروەها شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) لە ڕێگەیەكی ترەوە ئەم حەدیسەی لە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ڕیوایەت كردوەو {نەیفەرموە: لە (أبو الدَّرْدَاء)ەوە}. جا لەو ڕیوایەتەدا هاتوە، كە چەند جارێك پیاوەكە هاتوە بۆلای هاوەڵەكەو، عەرزی كردوە: "فریای ماڵەكەت بكەوە، ئاگری گرتوە". ئەویش فەرموویەتی: "نەخێر ئاگری نەگرتوە. چونكە لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «ئەو كەسەی بەیانیان ئەم وشانە بڵێت، نە خۆیو نە خێزانو نە ماڵی تووشی شتێك نابن، كە پێی ناخۆش بێت». جا منیش ئەمڕۆ وتوومن". پاشان

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠ / بە ژمارە: ٥٧. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێكی لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٢٥ - ٤٢٦.

فەرمووی: "هەستن با بڕۆین". ئەوجا هەستاو، ئەوانیش لە خزمەتیدا ڕۆیشتن بۆلای ماڵەکەی‌و، بینیان وا چواردەورەکەی سوتاوەو، ماڵەکەی ئەو هیچی لێ نەهاتوە.(١)

## ئەوەی لە بەیانی ڕۆژی جومعەدا دەوترێت

بزانە، هەموو ئەو زیکرانەی لە ڕۆژەکانی تردا دەکرێن، لە ڕۆژی جومعەشدا هەر دەکرێن. بەڵام ڕۆژی جومعە ئەوەشی زیادە، کە سونەتە لەوان زیاتر زیکری تێدا بکرێت‌و، صەلاواتیشی لەسەر پێغەمبەری خوا زیاتر تێدا بدرێت (درودی خوای لێ بێت).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبـەری خـواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویـەتی: «مَنْ قَالَ صَبِيْحَةَ يَوْمِ الْجُمُعَة، قَبْلَ صَلاةِ الغَـدَاةِ: "أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلهَ إلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّوْمُ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللهُ تَعَالَى ذُنُوْبَهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».(٢) واتە: "ئەو کەسەی بەرەبـەیانی ڕۆژی جومعـە بەر لـە نوێژی بەیانی سێ جار بڵێـت: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلهَ إلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّـوْمُ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ)، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، ئەگەرچی لـە زۆریـدا وەکو کەفی دەریا وابن".

سونەتیشە لە ڕۆژی جومعەدا نزاو پاڕانەوە زۆر بکرێت، هەر لە شەبەقەوە هەتا خۆرئاوابوون، بەو هیوایەی ڕێی لەو کاتە بکەوێت، کە دوعای تێدا گیرا دەبێت.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠ – ٣١ / بە ژمارە: ٥٨. شـێخی عەسـقەلانی بە حەدیسێکی لاوازی داناوە. چونکە کەسێکی نەناسراو لە ڕشتەکەیدا هەیە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٢٧ – ٤٢٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٢ / بە ژمارە: ٨٣. ڕشتەکەی لاوازە.

جا چەندین بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە دەستنیشان کردنی ئەو کاتە هاتوە:

- وتراوە: بریتیە لە دوای هەڵاتنی گزنگ‌و، پێش هەڵاتنی خۆر.
- وتراویشە: بریتیە لە دوای هەڵاتنی خۆر.
- وتراویشە: بریتیە لە دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان (واتە: دوای نیوەڕۆ).
- وتراویشە: بریتیە لە دوای عەسر.

هەروەها چەند بۆچوونێکی تریش هەن.

بەڵام بۆچوونی درووست، بەڵکو بۆچوونی ڕاست، کە بێجگە لە ئەو، هیچ بۆچوونێکی تر درووست نیە، ئەوەیە، کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەو کاتە بریتیە لە «مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ». واتە: "نێوان دانیشتنی ئیمام لەسەر مینبەر، هەتا نوێژەکە تەواو دەبێت".(١)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٨٤ / بە ژمارە: ٨٥٣. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: لەوەدا کە ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: (بۆچوونی ڕاست هەر ئەمەیە)، وا دەردەکەوێت کە هەموو بۆچوونەکانی تر هەڵەن. کە ئەمەش جێگەی سەرنج‌و تێبینیە. چونکە هەندێکی تریشیان هەر ڕاست‌و درووستن...... ئەوجا لە ڕێگەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ـەوە فەرمایشتێکی ئیمامی (أَحْمَد)ی هێناوە، کە فەرموویەتی: (زۆربەی حەدیسەکان لەسەر ئەوەن، کە ئەو کاتە بریتیە لەدوای نوێژی عەسرو، ئومێدیش هەیە کە لەدوای لادانی خۆر بێت لە ناوەڕاستی ئاسمان). پاشان شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم فەرمایشتی ئیمامی (أَحْمَد)ە کۆکردنەوەو بەیەکگەیاندنی حەدیسەکانی تێدایەو، لەوەش باشترە کە بۆچوونێکیان پێشبخرێت بەسەر ئەوی تریاندا، چیجای ئەوەی کە ئەوی تریان بە هەڵە دابنرێت. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٣١.

# ئەوەی لەکاتی هەڵاتنی خۆردا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر خۆر هەڵبهاتایە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ جَلَّلَنَا الْيَوْمَ عَافِيَتَهُ (عَافِيَةً)، وَجاءَ بالشَّمْسِ مِنْ مَطْلِعِها. اللّهُمَّ، أصبَحْتُ أشْهَدُ لَكَ بِمَا شَهِدْتَ بِهِ لِنَفسِكَ (عَلَى نَفْسِكَ)، وَشَهِدَتْ بِهِ مَلائِكَتُكَ وحَمَلَةُ عَرْشِكَ وَجَمِيْعُ خَلْقِكَ، إنَّكَ أَنْتَ اللّهُ، لا إلهَ إلاَّ أنْتَ، الْقَائِمُ بالْقِسْطِ، لا إلهَ إلاَّ أنْتَ الْعَزِيْزُ الْحَكِيمُ، اكْتُبْ شَهَادَتِيْ بَعْدَ شَهَادَةِ مَلائِكَتِكَ وَأُوْلِي الْعِلْمِ (وَمَنْ لَمْ يَشْهَدْ مِثْلَ مَا شَهِدْتُ بِهِ، فَاكْتُبْ شَهَادَتِي مَكَانَ شَهَادَتِهِ). اللّهُمَّ، أنْتَ السَّلامُ، وَمِنْكَ السَّلامُ، وَإلَيْكَ السَّلامُ، أسْأَلُكَ يَا ذَا الْجَلالِ وَالْإِكْرَام، أنْ تَسْتَجِيْبَ لَنَا دَعْوَتَنا، وَأنْ تُعْطِيَنَا رَغْبَتَنَا، وَأنْ تُغْنِيَنَا عَمَّنْ أغْنَيْتَهُ عَنَّا مِنْ خَلْقِكَ. اللّهُمَّ، أصْلِحْ لِيْ دِيْنِي الَّذِيْ هُوَ عِصْمَةُ أمْرِيْ، وَأصلِحْ لِيْ دُنْيَايَ الَّتِي فِيْهَا مَعِيْشَتِيْ (مَعَاشِيْ)، وأصْلِحْ لِيْ آخِرَتِي الَّتِيْ إلَيْهَا مُنْقَلَبِيْ».[1]

واتە: "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەمڕۆ بەتەواوی بێوەیی و لەشساغی کردین و، خۆریشی لە جێگەی هەڵهاتنی خۆیەوە بۆ هێناین. خوایە من ئەم بەیانیە شایەتی دەدەم بۆت بەوەی کە خۆت شایەتیت داوە بۆ خۆت و، بەوەش کە فریشتەکان و هەڵگرانی عەرشەکەت و تەواوی درووستکراوەکانت شایەتیان بۆ داوە، کە بەڕاستی تۆ خوایت و، بێجگە لە تۆش هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە بوونی نیەو، تۆ دادپەروەری دەچەسپێنیت. بێجگە لە تۆش هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە بوونی نیەو، تۆ دەسەڵاتدارو کاربەجێیت. تۆش شایەتیەکەی من لەدوای شایەتیدانی

---

جا بۆ زانیاری زیاتر لەسەر تەواوی ئەو بۆچوونانەی کە لەسەر دیاری کردنی ئەم کاتە هاتوون و، بۆ ناسینی خاوەنەکانیان و، بۆ دەستنیشان کردنی بەهێزی و لاوازیان بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِيّ / ٢ / ٤١٦ – ٤٢٢.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٧٦ / بە ژمارە: ١٤٧.

فریشتەکانتو زانایانەوە بنوسە (ئەو کەسەش شایەتیەکی وەکو ئەمەی منی نەداوە، شایەتیەکەی منی بۆ بنووسەو، بیخەرە جێگەی شایەتیەکەی ئەوەوە). خوایە تۆ خۆت سەلامیتو دووریت لە هەموو نەنگیو نوقسانیەك، سەلامیش هەر لە تۆوەیەو، هەر بۆلای تۆشە، داوات لێ دەکەم ئەی خاوەنی شکۆو بەخشندە، نزاو پاڕانەوەکانمان گیرا بکەیتو، ئەوەی حەزمان لێیەتی پێمان ببەخشیت، بێنیازیشمان بکە لەو درووستکراوانەی خۆت، کە بێنیازت کردوون لە ئێمە. خوایە ئاینەکەمم بۆ بپارێزە، کە پارێزەری هەموو کاروبارێکمەو، دنیاکەشم بۆ بپارێزە، کە بژێوی ژیانمی تێدایەو، دواڕۆژیشم بۆ بپارێزە، کە گەڕانەوەم بۆ ئەوێیە".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کەسێکی داناوە، تا چاودێری هەڵاتنی خۆری بۆ بکات. جا کە هەواڵی هەڵاتنی خۆری پێدا، ئەویش فەرمووی: (الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ وَهَبَ لَنَا هَذَا الْيَوْمَ، وَأَقَالَنَا فِيْهِ عَثَرَاتِنَا). واتە: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە ئەم ڕۆژەی پێ بەخشینو، لەم ڕۆژەشدا چاوپۆشی کرد لە تێکەوتنو پێخزانەکانمان).[1]

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٧٦ – ٧٧ / بە ژمارە: ١٤٨. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٤٠.

## ئەوەی لەکاتی بەرزبوونەوەو هەڵکشانی خۆردا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی کوڕی (عَبَسَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا تَسْتَقِلُّ الشَّمْسُ، فَيَبْقَى شَيْءٌ مِنْ خَلْقِ اللهِ تَعَالَى، إِلاَّ سَبَّحَ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- وَحَمِدَهُ، إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ الشَّيْطَانِ وَأَعْتَاءِ (وَأَعْتَى) بَنِيْ آدَمَ». واتە: "هەر کە خۆر بەرزبوویەوە هیچ شتێك نیە لە درووستکراوەکانی خوای گەورە، کە تەسبیحاتو سوپاسو ستایشی خوای گەورە نەکات، مەگەر شەیتانو ئادەمیزادە لوتبەرزو لەسنوور دەرچوەکان نەبێت".

(عَمْرو) دەفەرموێت: لە پێغەمبەری خوام پرسی: (أَعْتَاءِ بَنِيْ آدَمَ) کێن؟. ئەویش فەرمووی: «شِرَارُ الْخَلْقِ». واتە: خراپترین درووستکراوی خوای گەورەن. [1]

## ئەوەی لە نێوان نیوەڕۆو عەسردا دەوترێت

پێشتر باسمان کرد، کە ئەگەر موسوڵمانێك پۆشاكو جلو بەرگی لەبەرکرد چی زیکرێك دەکاتو، ئەگەر لەماڵی خۆیشی دەرچوو چی دەڵێتو، ئەگەر چوە سەرئاو چی دەڵێتو، ئەگەر لە سەرئاو هاتە دەرەوە چی دەڵێتو، ئەگەر دەستنوێژی گرت چی دەڵێتو، ئەگەر چوو بۆ مزگەوت چی دەڵێتو، ئەگەر گەیشتە دەرگای مزگەوت چی دەڵێتو، ئەگەر چوە ژوورەوە چی دەڵێتو، ئەگەر گوێی لە بانگخوێنو قامەتکەرەوە بوو چی دەڵێتو، لەنێوان بانگو قامەتدا چی دەڵێتو، لەکاتی هەستانیدا بۆ نوێژ چی دەڵێتو، لە نوێژدا -لە سەرەتاکەیەوە تا کۆتاییەکەی- چی دەڵێتو، لەدوای نوێژیش چی دەڵێت.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٧٧ / بە ژمارە: ١٤٩. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (حَسَن)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٢ / ٤٤٤.

جا تەواوی نوێژەکان لە هەموو ئەم زیکرانەدا هاوبەشن.

سونەتیشە لەدوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان زیکر زۆرتر بکرێتو، بەندایەتیەکانی تریش زۆرتر ئەنجام بدرێن. لەبەر ئەو حەدیسەی، کە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (سَائِب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دوای هاتنی کاتی نوێژی نیوەڕۆ، بەر لە کردنی نوێژە فەرزەکە چوار ڕکات نوێژی سونەتی دەکردو، دەیفەرموو: «إِنَّهَا سَاعَةٌ تُفْتَحُ فِيْهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، فَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِيْ فِيْهَا عَمَلٌ صَالِحٌ». واتە: "ئەمە کاتێکە دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێنەوە، منیش پێم خۆشە لەو کاتەدا کردەوەیەکی چاکم بەرز بکرێتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

سونەتیشە لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە زیکر زۆر بکرێت. لەبەر گشتگیری ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ [غافر: ٥٥].

زانایانی زمان فەرموویانە: (الْعَشِيّ) لە نیوەڕۆوە دەست پێدەکات تا خۆرئاوابوون.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُوْ مَنْصُوْر)ی (أَزْهَرِيّ) فەرموویەتی: (الْعَشِيّ) بەلای عەرەبەوە، بریتیە لە ماوەی نێوان لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان تا ئاوابوونی خۆر.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٤٢ / بە ژمارە: ٤٧٨.

# ئەوەی لە نێوان عەسرو خۆرئاوابووندا دەوترێت

پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە چی دەوترێتو چی دەکرێت. جا نوێژی عەسریش هەر بەو جۆرەیە. بەڵکو سونەتی دوپاتکراوەیە کە لە کاتی عەسردا زیکر زۆر بکرێت. چونکە بەلای فەرمایشتی کۆمەڵێك لە زانایانی (سَلَف)و (خَلَف)ـەوە نوێژی عەسر بریتیە لە (الصَّلاةُ الْوُسْطَى).

بە هەمان شێوە سونەتە لە کاتی نوێژی بەیانیشدا بایەخی زیاتر بە زیکرەکان بدرێت. چونکە درووستترین بۆچوون لەبارەی (الصَّلاةُ الْوُسْطَى)وە، ئەوەیە، کە بریتیە لە نوێژی عەسرو نوێژی بەیانی.

سونەتیشە لەدوای عەسرەوە زیکر زۆر بکرێتو، لە کۆتایی ڕۆژیشدا زیاتر بکرێت.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ [طه: ١٣٠].
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾ [غَافِر: ٥٥].
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾ [الأعْرَاف: ٢٠٥].
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ * رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ﴾ [النُّور: ٣٦ - ٣٧].

پێشتریش باسمان کرد، که (   ) بریتیە لە ماوەی نێوان عەسرو مەغریب.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (   )ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی:

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لأَنْ أَجْلِسَ مَعَ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- مِنْ صَلاةِ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتِقَ ثَمَانِيَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ».[1] واتە: "ئەگەر لە نوێژی عەسر تا خۆر ئاوادەبێت لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکدا دانیشم، کە زیکری خوای گەورە بکەن، پێم خۆشترە لەوەی هەشت (٨) کەس لە نەوەکانی حەزرەتی (إِسْمَاعِيل) لە کۆیلایەتی ئازاد بکەم".
خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر کەسێك گوێی لە بانگی مەغریبەوە بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فێری کردم، کە لەکاتی بانگی مەغریبدا بڵێم: «اللّهُمَّ، هَذَا إِقْبَالُ

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٦ / بە ژمارە: ٦٧٠. ڕشتەی ئەم حەدیسە بۆیە لاوازە، چونکە کەسێکی تێدایە بەناوی (يَزِيد)ی (رَقَّاشِيّ)ـەوە، کە کەسێکی لاوازە. بەڵام ئیمامی (أَبو دَاوُد) هەمان حەدیسی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە ڕیوایەت کردوەو، تەنها ئەوەندەی جیاوازە، کە لە ڕیوایەتەکەی ئەمدا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «پێم خۆشترە لەوەی چوار (٤) کەس لە نەوەکانی حەزرەتی (إِسْمَاعِيل) لە کۆیلایەتی ئازاد بکەم». زانای پایەبەرز حافظی عێراقی لە تەخریجی حەدیسەکانی (إِحْيَاءُ عُلُوْمِ الدِّيْن)دا فەرموویەتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ـەو، شێخ (نُورُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ)یش فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)ش ڕیوایەتی کردوەو، کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، کە شێخی (ابْنُ حِبَّان) بە متمانەداری داناوەو، زانایانی تر بە لاوازیان داناوەو، هەموو کەسەکانی تریشی متمانەدارن. بڕوانە: سُنَنُ أَبِي دَاوُد / ٢ / ٣٤٧ / بە ژمارە: ٣٦٦٧، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٠٥ / بە ژمارە: ١٦٩٤٠. بەمەش دەکرێت ئەم ڕیوایەتە پاڵپشتی ڕیوایەتەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)ی بکات.

لَيْلِكَ، وَإِدْبَارُ نَهَارِكَ، وَأَصْوَاتُ دُعَاتِكَ، فَاغْفِرْ لِيْ». [1] واتە: "خوایە ئەم بانگە کاتو وادەی هاتنی شەوەو، کاتو وادەی پشت هەڵکردنی ڕۆژەو، دەنگی بانگەوازکەرانی بەرنامەکەی تۆیە، جا تۆش لێم خۆشبە".

## ئەوەی لەدوای نوێژی مەغریبەوە دەوترێت

لەم نزیکانەدا باسمان کرد، کە مرۆڤی موسوڵمان لەدوای هەموو نوێژە فەرزەکانەوە ئەو زیکرانە دەکات، کە باسمان کردن.

دوای ئەوەش کە دوو ڕکاتە سونەتەکەی نوێژی مەغریب دەکات، سونەتە ئەو زیکرەش زیاد بکات، کە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە (أُمُّ سَلَمَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە نوێژی مەغرب بوایەتەوە، دەهاتەوە بۆ ماڵەوەو، دوو ڕکات نوێژی دەکردو، پاشان یەکێك لە دوعاکانی ئەمەبوو، کە دەیفەرموو: «يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِيْنِكَ». [2] واتە: "ئەی هەڵسوڕێنەری دڵەکان، دڵەکانمان لەسەر ئاینەکەت ڕاگیراو بکە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٢٠١ / بە ژمارە: ٥٣٠، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٥ / ٥٧٤ / بە ژمارە: ٣٥٨٩. ئیمامی (حَاكِم) بە حەدیسێکی (صَحِيْح)ی داناوە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٣١٤ / بە ژمارە: ٧١٤.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٠ / بە ژمارە: ٦٥٨. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: کەسێك لە ڕشتەکەیدایە بەناوی (عَطَاء)ی کوڕی (عَجْلان)ـەوە، کە زانایان بە کەسێکی (درۆزن)یان داناوە. پاشان شێخی عەسقەلانی خۆی لە دوو ڕێگەوە حەدیسەکە ڕیوایەت دەکاتو، بە حەدیسێکی (حَسَن)یشی داناوە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە زیکرو دوعاکە نەبەستراوەتەوە بە هیچ کاتو شوێنێکەوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٢ - ١٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە (عُمَارَة)ی کوڕی (شَبِيْب)ـەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِيْ، ويُمِيْتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ" عَشْرَ مَرَّاتٍ، عَلَى أَثَرِ الْمَغْرِب، بَعَثَ اللهُ تَعَالَى لَهُ مَسْلَحَةً، يَتَكَفَّلُوْنَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ مُوْجِبَاتٍ، وَمَحَا عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ مُوْبِقَاتٍ، وَكَانَتْ لَهُ بِعِدْلِ عَشْرِ رِقَابٍ مُؤْمِنَاتٍ». واتە: "ئەو کەسەی لەدوای نوێژی مەغریب دە (١٠) جار بڵێت: (لَا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِيْ، ويُمِيْتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ)، خوای گەورە چەند پاسەوانێکی بۆ دەنێرێت، هەتا بەیانی لە شەیتان دەیپارێزن‌و، بەو زیکرەش دە لەو چاکانەی بۆ دەنوسێت، کە هۆکاری چوونە بەهەشتن‌و، دە لەو خراپەو تاوانانەشی لێ دەسڕێتەوە، کە لەناوی دەبەن‌و، بە قەدەر ئازاد کردنی دە (١٠) کەنیزەکی ئیمانداریش پاداشتی دەست دەکەوێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئێمە ئاگامان لەوە نیە، کە (عُمَارَة)ی کوڕی (شَبِيْب) هیچی لە پێغەمبەری خوا بیستبێت (دروودی خوای لەسەر بێت).[١]

منیش دەڵێم: ئیمامی (نَسَائِيّ) ئەم حەدیسەی لە کتێبی (عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة)دا لە دوو ڕێگەوە ڕیوایەت کردوە: یەکێکیان هەر بەم جۆرەیەو، دوەمیشیان: لە (عُمَارَة)وەیە، ئەویش لە پیاوێکی (أَنْصَارِيّ)ـەوە.[٢] زانای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِم)ی (ابْنُ عَسَاكِر) فەرموویەتی: ئەمەی دوەمیان ڕاستە.[٣]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٤٤ / بە ژمارە: ٣٥٣٤. واتە: حەدیسەکە لەم ڕێگەیەوە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيّ) / ٣٨٥ / بە هەردوو ژمارە: ٥٧٧ و ٥٧٨.

(٣) بۆیە شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٦ - ١٧.

منیش دەڵێم: (مَسْلَحَة) واتە: پاسەوان.

## ئەوەی لە نوێژی (وِتْر)دا دەخوێنرێتو، ئەوەش لە دوای ئەوەوە دەوترێت

سونەتە بۆ ئەو کەسەی سێ ڕکات نوێژی (وِتْر) دەکات، لە ڕکاتی یەکەمیاندا لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ بخوێنێتو، لە دوەمیشیدا ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنێتو، لە سێیەمیشدا ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بخوێنێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە نوێژی (وِتْر) سلاوی بدایەتەوە، دەیفەرموو: «سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ».[1]

لە ڕیوایەتی ئیمامی (نَسَائِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا هاتوە، کە سێ جار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ».[2]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە کۆتایی نوێژە (وِتْر)ەکەیەوە، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوْذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوْبَتِكَ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْكَ، لا أُحْصِيْ ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ». واتە: "خوایە، پەنا دەگرم بە ڕازیبوونت لە تووڕەییت، پەناش

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٥٤ / بە ژمارە: ١٤٣٠.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (النَّسَائِيّ) / ٤٤١ / بە ژمارە: ٧٢٩، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢٩ - ٣٣٠ / بە ژمارە: ٧٠٦.

دەگرم بە لێبوردنت لە سزادانت، پەناش دەگرم بـە سـۆزو میهرت لـە خەشـمو تووڕەییت، من ناتوانم ستایشی تۆ بکەم، تۆ بەو جۆرەیت کە خۆت ستایشی خۆتـت کردوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## زیکری کاتی ڕاکشان بۆ خەوتن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِيْ خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْـتِلاَفِ اللَّيْـلِ وَالنَّهَارِ لايَاتٍ لِأُوْلِي الْأَلْبَابِ * الَّذِيْنَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُـودًا وَعَلَـى جُنُـوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ [آل عِمْرَان: ١٩٠ – ١٩١].

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لـە ڕێگـەی هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)ی کوڕی (يَمَان)و (أَبو ذَرّ)ی (غِفَارِيّ)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بچوایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «بِاسْمِكَ اللّهُمَّ، أحْيَا وَأَمُوْتُ».[2] واتـە: "خوایە بەناوی تۆوە دەژیمو دەمرم".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٥٢ / بە ژمـارە: ١٤٢٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦١ / بـە ژمـارە: ٣٥٦٦، وسُنَنُ النَّسَـائِيّ / ٣ / ٢٤٨ / بـە ژمـارە: ١٧٤٧. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٥ – ٢٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٦٩٢ / بە هەردوو ژمـارە: ٦٩٥٩ و ٦٩٦٠. هـەروەها دەقی حەدیسـەکە بەم جۆرەش هاتوە: «بِاسْمِكَ اللّهُمَّ، أَمُوتُ وَأَحْيَا».

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمیشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت).[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ئەوو بە (فَاطِمَة)ی فەرموو (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت): «إِذَا أَوَيْتُمَا إِلَى فِرَاشِكُمَا (أَوْ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا) فَكَبِّرَا ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وَسَبِّحَا ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ، وَاحْمَدَا ثَلاثاً وَثَلاثِيْنَ».[2] واتە: "ئەگەر چوونە سەر جێگەی خەوتن (یان ئەگەر ڕاکشان)، سیوسێ (٣٣) جار (اللهُ أَكْبَرُ)و، سیوسێ (٣٣) جار (سُبْحَانَ اللهِ)و، سیوسێ (٣٣) جار (الْحَمْدُ لِلّهِ) بکەن".

لە ڕیوایەتێکیشدا سیوچوار (٣٤) جار (سُبْحَانَ اللهِ) هاتوەو، لە ڕیوایەتێکی تریشدا: سیوچوار (٣٤) جار (اللهُ أَكْبَرُ) هاتوە.

جا ئیمامی (عَلِيّ) فەرموویەتی: لەو کاتەوە ئەو فەرمایشتەم لە پێغەمبەری خوا بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، وازم لەو زیکرانە نەهێناوە. عەرزی کرا: شەوی (صِفِّيْن)یش؟ فەرمووی: شەوی (صِفِّيْن)یش.[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا

---

(١) دەقی حەدیسەکە لای ئەو بەم جۆرەیە: «اللهُمَّ بِاسْمِكَ أَحْيَا، وَبِاسْمِكَ أَمُوتُ». بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٣ / بە ژمارە: ٢٧١١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٢٩ / بە ژمارە: ٥٩٥٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩١ / بە ژمارە: ٢٧٢٧.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٠٥١ / بە ژمارە: ٥٠٤٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩١ / بە ژمارە: ٢٧٢٧.

(دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ، فَإِنَّهُ لا يَدْرِيْ مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ. ثُمَّ يَقُوْلُ: "بِاسْمِكَ رَبِيْ وَضَعْتُ جَنْبِيْ، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِيْ، فَارْحَمْها، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا، فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِيْنَ"». واتە: "ئەگەر یەكێك لە ئێوە چوە سەر جێگەی خەوتن، با جێگەنوێنەكەی بە چمكی جلو بەرگەكەی بتەكێنێت، چونكە ئەو نازانێت دوای خۆی چی چوەتە سەر جێگەنوێنەكە. ئەوجا با بڵێت: (پەروەردگارم، بەناوی تۆوە لاتەنیشتم لەسەر ئەم جێگە دادەنێم بۆ خەوتن و، هەر بەناوی تۆشەوە بەرزی دەكەمەوەو هەڵدەسمەوە. ئەگەر لەم خەوەدا ڕۆحم گلدەدەیتەوەو، گیانم دەكێشیت، ئەوا بەزەییت پێیدا بێتەوەو، ڕەحمی پێ بكە. ئەگەر بەرەڵاشی دەكەیت و لێی دەگەڕێیت تا خەبەرم ببێتەوە، ئەوا بیپارێزە بەوەی، كە بەندە چاكە ڕاساڵەكانی خۆتی پێ دەپارێزیت)".

لە ڕیوایەتێكیشدا بەم جۆرە هاتوە: (يَنْفُضُهُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ).[1] واتە: (با سێ جار جێگەنوێنەكەی بە چمكی جلو بەرگەكەی بتەكێنێت).

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە (عَائِشَةَ)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی بهێنایەتە سەر جێگەی خەوتن، فووی دەكرد بە هەردوو دەستیداو، هەرسێ سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی دەخوێندو، دەستە پیرۆزەكانی دەهێنا بە لاشەی پیرۆزیدا.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٢٩ / بە ژمارە: ٥٩٦١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٤ / بە ژمارە: ٢٧١٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٢٩ / بە ژمارە: ٥٩٦٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩١ / بە ژمارە: ٢٧٢٧.

دیسان لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە، لە ڕێگەی دایکە (عَائِشَةَ)وە، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) شەوانە تەشریفی بهێنایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەستەکانی پێکەوە دەناو، فووی پێدا دەکردنو، هەرسێ سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی دەخوێندو، پاشان چەندە لەتوانایدا بوایە، دەستە پیرۆزەکانی دەهێنا بە لاشەی پیرۆزیداو، بە سەریو دەمو چاویو بەشەکانی پێشەوەی لاشەی دەستی پێ دەکردو، ئەم کارەشی سێ بارە دەکردەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو مَسْعُوْد)ی (أَنْصَارِيّ)ـەوە –کە ناوی (عُقْبَة)ی کوڕی (عَمْرو)ە– (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُوْرَةِ الْبَقَرَةِ، مَنْ قَرَأَ بِهِمَا فِيْ لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ».[2] واتە:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٩١٦ / بە ژمارە: ٤٧٢٩، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩١ / بە ژمارە: ٢٧٢٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٤٧٢ / بە ژمارە: ٣٧٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٥٤ / بە ژمارە: ٨٠٧. ئەمەش دەقی ئایەتەکانە: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ * لا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾. واتە: {پێغەمبەری خوا باوەڕی تەواوی بەو پەیامە پیرۆزە هەیە، کە لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆی دابەزێنراوەو، ئیماندارانیش باوەڕیان پێیەتی، هەمووشیان باوەڕیان بەخوای گەورەو، بە فریشتەکانیو، بە کتێبەکانیو، بە پێغەمبەرەکانی هێناوەو، دەڵێن: ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچکام لە پێغەمبەرەکانی خواداو، وتووشیانە: ئێمە فەرمایشتی خوامان بیستوەو، گوێڕایەڵیشمان لێ کردوە، ئەی پەروەردگارمان، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەینو، تەنها بۆلای تۆ دەگەڕێینەوە. خوای گەورە تەکلیف لە هیچ کەسێك ناکات بە کارێك نەبێت، کە لەتوانای ئەو کەسەدا هەبێت، هەموو نەفسێکیش پاداشتو سزای کارو

دوو ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی (الْبَقَرَةِ)، ئەو کەسەی لە شەودا بیانخوێنێت، بەسێتی.

زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەبارەی ڕستەی (كَفَتَاهُ):

- وتراوە: لە بەڵاو نەهامەتیەکانی ئەو شەوە دەیپارێزن.
- وتراویشە: ئەگەر هەڵیش نەسێت بۆ شەونوێژ هەر بەسێتی.

منیش دەڵێم: دەکرێت هەردوو ماناکە مەبەست بن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووم: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ، وَقُلْ: "اللَّهُمَّ، أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لا مَلْجَأَ وَلا مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِيْ أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِيْ أَرْسَلْتَ" فَإِنْ مُتَّ، مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ».[1] واتە: "ئەگەر ویستت بچیتە سەر جێگەی خەوتن، دەستنوێژێك بگرە وەکو دەستنوێژی نوێژ کردن، پاشان لەسەر لاتەنیشتی ڕاستت ڕاکشێ‌و، بڵێ: (خوایە، لاشەو ڕۆحم تەسلیمی تۆ

---

کردەوەی خۆی وەردەگرێتەوە، باوەڕداران دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو، یان هەڵەیەکمان کرد، لێمان مەگرە. ئەی پەروەردگارمان، باری گران مەخەرە سەرشانمان، وەکو خستبووتە سەر شانی ئەوانەی پێش ئێمە. ئەی پەروەردگارمان، بارێك مەخەرە سەر شانمان، کە توانای هەڵگرتنیمان نەبێت‌و، بمانبوورەو، لێمان خۆشبەو، بەزەییت پێماندا بێتەوە، تۆ گەورەو سەرپەرشتیارمانی، پشتیوانیمان بکەو بەسەر کافرو بێباوەڕەکاندا سەرمان بخە}.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٢٦ / بە ژمارە: ٥٩٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٢ / بە ژمارە: ٢٧١٠.

کردوەو، کاروبارم بە تۆ سپاردوەو، پشتم بەتۆ بەستوەو پەنام بۆ تۆ هێناوە، حەزم لە پاداشتو خەڵاتی تۆیەو، ترسیشم لە سزاو تۆڵەی تۆ هەیە، هیچ پەناو حەشارگەیەك نیە لە سزاو تۆڵەی تۆ، بێجگە لە گەڕانەوە بۆلای تۆ، باوەڕم بەو کتێبەت هەیە، کە داتبەزاندوەو، باوەڕیشم بەو پێغەمبەرەت هەیە، کە ڕەوانەت کردوەو ناردووتە)، جا ئەگەر دوای وتنی ئەم زیکرە مردیت، ئەوە لەسەر ئیمانی ساغو درووست دەمریتو، هەوڵیش بدە ئەم زیکرە دوایین وتەت بێت".

جا ئەمە دەقی یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئیمامی بوخاریەو، ڕیوایەتەکانی تریئەوو، ڕیوایەتەکانی ئیمامی موسلیمیش لەمەوە نزیکن.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕایسپاردم بۆ پاراستنی زەکاتی سەرفترەی مانگی ڕەمەزان. جا کەسێك هاتو، بە مشت دەستی کرد بە بردنی خۆراکەکە......... ئیتر حەدیسەکەی بەتەواوی گێڕایەوەو، لە کۆتاییەکەیدا کەسەکە پێی وتوە: ئەگەر چویتە سەر جێگەی خەوتن، (آيَةُ الْكُرْسِيّ) لە سەرەتاکەیەوە تا کۆتاییەکەی بخوێنە، بەردەوام لەلایەن خوای گەورەوە پارێزەرێکت لەگەڵدا دەبێتو، شەیتانیش تا بەیانی لێت نزیك نابێتەوە. پێغەمبەریش فەرمووی: «صَدَقَكَ، وَهُوَ كَذُوبٌ. ذَاكَ شَيْطَانٌ». واتە: "ئەو کەسە ڕاستی لەگەڵدا کردویت، بەلام خۆی کەسێکی درۆزنە. چونکە شەیتانێك بوو لە شەیتانەکان".[2]

ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەی لە صەحیحەکەی خۆیدا ڕیوایەت کردوەو، فەرموویەتی: (وَقَالَ عُثْمَانُ بْنُ الْهَيْثَمِ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِـي هُرَيْرَةَ) واتە: (عُثْمَان)ی کوڕی (هَيْثَم) فەرموویەتی: (عَوْف) لە (مُحَمَّد)ی کوڕی

---

(١) لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا ئەم زیادەیەشی تێدایە: «وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ».

(٢) بڕوانە: صَحِيحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٨١٢ / بە ژمارە: ٢١٨٧.

(سِيْرِيْن)ـەوە بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لـە (أَبُــو هُرَيْــرَةَ)وە. جـا ئەمـە ڕشـتەیەکی پێکەوەبەسـتراوە (مُتَّصِل)ــە. چـونکە (عُثْمَــان)ی کـوڕی (هَيْــثَم) یەکێکـە لــەو مامۆستایانەی ئیمامی بوخاری، کە لـە صەحیحەکەی خۆیدا حەدیسی لێوە ڕیوایـەت کردون.

سەبارەت بەوەش، کە زانای پایەبەرز (أَبُو عَبْدِاللهِ)ی (حُمَيْدِيّ) لـە کتێبی (الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّحِيْحَيْن)دا فەرموویەتی: "ئیمـامی بوخـاری ئـەو حەدیسـەی بـە (مُعَلَّــق)ی هێناوە". ئەوە فەرمایشتێکی پەسەندو درووسـت نیـە! چـونکە مەزهـەبی درووسـتی هەڵبژێردراو بەلای زانایانەوە، کە (مُحَقِّق)ـەکانیشی لەسەرە، ئەوەیە: هـەر کاتێـك ئیمامی بوخاریو زانایانی تـری وەکـو ئـەو بفـەرموون: (وَقَــالَ فُــلانٌ)، ئـەوە وا دادەنرێت، کە حەدیسەکەیان لـەو فلانەکەسە بیستوەو، ڕشـتەی حەدیسـەکەش بـە پێکەوەبەستراو (مُتَّصِل) دادەنرێت، بە مەرجێك ئەو کەسەی فەرموویـەتی: (وَقَــالَ فُلانٌ) کەسێکی (مُدَلِّس) نەبێتو، بەو فلانەکەسەش گەیشتبێت، کـە حەدیسـەکەی لێوە ڕیوایەت کردوە. جا ئەم حەدیسەش بەو جۆرەیە.

بەڵام حەدیسی (مُعَلَّــق): ئـەو حەدیسـەیە، کـە ئیمـامی بوخـاری لــە ڕشـتەی گێڕانەوەکەیدا مامۆسـتاکەی خـۆی، یـان مامۆسـتاکەیو چـەند کەسـێکی تریشـی لابردبێت. بۆ نموونە: لە ڕیوایـەت کردنـی ئـەم حەدیسـەدا بفـەرموێت: (عَــوْف) فەرمووی. یان (مُحَمَّد)ی کوڕی (سِيْرِيْن) فەرمووی. یـان (أَبُو هُرَيْــرَةَ) فـەرمووی. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُــنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)دا، لــە (حَفْصَــة)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بیویستایە بخەوێت، دەستی ڕاسـتی دەخسـتە ژێـر ڕوومەتیـەوەو، پاشـان سـێ جـار

دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، قِنِيْ عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ».[1] واتە: "خوایە ئەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە، لە سزای خۆت بمپارێزە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە ڕیوایەت کردوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت). پاشان فەرمووشێتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ی (حَسَن)ـە.[2]

هەروەها لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی کوڕی (عَازِب)یشەوە ڕیوایەتی کردوە. بەڵام لە هیچکام لە دوو ڕیوایەتەکەدا باسی (سێ جار)ی نەکردوە.[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو، لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِي)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە کاتێك تەشریفی بېردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، رَبَّ السَّمَوَاتِ، وَرَبَّ الْأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، رَبَّنَا، وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ (مُنَزِّلَ) التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيْلِ وَالْقُرْآنِ، أَعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِيْ شَرٍّ، أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ؛ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ، فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ، فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ، فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ، وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ».[4] واتە: "خوایە، ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویو عەرشی مەزن، پەروەردگاری ئێمەو

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣١ / بە ژمارە: ٥٠٤٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧١ / بە ژمارە: ٣٣٩٨.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧١ / بە ژمارە: ٣٣٩٩.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٤ / بە ژمارە: ٢٧١٣، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٢ / بە ژمارە: ٥٠٥١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٢ / بە ژمارە: ٣٤٠٠، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٣٩٥ / بە ژمارە: ٧٦٦٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٤ / بە ژمارە: ٣٨٧٣.

هەموو شتێك، ئەی تەقێنەرو قاڵکەری دانەوێڵەو ناوکی بەرووبوومەکان، ئەی دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێ دەگرم لە زیان و خراپەی هەموو شتێکی زیانبەخش و خراپ، کە لەبەردەستی هێزو توانای تۆدایە. خوایە تۆ یەکەمی بێ سەرەتای و، هیچ شتێك لەپێشتەوە نیە. تۆش دواهەمینی بێ کۆتاییت و، هیچ شتێك لەدواتەوە نیە. تۆش زاڵ و دەسەڵاتداریت و، هیچ شتێك لەسەرووی دەسەڵاتی تۆوە نیە. تۆش زاتێکی پەنهان و نادیاریت و، هیچ شتێك لە تۆ پەنهانترو نادیارتر نیە. خوایە، قەرزەکانمان لەسەر لابەو، بۆمان بدەرەوەو، لە هەژاری و نەداری ڕزگارمان بکەو دەوڵەمەندو بێنیازمان بکە".

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبو دَاوُد)دا بەم جۆرە هاتوە: «اقْضِ عَنِّيْ الدَّيْنَ، وأغْنِنِيْ مِنَ الفَقرِ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبــو دَاوُد)و (نَسَــائِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) کە کاتێك لەسەر جێگەی خەوتن ڕابکشایە، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إِنِّيْ أعُوْذُ بِوَجْهِكَ الْكَرِيْمِ، وَكَلِمَاتِكَ التَّامَّة، مِنْ شَرِّ مَا أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ. اللّهُمَّ، أَنْتَ تَكْشِفُ الْمَغْرَمَ وَالْمَأْثَمَ. اللّهُمَّ، لا يُهْزَمُ جُنْدُكَ، وَلا يُخْلَفُ وَعْدُكَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ. سُبْحَانَكَ، اللّهُمَّ، وَبِحَمْدِكَ».[2] واتە: "خوایە من پەنا دەگرم بە زاتی پیرۆزی تۆو، بە فەرمایشت و سیفەتە تەواوەکانت، لە خراپەو زیانی ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی تۆدایە. خوایە، تۆ قەرزاری لەکۆڵی ئادەمیزاد دەکەیتەوەو تاوانی لەسەر لادەبەیت. خوایە، سەربازەکانی تۆ نادۆڕێن و کەس بەسەریاندا زاڵ نابێت و، پەیمان و بەڵێنی تۆش پێچەوانە ناکرێت و دێتەدی و، دەوڵەمەندی و هەبوون و

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٢ / بە ژمارە: ٥٠٥١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٢ / بە ژمارە: ٥٠٥٢، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٧٧٣٢.

بەختو دەسەلاٌتیش سوود بە خاوەنەکەیان ناگەیەنن لەلای تۆ. خوایە پاكو بێگەردی بۆ تۆو، سوپاسو ستایشیش هەر شایستەی تۆیە".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو، لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی ببردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ أَطْعَمَنَا، وَسَقَانَا، وَكَفَانَا، وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لا كَافِيَ لَهُ وَلا مُؤْوِيَ». واتە: "سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردنو خواردنەوەی پێداینو، پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردینو، جێگەی مانەوەو حەوانەوەشی بۆ دابین کردین، کەسانێکی زۆر هەن، بێ کەسو بێ دەسو بێ لانەو بێ داڵدەن، نە کەس پێویستیان بۆ جێبەجێ دەکاتو، نە کەسیش نشینگەو جێگەی حەوانەوەیان بۆ دابین دەکات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الْأَزْهَر)ەوە -دەشوترێت: أَبُو زُهَيْر-ی (أَنْمَارِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لەشەودا تەشریفی ببردایتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «بِاسْمِ اللهِ وَضَعْتُ جَنْبِيْ. اللّهُمَّ، اغْفِرْ ذَنْبِيْ، وَأَخْسِىءْ شَيْطَانِيْ، وَفُكَّ رِهَانِيْ، وَاجْعَلْنِيْ فِيْ النَّدِيِّ الْأَعْلَى».[2] واتە: "خوایە بەناوی تۆوە لاتەنیشتم خستە سەر زەوی. خوایە لە تاوانم خۆشبەو، شەیتانەکەمم لێ دووربخەرەوەو، ڕزگاریشم بکە لەو ئەرکو مافانەی لەسەرمن (یان لە پێبەندو داوی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٥ / بە ژمارە: ٢٧١٥، وسُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٣ / بە ژمارە: ٥٠٥٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٠ / بە ژمارە: ٣٣٩٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٣ / بە ژمارە: ٥٠٥٤.

ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامم داونو، تۆ لێیان ناڕازیت)و، بیشمگێڕە لەو کەسانەی کە لە کۆڕی فریشتەکاندا دادەنیشنو ئامادە دەبن".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە پێشەوای پایەبەرز (أَبُو سُلَيْمَان)ی (خَطَّابِيّ)ـەوە، کە لە ڕاڤەی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: وشەی (النَّدِيّ) واتە: خەڵکانێك، کە لە جێگەیەکدا کۆبوونەتەوە. (النَّادِي)ش هەر بە هەمان واتایەو، جەمعەکەشی بریتیە لە (أَنْدِيَة). پاشان فەرموویەتی: مەبەستی پێغەمبەری خوا بە (النَّدِيِّ الْأَعْلَى) بریتیە لە: کۆڕی فریشتەکان.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (نَوْفَل)ی (أَشْجَعِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێی فەرمووم: «اقْرَأْ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُوْنَ﴾، ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ». واتە: سورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُوْنَ﴾ بە تەواوەتی بخوێنە، ئەوجا بخەوە، چونکە ئەو سورەتە مانای بەریبوون دەگەیەنێت لە هاوبەشدانان بۆ خوای پەروەردگار.[2]

لە (مُسْنَد)ی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)شدا هاتوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى كَلِمَةٍ تُنَجِّيْكُمْ مِنَ الْإِشْرَاكِ بِاللهِ -عَزَّ وَجَلَّ-؟ تَقْرَؤُوْنَ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُوْنَ﴾ عِنْدَ مَنَامِكُمْ». واتە:

---

(١) بڕوانە: مَعَالِمُ السُّنَن / ٤ / ١٤٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٣ / بە ژمارە: ٥٠٥٥، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٤ / بە ژمارە: ٣٤٠٣. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ٥٨٧ / بە ژمارە: ٣٩٨٢، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٦١.

"ئایا ڕێنموویتان نەکەم بۆ لای فەرمایشتێك، کە لە هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە ڕزگارتان بکات؟ لەکاتی خەوتندا سورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُوْنَ﴾ بخوێنن". [١]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عِرْبَاض)ی کوڕی (سَارِيَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بەرلەوەی بخەوێت، ئەو سورەتانەی دەخوێند، کە سەرەتاکانیان بە تەسبیحات دەست پێ دەکات {واتە: سورەتەکانی: (الْإِسْرَاء)و (الْحَدِيْد)و (الْحَشْر)و (الصَّفّ)و (الْجُمُعَة)و (التَّغَابُن)و (الْأَعْلَى)}.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. [٢]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، نەدەخەوت، تاوەکو هەردوو سورەتی {(بَنُو إِسْرَائِيْل) (واتە: الْإِسْرَاء)} و (الزُّمَر) نەخوێنێت.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. [٣]

---

(١) ئەم حەدیسەم لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکانی (مُسْنَد)ی (أَبُو يَعْلَى)ی (مَوْصِلِيّ)دا نەبینیەوە. بەڵام هەریەکە لە ئیمامی (طَبَرَانِي)و زانای پایەبەرز (أَبُو نُعَيْم)ی (أَصْبَهَانِيّ) ڕیوایەتیان کردوەو، لە ڕشتەکەشیدا کەسێك هەیە بەناوی (جُبَارَة)ی کوڕی (مُغَلِّس)ـەوە، کە زۆرێك لە زانایان بە کەسێکی لاوازیان داناوە. بڕوانە: الْمُعْجَمُ الْكَبِيْر / ١٢ / ٢٤١ / بە ژمارە: ١٢٩٩٣، وحِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء / ٤ / ٩٦، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٦٦ - ١٦٧ / بە ژمارە: ١٧٠٣٥، وإِتْحَافُ الْخِيَرَةِ الْمَهَرَة / ٦ / ٣٠٦ / بە ژمارە: ٥٩٠٥. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسەکەی پێشووی (نَوْفَل) پاڵپشتی لەم حەدیسە دەکات. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٦٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٤ / بە ژمارە: ٥٠٥٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ٣٤٠٦.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٥ / بە ژمارە: ٣٤٠٥.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی ببردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ كَفَانِيْ، وَآوَانِيْ، وَأَطْعَمَنِيْ، وَسَقَانِيْ، وَالَّذِيْ مَنَّ عَلَيَّ، فَأَفْضَلَ، وَالَّذِيْ أَعْطَانِيْ، فَأَجْزَلَ. الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ. اللّهُمَّ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيْكَهُ، وَإِلهَ كُلِّ شَيْءٍ، أَعُوْذُ بِكَ مِنَ النَّارِ».(١) واتە: "سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردوم و، جێگەی حەوانەوەو نیشتەجێبوونیشی بۆ دابین کردوم و، خواردن و خواردنەوەشی پێداوم و، ئەو خوایەی کە منەتێکی زۆری بەسەردا ڕشتووم و، خەڵاتی زۆر گەورەشی پێشکەش کردووم. خوایە لە هەموو کات و سات و حاڵەتێکدا سوپاس و ستایش هەر شایستەی تۆیە. خوایە، ئەی پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، ئەی خواوەندو پەرستراوی هەموو شتێك، پەنا دەگرم بە تۆ لە ئاگری سەختی دۆزەخ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ حِيْنَ يَأْوِيْ إِلَى فِرَاشِهِ: "أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّوْمَ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللهُ تَعَالَى لَهُ ذُنُوبَهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ النُّجُوْمِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ رَمْلِ عَالِجٍ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ أَيَّامِ الدُّنْيَا».(٢) واتە: "ئەو کەسەی کاتێك دەچێتە سەر جێگەی خەوتن، سێ جار بڵێت: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّوْمَ،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٤ / بە ژمارە: ٥٠٥٨. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، ئەوەش جێگەی سەرنج و تێبینیە، کە ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: "ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٦٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٠ / بە ژمارە: ٣٣٩٧. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٦٨.

وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ)، خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، ئەگەرچی لە زۆریشدا وەکو کەفی دەریا وەهابن، یان وەکو ژمارەی ئەستێرەکان وەهابن، یان وەکو ژمارەی لمی کەڵەکەبووی بیابان وەهابن، یان وەکو ژمارەی ڕۆژەکانی دنیا وەهابن".

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا، بە ڕشتەی (صَحِيْح)، لە پیاوێکی هۆزی (أَسْلَم)وە، کە یەکێك بوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەو پیاوە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتبووم (دروودی خوای لەسەر بێت)، یەکێك لە هاوەڵان هات بۆ خزمەتی‌و، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمشەو شتێك پێوەی دام، هەتا بەیانی خەوم لێ نەکەوت!!! پێغەمبەریش فەرمووی: (چی پێوەی دایت؟) ئەویش عەرزی کرد: دوپشك. پێغەمبەریش فەرمووی: ئەگەر ئێوارە بتوتایە: «أَعُوْذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»، (إِنْ شَاءَ اللهُ) هیچ زیانی پێ نەدەگەیاندیت.(١)

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت). پێشتریش لە صەحیحی موسلیمەوە هێنامان، لە باسی (**ئەوەی لە بەیانیان‌و لە ئێواراندا دەوترێت**).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئامۆژگاری کەسێکی کرد، کە ئەگەر چوە سەر جێگەی خەوتن، با سورەتی (الْحَشْر) بخوێنێت‌و، پێیشی فەرموو: «إِنْ مُتَّ، مُتَّ شَهِيْداً (أَوْ قَالَ: مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»).

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠٦ / بە ژمارە: ٣٨٩٨.

واتــه: "ئەگــەر بمریــت، بــه شــەهیدی دەمریــت"، یــان فــەرمووی: "لــه ئــەهلی بەهەشتیت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوه لـه صەحیحی موسلیمدا، هـاوەڵی خۆشەویسـت (ابْـنُ عُمَر)ەوه (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرمانی کردوه بـه پیاوێـك، ئەگـەر چـوه سەر جێگەی خەوتن، بـا بڵێـت: (اللّهُمَّ، أنْتَ خَلَقْتَ نَفْسِيْ، وأنْتَ تَتَوَفَّاهَـا، لَـكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا، إنْ أحْيَيْتَهَا، فَاحْفَظْهَا، وَإنْ أمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا. اللّهُـمَّ، إنِّـيْ أسْـأَلُكَ الْعَافِيَةَ). واته: (خوایه، تۆ ڕۆحی منت درووست کردوەو، تۆش دەیمرێنیـت، ژیـانو مردنی هەر بەدەستی تۆیه، جا ئەگەر دەیژێنیت، بیپارێزەو ئاگات لێـی بێـت، ئەگـەر دەشیمرێنیت، لێی خۆشبه. خوایه من داوای سەلامەتی بێوەییت لێ دەکەم).

ئەوجا (ابْنُ عُمَر) فەرمووی: ئەم زیکرەم لـه پێغەمبەری خوا بیستوه (دروودی خوای لەسەر بێت).[2]

هەروەها لـه (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و، لـه غەیری ئەوانیشـدا، بـه چـەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـو هُرَيْـرَة)مـان بـۆ ڕیوایەت کراوه (خوای لێ ڕازی بێت)، کـه پێشـتریش هێنامـان لـه باسـی (**ئـەوەی لـه بەیانیانو لە ئێوارانیدا دەوترێت**)، سەبارەت به چیرۆکەکەی ئیمامی (أَبُو بَكْر) (خوای لێ ڕازی بێت)، که پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) پێـی فـەرموو: بـەیانیانو ئێوارانو لەکاتی ڕاکشانیشدا بڵێ: «اللّهُمَّ، فاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأرْضِ، عَالِمَ الْغَيْـبِ

(١) بروانـه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّـنِّيّ) / ٣٣٤ – ٣٣٥ / بـه ژمـاره: ٧١٨. شـێخی عەسقەلانی به حەدیسێکی لاوازی داناوه. بڕوانه: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٣ / ٧٠.
(٢) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٨٣ / به ژماره: ٢٧١٢.

وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيْكَهُ، أشْهَدُ أنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أنْتَ، أعُوْذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفِسِيْ، وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ». (١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (شَدَّاد)ی کوڕی (أَوْس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا مِنْ (عَبْدٍ) مُسْلِمٍ يَأْوِيْ إِلَى فِرَاشِهِ، فَيَقْرأُ سُوْرَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ تَعَالَى حِيْنَ يَأْخُذُ مَضْجَعَهُ، إلاَّ وَكَّلَ اللهُ –عَزَّ وَجَلَّ– بِهِ مَلَكاً، لا يَدَعُ شَيْئاً يَقْرَبُهُ وَيُؤْذِيْهِ، حَتَّى يَهُبَّ (مِنْ نَوْمِهِ) مَتَى هَبَّ». (٢) واتە: "هەر موسوڵمانێك بچێتە سەر جێگەی خەوتن،و، کاتێك ڕادەکشێت سورەتێك لە قورئانی پیرۆز بخوێنێت، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ ڕادەسپێرێت، ڕێگە نادات هیچ شتێك نزیکی بێتەوەو ئازاری بدات، هەتا لەخەو هەڵدەسێت و خەبەری دەبێتەوە، ئیتر هەرکەی خەبەری بێتەوە".

ڕشتەی ئەم حەدیسە لاوازە. (٣)

وشەی (هَبَّ)ش واتە: لەخەو هەستاو خەبەری بوویەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إنَّ الرَّجُلَ إذَا أوَى إِلَى فِرَاشِهِ، ابْتَدَرَهُ مَلَكٌ وَشَيْطَانٌ، فَقَالَ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٧ / بە ژمارە: ٥٠٦٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ٣٣٩٢. پێشتر واتاکەیمان نووسیوە.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٦ / بە ژمارە: ٣٤٠٧، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٤٧ – ٣٤٨ / بە ژمارە: ٧٤٦.

(٣) چونکە کەسێکی نەناسراوی تێدایە. بەڵام شێخی عەسقەلانی بە ڕشتەی خۆی حەدیسێکی هاوشێوەی لە ئیمامی (أحْمَد)و ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ـەوە ڕیوایەت کردوەو، پاشا فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٧٢ – ٧٤.

الْمَلَكُ: اللّهُمَّ، اخْتِمْ بِخَيْرٍ. فَقَالَ الشَّيْطَانُ: اخْتِمْ بِشَرٍّ. فَإِنْ ذَكَرَ اللهَ تَعَالَى، ثُمَّ نَـامَ، بَاتَ الْمَلَكُ يَكْلَؤُهُ».[١] واته: "بەڕاستی ئەگەر پیاو چوە سەر جێگەی خەوتن، فریشتەیەكو شەیتانێك پێشبڕكی دەكەنو بەپەلە دەچن بۆلای. فریشتەكە دەفەرموێت: (خوایە، خەوەكەی بەخەیرو خۆشی كۆتایی پێ بهێنە). شەیتانەكەش دەڵێت: (بەشەڕو ناخۆشی كۆتایی پێ بهێنە). جا ئەگەر پیاوەكە زیكری خوای گەورە بكاتو، ئەوجا بخەوێت، ئیتر بەدرێژایی ئەو شەوە فریشتەكە چاودێریو پارێزگاری لێ دەكات".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوكیشی ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە ئەگەر تەشریفی ڕاكشایە بۆ خەوتن، دەیفەرموو «اللَّهُمّ، بِاسْمِكَ رَبِّيْ، وَضَعْتُ جَنْبِيْ، فَاغْفِرْ لِـيْ ذَنْبِيْ».[٢] واتە: "خوایە، بەناوی تۆوە لاتەنیشتی خۆم خستە سەر جێگە، دەی تۆش لە تاوانم خۆشبە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «مَنْ أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ طَاهِراً، وَذَكَرَ اللهَ -عَزَّ وَجَلَّ- حَتَّى يُدْرِكَهُ النُّعَاسُ، لَمْ يَتَقَلَّبْ ساعَةً مِنَ اللَّيْلِ، يَسْأَلُ اللهَ -عَزَّ

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٤٧ / بە ژمارە: ٧٤٥. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێكی (حَسَن)ی داناوەو، فەرمووشێتی: هەریەكە لە ئیمامی (نَسَائِيّ)و (ابْنُ حِبَّان)و (حَاكِم)و (طَبَرَانِيّ)یش ڕیوایەتیان كردوەو، سەریشم سووڕ دەمێنێت، كە ئیمامی نەوەوی تەنها لە ڕێگەی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە حەدیسەكەی هێناوەو، كەچی لە كتێبە بەناوبانگەكانی ئەو زانا پایەبەرزانەشدا هاتوە!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٧٩ - ٨٠.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٣٣ / بە ژمارە: ٧١٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٨٠.

وَجَلَّ- فِيْهَا خَيْراً مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ».[1] واته: "ئەو کەسەی بە خاوێنیو بە دەستنوێژەوە بچێتە سەر جێگەی خەوتنو، زیکری خوای گەورە بکات هەتا خەو دەیباتەوە، ئەوا هەر ساتێکی ئەو شەوە خەبەری بێتەوەو، داوای خەیرێك لە خەیرەکانی دنیاو دوارۆژ لە خوای گەورە بکات، خوای گەورە دەیداتیو پێی دەبەخشێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی ببردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، أَمْتِعْنِيْ بِسَمْعِيْ وَبَصَرِيْ، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ مِنِّيْ، وَانْصُرْنِيْ عَلَى عَدُوِّيْ، وَأَرِنِي (مِنْهُ) ثَأْرِيْ. اللّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ، وَمِنَ الْجُوْعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيْعُ».[2] واته: "خوایە، هێزی بیستنو بینینم پێ کەرەم فەرموو، هەتا دەمرم هەردووکیانم بە ساغو سەلامەتی بۆ بهێڵەرەوەو، بەسەر دوژمنەکەمدا سەرم بخەو، پیشانم بدە کە تۆڵەی منی لێ دەکەیتەوە. خوایە، من پەنات پێ دەگرم لە زۆربۆهێنانی قەرزاریو، لە برسێتیش، کە بەڕاستی هاونوێنێکی خراپو بەدە".

زانایان فەرموویانە: مانای (اجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ مِنِّيْ) ئەوەیە، کە بە ساغو سەلامەتی بیانهێڵەرەوە، هەتا دەمرم.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٣٣٥ / بە ژمارە: ٧١٩. ڕشتەکەی لاوازە. بەڵام هەریەکە لە ئیمامی (أَحْمَد)و (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيِّ)و (ابْنُ مَاجَه) حەدیسێکی هاوشێوەی ئەمەیان لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ـەوە ڕیوایەتیان کردووەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٨٢ - ٨٤.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٣٤٠ - ٣٤١ / بە ژمارە: ٧٣٤. حەدیسێکی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٨٦.

وتراویشـه: مەبەسـت ئەوەیـە، کـە لـەکاتی پـیری‌و لاوازبـوونی ئەندامـەکان‌و هەستەوەرەکانی (الْحَوَاسّ) تردا ئەو دوانە بە بەهێزی بمێننەوە. واتە: خوایە ئـەو دوو هێزە بکە بە میراتبەری هێزی تەواوی ئەندام‌و هەستەوەرەکانی تر.

وتراویشـە: (سَمْع) بریتیـە لـە تێگەیشـتن‌و کـار کـردن بـەوەی دەبیسـترێت‌و، (بَصَر)یش بریتیە لە پەند وەرگرتن لەوەی دەبینرێت‌و بەرچاو دەکەوێت.

هەروەها ئەم ڕستەیە بەم جۆرەش ڕیوایەت کراوە «اجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنِّيْ». بەمەش ڕاناوی (هَاء)ەکە بۆ (إمْتَاع) دەگەڕێتەوە، کە مەصدەری (أمْتِعْ)ـە. بۆیە بـە ڕانـاوی تاك هێناویێتی.

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: لـەوەتـەی مـن بـوم بـە هاوسەری پێغەمبەری خوا، تا ئەو کاتەی دنیای بەجێهێشت، هـەرگیز نەدەخـەوت، تـاوەکو پـەنا بـەخوای گـەورە نـەگرێت لـە: ترسـنۆکی‌و، تەمـەڵی‌و، ڕژدی‌و، لێتێکچوونی کاتی پیری‌و، دیمەنی خراپ‌و ناخۆشی خێزان‌و ماڵو، سزای ناو گۆڕو، لە شەیتان‌و لـەو وەسوەسـەی، کـە لـە دڵـدا درووسـتی دەکـات، سـەبارەت بـە هاوبەشدانان بۆ خوای پەروەردگار.[1]

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە ئـەو هـەرکاتێك بیویسـتایە بخـەوێت، دەیفەرموو: "خوایە، من داوای بینینی خەوی باشت لێ دەکەم، ڕاسـت بێـت‌و، درۆ نەبێت، سوودبەخش بێت‌و، زیانبەخش نەبێت". جا هەرکاتێکیش ئەمەی بفەرموایـە،

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٣٤٢ / بـە ژمـارە: ٧٣٦. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٣ / ٨٩.

ئیتر کەسەکانی چواردەوری دەیانزانی هەتا بەیانی، یان تا کاتێك شەو خەبەری دەبێتەوە، هیچ وشەیەك بەدەمیدا نایەت‌و هیچ نافەرموێت.[1]

پێشەوای پایەبەرز (أَبو بَكْر)ی کوڕی ئیمامی (أَبو دَاوُد) بە ڕشتەی خۆی ڕیوایەتی کردوە لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو فەرموویەتی: "وا نازانم کەسێکی ژیرو فامدار هەبێت، بەر لەوەی سێ ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (الْبَقَرَة) بخوێنێت، بخەوێت".

ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری‌و موسلیم.

دیسان ڕیوایەت کراوە لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: "وا نازانم کەسێکی ژیرو فامدار هاتبێتە ناو ئیسلامەوەو، بخەوێت، هەتا (آيَةُ الْكُرْسِيّ) نەخوێنێت".[2]

ڕیوایەتیش کراوە لە زانای پایەبەرز (إِبْرَاهِيْم)ی (نَخَعِيّ)ـەوە، کە فەرموویەتی: "هاوەڵان ئەوانیان فێر دەکرد، کە ئەگەر چوونە سەر جێگەی خەوتن، هەردوو سورەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بخوێنن".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: "هاوەڵان بە سونەتیان داناوە، کە هەموو شەوێك ئەم سورەتانە سێ جار بخوێنن: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾".

ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٤٦ / بە ژمارە: ٧٤٣. ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٨٩.

(٢) ڕشتەکەی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٩١.

ئەوجا بزانە، کە ئەو حەدیس‌و فەرمایشتانەی سەبارەت بەم باسە هاتوون گەلێك زۆرن، ئەوەندەش کە ئێمە باسمان کرد، بەسە بۆ ئەو کەسەی، خوای گەورە موەفەقی کردبێت بۆ کار پێکردنیان. جا بۆیە لەوە زیاترمان باس نەکرد، ترسی ئەوەمان هەبوو، کە ببێتە مایەی ماندووبوون بۆ کەسی فێرخواز.

پاشان، باشتر وایە مرۆڤی موسوڵمان هەموو ئەو زیکرانە بکات، کە لەم باسەدا باسمان کردن. خۆ ئەگەر بۆی نەکرا، ئەوا چەندە دەتوانێت با گرنگەکانیان بکات.

## خەوتن بەبێ زیکری خوا ناپەسەندە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَعَدَ مَقْعَداً لَمْ يَذْكُرِ اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تِرَةٌ (تِرَةً)، وَمَنْ اضْطَجَعَ مَضْجَعاً لا يَذْكُرُ اللهَ تَعَالَى فِيْهِ، كَانَتْ عَلَيْهِ مِنَ اللهِ تَعَالَى تِرَةٌ (تِرَةً)».[1] واتە: "ئەو کەسەی لە جێگەیەکدا دابنیشێت‌و، زیکری خوای تێدا نەکات، دانیشتنەکەی لای خوای گەورە دەبێتە مایەی نەنگی‌و شوورەیی بۆی. ئەو کەسەش لە جێگەیەکدا ڕابکشێت‌و، زیکری خوای تێدا نەکات، ڕاکشانەکەی لای خوای گەورە دەبێتە مایەی نەنگی‌و شوورەیی بۆی".

منیش دەڵێم: وشەی (تِرَة) بەمانای (نەنگی‌و نوقسانی) دێت. وتراویشە: بەمانای (سەرەنجامی خراپ‌و شوورەیی) دێت.

## ئەگەر کەسێک شەو خەبەری بوویەوە، ویستی بخەوێتەوە چی بڵێت؟

بزانە، کە ئەو کەسەی لە شەودا خەبەری دەبێتەوە، دوو جۆرە:

- یەکەمیان: ئەوەیە کە دواتر ناخەوێتەوە. ئێمەش لە سەرەتای ئەم کتێبەوە زیکرەکانی ئەم جۆرە کەسەمان باس کرد.
- دوەمیان: ئەوەیە کە دواتر دەیەوێت بخەوێتەوە. ئەمەشیان سونەتە هەتا خەو زۆری بۆ دەهێنێت زیکری خوا بکات‌و، زیکرێکی زۆریشی لەبارەوە هاتوە، هەندێکیان ئەوانەن کە پێشتر سەبارەت بە جۆری یەکەم باسمان کردن.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٨٠ / بە ژمارە: ٤٨٥٦.

یەکێکیش لەو زیکرانە ئەوەیە، کە لە صەحیحی بوخاریدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُبَادَة)ی کوڕی (صَامِت)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ، فَقالَ: "لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ، وَالْحَمْدُ لِلّهِ، وَسُبْحَانَ اللّهِ، وَلا إلهَ إلاَّ اللّهُ، وَاللهُ أكْبَرُ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللّهِ"، ثُمَّ قَالَ: اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ -أوْ دَعَا- اسْتُجِيْبَ لَهُ، فَإنْ تَوَضَّأَ (وَصَلَّى) قُبِلَتْ صَلاتُهُ».[1] واتە: "ئەو کەسەی شەو خەبەری ببێتەوەو، بڵێت: (لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ، وَالْحَمْدُ لِلّهِ، وَسُبْحَانَ اللّهِ، وَلا إلهَ إلاَّ اللّهُ، وَاللهُ أكْبَرُ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللّهِ)، پاشان بڵێت: خوایە لێم خۆشبە -یان بپاڕێتەوەو نزا بکات-، خوای گەورە نزاو پاڕانەوەکەی گیرا دەکات. خۆ ئەگەر دەستنوێژیش بگرێتو، نوێژیش بکات، ئەوە نوێژەکەشی لێ قبوڵ دەکرێت".

جا ئێمە ئەم حەدیسەمان لە نوسخەی تەحقیقکراوی بیستنەکەی خومانو، لە نوسخە پشت پێ بەستراوەکانی صەحیحی بوخاریشدا هەر بەم جۆرە پێگەیشتوە. بەڵام ڕستەی (لا إلهَ إلاَّ اللهُ) لەپێش (اللهُ أكْبَرُ)ەوە لە زۆرێك لە نوسخەکاندا نەهاتوەو نەنوسراوەو، زانای پایەبەرز (حُمَيْدِيّ)ش لە کتێبی (الْجَمْعُ بَيْنَ الصَّحِيْحَيْن)دا نەیهێناوە.

هەروەها ئەم ڕستەیە لە ڕێگەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە ڕێگەی غەیری ئەویشەوە هاتوە. بەڵام لە ڕێگەی ئیمامی (أبو دَاوُد)ەوە نەهاتوە.

ئەو گومانەش کە لە ڕستەی: (اغْفِرْ لِيْ -أوْ دَعَا-)دا هەیە، لەلای یەکێك لە ڕاویەکانەوە درووست بوە، کە ناوی (وَلِيْد)ی کوڕی (مُسْلِم)ـەو، لە گێڕانەوەی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٨٧ / بە ژمارە: ١١٠٣.

ئەم حەدیسەدا مامۆستای مامۆستاکانی ئیمامی بوخاریو (أَبُــو دَاوُد)و (تِرْمِــذِيّ)و زانایانی تریشە.

وشەی (تَعَارَّ)ش واتە: لەخەو هەستاو خەبەری بوویەوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لــە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، بـە ڕشـتەیەك، کـە ئـەو بـە لاوازی دانەناوە، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە ئەگـەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، شەو خەبـەری بوایەتـەوە، دەیفـەرموو: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، سُبْحَانَكَ، اللَّهُمَّ، أَسْتَغْفِرُكَ لِذَنْبِيْ، وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ. اللَّهُمَّ، زِدْنِيْ عِلْماً، وَلاَ تُزِغْ قَلْبِيْ بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِيْ، وَهَبْ لِيْ مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً، إِنَّكَ أَنْــتَ الْوَهَّــابُ».[1] واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە تـۆ، خوایـە پـاكو بێگـەردی بـۆ تۆیەو، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم بـۆ تاوانـەکانم، داوای سـۆزو میهریشـت لێ دەکەم. خوایە زانستی زۆرم پێ ببەخشەو، دوای ئەوەی کە هیدایەتت دامو ڕێگەی ڕاستت پیشاندام، دڵم مەگۆڕەو، لەو ڕێگە ڕاستە لام مەدەو، لە کانگای پڕ سـۆزو میهرت ڕەحمو بەزەییم پێ ببەخشە، چونکە بەڕاستی تۆ زاتێکی زۆر بەخشندەیت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّــنِّيّ)دا، لــە (عَائِشَــةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، شەو خەبەری بوایەتەوە، دەیفـەرموو: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الوَاحِدُ القَهَّارُ، رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَــا بَيْنَهُمَــا، الْعَزِيْــزُ الْغَفَّــارُ».[2] واتـە: "هـیچ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٣٥ / بە ژمارە: ٥٠٦١. حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، پێشتریش تەخریجمان کرد.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْــنُ السُّــنِّيّ) / ٣٥٣ – ٣٥٤ / بـە ژمـارە: ٧٥٧. شـێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، هەریەکـە لـە ئیمـامی (نَسَــائِيّ)و (ابْــنُ حِبَّان)و (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوە. بۆیە سەیرە کە ئیمامی نەوەوی تەنها لـە ڕێگـەی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە هێناویەتی!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٠٣.

پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە خوای تاکو تەنهای دەسەڵاتدار، کە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی‌و شتەکانی نێوانیشیانەو، زاتێکی بەهێزی زۆر لێبوردەیە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لێبوە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا رَدَّ اللهُ -عَزَّ وَجَلَّ- إِلَى الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ نَفْسَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَسَبَّحَهُ، وَاسْتَغْفَرَهُ، وَدَعَاهُ، تَقَبَّلَ مِنْهُ».[1] واتە: "ئەگەر خوای گەورە بەشەودا ڕۆحی گەڕاندەوە بۆ بەندە موسوڵمانەکەی خۆی‌و، ئەویش تەسبیحاتی خوای کردو، داوای لێخۆشبوونی لێ کردو، لێی پاڕایەوە، خوای گەورەش نزاو پاڕانەوەکەی گیرا دەکات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَهْ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ عَنْ فِرَاشِهِ مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ عَادَ إِلَيْهِ، فَلْيَنْفُضْهُ بِصَنِفَةِ إِزَارِهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّهُ لا يَدْرِيْ مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ، فَإِذَا اضْطَجَعَ، فَلْيَقُلْ: بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِيْ، فَارْحَمْهَا، وَإِنْ رَدَدْتَهَا، فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِيْنَ». واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە شەودا لەسەر جێگەکەی خۆی هەستاو، پاشان گەڕایەوە بۆی، با سێ جار بە چمکی جلو بەرگەکەی جێگەنوێنەکەی بتەکێنێت، چونکە ئەو نازانێت دوای خۆی چی چوەتە سەر جێگەنوێنەکە. ئەوجا کە ڕاکشا، با بڵێت: (خوایە، بەناوی تۆوە لاتەنیشتم لەسەر ئەم جێگە دادەنێم بۆ خەوتن‌و، هەر بەناوی تۆشەوە بەرزی دەکەمەوەو هەڵدەسمەوە. ئەگەر لەم خەوەدا ڕۆحم گلدەدەیتەوەو، گیانم دەکێشیت، ئەوا

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٥١ / بە ژمارە: ٧٥٣.

بەزەییت پێیدا بێتەوەو، ڕەحمی پێ بکە. ئەگەر بۆشم دەگەڕێنیتەوەو لێی دەگەڕێیت تا خەبەرم ببێتەوە، ئەوا بیپارێزە بەوەی، کە بەندە چاکە ڕاسالّەکانی خۆتی پێ دەپارێزیت)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)دا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە بەشی (بَابُ الدُّعَاء)دا، لە کۆتایی (كِتَابُ الصَّلاة)وە: لە ئیمامی (مَالِك) خۆیەوە، کە لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو الدَّرْدَاء)ەوە پێی گەیشتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەو لە ناوەڕاستی شەودا هەڵدەستاو، دەیفەرموو: (نَامَتِ الْعُيُوْنُ، وَغَارَتِ النُّجُوْمُ، وأَنْتَ حَيٌّ قَيُوْمٌ). واتە: (چاوەکان خەوتونو، ئەستێرەکانیش ئاوا بوونو، تۆش زاتێکی زیندوویتو، ڕاپەڕێنەری کاروباری بوونەوەرانیت).[2]

## ئەگەر کەسێك بەهۆی دڵەڕاوکێوە خەوی لێ نەدەکەوت چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَيْد)ی کوڕی (ثَابِت)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: سکاڵام بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە تووشی خەولێنەکەوتن بووم. ئەویش فەرمووی: بڵێ: «اللّهُمَّ، غَارَتِ النُّجُوْمُ، وَهَدَأَتِ الْعُيُوْنُ، وَأَنْتَ حَيٌّ قَيُّومٌ، لا تَأْخُذُكَ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ، يَا حَيُّ يَا قَيُّوْمُ، أَهْدِىءْ لَيْلِيْ، وَأَنِمْ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٧٢ / بە ژمارە: ٣٤٠١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٧٥ / بە ژمارە: ٣٨٧٤، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٥٨ / بە ژمارە: ٧٦٥.

(٢) بڕوانە: مُوَطَّأُ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٢١٩ / بە ژمارە: ٥١١. هەروەها ئەم زیکرە لە حەدیسێکی لاوازیشدا وەکو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ڕیوایەت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٠٧ - ١٠٨.

عَيْنِيْ». واته: "خوایه، ئەستێرەکان ئاوا بوونو، چاوەکانیش هێور بوونەوەو نیشتن، تۆش زیندوویتو، ڕاپەڕێنەری کاروباری بوونەوەرانیت، نە وەنەوزو خەوەنووچکە دەتباتەوەو نە خەویشت لێ دەکەوێت، ئەی ئەو زاتەی کە هەمیشە زیندوویتو، ڕاپەڕێنەری کاروباری بوونەوەرانیت، ئارامی بخەرە ئەم شەوەمەوەو، خەویش بخەرە چاوەکانمەوە". جا منیش ئەمەم وتمو، خوای گەورە حاڵەتەکەی لەسەر لابردم.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە زانای پایەبەرز (مُحَمَّد)ی کوڕی (يَحْيَى)ی کوڕی (حَبَّان)ـەوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (خَالِد)ی کوڕی (وَلِيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ماوەیەك تووشی خەولێنەکەوتن بوە، بۆیە سکاڵای بردۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمانی پێکردوە، کە لەکاتی خەوتندا پەنا بگرێت بە فەرمایشتو سیفەتە تەواوەکانی خوای گەورە لە غەزەبو تووڕەبوونیو، لە شەڕو خراپەی بەندەکانیو، لە وەسوەسەو خەیاڵی شەیتانەکانو، لەوەش کە لەلایدا ئامادەبنو، ببن بە هاوەڵی.(٢)

ئەم حەدیسە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە. چونکە (مُحَمَّد)ی کوڕی (يَحْيَى) یەکێکە لە شوێنکەوتوان.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز – کە ئیمامی (تِرْمِذِيّ) خۆیشی بەلاوازی داناوە– لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (خَالِد)ی کوڕی (وَلِيْد) (خوای لێ ڕازی بێت) سکاڵای بردۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە تووشی خەولێنەکەوتن بووە. ئەویش پێی فەرموە: ئەگەر چوویتە سەر جێگەی خەوتن، بڵێ: «اللّهُمَّ، رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظَلَّتْ، وَرَبَّ الْأَرَضِيْنَ وَمَا أَقَلَّتْ،

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٤٩ / بە ژمارە: ٧٤٩. حەدیسێکی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١١٠ – ١١١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٤٨ – ٣٤٩ / بە ژمارە: ٧٤٨.

وَرَبَّ الشَّيَاطِيْنِ وَمَا أَضَلَّتْ، كُنْ لِيْ جَاراً مِنْ شَرِّ خَلْقِكَ كُلِّهِمْ جَمِيْعاً، أنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أحَدٌ مِنْهُمْ، أو أنْ يَبْغِيَ عَلَيَّ، عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ، وَلا إلـهَ غَيْـرُكَ، وَلا إلـهَ إلاَّ أنْتَ».[1] واته: "خوایه، ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانو ئەوەش لەژێر سایەو سێبەری ئەواندایە، ئەی پەروەردگاری چینەکانی زەوی‌و، ئەوەش ئەوان هەڵیان گرتوە، ئەی پەروەردگاری شەیتانەکانو، ئەوەش ئەوان گومڕایان کردوە، تۆ ببە بە پەناو پارێزەرم لە خراپەی هەموو دروستکراوەکانت، نەوەکو هیچکامیان بیانەوێت ئازارم بدەنو زیانم پێ بگەیەنن، یان ستەمم لێ بکەن. بەڕاستی ئەو کەسەی لەپەنای تۆدایە بەڕێزو بەهێزەو، ستایشی تۆش زۆر کارێکی گەورەو مەزنەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە، بێجگە لە تۆ".

## ئەگەر کەسێك لەکاتی خەوتندا تووشی ترس دەبوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە زانای پایەبەرز (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَيْب)ەوە، ئەویش لە باوکی خۆیەوە، باوکیشی لە باپیرەی خۆیەوە {کە بریتیە لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص) (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێت)}، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بۆ نەهێشتنی ترس ئەم وشانەی فێر دەکردن: «أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِيْنِ، وأنْ يَحْضُرُوْنِ». واتە: "پەنا دەگرم بە فەرمایشتو سیفەتە تەواوەکانی خوای گەورە لە خەشمو تووڕەیی خۆی‌و، لە شەڕو خراپەی بەندەکانی‌و، لە وەسوەسەو خەیاڵاتی شەیتانەکانو، لەوەش کە لەلامدا ئامادەبن".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٨ / بە ژمارە: ٣٥٢٣.

(عَمْرو) فەرموویەتی: هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو) ئەم وشانەی فێری منداڵە فامدارو ژیرەکانی خۆی دەکردو، ئەوانەش کە فامیان نەبوو، دەینووسیو، هەڵیدەواسی پێیاندا.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

لە ڕیوایەتەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا هاتوە، کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، سکاڵای ئەوەی کرد، کە لە خەویدا تووشی ترس دەبێت. پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەگەر چوویتە سەر جێگەی خەوتن، بڵێ: «أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ، وَمِنْ شَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِيْنِ، وأنْ يَحْضُرُوْنِ». جا پیاوەکەش وتیو، ئیتر ترسەکەی نەما.[2]

## ئەگەر کەسێك خەوێکی بینی، کە پێی خۆش بوو، یان پێی ناخۆش بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أبُوْ سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إذَا رَأى أحَدُكُمْ رُؤْيا يُحِبُّهَا، فإنَّمَا هِيَ مِنَ اللهِ تَعَالَى، فَلْيَحْمَدِ اللهَ تَعَالَى عَلَيْهَا، وَلْيُحَدِّثْ بِهَا».[3] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە: «فَلا يُحَدِّثْ بِهَا إلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإذَا رَأى غَيْرَ ذلِكَ، مِمَّا يَكْرَهُ، فإنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠٥ / بە ژمارە: ٣٨٩٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٤١ / بە ژمارە: ٣٥٢٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٢ / بە ژمارە: ٦٣٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٥٦٣ / بە ژمارە: ٦٥٨٤.

فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا، وَلا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ، فَإِنَّهَا لا تَضُرُّهُ». [1] واته: "ئەگەر یەكێك لە ئێوە خەوێكی بینی، كە پێی خۆشبوو، ئەوە بزانێت كە لە خوای گەورەوەیە، بۆیە با سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكات لەسەری‌و، با بیشیگێڕێتەوە (یان با تەنها بۆ ئەو كەسەی بگێڕێتەوە، كە خۆشی دەوێت). خۆ ئەگەر خەوێكی تری بینی، لەو جۆرە خەوانەی كە پێی ناخۆشەو حەزیان لێ ناكات، ئەوە با بزانێت، كە لە شەیتانەوەیە، بۆیە با پەنا بگرێت بەخوای گەورە لە شەڕو زیانی ئەو خەوەو، با بۆ كەسیشی نەگێڕێتەوە، ئیتر ئەو خەوە زیانی پێ ناگەیەنێت".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ قَتَادَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ (وَفِيْ رِوَايَةٍ: الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ) مِنَ اللّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى شَيْئاً يَكْرَهُهُ، فَلْيَنْفُثْ عَنْ شِمَالِهِ ثَلاثاً، وَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا لا تَضُرُّهُ». [2] واتە: "خەوی باش لە خواوەیەو، خەوی خراپو خەیالاّتی پڕوپووچیش لە شەیتانەوەیە. جا ئەو كەسەی خەوێكی بینی‌و، پێی ناخۆشبوو، با سێ جار تف بكات بەلای چەپیداو، با پەناش بەخوا بگرێت لە شەیتان، ئیتر ئەو خەوە زیانی پێ ناگەیەنێت".

لە ڕیوایەتێكیشدا لە بریتی ڕستەی (فَلْيَنْفُثْ) ڕستەی (فَلْيَبْصُقْ) هاتوە. واش دەردەكەوێت، كە مەبەست بە (نَفْث): فوویەكی هێواشە، كە پرشی لیكی لەگەڵدا نەبێت.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٥٨٢ / بە ژمارە: ٦٦٣٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٩ / بە ژمارە: ٥٤١٥، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٧٢ / بە ژمارە: ٢٢٦١.

که فەرموویـەتی: «إِذَا رَأى أحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثاً، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاثاً، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِيْ كَانَ عَلَيْهِ».(١) واته: "ئەگەر یـەکێك لە ئێوە خەوێکی بینیو، پێی ناخۆشبوو، با سێ جار تف بکات بەلای چەپیداو، سـێ جاریش پەنا بەخوا بگرێت لە شەیتانو، با خۆیشی هەڵسـوڕێنێت لـەو لاتەنیشـتەی کە لەکاتی خەوەکەیدا لەسەری بوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش حەدیسێکی لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە ڕیوایەت کردوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «إِذَا رَأى أحَدُكُمْ رُؤْيَا يَكْرَهُهَا، فَلا يُحَدِّثْ بِهَا أحَداً، وَلْـيَقُمْ، فَلْيُصَـلِّ».(٢) واتـە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەوێکی بینیو، پێی ناخۆشبوو، با بـۆ کەسـی نەگێڕێتـەوە، بەڵکو با هەستێتو نوێژ بکات".

هەروەها ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شـێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، کـە پێغەمبـەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا رَأى أحَدُكُمْ رُؤْيَا يَكْرَهُهَا، فَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ لْيَقُلْ: "اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أعُوْذُ بِكَ مِنْ عَمَـلِ الشَّـيْطَانِ وَسَـيِّئَاتِ الْأحْلامِ"؛ فَإِنَّهَا لاَ تَكُوْنُ شَيْئاً».(٣) واته: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەوێکی بینیو، پێی ناخۆشبوو، با سێ جار تف بکات بەلای چەپیداو، پاشان بڵێت: (خوایە من پەنا بەتۆ

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٧٢ / بە ژمارە: ٢٢٦٢.

(٢) بڕوانـە: سُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٤ / ٥٤١ / بـە ژمـارە: ٢٢٩١. وەکـو شـێخی عەسـقەلانیش فەرموویەتی: سەیرە ئیمامی نەوەوی ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ـەوە هێناوەو، لەگەڵ ئەوەشدا حەدیسەکە لە صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا هـاتوە. بڕوانـە: صَـحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٥٧٤ / بە ژمـارە: ٦٦١٤، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٤ / ١٧٧٣ / بـە ژمـارە: ٢٢٦٣.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٦٠ – ٣٦١ / بـە ژمـارە: ٧٧٠. حەدیسـێکی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدایە، سەرەڕای ئـەوەی کـە ڕشـتەکەی بچڕانیشی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٣ / ١٢٨.

دەگرم لە کارو کردەوەی شەیتانو لە خەوی خراپ)، ئیتر خەوەکەی هیچ نیەو، زیانی پێ ناگەیەنێت".

## ئەگەر کەسێك خەونێکی بۆ گێڕایتەوە چی پێ دەڵێیت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، کە کەسێك عەرزی پێغەمبەری خوای کردوە: (قوربان خەونێکم بینیوە). ئەویش (درودی خوای لەسەر بێت) پێی فەرمووە: «خَيْراً رَأَيْتَ، وَخَيْراً يَكُـوْنُ».[1] واتە: "خەیرت بینیوەو، خەیریش دەبێت".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە[2]: «خَيْراً (خَيْرٌ) تَلْقَاهُ، وَشَرّاً (وَشَرٌّ) تَوَقَّاهُ، خَيْراً (خَيْرٌ) لَنَا، وَشَرّاً (وَشَرٌّ) عَلَى أعْدَائِنَا (لِأعْدَائِنَا)، وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ».[3] واتە: "بە خەیر دەگەیتو خەیرت دێتە ڕێگەو، لە شەڕیش دوورو پارێزراو دەبیت، خەیر بێت بۆ ئێمەو، شەڕ بێت بۆ دوژمنەکانمان، سوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری عالەم". خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٦٢ / بە ژمارە: ٧٧٣. حەدیسێکی زۆر لاوازە. چونکە کەسێکی زۆر لاواز لە ڕشتەکەیدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٣ / ١٣٠.

(٢) لەم فەرمایشتەی ئیمامی نەوەویەوە وا وەردەگیرێت، کە ئەم دوو حەدیسە هەر یەك حەدیسنو، ڕاویەکانیان جیاوازە. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە دوو حەدیسی جیاوازن.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٦١ - ٣٦٢ / بە ژمارە: ٧٧٢. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٣ / ١٣١ - ١٣٢.

## باسی هەڵسان لەسەر نزاو پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون کردن لە نیوەی دوەمی هەموو شەوێکدا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «يَنْزِلُ رَبُّنَا كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِيْنَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، فَيَقُوْلُ: مَنْ يَدْعُوْنِيْ، فَأَسْتَجِيْبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِيْ، فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِيْ، فَأَغْفِرَ لَهُ؟».(١) واتە: "پەروەردگارمان هەموو شەوێك، لە سێیەکی کۆتایی شەودا دادەبەزێت بۆ نزیکترین ئاسمان لە زەویەوە -دابەزینەکەشی تەنها خۆی دەزانێت چۆنەو، بەجۆرێکە کە شایستەی زاتی پاکی بێوێنەی ئەوە-، جا دەفەرموێت: (کێ لێم دەپاڕێتەوە، تا پاڕانەوەکەی گیرا بکەم؟ کێ داوای شتێکم لێ دەکات، تا بیدەمێ؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات، تا لێی خۆش ببم؟)".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا بەم جۆرە هاتوە: «يَنْزِلُ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ، حِيْنَ يَمْضِيْ ثُلُثُ اللَّيْلِ الْأَوَّلُ، فَيَقُوْلُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَنَا الْمَلِكُ، مَنْ ذَا الَّذِيْ يَدْعُوْنِيْ، فَأَسْتَجِيْبَ لَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِيْ يَسْأَلُنِيْ، فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِيْ يَسْتَغْفِرُنِيْ، فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلا يَزَالُ كَذَلِكَ، حَتَّى يُضِيْءَ الْفَجْرُ».(٢) واتە: "خوای پاكو بێگەرد هەموو شەوێك، لەدوای تێپەڕینی سێیەکی یەکەمی شەو دادەبەزێت بۆ نزیکترین ئاسمان لە زەویەوە، جا دەفەرموێت: (من پاشام، من پاشام، ئەوە کێیە لێم دەپاڕێتەوە، تا پاڕانەوەکەی گیرا بکەم؟ ئەوە کێیە داوای شتێکم لێ دەکات، تا بیدەمێ؟ ئەوە کێیە داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات، تا لێی خۆش ببم؟)، ئیتر هەر وا دەفەرموێت، هەتا ڕۆژ دەبێتەوە".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٨٤ / بە ژمارە: ١٠٩٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٢١ / بە ژمارە: ٧٥٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٢٢ / بە ژمارە: ٧٥٨.

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «إِذَا مَضَى شَطْرُ اللَّيْلِ، أَوْ ثُلُثَاهُ».[1] واتە: "ئەگەر نیوەی شەو یان دوو سێیەکی شەو ڕۆیشت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی کوڕی (عَبَسَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَقْرَبُ مَا يَكُوْنُ الرَّبُّ مِنَ الْعَبْدِ فِيْ جَوْفِ اللَّيْلِ الْآخِرِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُوْنَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللهَ تَعَالَى فِيْ تِلْكَ السَّاعَةِ، فَكُنْ». واتە: "نزیکترین کات کە خوای پەروەردگار تێیدا لە بەندەی خۆیەوە نزیک بێت بریتیە لە نیوەی کۆتایی شەو، جا ئەگەر دەتوانیت ببیت بە یەکێك لەو کەسانەی لەو کاتەدا زیکری خوای گەورە دەکەن، هەوڵ بدە ببیت بە یەکێك لەوان".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

## سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لە هەموو ساتەکانی شەودا دوعا بکات و بپاڕێتەوە، بەڵکو ڕێی لەو ساتە بکەوێت، کە دوعای تێدا گیرا دەبێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ فِيْ اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، يَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى خَيْراً مِنَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٢٢ / بە ژمارە: ٧٥٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٠٩ / بە ژمارە: ١٢٧٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٩ / بە ژمارە: ٣٥٧٩.

إِيَّاهُ، وَذٰلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ».[1] واته: "بەڕاستی لە شەودا ساتێك هەیە، هەر موسوڵمانێك لەو ساتەدا داوای خەیرو خۆشیەکی دنیاو دوارۆژ لە خوای گەورە بکات، خوا دەیداتێ. جا ئەو ساتەش لە هەموو شەوێکدایە".

## ناوە جوانەکانی خوای گەورە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِلّٰهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوْهُ بِهَا﴾ [الْأَعْرَاف: ١٨٠]. واته: {خوای گەورە خاوەنی جوانترینی ناوەکانە، دەی ئێوەش بەو ناوانە ناوی ببەنو لێی بپاڕێنەوە}.

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ لِلّٰهِ تَعَالَى تِسْعَةً وَتِسْعِيْنَ اسْماً، مَائَةٌ إِلاَّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا، دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنَّهُ وِتْرٌ، يُحِبُّ الْوِتْرَ. هُوَ: اللّٰهُ الَّذِيْ لا إِلهَ إِلاَّ هُوَ، الرَّحْمَنُ، الرَّحِيمُ، الْمَلِكُ، الْقُدُّوسُ، السَّلامُ، الْمُؤْمِنُ، الْمُهَيْمِنُ، الْعَزِيزُ، الْجَبَّارُ، الْمُتَكَبِّرُ، الْخالِقُ، الْبارىءُ، الْمُصَوِّرُ، الْغَفَّارُ، الْقَهَّارُ، الْوَهَّابُ، الرَّزَّاقُ، الْفَتَّاحُ، الْعَلِيمُ، الْقَابِضُ، الْباسِطُ، الْخَافِضُ، الرَّافِعُ، الْمُعِزُّ، الْمُذِلُّ، السَّمِيعُ، الْبَصِيرُ، الْحَكَمُ، الْعَدْلُ، اللَّطِيفُ، الْخَبِيرُ، الْحَلِيمُ، الْعَظِيمُ، الْغَفُورُ، الشَّكُورُ، الْعَلِيُّ، الْكَبِيرُ، الْحَفِيْظُ، الْمُغِيثُ، الْحَسِيبُ، الْجَلِيلُ، الْكَرِيمُ، الرَّقِيبُ، الْمُجِيبُ، الْوَاسِعُ، الْحَكِيمُ، الْوَدُودُ، الْمَجِيدُ، الْباعِثُ، الشَّهِيدُ، الْحَقُّ، الْوَكِيلُ، الْقَوِيُّ، الْمَتِينُ، الْوَلِيُّ، الْحَمِيدُ، الْمُحْصِي، الْمُبْدِىءُ، الْمُعِيدُ، الْمُحْيِي، الْمُمِيتُ، الْحَيُّ، الْقَيُّومُ، الْوَاجِدُ، الْمَاجِدُ، الْوَاحِدُ، الصَّمَدُ، الْقَادِرُ، الْمُقْتَدِرُ، الْمُقَدِّمُ، الْمُؤَخِّرُ، الْأَوَّلُ، الْآخِرُ، الظَّاهِرُ، الْبَاطِنُ، الْوَالِي، الْمُتَعال، الْبَرُّ، التَّوَّابُ، الْمُنْتَقِمُ، الْعَفُوُّ، الرَّؤُوف، مالِكُ الْمُلْكِ، ذُو الْجَلالِ وَالْإِكْرَامِ، الْمُقْسِطُ، الْجامِعُ، الْغَنِيُّ، الْمُغْنِي، الْمَانِعُ، الضَّار، النَّافِعُ، النُّورُ، الْهَادِي، الْبَدِيعُ، الْباقِي،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٢١ / بە ژمارە: ٧٥٧.

الْوَارِثُ، الرَشِيدُ، الصَّبُورُ». واته: "خوای گەورە نەوەدونۆ (٩٩) ناوی هەیە، سەد بێجگە یەك، ئەو کەسەی لەبەریان بکات، دەچێتە بەهەشتەوە. بەڕاستی خوای گەورە تاكو تەنهایەو، شتی تاکیشی خۆش دەوێت. ناوەکانیش ئەمانە: (الرَّحْمَن........... الصَّبُور)".

ئەم حەدیسە ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە، هەتا دەگاتە فەرمایشتی (يُحِبُّ الْوِتْرَ).[1] لەوەش بەدواوە حەدیسێکی (حَسَـن)ـە، ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردوە.[2]

لە هەندێك ڕێگەوە لە بریتی ناوی (الْمُغِيْث) ناوی (الْمُقِيْت) ڕیوایەت کراوە.

لە هەندێك ڕێگەشەوە لە بریتی ناوی (الرَّقِيْب) ناوی (الْقَرِيْب) ڕیوایەت کراوە.

لە هەندێك ڕێگەشەوە لە بریتی ناوی (الْمَتِيْن) ناوی (الْمُبِيْن) ڕیوایەت کراوە. بەڵام مەشهوورەکەیان بریتیە لە (الْمَتِيْن).

ڕستەی (أَحْصَاهَا) بەمانای (حَفِظَهَا) دێت. واتە: (هەر کەسێك لەبەریان بکات (دەچێتە بەهەشتەوە). ئیمامی بوخاریو زۆرێکیش لە زانایان بەم جۆرە ڕاڤەیان کردوەو لێکیانداوەتەوە. ڕیوایەتێکیش لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە پشتگیری ئەم لێکدانەوەیە دەکات. ڕیوایەتەکەش ئەمەیە: «مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ».[3]

وتراویشە: بەمانای ئەوە دێت، کە هەر کەسێك ماناکانیان بزانێتو، باوەڕیشی پێیان هەبێت (دەچێتە بەهەشتەوە).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٥٤ / بە ژمارە: ٦٠٤٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٣ / بە ژمارە: ٢٦٧٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٠ / بە ژمارە: ٣٥٠٧، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ١٠ / ٢٧ / بە ژمارە: ١٩٦٠٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٢ / بە ژمارە: ٢٦٧٧.

وتراویشه: بەمانای ئەوە دێت، کـە هـەر کەسـێك بتوانێـت بـەجوانی ڕەچـاوی ماناکانیان بکاتو، خۆیشی بڕازێنێتەوە بە کار کردن بە مانـای ئەوانـەیان، کـە لـە توانایدا هەیە (دەچێتە بەهەشتەوە). خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

بزانە، کە قورئان خوێندن لە هەموو زیکرەکانی تر باشترە. جا ئەوەی گرنگو مەبەستە، ئەوەیە کە بە تێگەیشتنو تێڕامانەوە بخوێنرێت.

ئەوجا خوێندنی قورئانیش ئادابو مەبەستی تایبەتی خۆی هەیەو، منیش بەر لە نووسینی ئەم کتێبە، کتێبێکی کورتو پوختم سەبارەت بەو ئادابو مەبەستانە داناوە {بەناوی: (التِّبْيَان فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)}، کە داگرەوەیە بەسەر چەندین ئادابی بەنرخی کەسی قورئانخوێنو خودی قورئان خوێندنو، صیفاتەکانیو، ئەوەش پەیوەندی پێیەوە هەیە، لەو زانیاریانەی، کە جوان نیەو ناپەسەندە کەسی قورئانخوێن ئاگای لێیان نەبێت.

وا لەم کتێبەشدا بە کورتی ئاماژە بە هەندێك لەو مەبەستانە دەکەمو، جێگەی باسکردنیشیانم پێشانی ئەو کەسە داوە، کە دەیەوێت بە وردی ئاگای لێیان بێت. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## باسێك: {خوێندنەوەی قورئان بە بەردەوامی}

پێویستە مرۆڤی موسوڵمان بەردەوام قورئان بخوێنێت، چی بە شەوو چی بە ڕۆژ، چی لە سەفەرداو چی لەماڵەوە.

موسوڵمانانی (سَلَف)یش (خوایان لێ ڕازی بێت) عادەتی جیاوازیان هەبوە سەبارەت بەو ماوەیەی، کە قورئانی پیرۆزیان تێیدا خەتم کردوە:

- هەندێکیان دوو مانگ جارێك خەتمەیەکیان دەکرد.
- هەندێکیشیان مانگی جارێك.
- هەندێکیشیان دە شەو جارێك.
- هەندێکیشیان هەشت شەو جارێك.

- هەندێکیشیان حەوت شەو جارێك -کە زۆربەی زۆریان بەم جۆرەیان دەکرد-.
- هەندێکیشیان شەش شەو جارێك.
- هەندێکیشیان پێنج شەو جارێك.
- هەندێکیشیان چوار شەو جارێك.
- زۆرێکیشیان سێ شەو جارێك.
- هەندێکیشیان شەوو ڕۆژێك جارێك.
- کۆمەڵێکیشیان شەوو ڕۆژێك دوو جار.
- هەندێکیشیان شەوو ڕۆژێك سێ جار.
- هەندێکیشیان شەوو ڕۆژێك هەشت جار، چواریان لە شەوداو، چواریشیان لە ڕۆژدا.

جا یەکێك لەو زانایانەی کە لە شەودا چوار خەتمی کردوەو، لە ڕۆژیشدا چوار، بریتیە لە خواناسی پایەبەرز {(ابْنُ الْكَاتِب)ی (صُوْفِيّ)، کە ناوی (حَسَـن)ی کوڕی (أحْمَد)ەو، کونیەکەشی (أَبُوْ عَلِيّ)ـە} (خوای لێ ڕازی بێت). ئەمەش زۆرترین خەتمەیە، کە لە شەوو ڕۆژێکدا کرابێتو، بە ئێمەش گەیشتبێت.

خواناسی پایەبەرز {(أَحْمَد)ی کوڕی (إِبْرَاهِيْم)ی (دَوْرَقِيّ)} بە ڕشتەی خۆی ڕیوایەتی کردوە، لە خواناسی پایەبەرزی شوێنکەوتوان (مَنْصُوْر)ی کوڕی (زَاذَان)ـەوە، کە ئەو لە نێوان نیوەڕۆو عەسردا خەتمەیەکی دەکردو، لە نێوان مەغریبو عیشاشدا خەتمەیەکی دەکردو، لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیشدا لە نێوان مەغریبو عیشادا دوو خەتمەو تۆزێکی دەکردو، عادەتیشی وەهابوو، کە لە مانگی ڕەمەزاندا نوێژی عیشای دوادەخست، تا چواریەکی شەو تێدەپەڕی.

زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ دَاوُد) بە ڕشتەی (صَحِيْح)ی خۆی ڕیوایەتی کردوە، کە زانای پایەبەرز (مُجَاهِد)ی کوڕی (جَبْر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە مانگی ڕەمەزاندا، لە نێوان مەغریبو عیشادا قورئانی خەتم دەکرد.

سەبارەت بەو کەسانەش، کە لە یەك ڕکات نوێژدا قورئانیان خەتم کردوە، ئەوە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن. لەوانە:

- ئیمامی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَفَّان) (خوای لێ ڕازی بێت).
- هاوەڵی خۆشەویست (تَمِیْم)ی (دَارِيّ) (خوای لێ ڕازی بێت).
- زاناو پێشەوای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (سَعِیْد)ی کوڕی (جُبَیْر) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

جا بۆچوونی هەڵبژێردراو لەم مەسەلەدا ئەوەیە، کە مەسەلەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە:

هەر کەسێك بەهۆی تێفکرینی وردەوە بتوانێت زانیاریو وردەکاریەکانی ناو قورئانی پیرۆزی بۆ دەربکەوێت، ئەوا با تەنها ئەوەندە بخوێنێت، کە توانای بەتەواوەتی لێتێگەیشتنی هەبێت.

بە هەمان شێوە هەر کەسێکیش، کە سەرقاڵ بێت بە بڵاو کردنەوەی زانستو زانیاریەوە، یان سەرقاڵ بێت بە یەکلایی کردنەوەی کێشەی نێوان موسوڵمانانەوە، یان سەرقاڵ بێت بە هەر شتێکی ترەوە، کە گرنگیو بایەخی دینی هەبێت، یان بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانانی تێدابێت، ئەویش با تەنها ئەوەندە بخوێنێت، کە بەهۆیەوە کەموکورتی نەکەوێتە ڕاپەڕاندنی کارەکەیەوە، بەجۆرێك کە نەتوانێت بە تەواوەتی جێبەجێی بکات.

بەڵام بێجگە لەمانەی باسمان کردن، هەر کەسێکی تر چەندە لەتوانایدا هەبێت با قورئان زۆر بخوێنێت، بە مەرجێك لەو ئاستە دەرنەچێت، کە خۆی تووشی

ماندووبوون‌و شه‌كه‌تی بكات، یان به‌ مه‌رجێك ئایه‌ته‌كانی قورئان زۆر به‌ په‌له‌و به‌ ناڕوونی نه‌خوێنێته‌وه‌.

كۆمه‌ڵێكیش له‌ زانایانی (مُتَقَدِّمِيْن) به‌ ناپه‌سه‌ندیان زانیوه‌، كه‌ قورئان له‌ شه‌وو ڕۆژێكدا خه‌تم بكرێت. به‌ڵگه‌ش له‌سه‌ر ئه‌م بۆچوونه‌ی ئه‌وان بریتیه‌ له‌و حه‌دیسه‌ی، كه‌ له‌ (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و له‌ غه‌یری ئه‌وانیشدا، به‌ چه‌ند ڕشته‌یه‌كی (صَحِيْح) بۆمان ڕیوایه‌ت كراوه‌، له‌ هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (عَبْدُاللّه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـه‌وه‌ (خوا له‌ خۆی‌و باوكیشی ڕازی بێت)، كه‌ فه‌رموویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویه‌تی: «لاَ يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِيْ أَقَلَّ مِنْ ثَلاثٍ».[1] واته‌: "ئه‌و كه‌سه‌ی ته‌واوی قورئان له‌ كه‌متر له‌ سێ شه‌وو ڕۆژدا بخوێنێت، به‌ باشی‌و وه‌كو پێویست لێی تێناگات".

سه‌باره‌ت به‌ كاتی ده‌ست پێكردن‌و خه‌تم كردنی قورئانیش، ئه‌وه‌ كه‌سی قورئانخوێن خۆی سه‌رپشكه‌ تێیدا.

جا ئه‌گه‌ر له‌و كه‌سانه‌ بوو، كه‌ له‌ هه‌فتیه‌كدا یه‌ك خه‌تمه‌ی ده‌كرد، ئه‌وه‌ ئیمامی (عُثْمَان) (خوای لێ ڕازی بێت) له‌ شه‌وی جومعه‌دا ده‌ستی پێده‌كردو، له‌ شه‌وی پێنج شه‌ممه‌شدا خه‌تمی ده‌كرد.

پێشه‌وای پایه‌به‌رز (أَبو حَامِد)ی (غَزَالِيّ) له‌ كتێبی (إِحْيَاءُ عُلُوْمِ الدِّيْن)دا فه‌رموویه‌تی: باشتر وایه‌ ئه‌و كه‌سه‌ی هه‌فتانه‌ خه‌تم ده‌كات له‌ شه‌ودا خه‌تمه‌یه‌ك بكات‌و، له‌ ڕۆژیشدا خه‌تمه‌یه‌ك بكات‌و، خه‌تمه‌كه‌ی ڕۆژیشی له‌ ڕۆژی دووشه‌ممه‌دا بێت، له‌ ناو دوو ڕكاته‌ سونه‌ته‌كه‌ی پێش نوێژی به‌یانیدا، یان له‌دوای ئه‌وانه‌وه‌. خه‌تمه‌كه‌ی شه‌ویشی له‌ شه‌وی جومعه‌دا بێت، له‌ ناو دوو ڕكاته‌ سونه‌ته‌كه‌ی دوای

---

(١) بڕوانه‌: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١/ ٤٤٣ / به‌ ژماره‌: ١٣٩٤، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٩٨ / به‌ ژماره‌: ٢٩٤٩، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٥ / ٢٥ / به‌ ژماره‌: ٨٠٦٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٢٨ / به‌ ژماره‌: ١٣٤٧.

نوێژی مەغریبدا، یان لەدوای ئەوانەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی کە خەتمەکانی لە سەرەتاو لە کۆتایی ڕۆژەوە بێت.

زانای پایەبەرز (ابْـنُ أبِـيْ دَاوُد) ڕیوایەتی کردوە، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (عَمْرو)ی کوڕی (مُرَّة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەوان پێیان خۆش بوو، کە قورئان لە سەرەتای شەو، یان لە سەرەتای ڕۆژەوە خەتم بکرێت.

هەروەها (ابْنُ أبِيْ دَاوُد) ڕیوایەتی کردوە لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (طَلْحَة)ی کوڕی (مُصَرِّف)ـەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك لە هەر کاتێکی ڕۆژدا قورئان خەتم بکات، فریشتەکان تا ئێوارە صەلاواتی لەسەر دەدەن‌و، لە هەر کاتێکی شەویشدا قورئان خەتم بکات، فریشتەکان تا بەیانی صەلاواتی لەسەر دەدەن.

هەروەها (ابْنُ أبِـيْ دَاوُد) فەرمایشتێکی لەم جۆرەشی لە زانای پایەبەرز (مُجَاهِد)ەوە ڕیوایەت کردوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ەکەی پێشەوای پایەبەرز (أَبُـو مُحَمَّـد)ی (دَارِمِيّ)دا -کە کۆدەنگی هەیە لەسەر پایەبەرزی‌و بیرتیژی‌و لێهاتوویەکەی- ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أبِيْ وَقَّـاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر وا ڕێك بکەوێت، کە خەتمی قورئان لە سەرەتای شەودا بێت، ئەوە فریشتەکان تا بەیانی صەلاوات لەسەر قورئانخوێنەکە دەدەن‌و، ئەگەر لە کۆتایی شەویشدا بێت، ئەوە تا ئێوارە صەلاواتی لەسەر دەدەن.

ئیمامی (دَارِمِيّ) فەرموویەتی: ئەم فەرمایشتەی (سَعْد) فەرمایشتێکی (حَسَن)ـە.[1]

## ئەو کاتانەی بۆ قورئان خوێندن پەسەندن

بزانە، کە باشترین قورئان خوێندن ئەوەیە، کە لەناو نوێژدا بێت‌و، مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)و زانایانی تریش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ئەوەیە، کە درێژ کردنەوەی ڕاوەستانی ناو نوێژ بە قورئان خوێندن لە درێژ کردنەوەی سەجدەو ڕوکنەکانی تر باشترە.

سەبارەت بە قورئان خوێندن لە غەیری نوێژیشدا، باشترینیان ئەوەیە کە لە شەودا بێت‌و، نیوەی دوەمی شەویش لە نیوەی یەکەمی باشترەو، قورئان خوێندنیش لە نێوان مەغریب‌و عیشاشدا زۆر پەسەندە.

سەبارەت بە قورئان خوێندنیش لە ڕۆژدا، باشترینیان ئەوەیە کە لەدوای نوێژی بەیانی بێت.

هیچ ناپەسەندیەکیشی تێدا نیە، کە قورئان لە هەر کاتێك لە کاتەکاندا بخوێنرێت، باوەکو ئەو کاتانەش بێت، کە نەهی کراوە لەوەی نوێژیان تێدا بکرێت (وەکو دوای عەسر).

سەبارەت بەوەش، کە زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ دَاوُد) گێڕاویتیەوە لە (مُعَان)ی[1] کوڕی (رِفَاعَة)وە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، ئەویش لە کۆمەڵێك لە مامۆستاکانی

(١) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٥٦١ / بە ژمارە: ٣٤٨٣. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: کەسی لاواز لە ڕشتەی ئەم حەدیسەدا هەیە. جا ڕەنگە ئیمامی (دَارِمِيّ) بەهۆی پاڵپشتی کردنی فەرمایشتەکانی پێشترەوە بە (حَسَن)ی دانابێت، یان مەبەستی ئەوە بێت کە فەرمایشتەکە فەرمایشتێکی (حَسَن)و جوانە، نەك (حَسَن)بێت وەکو زاراوە، کە جۆرێکە لە دوو جۆرەکەی حەدیسی پەسەندو پێوەرگیراو. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٦٩.

خۆیەوە، کە ئەوان بەناپەسەندیان داناوە لەدوای عەسرەوە قورئان بخوێنرێتو، فەرمووشیانە: "جولەکەکان لەو کاتەدا خەریکی دەورو دەرس دەبن" ئەوە بۆچوونێکی قبوڵکراو نیەو، هیچ ئەصڵێکیشی نیە!

لە ڕۆژەکانیشدا ئەمانەیان پەسەندو هەڵبژێردراون بۆ قورئان خوێندن: جومعەو، دوو شەممەو، پێنج شەممەو، ڕۆژی عەرەفەو، لە دە ڕۆژەکانیشدا: دە ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذُوْ الْحِجَّة)و، دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزانو، لە مانگەکانیشدا: مانگی ڕەمەزان.

## ئادابەکانی خەتمی قورئانو، ئەوەش پەیوەندی بە خەتمەوە هەیە

پێشتر باسمان کرد، کە ئەگەر کەسێك ویستی خۆی بە تەنها خەتمی قورئان بکات، سونەتە لەناو نوێژدا خەتمی بکات.

سەبارەت بەو کەسەش، کە دەیەوێت لە غەیری نوێژدا خەتم بکات، وەکو ئەو کۆمەڵە کەسەی، کە بەیەکەوە خەتم دەکەن، ئەوە سونەتە لە سەرەتای ڕۆژدا، یان لەسەرەتای شەودا خەتمەکەیان بکەن. وەکو پێشتر باسمان کرد.

---

(١) لە زۆرێك لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکاندا نوسراوە (مُعَاذ)، بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە کە ئێمە نوسیومانە، چونکە شێخی عەسقەلانیش هەر وای فەرموە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٦٩.

ئەوجا ڕاستە کە کەسێك هەیە بەناوی (مُعَاذ)ی کوڕی (رِفَاعَة)وە، بەڵام ئەمە کەسێکی ترەو، جیاوازە لەوەی کە (ابْنُ أبِيْ دَاوُد) بۆچوونەکەی لێوە نقلّ کردوە. چونکە (مُعَاذ) یەکێکە لە شوێنکەوتوانو، خەڵکی شاری (مَدِيْنَة)ی پیرۆزە. بەڵام (مُعَان) یەکێکە لە شوێنکەوتووی شوێنکەوتوانو، خەڵکی شاری (دِمَشْق)ـە. جا بۆ ناسینی هەردووکیانو جیاکردنەوەیان لە یەکتری، بڕوانە: تَلْخِيْصُ الْمُتَشَابِهِ فِي الرَّسْم (الْخَطِيْب الْبَغْدَادِيّ) تَحْقِيْق: سُكَيْنَة الشِّهَابِيّ / ٢ / ٧٨٤ – ٧٨٥.

سونەتیشە لە ڕۆژی خەتمەکەدا قورئانخوێنەکە بەڕۆژوو بێت، مەگەر وا ڕێک بکەوێت، کە شەرع نەهی کردبێت لە ڕۆژوو گرتن لەو ڕۆژەدا.

جا بە صەحیحی هاتوە لە هەر سێ زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوانی شاری کووفە: (طَلْحَة)ی کوڕی (مُصَرِّف)و، (مُسَيَّب)ی کوڕی (رَافِع)و، (حَبِيب)ی کوڕی (أَبو ثَابِت)، کە هەر سێکەیان ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوون، کە خەتمەکەیان تێدا دەکرد.

سونەتیشە هەم کەسی قورئانزانو هەم کەسانی تریش لە کۆڕی خەتمی قورئاندا ئامادە بن.

جا بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمانی کردوە بەو ئافرەتانەی لە سووڕی مانگانەدا بوون، کە ڕۆژی جەژن بێنە دەرەوە، تا ئامادەی خەیرو دوعای موسوڵمانان بن.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (دَارِمِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، کە ئەو پیاوێکی دادەنا، تا چاودێری کەسێکی بۆ بکات، کە خەریکی قورئان خوێندن بوو. جا کە قورئانخوێنەکە بیویستایە خەتمی بکردایە، پیاوەکە (ابْنُ عَبَّاس)ی ئاگادار دەکردەوەو، ئەویش تەشریفی دەهێناو، ئامادەی خەتم کردنەکە دەبوو.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٢٣ / بە ژمارە: ٣١٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٠٦ / بە ژمارە: ٨٩٠.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٥٥٩ / بە ژمارە: ٣٤٧٢. ڕشتەکەی لاوازە. چونکە کەسێکی لاوازی تێدایەو، بچڕانیشی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٧٢.

زانای پایەبەرز (ابْنُ أبِيْ دَاوُد)یش بە دوو ڕشتەی (صَحِيْح) ڕیوایەتی کردوە، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (قَتَادة)وە -کە یەکێك بوە لە قوتابیەکانی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس) (خوای لێ ڕازی بێت)- ئەو فەرموویەتی: ئەگەر هاوەڵی خۆشەویست (أنَس)ی کوڕی (مَالِك) (خوای لێ ڕازی بێت) قورئانی خەتم بکردایە، خێزانو منداڵەکانی کۆدەکردەوەو، دەستی دەکرد بە دوعا کردن.

هەروەها (ابْنُ أبِيْ دَاوُد) بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح) ڕیوایەتی کردوە، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (حَكَم)ی کوڕی (عُتَيْبَة)وە، کە فەرموویەتی: هەردوو زانای پایەبەرز (مُجَاهِد)و، (عَبْدَة)ی کوڕی (أَبو لُبَابَة) ناردیان بەشوێنمدا، جا کە هاتم بۆلایان، هەردووکیان فەرموویان: بۆیە ناردوومانە بەشوێنتدا، چونکە دەمانەوێت خەتمی قورئان بکەین‌و، دوعاش لە کاتی خەتمی قورئاندا گیرایە.

هەروەها لە هەندێك لە ڕیوایەتە (صَحِيْح)ـەکانی (ابْنُ أبِيْ دَاوُد)دا هاتوە: کە وتراوە: لەکاتی خوێندنەوەی کۆتایی قورئاندا ڕەحمەت دادەبارێت.

هەروەها (ابْنُ أبِيْ دَاوُد) بە ڕشتەی (صَحِيْح)ی خۆی ڕیوایەتی کردوە، لە زانای پایەبەرز (مُجَاهِد)ەوە، کە فەرموویەتی: زانایان لەکاتی خەتمی قورئاندا کۆدەبوونەوەو، دەیانفەرموو: ڕەحمەت دادەبارێت.

## باسێك: {نزاو پاڕانەوە لەدوای خەتمی قورئانەوە سونەتە}

وەکو پێشتر باسمان کرد، نزاو پاڕانەوە لەکاتی خەتمی قورئاندا زۆر سونەتە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ی ئیمامی (دَارِمِيّ)دا، لە قورئانزانی پایەبەرز (حُمَيْد)ی (أعْرَج)ـەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك قورئان بخوێنێت‌و، پاشان

بپاڕێتەوەو دوعا بکات، چوار هەزار فریشتە (آمِــیْن) لەسـەر نـزاو پاڕانەوەکـەی دەکەن.[1]

جا باشتر وایە کەسی نزاکەر زۆر بە پەرۆشەوە بپاڕێتەوەو، داوای شتی گرنگ‌و بایەخدار بکات‌و، ئەو ڕستەو تەعبیرانەش بەکاربهێنێت کـە داگـرەوەن بـۆ خـەیرو خۆشی دنیاو دوارۆژ.

هەروەها باشتر وایـە زۆربـەی یـان هـەموو نـزاو پاڕانـەوەکانی پەیوەنـدیان بـە دوارۆژو بـــە کاروبـــاری موســـوڵمانان‌و، بـــە چـــاکبوونی دەســـەڵاتدارو فەرمانڕەواکانیانــەوە هــەبێت‌و، خــوای گــەورە موســوڵمانان موەفــەق بکــات بــۆ گوێڕایەڵی فەرمانەکان‌و، بۆ خۆپاراستن لە سەرپێچیەکان‌و، بـۆ هاوکـاری کردنـی یەکتر لەسەر چاکەو لە خوا ترسان‌و، بۆ حەقڕەوی‌و کۆبوونەوەیان لەسەر حـەق‌و ڕاستی‌و، بۆ سەرکەوتنیان بەسەر دوژمنانی ئاین‌و تێکڕای ناحەزەکانیاندا.

منیش لـە کتێبی (التِّبْيَان آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا ئاماژەم کـردوە بـە بەشـێك لـەم زانیاریانەو، چەند نزاو پاڕانەوەیەکی کورتیشم لەوێ باس کردوە. جا هەر کەسـێك دەیەوێت، با لەو کتێبەوە نقلی بکات.

ئەوجا ئەگەر کەسێك لە خەتمەیەك بوویەوە، سونەتە هەر بەدەم ئـەوەوە دەسـت بکات بە خەتمەیەکی تر. چونکە زانایانی (سَلَف) وایان بە باش زانیوەو، بەڵگەشـیان بەو حەدیسـەی هاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَــس) هێناوەتـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «خَيْرُ الْأَعْمَالِ الْحَلُّ وَالرِّحْلَةُ». واتە: "باشترینی کردەوەکان بریتین لە (الْحَلّ)و (الرِّحْلَة)". جـا عـەرزی کـرا: ئـەو

(1) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٥٦٠ / بە ژمارە: ٣٤٨١. ڕشتەکەی لاوازە. چـونکە کەسـی لاوازی تێدایەو، بچڕانیشی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٧٢.

دوانە چین؟ ئەویش فەرمووی: "ئەو دوانە بریتین لە دەست پێکردنو خەتم کردنی قورئانی پیرۆز".[1]

## باسێك: سەبارەت بەو کەسەی کە لە شەودا خەوی لێ دەکەوێت بەرلەوەی بەشە زیکرو بەشە ویردی دیاریکراوی خۆی بخوێنێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ مِنَ اللَّيْلِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرأَهُ مَا بَيْنَ صَلاةِ الْفَجْرِ وَصَلاةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ، كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ».[2] واتە: "ئەو کەسەی خەوی لێکەوتو، بۆی نەکرا تەواوی یان بەشێکی زیکرو ویردە سونەتە دیاریکراوەکانی

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ دَاوُد) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی (بِشْر)ی کوڕی (حُسَيْن)ـەوە ڕیوایەت کردووە، زۆرێك لە زانایانیش (بِشْر)یان بە کەسێکی درۆزنن داناوە. (واتە: دەکرێت بوترێت: حەدیەکەی هەڵبەستوە!!!).

ئەوجا فەرموویەتی: سەیرە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی بەس ئەم حەدیسەی هێناوەتەوەو، فەرمووشێتی: زانایانی (سَلَف) کردوویانە بە بەڵگەو، نەهاتوە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) بهێنێت، کە لەم باسەدا ناسراوەو، یەکێکیش لە شەش فەرموودەناسە بەناوبانگەکە {مەبەستی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ـە} ڕیوایەتی کردووەو، هەندێکیش لە فەرموودەناسان بە (صَحِيْح)یان داناوە!!!

پاشان شێخی عەسقەلانی خۆی حەدیسەکەی (ابْنُ عَبَّاس)ی هێناوەو، فەرموویەتی: عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: "يَا رَسُولَ الله، أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى الله؟" قَالَ: «الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ». قَالَ: "وَمَا الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ؟" قَالَ: «الَّذِيْ يَضْرِبُ مِنْ أَوَّلِ الْقُرْآنِ إِلَى آخِرِهِ، كُلَّمَا حَلَّ ارْتَحَلَ». بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٧٨ - ١٧٩. بۆ دەقی حەدیسەکەش لای ئیمامی (تِرْمِذِيّ) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٩٧ / بە ژمارە: ٢٩٤٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥١٥ / بە ژمارە: ٧٤٧.

شەوانەی خۆی بخوێنێت‌و، دواتر لە نێوان نوێژی بەیانی‌و نوێژی نیوەڕۆدا خوێندیەوە، وەکو ئەوە وەهایە، کە لە شەودا خوێندبێتی".

## باسێك: سەبارەت بە فەرمان كردن بە خوێندنەوەو دەور كردنەوەی قورئان و، هۆشداریدان لە لەبیرچوونەوەی

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، كە فەرموویەتی: «تَعَاهَدُوا هذَا الْقُرْآنَ، فَوَالَّذِيْ نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَهُوَ أَشَدُّ تَفَلُّتاً مِنَ الْإِبِلِ فِيْ عُقُلِهَا».[1] واتە: "بەردەوام خەریكی خوێندنەوەو دەور كردنەوەی قورئانی پیرۆز بن. جا سوێند بەو كەسەی گیانی (مُحَمَّد)ی بەدەستە، ئەو قورئانە زیاترو زووتر لەبیر دەچێتەوەو لەدەست دەردەچێت، لەو حوشترەی كە بە پەت بەستراوەتەوە".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ (صَاحِبِ) الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ: إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا، أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ».[2] واتە: "وێنەی كەسی قورئانخوێن هەروەكو خاوەنی ئەو حوشترە پەتكراوو بەستراوە وەهایە، كە ئەگەر ئاگای لە حوشترەكەی بێت، دەیگرێتو لەدەستی دەرناچێت، ئەگەر بەرەڵاشی بكاتو بەری بدات، دەڕواتو لەدەستی دەردەچێت".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «عُرِضَتْ عَلَيَّ أُجُوْرُ أُمَّتِيْ، حَتَّى الْقَذَاةُ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٩٢١ / بە ژمارە: ٤٧٤٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤٥ / بە ژمارە: ٧٩١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٩٢٠ / بە ژمارە: ٤٧٤٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤٣ / بە ژمارە: ٧٨٩.

يُخْرِجُهَا الرَّجُلُ مِنَ الْمَسْجِدِ، وَعُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوْبُ أُمَّتِي، فَلَمْ أَرَ ذَنْباً أَعْظَمَ مِنْ سُوْرَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ، أُوْتِيَهَا رَجُلٌ، ثُمَّ نَسِيَهَا». واته: "پاداشتی کردەوەکانی ئومەتەکەمم خرایە پێشچاو، هەتا ئەو پیسیو چەپەڵیەش کە پیاوێك لە مزگەوت فڕەی دەداتە دەرەوە. هەروەها تاوانی ئومەتەکەشم خرایە پێشچاو، هیچ تاوانێکم نەبینی لەوە گەورەتر بێت، کە پیاوێك سورەتێك یان ئایەتێکی قورئان فێربووبێتو، پاشان لەبیری چووبێتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرمایشتی لەبارەی ئەم حەدیسەوە هەیە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی ئیمامی (أَبُو دَاوُد)و (مُسْنَد)ی ئیمامی (دَارِمِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١/ ١٧٩ / بە ژمارە: ٤٦١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ١٧٨ / بە ژمارە: ٢٩١٦. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی غەریبەو، واش دەزانین تەنها لەم ڕێگەیەوە هاتوە. ئەوجا فەرموویەتی: لە خزمەتی ئیمامی بوخاریدا ئەم حەدیسەم باس کرد، ئەویش ئاگای لێی نەبوو، بە غەریبیشی داناو، فەرمووی: وا نازانم (مُطَّلِب)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی کوڕی (حَنْطَب) حەدیسی لە هیچکام لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە بیستبێت، تەنها ئەو حەدیسە نەبێت، کە وتوویەتی: "کەسێك بۆی گێڕامەوە کە ئامادەی وتارەکەی پێغەمبەری خوا بووبوو". هەروەها ئیمامی بوخاری فەرمووی: بیستوومە لە {ئیمامی (دَارِمِيّ): (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبْدُالرَّحْمَن)}، کە فەرموویەتی: "وا نازانین (مُطَّلِب) حەدیسی لە هیچکام لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە بیستبێت". هەروەها ئیمامی (دَارِمِيّ) فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيُّ) ئینکاری ئەوەی کردوە، کە (مُطَّلِب) حەدیسی لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس) بیستبێت.

بەڵام شێخ (عَبْدُالْقَادِر)ی (أَرْنَؤُوْط) لە تەحقیقەکەی خۆیدا فەرموویەتی: بەهۆی چەند پاڵپشتێکەوە پلەی حەدیسەکە بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی حەدیسی (حَسَن).

الْقُرْآنَ، ثُمَّ نَسِيَهُ، لَقِيَ اللهَ تَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ أجْذَمَ».[1] واته: "ئەو کەسەی قورئان بە تەماشا کردن یان بە لەبەر بخوێنێتو، پاشان لەبیری بچێتەوە (یان واز لە خوێندن، یان کار پێکردنی بهێنێن)، لە ڕۆژی قیامەتدا بە گولی (یان بە دەست بڕاوی، یان بە دەستی خاڵی، یان بە ددان کەوتوویی) دەگاتەوە خزمەتی خوای گەورە".

## باسێك: سەبارەت بە هەندێك مەسەلەو ئاداب، کە پێویستە قورئانخوێن بایەخیان پێ بدات

ئەو مەسەلەو ئادابانەی کە دەبێت کەسی قورئانخوێن بایەخیان پێ بدات زۆر زۆرن، ئێمەش تەنها هەندێکیان باس دەکەین، بەبێ هێنانی بەڵگەکانیان، چونکە هەم مەشهوورنو، هەم ترسی ئەوەشمان هەیە، کە هێنانی بەڵگەکان باسەکە درێژ بکاتەوەو، ببێت بەهۆی ماندوو کردنی کەسی خوێنەر.

جا یەکەم شتێك کە فەرمان دەکرێت بە کەسی قورئانخوێن، ئەوەیە کە: ئیخلاصو دڵسۆزی هەبێت لە قورئان خوێندنەکەیداو، مەبەستیشی تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، نەوەك گەیشتن بە هیچ شتێکی تر. هەروەها بە ئەدەبەوە لە خزمەتی قورئاندا بێتو، هەمیشە ئەوەی لەبیریدا بێت، کە ئەو لە خزمەت خوای گەورەدا قسە دەکاتو، کتێبەکەی ئەو دەخوێنێتەوە. بۆیە دەبێت لەکاتی قورئان خوێندنەکەدا حاڵی وەکو حاڵی ئەو کەسە وەهابێت، کە خوای گەورە دەبینێتو چاوی لێیەتی. خۆ ئەگەر ئەویش چاوی لە خوا نەبێت، ئەواخوای گەورە هەر ئەو دەبینێتو چاوی لێیەتی.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٥ / ١٤٧٤، وسُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٥٢٩ / بە ژمارە: ٣٣٤٠. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ١٨٨ – ١٩٠.

## باسێك: {حوكمی سیواك كردن لەكاتی خوێندنی قورئاندا}

ئەگەر كەسێك ویستی قورئان بخوێنێت، پێویستە دەمی بە سیواكو بە شتی تر پاك بكاتەوە. جا باشتر وایە سیواكەكە لە داری (أَرَاك) بێت.

هەروەها سیواك كردن بە توولە داری تریش هەر دروستەو، بە ڕوەكی (سُعْد)و، بە ڕوەكی (أُشْنَان)و، بە قوماشی زبرو، بە هەر شتێكی تریش كە پاكەوەكەر بێت.

جا لەوەدا كە ئایا سیواك كردن بە پەنجەی زبر دروستە یان نا؟ ئەوە سێ بۆچوونی هاوەڵانی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەسەرە:

- مەشهورترین بۆچوونیان ئەوەیە، كە بە پەنجەی زبر سیواك ناكرێت.
- دوەم بۆچوونیشیان ئەوەیە، كە پێی دەكرێت.
- سێیەمیشیان ئەوەیە، كە ئەگەر شتی تری دەست نەكەوت، ئەوە پێی دەكرێت. بەڵام ئەگەر شتی تری دەستكەوت، ئەوە پێی ناكرێت.

جا با مرۆڤی موسوڵمان سیواك كردنەكەی بە باری پانی ددانەكانیدا بێتو، سەرەتا بەلای ڕاستی دەمی دەست پێ بكاتو، نیەتی ئەوەشی لێ بهێنێت، كە سونەتێك جێبەجێ دەكات.

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرمویانە: با لەكاتی سیواك كردندا بڵێت: (اللّٰهُمَّ، بَارِكْ لِيْ فِيْهِ، يَا أرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ). واتە: (خوایە بەرەكەت بخەرە ئەم كارەوە بۆم، ئەی بەسۆزترنی بەسۆزەكان).[1]

---

(١) لە كتێبی (الْمَجْمُوْع)دا هاتوە، كە یەكێك لە هاوەڵانمان فەرموویەتی: سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لە سەرەتای سیواك كردنەكەیدا بڵێت: (اللّٰهُمَّ بَيِّضْ بِهِ أَسْنَانِي، وَشُدَّ بِهِ لَثَاتِي، وَثَبِّتْ بِهِ لَهَاتِي، وَبَارِكْ لِي فِيهِ، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ). جا ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: ئەم نزاو

هـەروەها بـا سـیواکەکە بهێنێـت بـە ڕووی دەرەوەو بـە ڕووی نـاوەوەی ددانەکانیـداو، یـا بـە نـەرمیو لەسـەرخۆییش سـیواکەکە بهێنێـت بـە سـەری ددانەکانیداو، بە بنی دانە خڕێکانیداو، بە ئاسمانی دەمیدا.

هەروەها با بە توولێکی مامناوەند سیواك بکات، نە زۆر وشـك بێـتو، نـە زۆر نەرمیش بێت. خۆ ئەگەر زۆر وشك بوویەوە، با بە ئاو نەرمی بکاتەوە.

ئەوجا ئەگەر دەمی بە خوێن یان بە شتێکی تـر پـیس بووبـوو، ئـەوا بەرلـەوەی بیشۆرێت ناپەسـەندە قورئـان بخوێنێـت. بـەڵام ئایـا حەرامـە؟ ئـەوە دوو بۆچـوونی لەسەرە: درووستترینیان ئەوەیە، کە حەرام نیەو، پێشتریش لـە سـەرەتای کتێبەکـەدا باسمان کرد (واتە لـە باسی: **سیفەتی ئەو جێگایەی زیکری تێدا دەکرێت**).

جا ئەم باسـە قسـەی زۆرتریشـی لەسـەرە، کـە لـە باسـەکانی سـەرەتای ئـەم کتێبەکەدا باسمان کردن.

## باسێك: {ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئان}

پێویستە مرۆڤی موسوڵمان بە ملکەچیو کزۆڵیو تێرامانەوە قورئـان بخوێنێـت، چونکە مەبەستەکە هەر ئەمەیەو، بەمەش دڵەکان گوشادو نوورانی دەبن.

جا بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە لەوە زیاترن، کـە بـژمێردرێنو، لـەوەش مەشـهور ترن، کە باس بکرێن.

---

پاڕانەوەیە ئەگەرچی ئەصڵێکیشی نیە، بەڵام هیچ خراپەیەکی تێدا نیەو، دوعایـەکی جوانـە. بڕوانە: الْمَجْمُوْع شَرْحُ الْمُهَذَّب / ١ / ٢٨٣.

لەناو زانایانی (سَلَف)دا کەسی وەهایان تێدا بوە، کە لە تەواوی شەودا، یان لە زۆربەی ساتەکانی شەودا تەنها یەك ئایەتیان خوێندۆتەوەو، لەکاتی خوێندنەوەکەشدا بە وردی بیریان لە ماناکەی کردۆتەوە. هەندێکیشیان لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا لەهۆشی خۆیان چوونو، هەندێکیشیان وەفاتیان کردوە.

سونەتە کەسی قورئانخوێن لە کاتی قورئان خوێندنەکەیدا بگری، خۆ ئەگەر گریانی نەهات، با خۆی بگریێنێت. چونکە گریان لەکاتی قورئان خوێندندا سیفەتی خواناسەکانەو، نیشانەی بەندە ڕاسالّەکانی خوای گەورەیە. وەکو خۆی فەرموویەتی: ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً﴾ [الإسراء: ١٠٩]. واتە: {بەڕوودا دەکەونو کڕنووش دەبەنو دەگرینو، بیستنی ئایەتەکانی قورئانیش ترسو ملکەچیان زیاد دەکات}.

منیش لە کتێبی (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا حەدیسو فەرمایشتێکی زۆری هاوەڵانو شوێنکەوتوانم سەبارەت بەم مەسەلەیە هێناوە.

خواناسی پایەبەرز شێخ (إِبْرَاهِيْم)ی (خَوَّاص)، کە خاوەنی کەراماتو زانیاریو بەهرەو خەلأتە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: دەرمانی دڵ پێنج شتە:

- خوێندنەوەی قورئان بە تێڕامانەوە.
- برسێتیو ناوسك خاڵێتی.
- شەونوێژ کردن.
- کزۆڵیو ملکەچی نواندن لە بەرەبەیاندا.
- دانیشتن لە خزمەتی پیاوچاکاندا.

## باسێك: {فەزڵی قورئان خوێندن بە تەماشا كردنی قورئان}

قورئان خوێندن بە تەماشا كردن لــە قورئــان خوێنــدن بــە لەبــەربوون باشــترەو گەورەترە. هاوەڵانمان وایان فەرمووەو، ئەوەش مەشهورە لە زانایــانی (سَـــلَف)ـــەوە (خوایان لیّ ڕازی بێت). بەڵام نابێت ئەم بۆچوونە بە ڕەهایی وەربگیرێت. بــەڵكو ئەگــەر قورئانخوێنەكە بە لەبەربوون زیاتر بیری لە مانای ئایەتەكان دەكردەوەو، بــە دڵو بــە چاو ئاگای لێیانبوو، ئەوا قورئان خوێندنەكە بە لەبەربوون باشترە. بەڵام ئەگــەر لــە هەردوو حاڵەتەكەدا وەكو یــەك بــوو، ئــەوا بــە تەماشــا كــردن باشــترەو، ئەمــەش مەبەستی زانایانی (سَلَف)ـەـ.

## باسێك: {كامیان باشترە، خوێندنی قورئان بە دەنگی بەرز یان بە دەنگی نزم؟}

سەبارەت بە باشێتی خوێندنــەوەی قورئــانی پــیرۆز بــە دەنگــی بــەرز كۆمــەڵێك فەرمایشــت هــاتوون‌و، ســەبارەت بــە خوێندنەوەشــی بــە دەنگــی نــزم كۆمــەڵێك فەرمایشتی تر هاتوون.

جــا بــۆ یەكخســتنەوەی ئــەم دوو كۆمەڵــە فەرمایشــتە، زانایــان فەرموویانــە: خوێندنەوەی قورئان بە دەنگی نزم دوورترە لە ڕیاو ڕووپاماییەوە. كەواتە دەرهــەق بەو كەسەی كە ترسی تووشبوون بە ڕیای هەیە، خوێندنەوە بە دەنگی نــزم باشــترە. بەڵام ئەگەر ترسی نەبوو، ئەوا بە دەنگی بەرز باشترە، بــە مــەرجێك زەرەرو زیــان‌و ناڕەحەتی بۆ كەسی نوێژخوێن، یان بۆ كەسی خەولێكــەوتوو، یــان بــۆ كەســانی تــر نەبێت.

بەڵگەی باشێتی بەدەنگی بەرز خوێندن ئەوەیە، كە كارو ڕەنجی زۆرتــری تێدایــە (واتە: خوێندنەوەكە تەنها بە دڵ نیە، بەڵكو بە دەمیشە).

هەروەها سودی بۆ کەسانی تریش دەبێت‌و، دڵی قورئانخوێنەکەش بە هۆشیاری دەهێڵێتەوەو، هەموو توانایەکی خۆی کۆدەکاتەوە بۆ بیرکردنەوەو تێڕامان لە ئایەتەکان‌و، هێزی بیستنیشی تەرخان دەکات بۆ بیستنیان.

هەروەها خەو لە قورئانخوێنەکە دەتۆرێنێت‌و، چالاکی زیاتری دەداتیٚ‌و، کەسانی بێئاگاو خەولێکەوتووش بەخەبەر دەهێنێتەوەو، گورج‌وگۆڵیان دەکاتەوە. بۆیە هەرکاتێك کەسی قورئانخوێن یەکێك لەم مەبەستانەی هەبوو، ئەوا خوێندنەوەی قورئان بە دەنگی بەرز باشترە تاوەکو بە دەنگی نزم.

## باسێك: {خوێندنەوەی قورئان بە دەنگی خۆش}

سونەتە قورئان بە دەنگی خۆش بخوێنرێت‌و برازێنرێتەوە، بە مەرجێك زیاد لە حەدی خۆی درێژو خاو نەکرێتەوبە مەرجێکە. خۆ ئەگەر کەسی قورئانخوێن زیادەڕەوی تێدا کرد، هەتا پیتێکی زیاد کرد، یان پیتێکی شاردەوە، ئەوە حەرامە.

سەبارەت بە خوێندنی قورئانیش بە ئاوازەوە، ئەویش هەر بەو جۆرەیە، کە باسمان کرد، ئەگەر قورئانخوێنەکە زیادەڕەوی تێدا کرد، ئەوە حەرامە، ئەگەرنا حەرام نیە.

جا ئەو حەدیسانەی لە کتێبە صەحیحەکان‌و لە غەیری ئەوانیشدا سەبارەت بە خوێندنی قورئان بە دەنگی خۆش هاتوون، زۆر مەشهورن، منیش لە کتێبی (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا هەندێکیانم باس کردوە.(١)

---

(١) یەکێك لەوانە بریتیە لە حەدیسی: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ». کە حەدیسێکی (صَحِيْح)ەو، زۆرێك لە پێشەوایان ڕیوایەتیان کردوەو، لای هەندێکیان ئەم زیادەشی لەگەڵدایە: «فَإِنَّ الصَّوْتَ الْحَسَنَ يَزِيدُ الْقُرْآنَ حُسْنًا». بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْر / ٩ / ٦٣٧ – ٦٣٩، والتَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ٤ / ٣٦٨ – ٣٦٩.

## باسێك: {چۆنێتی خوێندنەوەی قورئان}

ئەگەر قورانخوێن لە ناوەڕاستی سورەتێکەوە دەستی پێکرد، ئەوا سونەتە لە سەرەتای فەرمایشتێکەوە دەست پێ بکات، کە بەشەکانی پەیوەندیدارو پێکەوەبەستراو بن. بە هەمان شێوە ئەگەر لە ناوەڕاستی سوورەتێکیشدا ڕاوەستا، هەر سونەتە لەسەر فەرمایشتێك ڕابوەستێت، کە بەشەکانی پەیوەندیدارو پێکەوەبەستراو بن‌و، لەو جێگەشدا ڕابوەستێت کە فەرمایشتەکە تەواو دەبێت. ئیتر نە لە دەست پێکردن‌و نە لە ڕاوەستانیشدا خۆی نەبەستێتەوە بە جوزئەکان‌و حیزبەکان‌و دە ئایەت دە ئایەتەوە. چونکە زۆرێك لەوانە لە ناوەڕاستی فەرمایشتێکەوەن، کە پەیوەندیان بە فەرمایشتێکی ترەوە هەیە.

هەروەها نابێت کەسی قورئانخوێن بە زۆری ژمارەی ئەو کەسانە هەڵبخەڵەتێت، کە بەو جۆرە دەکەن، وا ئێمە نەهیمان لێ کرد، لەوانەی کە ڕەچاوی ئەم ئادابانە ناکەن. بەڵکو با بەگوێی ئەو فەرمایشتەی زاناو خواناسی پایەبەرز (فُضَیْل)ی کوڕی (عِیَاض) بکات، کە فەرموویەتی: خۆت دوور مەگرە لە ڕێگای حەق‌و ڕاستی، تەنها لەبەر ئەوەی، کە خەڵکانێکی کەم پەیڕەوی لێ دەکەن، هەڵیش مەخەڵەتێ بە زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی، کە کەوتوونەتە سەر ڕێگەی تیاچوون‌و فەوتان.

جا هەر لەبەر ئەمەیە کە زانایان فەرموویانە: خوێندنەوەی سورەتێك بە تەواوەتی، لە خوێندنەوەی ئەندازەی ئایەت‌و وشەکانی ئەو سورەتە لە سورەتێکی درێژتر باشترە. چونکە لە هەندێك حاڵەت‌و جێگەدا زۆرێك یان زۆرینەی خەڵکی ئاگایان لە پەیوەندی نێوان فەرمایشتەکان نیە.

## باسێك: {ئەو شتانەی لە خوێندنەوەی قورئاندا بیدعەو داهێنراون}

یەكێك لەو داهێنراوە خراپو ناشیرینانە ئەوەیە، كە زۆرێك لەو كەسە نەزانانە ئەنجامی دەدەن، كە لە نوێژی تەراویحدا پێشنوێژی بۆ خەڵكی دەكەن، ئەویش بەوەی، كە لە دوایین ڕكاتی شەوی حەوتەمدا سورەتی (الْأَنْعَــام) بە تەواوەتی دەخوێننو، باوەڕیشیان وایە، كە ئەوەی دەیكەن سونەتە، بە پاساوی ئەوەی، كە ئەو سورەتە بە یەكجار دابەزیوە.

جا ئەو كارەی ئەوان كۆمەڵێك خراپەی تێدایە:

- یەكێك لەوانە ئەوەیە، كە باوەڕیان وایە: ئەوەی دەیكەن سونەتە.
- یەكێكی تریشیان ئەوەیە، كە وا دەبەنە مێشكی خەڵكە عەوامەكەوە، كە ئەو كارە سونەتە.
- یەكێكی تریشیان ئەوەیە، كە ڕكاتی دوەم لە ڕكاتی یەكەم درێژتر دەبێتەوە.
- یەكێكی تریشیان ئەوەیە، كە نوێژەكە لەسەر نوێژخوێنەكان درێژ دەبێتەوە.
- یەكێكی تریشیان ئەوەیە، كە قورئانەكە بە پەلە دەخوێنرێت.
- یەكێكی تریشیان ئەوەیە، كە ڕكاتەكانی پێشتر كورت دەكرێنەوە. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

## باسێك: {حوكمی ناونانی سورەتەكانی قورئان}

درووستە بوترێت: سورەتی (الْبَقَــرَة)و، سورەتی (آل عِمْــرَان)و، سورەتی (النِّسَاء)و، سورەتی (الْعَنْكَبُوْت). بە هەمان شێوە سورەتەكانی تریش. ئەم وتەیەش هیچ ناپەسەندیەكی تێدا نیە.

هەندێکیش لە زانایانی (سَلَف) فەرموویانە: ناپەسەندە وا بوترێت. بەڵکو دەبێت بوترێت: ئەو سورەتەی کە باسی (الْبَقَـرَة)ی تێدایـەو، ئـەو سـورەتەی کـە باسـی (النِّسَاء)ی تێدایەو، بە هەمان شێوە سورەتەکانی تریش.

جا بۆچوونی ڕاست ئـەوەی یەکەمیانـەو، ئـەویش بۆچـوونی زۆربـەی زانایـانی (سَلَف)و (خَلَف)ـەو، ئەو حەدیسانەش کە لـەو بارەوە لـە پێغەمبەری خواوە هاتوون (دروودی خوای لەسەر بێت)، لـە زۆریاندا لـەژمارە نایەن.[1] بە هـەمان شـێوە فەرمایشـتی هاوەڵانو زانایانی دواتریش لـەو بارەوە هەر لـە ژمارە نایەن.

بە هەمان شێوە ناپەسەند نیە، کە بوترێت ئەمە قیرائـەتی (أَبو عَمْرو)ەو، ئەمـەش قیرائەتی (ابْنُ كَثِير)ەو، ئەمەش قیرائەتی فلاْنە قورئانخوێنی ترە.[2]

---

(١) یەکێك لـەوانە ئەو حەدیسـەیە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «الآيَتَانِ مِنْ آخِـرِ سُـورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ». بڕوانـە: صَـحِيْحُ الْبُخَـارِيِّ / ٤ / ١٩٢٣ / بـە ژمـارە: ٤٧٥٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٥٤ / بە ژمارە: ٨٠٧.

(٢) لە ئاسمانی دنیای قیرائەتی قورئانی پیرۆزدا نـاوی چـەند زانـاو قورئانزانێـك بـە بـەردەوامی دەدرەوشێنەوە، کە خەڵکی لـەسەر شێوازی خوێندنەوەکـەی ئـەوان قورئـان دەخـوێنن. جـا شێوازی خوێندنەوەی هەریەکە لـەو کەڵەقورئانزانانە بەناوی قورئانزانەکە خۆیەوە نـاونراوەو ناوبانگی دەرکردوە. بۆ نموونە: دەوترێت: قیرائەتی (عَاصِـم)، یـان قیرائـەتی (نَـافِع)، یـان قیرائەتی (أَبو عَمْر)، یان قیرائەتی (ابْنُ كَثِير)....... هتد.

ئـەوجا زانایـان چـەندین کتێبیـان لـەبارەی شـێوازی خوێندنـەوەی هەریەکـە لـەو کەڵەقورئانزانانەوە داناوە، کە یەکێك لە گرنگترینیان بریتیە لە کتێبی (النَّشْر فِي الْقِـرَاءاتِ الْعَشْر)ی زانای پایەبەرزو ناسـراوی گەلەکـەمانو هـەموو دنیـای ئیسـلام، شـێخ (شَـمْسُ الدِّيْن)ی (ابْنُ الْجَزَرِيّ).

هەروەها چەندین کتێبیشیان بۆ ناسینی هەریەکە لـەو کەڵەقورئانزانانە داناوە، کە یـەکێك لە گرنگترینیان بریتیە لـە کتێبی (غَايَةُ النِّهَايَةِ فِي طَبَقَاتِ الْقُرَّاء)، کـە ئـەمیش هـەر دانـراوی شێخی (ابْنُ الْجَزَرِيّ)ـەو، سوپاس بۆ خوای گـەورە هەردووکیشـیان بەچـاپکراوی دەسـت دەکەون.

ئەوجا ئەمە ئەو مەزهەبە درووستە هەڵبژێردراوەیە، کە کاری زانایـانی (سَلَف)و (خَلَف)یشی لـەسـەرەو، کەسیش نکۆڵی لێ نەکردوە.

لـە زانـای پایەبـەرز (إِبْرَاهِيْم)ی (نَخَعِيّ)ـــەوە هـاتوە (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت)، کـە فەرموویەتی: زانایانی سەردەمی ئەو پێیان ناخۆش بوە، کە بوترێت: (سـونەتی فلآنـە کەس)، یان (قیرائەتی فلآنە کەس). بەڵام وەکو وتمان بۆچوونی ڕاست ئەوەیـە، کـە درووستەو هیچ ناپەسەندیەکیشی تێدا نیە.

## باسێك: {نەهی کردن لە وتنی: فلآنە ئایەتم لەبیرچومتەوە}

ناپەسەندە کەسی قورئانزان بڵێت: فلآنە ئایەت، یان فلآنە سورەتم لـەبیر چوەتەوە (نَسِيتُ آيَةَ كَذَا أَوْ سُوْرَةَ كَذَا). بەڵکو با بڵێت: لــەبیرم براوەتـەوە (أُنْسِيْتُهَا)، یـان: وازم لێ هێناوە بەهۆی لـەبیرچوونەوەوە (أَسْقَطْتُهَا).

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لــە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویــەتی: «لا يَقُولُ أَحَدُكُمْ: "نَسِيْتُ آيَةَ كَذَا وَكَذَا"، بَلْ هُوَ نُسِّيَ».[1] واتە: "با کەس لـە ئێوە نەڵێت: (فلآنو فیســار ئایــەتم لـەبیرچـوەتەوە، بەڵکو لـەبیری براوەتەوە)".

دیسان لـە ڕیوایەتێکی تری هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هـاتوە، کـە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «بِئْسَمَا لِأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُوْلَ: "نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْــتَ"،

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٩٢٣ / بە ژمارە: ٤٧٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤٤ / بە ژمارە: ٧٩٠. تەنها لـە صەحیحی موسلیمدا بەم دەقە هاتوەو، بەم جۆرەشە (لا يَقُلْ).

بَلْ هُوَ نُسِّيَ». [١] واته: "قسەیەكی خراپو ناشیرینە كـە كەسێك بڵێـت: (فـلانو فیسار ئایەتم لەبیرچوەتەوە، بەڵكو لەبیری براوەتەوە)".

بۆشمـان ڕیوایـەت كـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (عَائِشَةَ)ی دایكی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێت)، گوێی لە پیاوێك بوو قورئانی دەخوێندەوە، ئەویش فـەرمووی: «رَحِمَـهُ اللَّهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِيْ آيَةً، كُنْتُ أَسْقَطْتُهَا». [٢] واتە: "خوا ڕەحمـی پـێ بكـات، بەڕاسـتی ئایەتێكی بیرهێنامەوە، كە بەهۆی لەبیرچوونەوەوە وازم لێ هێنابوو".

لە ڕیوایەتێكی تری صەحیحدا هاتوە، كە فەرموویەتی: «كُنْتُ أُنْسِيْتُهَا». [٣] واتە: "لەبیرم برابوەوە".

## باسێك: {ئادابەكانی خوێندنەوەی قورئان}

بزانە كە ناكرێت تەواوی ئادابەكانی قورئانخوێنو قورئان خوێندن لە كـەمتر لـە چەند بەرگێكدا باس بكرێت. بەڵام ئێمە ویستمان لەم چەند باسە كورتەدا ئاماژە بە هەندێك لە مەبەستە گرنگـەكانی بـدەین. لـە باسـەكانی پێشووشـدا لـە سـەرەتای كتێبەكەوە باسی هەندێك لە ئادابەكانی كەسـی زیكركـەرو كەسـی قورئانخوێنمـان كردو، لە باسی زیكرەكانی نوێژیشدا باسی كۆمەڵێك لـەو ئادابانـەمان كـرد، كـە

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٤ / ١٩٢٣ / بە ژمارە: ٤٧٥٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤٤ / بە ژمارە: ٧٩٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٢ / ٩٤٠ / بە ژمارە: ٢٥١٢، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ٥٤٣ / بە ژمارە: ٧٨٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٤ / ١٩٢٢ / بە ژمارە: ٤٧٥١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٥٤٣ / بە ژمارە: ٧٨٨.

پەیوەندیان بە قورئان خوێندنەوە هەبوو، پێشتریش وتمان: هەر کەسێك زیاتری دەوێت، با بگەڕێتەوە سەر کتێبی (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآنِ).

جا تەوفیق تەنها بە دەستی خوایەو، هەر تەنها ئەویش پشتو پەنایە.

## باسێك: {خوێندنەوەی قورئان لە هەموو زیکرەکانی تر گەورەترو باشترە}

بزانە کە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە هەموو زیکەکانی تر زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە، وەکو پێشتریش باسمان کرد. بۆیە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان بەردەوام قورئان بخوێنێتو، هیچ شەوو ڕۆژێکی بێ قورئان خوێندن بەسەر نەبات، ئیتر باوەکو چەند ئایەتێکی کەمیش بخوێنێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ فِيْ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَمْسِيْنَ آيَةً، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغافِلِينَ. وَمَنْ قَرَأَ مِئَةَ آيَةٍ، كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِيْنَ. وَمَنْ قَرَأَ مِئَتَيْ آيَةٍ، لَمْ يُحَاجِّهِ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ قَرَأَ خَمْسَمِئَةٍ، كُتِبَ لَهُ قِنْطَارٌ مِنَ الْأَجْرِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی لە ڕۆژو شەوێکدا پەنجا (٥٠) ئایەت بخوێنێت، لەڕیزی غافڵو بێئاگاکاندا ناوی نانوسرێت. ئەو کەسەش سەد (١٠٠) ئایەت بخوێنێت، لەڕیزی خواپەرستە ملکەچەکاندا ناوی دەنوسرێت. ئەو کەسەش دووسەد (٢٠٠) ئایەت بخوێنێت، قورئان لەڕۆژی قیامەتدا بەرامبەری

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٧ / بە ژمارە: ٦٧١. حەدیسەکە خۆی لاوازە، بەڵام بە چەند ڕیوایەتێکی تر پاڵپشت کراوە. (واتە: دەبێت بە: حَسَن) بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٤٨ – ٢٥١.

لیٚ ناگریٚت‌و، دژی ڕاناوەستیٚت. ئەو کەسەش پیٚنج سەد (٥٠٠) ئایەت بخوێنیٚت، بە ئەندازەی (قِنْطَار)یٚك پاداشتی بۆ دەنوسریٚت". [١]

لە ڕیوایەتیٚکیشدا لەبریٚتی (خَمْسِيْنَ) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ أَرْبَعِيْنَ آيَةً». [٢]

لە ڕیوایەتیٚکیشدا فەرموویەتی: «عِشْرِيْنَ». [٣]

لە ڕیوایەتیٚکیشدا لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْـرَةَ)وە هاتوە (خوای لیٚ ڕازی بیٚت)، کە فەرموویەتی: پیٚغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بیٚت) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ عَشْرَ آيَاتٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِيْنَ». [٤]

هەروەها لەم باسەدا زۆریٚك حەدیسی تری لەم جۆرە هاتون.

چەندین حەدیسیشمان بۆ ڕیوایەت کراوە سەبارەت بە خویٚندنی چەند سورەتیٚکی دیاریکراو لە شەوو ڕۆژدا. لەوانە: سورەتەکانی: (يـس)و (الْمُلْـك)و (الْوَاقِعَة)و (الدُّخَان).

ئەوەتا لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە هاتوە (خوای لیٚ ڕازی بیٚت)، ئەویش لە پیٚغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بیٚت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ "يس" فِـيْ

---

(١) زانایان سەبارەت بە ڕاڤەکردن‌و لیٚکدانەوەی وشەی (قِنْطَار) چەندین بۆچوونی جیاوازیان هەیە. جا پوختەی بۆچوونەکانیان ئەوەیە، کە بریتیە لە ماڵیٚکی زۆر. بڕوانە: تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَات / ٤ / ١٠٤ – ١٠٥.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٧ / بە ژمارە: ٦٧٢.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢٦ / بە ژمارە: ٦٩٨.

(٤) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢٨ / بە ژمارە: ٧٠٢. ئیمامی (حَـاكِم) فەرموویەتی: حەدیسیٚکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧٤٢ / بە ژمارە: ٢٠٤١.

يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللّهِ، غُفِرَ لَهُ».[1] واته: "ئەو كەسەی لە شەوو ڕۆژێكدا لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە سورەتی (یس) بخوێنێت، خوا لێی خۆش دەبێت".

لە ڕیوایەتێكی تریشدا لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْـرَةَ)وە هـاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا فەرموویـەتی: «مَنْ قَرَأَ سُوْرَةَ "الـدُّخَانِ" فِـيْ لَيْلَـةِ (جُمُعَةٍ)، أَصْبَحَ مَغْفُوْراً لَهُ».[2] واته: "ئەو كەسـەی لـە شـەوی جومعـەدا سـورەتی (الدُّخَان) بخوێنێت، بەیانیەكـەی خـوای گـەورە لـە تاوانـە (بچـووكە)كانی خـۆش دەبێت".

لە ڕیوایەتێكیشدا لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە هـاتوە (خوای لێ ڕازی بێت) كە فەرموویەتی: لە پێغەمبـەری خـوام بیسـتوە (درودی خـوای لەسـەر بێـت)، كـە فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ سُوْرَةَ "الْوَاقِعَةِ" فِيْ كُلِّ لَيْلَةٍ، لَمْ تُصِبْهُ فَاقَةٌ (أَبَـداً)».[3] واتـە: "ئەو كەسەی هەموو شەوێك سورەتی (الْوَاقِعَة) بخوێنێت، هەرگیز هەژاریو نەداری توش نابێت".

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٨ / بە ژمارە: ٦٧٤. شـێخی عەسـقەلانی بـە حەدیسێكی (حَسَن)ی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفكَار / ٣ / ٢٥٧.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٩ - ٣٢٠ / بـە ژمـارە: ٦٧٩. حەدیسـێكی لاوازە، بەڵام پشتگیرێكی باشی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٥٩ - ٢٦٠.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٣٢٠ / بـە ژمـارە: ٦٨٠. حەدیسـێكی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٦٢ - ٢٦٤.

لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)یشەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەموو شەوێك نەدەخەوت، تاوەکو هەردوو سورەتی (السَّجْدَة)و، (الْمُلْك) نەخوێنێت.(١)

لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)یشەوە هاتوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ فِيْ لَيْلَةٍ ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ﴾ كَانَتْ لَهُ كَعِدْلِ نِصْفِ الْقُرْآنِ، وَمَنْ قَرَأَ ﴿قُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ كَانَتْ لَهُ كَعِدْلِ رُبُعِ الْقُرْآنِ، وَمَنْ قَرَأَ ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ كَانَتْ لَهُ كَعِدْلِ ثُلُثِ الْقُرْآنِ».(٢) واتە: "ئەو کەسەی بەشەودا سورەتی ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ﴾ بخوێنێت، پاداشتی خوێندنی نیوەی قورئانی دەست دەکەوێت. ئەو کەسەش سورەتی ﴿قُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنێت، پاداشتی خوێندنی چارەکێکی قورئانی دەست دەکەوێت. ئەو کەسەش سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت، پاداشتی خوێندنی سێیەکی قورئانی دەست دەکەوێت".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ، وَأَوَّلَ "حم (الْمُؤْمِن)، عُصِمَ ذلِكَ الْيَوْمَ مِنْ كُلِّ سُوْءٍ».(٣) واتە: "ئەو کەسەی (آيَةُ الْكُرْسِيِّ)و سەرەتای سورەتی (غَافِر) بخوێنێت، ئەو ڕۆژە لە هەموو خراپەیەك پارێزراو دەبێت".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٨ / بە ژمارە: ٦٧٥. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٤٤٦ / بە ژمارە: ٣٥٤٥.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢٢ / بە ژمارە: ٦٨٦. حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٦٨.

(٣) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٢٣ / بە ژمارە: ٦٨٧. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٣ / ٢٧٣.

هەروەها زۆرێك حەدیسی تریش لەم بارەوە هاتوون. ئێمەش لێرەدا تەنها گرنگ‌و سەرەكیەكانیانمان هێناوە. خوای گەورەش لە هەموو كەس زاناترە بە ڕاستیەكان‌و، هەموو سوپاس‌و ستایشێكیش هەر شایستەی ئەوەو، هەموو نازو نیعەمتیش هەر هی ئەوەو، تەوفیق‌و پاراستنیش لە هەڵە هەر بە دەستی ئەوە.

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلّهِ وَسَلامٌ عَلَى عِبَادِهِ الَّذِيْنَ اصْطَفَى﴾ [النَّمل: ٥٩]. واتە: {تۆ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو، سەلامەتی و بێوەییش بڕژێت بەسەر ئەو بەندانەدا، کە ئەو هەڵیبژاردوون}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ [النَّمل: ٩٣]. واتە: {هەروەها بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، خوا لەمەولا بەڵگەو نیشانەکانی گەورەیی و دەسەڵاتی خۆیتان پیشان دەدات و، ئێوەش دەیانبینن و دەیانناسنەوە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ لَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً﴾ [الإسْرَاء: ١١١]. واتە: {سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە نەوەو منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ [إبْرَاهِيم: ٧]. واتە: {ئەگەر ئێوە سوپاس گوزاری من بکەن، منیش نازو نیعمەتتان بۆ زیاد دەکەم}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلا تَكْفُرُونِ﴾ [البَقَرَة: ١٥٢]. واتە: {دەی ئێوە زیکرو یادی من بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم و پاداشتتان بدەمەوە. هەروەها شوکرو سوپاسی من بکەن و، ناسوپاسگوزار مەبن}.

هەروەها زۆرێك ئایەتی زانراوی تر هەن، کە ڕاشکاوانە فەرمان بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەن و، باسی فەزڵ و گەورەیی سوپاس و ستایش دەکەن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَهْ)و (مُسْنَد)ی زانای پایەبەرز (أَبُو عَوَانَة)ی (إسْفَرَايِيْنِيّ)دا -الْمُخَرَّج عَلَى صَحِيْحِ مُسْلِم- (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «كُلُّ أَمْرٍ ذِيْ بَالٍ لا يُبْدَأُ

فِيْهِ بِالْحَمْدِ لِلّهِ فَهُوَ أَقْطَعُ». [1] واته: "هەموو کارێکی گرنگو بایەخدار بە سوپاسو ستایشی خوای گەورە دەستی پێ نەکرێت، کەم بەرەکەت یان بەرەکەتبڕاو دەبێت".

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «بِحَمْدِ اللّهِ».

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «بِالْحَمْدِ، فَهُوَ أَقْطَعُ».

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «كُلُّ كَلامٍ لا يُبْدَأُ فِيْهِ بِالْحَمْدِ لِلّهِ، فَهُوَ أَجْذَمُ».

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «كُلُّ أَمْرٍ ذِيْ بَالٍ لا يُبْدَأُ فِيْهِ بِـ(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، فَهُوَ أَقْطَعُ».

هەروەها هەموو ئەم دەقانەشمان لە (كِتَابُ الْأَرْبَعِيْن)ی زانای پایەبەرز شێخ (عَبْدُالْقَادِر)ی (رُهَاوِيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، حەدیسەکەش حەدیسێکی (حَسَن)ـەو، وەکو باسمان کرد بە ڕشتەی پێکەوەبەستراو (مُتَّصِل) ڕیوایەت کراوەو، بە (مُرْسَل)یش ڕیوایەت کراوەو، ڕیوایەتە (مُتَّصِل)ـەکەش ڕشتەکەی جوانە.

جا ئەگەر حەدیسێك بە (مُتَّصِل)ی‌و، بە (مُرْسَل)یش ڕیوایەت کرابێت، ئەوا بەلای زۆرینەی زانایانەوە حیساب بۆ ڕیوایەتە (مُتَّصِل)ـەکەیان دەکرێت. چونکە زیادەی کەسی متمانەداری تێدایەو، زیادەی کەسی متمانەداریش بەلای زۆربەی زانایانەوە قبوڵ دەکرێت.

(ذِيْ بَال)یش واتە: جێگەی بایەخو گرنگی بێت. (أَقْطَعُ)یش واتە: بەرەکەتی کەمەو، (أَجْذَمُ)یش هەمان مانای هەیە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٧٧ / بە ژمارە: ٤٨٤٠، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٦١٠ / بە ژمارە: ١٨٩٤، ومُسْتَخْرَجُ أَبِيْ عَوَانَة / سەرەتای پێشەکیەکەی.

زانایان فەرموویانە: بۆیە سـونەتە هـەموو دانـەرو نوسـەرێكو، وانـەخوێنێكو، وانەبێژێكو، وتاربێژێكو، خوازبێنیكەرێك، لـەپێش دەست پێكردنـی كارەكەیانـەوە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكەن. هـەروەها سـونەتە لـەپێش هـەموو كـارێكی گرنگو بایەخداری تریشەوە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكرێت.

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: من پێم خۆشە هەموو كەسـێك لـەپێش دەست كردنی بە قسە بۆ داواكردنو خوازبێنی ژنێك، یـان بـۆ داواكردنـی هەر شتێكی تر، سەرەتا سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكاتو، صەلاواتیش لەسەر پێغەمبەری خوا بدات (دروودی خوای لەسەر بێت).(1)

## باسێك: {كردنی سوپاسو ستایشی خوای گەورە لە پێش هەموو كارێكەوە}

وەكو باسمان كرد، سونەتە لـە سەرەتای هەموو كـارێكی گـرنگو بایەخـدارەوە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكرێت.

هەروەها لـەدوای لێبوونەوە لـە خواردنو خواردنـەوەو، لـەدوای پـژمینو، لـە كاتی خوازبێنیداو، لەكاتی بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیریداو، لـە دوای دەرچـوون لـە سەرئاویش هەر سونەتە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بكرێت.

جـا ئەگـەر خـوای گـەورە بیـەوێت، لـەمـەولا هـەر یـەكێك لـەم مەسـەلانەو لقەباسەكانیشیان لـە باسەكانی خۆیاندا بە بەڵگەوە ڕوون دەكەینەوە.

---

(1) بڕوانە: الْأُمّ / ٦ / ١٠٦.

هەروەها پێشتریش باسی ئەوەمان کرد، کە لەدوای دەرچوون لە سەرئاو چی دەوترێت.

هەروەها وەکو پێشتریش باسمان کرد، سونەتە لە سەرەتای دانانی کتێبەوە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بکرێت. بەهەمان شێوە لە سەرەتای دەرسی ماموٚستایانو، سەرەتای خوێندنەوەی قوتابیانیشەوە هەر سونەتە، ئیتر ئایا دەرسی حەدیس بێت، یان شەرع، یان هەر زانستێکی تر.

جا باشترین ڕستەش بۆ سوپاس‌و ستایش کردن بریتیە لە (الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ).

## باسێك: {کردنی سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە یەکێکە لە ڕوکنەکانی وتاری جومعە}

سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە یەکێکە لە پایەکانی وتاری جومعەو وتارەکانی تریش. بۆیە هیچ وتارێك بەبێ سوپاس‌و ستایشی پەروەردگار درووست نیە.

جا بەلایەنی کەمەوە پێویستە وتاربێژەکە بلێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ). بەلاّم باشتر وەهایە کە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە زۆر بکاتو، درێژی ئەم باسەش لە کتێبە فیقهیەکاندا هەیە.

هەروەها بەمەرج گیراوە سوپاس‌و ستایشەکەو تەواوی ڕوکنەکانی تری وتارەکە هەر بە زمانی عەرەبی بن.

## باسێك: {سونەتە بە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە كۆتایی بە نزاو پاڕانەوە بهێنرێت}

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان بە سوپاس‌و ستایشی خوای پەروەردگار (الْحَمْدُ لِلَّـهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ) كۆتایی بە نزاو پاڕانەوەكەی بهێنێت. بە هەمان شێوە بە سوپاس‌و ستایشی ئەویش دەست پێ بكات.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ﴾ [يُونُس: ١٠]. واتە: {دوایین نزاو پاڕانەوەی ئەو بەهەشتیانە ئەوەیە كە دەڵێن: سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو عالەم}.

سەبارەت بەوەش كە سونەتە نزاو پاڕانەوە بە سوپاس‌و ستایشی پەروەردگار دەست پێ بكات، ئەوە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت، لەم نزیكانەدا لە ((**كتێبی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا**))دا بەڵگەكەی باس دەكەین، كە حەدیسی (صَحِيْح)ی لەبارەوە هاتوە.

## باسێك: {كردنی سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە لەكاتی پەیدابوونی نیعمەت‌و، لاچوونی زەحمەتدا}

سونەتە لەكاتی دەستكەوتنی نیعمەتێكدا، یان لەكاتی لەكۆڵبوونەوەی خراپەیەكدا سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بكرێت، ئیتر ئایا بۆ خۆی بێت، یان بۆ دۆست‌و برادەرێكی، یان بۆ موسوڵمانان.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە شەوی شەوڕەویەكەیدا پیاڵەیەك مەی (خَمْر)و، پیاڵەیەك شیری بۆ هێنرا، ئەویش تەماشای

کردن‌و، شیره‌که‌ی وه‌رگرت. جا جوبره‌ئیل (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) پێی فه‌رموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ). واته: (سوپاس‌و ستایش بۆ ئه‌و خوایه‌ی، که ڕێگه‌ی ڕاستی ئیسلامه‌تی پێشاندایت‌و خستیتێ سه‌ری. خۆ ئه‌گه‌ر مه‌یه‌که‌ت وه‌ربگرتایه، ئومه‌ته‌که‌ت گومڕاو سه‌رلێشێواو ده‌بوون).[1]

## باسێك: {سوپاس‌و ستایشی خوای گه‌وره له‌کاتی مردنی خزمێکی نزیکدا}

بۆمان ڕیوایه‌ت کراوه له کتێبه‌که‌ی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و له غه‌یری ئه‌ویشدا، له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـه‌وه (خوای لێ ڕازی بێت)، که پێغه‌مبه‌ری خوا (درودی خوای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویه‌تی: «إِذا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى لِمَلائِكَتِهِ: "قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي؟" فَيَقُوْلُوْنَ: "نَعَمْ". فَيَقُوْلُ: "قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ؟" فَيَقُوْلُوْنَ: "نَعَمْ". فَيَقُوْلُ: "فَمَاذَا قالَ عَبْدِي؟" فَيَقُوْلُوْنَ: حَمِدَكَ، وَاسْتَرْجَعَ. فَيَقُوْلُ اللهُ تَعَالَى: "ابْنُوا لِعَبْدِيْ بَيْتاً فِيْ الْجَنَّةِ، وَسَمُّوْهُ بَيْتَ الْحَمْدِ». واته: "ئه‌گه‌ر منداڵی به‌نده‌یه‌ك بمرێت، خوای گه‌وره به فریشته‌کانی ده‌فه‌رموێت: (گیانی منداڵی به‌نده‌که‌متان کێشا؟ به‌روبوومی دڵیتان لێ وه‌رگرته‌وه؟) ئه‌وانیش عه‌رزی ده‌که‌ن: (به‌ڵێ). خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: (ئه‌ی به‌نده‌که‌م چی وت؟) ئه‌وانیش عه‌رزی ده‌که‌ن: (سوپاس‌و ستایشی تۆی کردو، ئه‌وه‌شی وت که هه‌موومان موڵکی خواین‌و، بۆ خزمه‌تی ئه‌ویش ده‌گه‌ڕێینه‌وه: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). ئه‌وجا خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: (ئێوه‌ش له به‌هه‌شتدا ماڵو خانوویه‌ك بۆ به‌نده‌که‌م درووست بکه‌ن‌و، ناوی بنێت: ماڵو خانووی سوپاس‌و ستایش)".

---

(١) بڕوانه: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٥٩٢ / به ژماره: ١٦٨.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

هەروەها چەندین حەدیسی مەشهوری تریش سەبارەت بە فەزڵو گەورەیی سوپاس‌و ستایش هاتوون‌و، ئێمەش لە سەرەتای ئەم کتێبەوە کۆمەڵێك لەو حەدیسە (صَحِیْح)ـانەمان هێنا، کە سەبارەت بە فەزڵو گەورەیی تەسبیحات‌و سوپاس‌و ستایش‌و، زیکرەکانی تر هاتبوون.

## باسێك: {باشترین ئەو صیغانەی بۆ سوپاس‌و ستایش بەکاردەهێنرێن}

زانایانی (مُتَأَخِّرِیْن)ی هاوەڵە خۆراسانیەکانمان فەرموویانە: ئەگەر کەسێك سوێند بخوات، کە بە گشتگیرترین‌و داگرەوەترین ڕستە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەکات -هەندێکیشیان فەرموویانە: بە گەورەترین‌و باشترین ڕستە-، ئەوا ڕێگەچارە بۆ نەکەوتنی سوێندەکەی ئەوەیە، کە بڵێت: (اَلْحَمْدُ لِلّهِ حَمْداً يُوَافِيْ نِعَمَهُ، وَيُكَافِيءُ مَزِيْدَهُ).

(يُوَافِيْ نِعَمَهُ) واتە: سوپاس‌و ستایشێکی وەها، کە لەگەڵ هەموو نازو نیعمەتێکدا بوونی هەبێت.

(يُكَافِيءُ مَزِيْدَهُ) واتە: هاوتاو یەکسان بێت لەگەڵ زیادبوونی نازو نیعمەتەکاندا. پوختەی ماناکەشی ئەوەیە، کە ئەو کەسە سوپاسی هەموو نازو نیعمەتێکی زیادەش دەکات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٤١ / بە ژمارە: ١٠٢١. هەروەها بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ٢٣ / ٥٠٠ - ٥٠١ / بە ژمارە: ١٩٧٢٥، وَصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّـان / ٧ / ٢١٠ / بە ژمارە: ٢٩٤٨.

هەروەها ئەو زانایانە فەرموویانە: ئەگەر کەسێك سوێند بخوات، کە بە باشترین تەعبیر سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکات، ئەوا ڕێگەچارە بۆ نەکەوتنی سوێندەکەی ئەوەیە، کە بڵێت: (لا أُحْصِيْ ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ). واتە: (من ناتوانم ستایشی تۆ بکەم و، ناشزانم چۆنی بکەم، تۆ بەو جۆرەی، کە خۆت ستایشی خۆتت کردوە).

جا هەندێکیان ئەمەشیان لە کۆتاییەکەیەوە زیاد کردوە: (فَلَكَ الْحَمْدُ حَتَّى تَرْضَى). واتە: (دەی سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆ، هەتا ڕازی دەبیت).

زانای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلِّي) نموونەی مەسەلەکەی بۆ ئەو کەسە هێناوە، کە سوێندی خواردوە: بە گەورەترین و باشترین صیغە سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکات. جا شێخی (مُتَوَلِّي) لە سەرەتای زیکرەکەوە تەعبیری (سُبْحَانَكَ)شی بۆ زیاد کردوە.

لە زانای پایەبەرز (أَبو نَصْر)ی (تَمَّار)یشەوە هاتوە، ئەویش لە زانای پایەبەرز (مُحَمَّد)ی کوڕی (نَصْر)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: حەزرەتی ئادەم (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: "ئەی پەروەردگار، بە کارو کردەوەکانی دەستی خۆمەوە سەرقاڵت کردوم. جا فێری فەرمایشتێکم بکە، کە هەموو سوپاس و ستایش و تەسبیحاتێکی تێدا بێت". خوای گەورەش وەحیی بۆ کرد: "ئەی ئادەم، بەیانیان سێ جارو، ئێوارانیش سێ جار بڵێ: (الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ، حَمْداً يُوَافِيْ نِعَمَهُ، وَيُكَافِيءُ مَزِيْدَهُ). چونکە ئەو صیغەیە گشتگیرو داگرەوەیە بۆ هەموو سوپاس و ستایش و تەسبیحاتێك".

خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

خوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّـذِيْنَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ [الأحزاب / ٥٦]. واتە: {بەڕاستی خـوای گـەورەو فریشتەکانی صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا دەدەن، ئەی ئەو کەسـانەی باوەڕتـان هێناوە، ئێوەش صەلاواتی لەسەر بدەنو، سڵاوی لیّ بکەن}.

ئەو حەدیسانەش کـە سـەبارەت بـە فـەزڵو گـەورەیی صـەلاواتدانو، فـەرمان پێکردنی هاتوون، زۆر لەوە زیاترن، کـە بـژمێردرێن. بـەڵام ئێمـە تـەنها ئامـاژە بـە هەندێکیان دەکەین، وەکو ئاگادار کردنەوەیەك لەسەر ئەوانی تریانو، بە مەبەسـتی پیرۆزبوونی کتێبەکەش بە هێنانو باسکردنی ئەو حەدیسانە.

بۆمان ڕیوایەت کـراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، کـە گوێی لێبوە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، فەرمووی: «مَنْ صَـلَّى عَلَـيَّ صَلاةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً».[1] واتە: "ئەو کەسەی صەلاواتێکم لەسەر بـدات، خوا بەو صەلاواتە دە ڕەحمەتی بەسەردا دەبارێنێت".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خـوای لیّ ڕازی بێـت)، کـە پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً».[2]

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە کتێبەکـەی ئیمـامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لیّ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَوْلَى النَّاسِ بِيْ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ أَكْثَـرُهُمْ عَلَـيَّ صَلاةً». واتە: "نزیکترینو لەپێشترینی خـەڵکی لـە منـەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـەو کەسەیە، کە لە هەموو کەسێك زیاتر صەلاواتی لەسەر داوم".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢٨٨ / بە ژمارە: ٣٨٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٠٦ / بە ژمارە: ٤٠٨.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە.[1]

هــەروەها فەرمووویــەتی: لــەم باســەدا حــەدیس لــە هــاوەڵانی خۆشەویســت: (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی (عَوْف)و، (عَامِر)ی کــوڕی (رَبِیْعَــة)و، (عَمَّــار)و، (أَبــوْ طَلْحَة)و، (أَنَس)و، (أُبَيّ)ی کوڕی (كَعْب)یشــەوە ڕیوایەت کــراوە (خوا لــە هــەموویان ڕازی بێت).[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لــە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَــە)دا، بــە چەند ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَوْس)ی کــوڕی (أَوْس)ــەوە (خــوای لێ ڕازی بێــت)، کــە فەرمووویــەتی: پێغەمبــەری خــوا (دروودی خــوای لەســەر بێــت) فەرمووویــەتی: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاةِ فِيْهِ، فَــإِنَّ صَلاتَكُمْ مَعْرُوْضَةٌ عَلَيَّ». واتە: "یەکێك لە باشــترینی ڕۆژەکانتــان بریتیــە لــە ڕۆژی جومعە، بۆیە لــەو ڕۆژەدا صــەلاواتم زۆر لەســەر بــدەن. چــونکە صــەلاواتەکانتان دەخرێنە بەردەمم‌و پیشانم دەدرێن". جا هاوەڵان عەرزیان کــرد: (وَكَيْــفَ تُعْــرَضُ صَلاتُنَا عَلَيْكَ، وَقَدْ أَرَمْتَ؟). واتە: (ئــەی پێغەمبــەری خــوا، چــۆن صــەلاواتەکانمان دەخرێنە بەردەمت‌و پیشانت دەدرێن، لەکاتێکدا کە لاشەی جەنابت لە گۆڕەکــەدا پتورکاوەو شی بوەتەوە؟!) پێغەمبەریش فــەرمووی: «إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ».[3] واتە: "بەڕاستی خوا لاشەی پێغەمبەرانی قەدەغەو حەرام کردوە لەســەر زەوی".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٥٤ / بە ژمارە: ٤٨٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٥٥.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٤٢ / بە ژمــارە: ١٠٤٧، وسُنَنُ النَّسَــائِيّ / ٣ / ٩١ / بــە ژمارە: ١٣٤٧، وَسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ١ / ٣٤٥ / بە ژمارە: ١٠٨٥.

ئیمامی (خَطَّابِيّ) فەرموویەتی: وشـەی (أَرَمْتَ) لـە ئەصـڵدا (أَرْمَمْـتَ) بـوەو، یەکێك لە دوو میمەکەیان لابردوە. کـە ئـەویش زمـانی هەنـدێك عەرەبـە. وەکـو وتویانە: (ظَلْتُ أَفْعَلُ كَذَا) واتە: (ظَلَلْتُ).[1]

زانایەکی تر فەرموویەتی: وشـەی (أَرَمت) بـە (أَرَمَّـتْ) دەخوێنرێتـەوە. واتـە: {میمەکە شەدەدارەو، تائەکەش زەنـەدارەو، تـائی (تَأْنِيْـث)ـەو، ماناکەشـی بـەم جۆرەیە} : (أَرَمَّتْ الْعِظَامُ). واتە: (ئێسکەکانت پتورکاون).

هەروەها خوێندنەوەی ئەو وشەیە چەند بۆچوونێکی تریشی لەسەرە. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کۆتایی (كِتَابُ الْحَجّ)ی (سُنَن)ی (أَبُـو دَاوُد)دا، لـە (بَابُ زِيَارَةِ الْقُبُوْر)دا، بە ڕشتەیەکی (صَـحِيْح)، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) فەرموویـەتی: «لا تَجْعَلُوا قَبْرِيْ عِيْداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِيْ حَيْـثُ كُنْتُمْ».[2] واتە: "سەردانی گۆڕەکەم وەکو سەردانی جەژن لێ مەکەن (کە سەردانی جەژن بۆ کەیفو خۆشیە)، صـەلاواتم لەسـەر بـدەن. چـونکە لـە هـەرکوێ بـن صەلاواتەکانتان پێم دەکات".

دیسان بۆمان ڕیوایـەت کـراوە لـە (سُـنَن)ی (أَبُـو دَاوُد)دا ، بـە ڕشـتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ، إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَـيَّ

---

(١) بڕوانە: مَعَالِمُ السُّنَن / ١ / ٢٤٢ – ٢٤٣.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٢٢ / بە ژمارە: ٢٠٤٢.

رُوْحِيْ، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ».[1] واته: "هەر کەسێك سڵاوم لێ بکات، خوای گەورە ڕۆحم بۆ دەگەڕێنێتەوە، هەتا وەڵامی سڵاوەکەی دەدەمەوە".

## با ئەو کەسەی ناوی پێغەمبەری خوا لەلایدا دەبرێت، صەلاواتی لەسەر بدات (دروودی خوای لەسەر بێت)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ، ذُكِرْتُ عِنْدَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ». واته: "لوتی ئەو پیاوە بە قوڕدا بچێتو زەلیلو ڕسوا بێت، کە ناوی منی لەلادا دەبرێتو، صەلاواتم لەسەر نادات".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّد)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ ذُكِرْتُ

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٦٢٢ / بە ژمارە: ٢٠٤١. مانای ئەم فەرموودەیە سەرلێدەرنەچوونێکی تێدایە سەبارەت بە گەڕاندنەوەی ڕۆح بۆ پێغەمبەری خوا. جا بۆ تێگەیشتن لە ماناو مەبەستەکەی بڕوانە: فَتْحُ الْبَارِي / ٦ / ٤٨٨. هەروەها بڕوانە ڕیسالەیەکی ئیمامی (سُيُوْطِيّ) بەناونیشانی (انْتِبَاهُ الْأَذْكِيَاءِ بِحَيَاةِ الْأَنْبِيَاءِ) لە کتێبی (الْحَاوِيْ لِلْفَتَاوِيْ).

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥٠ / بە ژمارە: ٣٥٤٥.

عِنْدَهُ، فَلْيُصَلِّ عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ مَرَّةً، صَلَّى اللهُ -عَزَّ وَجَلَّ- عَلَيْهِ عَشْـراً».[1] واته: "ئەو کەسەی ناوی منی لەلادا برا، با صەلاواتم لەسەر بدات. چونکە بەڕاستی هەر کەسێك جارێك صـەلاواتم لەسـەر بـدات، خـوای گـەورە دە (١٠) ڕەحمـەتی بەسەردا دەبارێنێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، بـە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَـابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ، فَلَمْ يُصَـلِّ عَلَيَّ، فَقَدْ شَقِيَ».[2] واته: "ئەو کەسەی ناوی من ببرێت لەلایداو، صەلاواتم لەسەر نەدات، ئەوە بەڕاستی بەدبەختو نەگبەتە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویەتی: «الْبَخِيْلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ». واته: "ڕژدو چرووك ئـەو کەسەیە، کە ناوی من ببرێت لەلایداو، صەلاواتم لەسەر نەدات".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨٣ - ١٨٤ / بە ژمارە: ٣٨٠. شـێخی (ابْـنُ السُّنِّيّ) ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (أَبُو يَعْلَى)وە ڕیوایـەت کـردوە. جـا شـێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: (رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى، وَرِجَالُهُ رِجَالُ الصَّحِيحِ). بڕوانـە: مُسْنَدُ أَبِيْ يَعْلَى / ٧ / ٧٥ / بە ژمارە: ٤٠٠٢، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١ / ١٣٧ / بـە ژمـارە: ٥٧٩. شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی -وەکو شـێخی (ابْنُ عَلاَّن) لێـەوە هێنـاویەتی-: وەسـفدار کردنی ڕشـتەکە بـە (جَيِّـد) لەلایـەن ئیمـامی نەوەویـەوە لـەو ڕووەوەیـە کـە کەسـەکانی متمانەدارن، ئەگینا ڕشتەکە بچڕانی تێدایە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٣ / ٣٢١. هەروەها بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٢ - ٣٣. بەڵام مامۆستای بەڕێز (سَلِيْم الْهِلالِيّ) لـە تـەخریجی ئەم حەدیسەدا نوسیویتی: حەدیسەکە لە ڕێگەی ترەوە بە ڕشتەی (حَسَن) هاتوە. بۆیە پلەی بەرز دەبێتەوە بۆ پلەی (صَحِيْح). بڕوانە: عُجَالَةُ الرَّاغِبِ الْمُتَمَنِّيْ فِيْ تَخْرِيْجِ كِتَـابِ عَمَـلِ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ لِابْنِ السُّنِّيّ / ١ / ١٢٢.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨٤ / بە ژمارە: ٣٨١.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِیح)ـە.[1]

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)شدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی (حُسَیْن)ی کوڕی ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).[2]

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) لەپاڵ ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی: لە یەکێك لە زانایانەوە ڕیوایەت کراوە، کە فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك لە کۆڕێکدا تەنها یەك جاریش صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدات (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئیتر بەسێتی‌و جێگەی بۆ دەگرێت، باوەکو چەند جارێکیش ناوی پێغەمبەری خوای تێدا برابێت.

## چۆنێتی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)

پێشتر لە ((**کتێبی زیکرەکانی نوێژ**))دا باسی ئەوەمان کرد، کە بەچی شێوەیەك صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدرێت (دروودی خوای لەسەر بێت). هەروەها باسی ئەو شتانەشمان کرد، کە پەیوەندیان بە صەلاواتدانەوە هەیەو، باسی ئەوەشمان کرد، کە تەواوترین صیغەی صەلاواتدان‌و، کورتترین صیغە کامەیە.

سەبارەت بەوەش کە هەندێك لە هاوەڵانی ئێمەو، زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِيْ زَیْد)ی (مَالِکِيّ)ش فەرموویانە: "سونەتە لە صەلاواتداندا ئەمەشی بۆ زیاد بکرێت: (وَارْحَمْ مُحَمَّداً وَآلَ مُحَمَّدٍ)"، ئەوە شتێکی بیدعەو داهێنراوەو، هیچ ئەصلێکی نیە.

جا پێشەوای پایەبەرز شێخ (أَبو بَکْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ)ی (مَالِکِيّ) لە کتێبی (عَارِضَةُ الْأَحْوَذِيّ فِيْ شَرْحِ التِّرْمِذِيّ)دا زۆر بە توندی بەرپەرچی ئەو بۆچوونەی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٥١ / بە ژمارە: ٣٥٤٦.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْیَوْمِ وَاللَّیْلَة (النَّسَائِيّ) / ١٦٣ / بە هەردوو ژمارە: ٥٥ و ٥٦.

داوەتەوەو، شێخی (ابْنُ أَبِي زَيْد)یشی بە هەڵە داناوەو، ئەو کەسەشی بە نەزان داناوە، کە شتی وا دەکات. ئەوجا فەرموویەتی: چونکە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) خۆی فێری کردوین کە چۆن صەلاواتی لەسەر بدەین. بۆیە زیاد کردنی شتێك بۆ فەرمایشتی ئەو، واتە فەرمایشتەکەی کەموکورتی تێدایەو دەبێت تەواو بکرێت!!! تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.[1]

---

(١) شێخی عەسقەلانی پێی وایە کە زیاد کردنی (وَارْحَمْ مُحَمَّداً وَآلَ مُحَمَّدٍ) بیدعە نیە، بەڵکو ئەصڵیشی هەیەو، لە چەند حەدیسێکدا لە ڕێگەی هەر چوار هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)و (ابْنُ مَسْعُوْد)و (ابْنُ عَبَّاس)و (بُرَيْدَة)وە هاتوە. ئەوجا یەکە یەکە حەدیسەکان دەهێنێتو، پاشان دەفەرموێت: ئەم حەدیسانە پشتی یەکتر دەگرنو، هەمووشیان دەبن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە زیاد کردنەکە ئەصڵێکی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٨ – ٤٠. ئیمامی (سُيُوْطِيّ)ش دوای ئەوەی فەرمایشتەکەی شێخی عەسقەلانیو فەرمایشتی چەند زانایەکی تریش بەدرێژی دەهێنێت، خۆیشی دەفەرموێت: ئەو حەدیسانەی شێخی عەسقەلانی هێناونی دەبن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە درووستە بە شوێن صەلاتو سەلامەکەدا داوای ڕەحمەتو سۆز بۆ پێغەمبەری خوا بکرێت (واتە: بوترێت: صَلِّ وَسَلِّمْ وَتَرَحَّمْ عَلَى النَّبِـيِّ). بەڵام ئەگەر بەتەنها بوترێت: پێغەمبەر (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئەوە پێچەوانەی ئەدەبەو، پێچەوانەی ئەوەشە، کە ئەو فەرمانی پێ کردوە لە چۆنێتی صەلاواتدان لەسەریو، هیچ بەڵگەیەکیشی لەبارەوە نەهاتوە. بڕوانە: تُحْفَةُ الْأَبْرَار / ٨٣.

## باسێك: {كۆكردنەوەو بەیەكەوە هێنانی صەلاتو سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)}

ئەگەر كەسێك صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدات (دروودی خوای لەسەر بێت)، با صەلاتو سەلام بەیەكەوە كۆبكاتەوەو، تەنها یەكێكیان نەڵێت. واتە: نە تەنها بڵێت: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ)و، نە تەنها بشڵێت: (عَلَيْهِ السَّلامُ).[1]

## باسێك: {صەلاواتدان بە دەنگی بەرز}

ئەو كەسەی حەدیس دەخوێنێتەوە، یان هەر كەسێكی تری وەكو ئەو، ئەگەر ناوی پێغەمبەری خوای هێنا (دروودی خوای لەسەر بێت)، سونەتە بەدەنگی بەرز صەلاتو سەلامی لەسەر بداتو، زۆریش دەنگ بەرز نەكاتەوە.

جا لەو زانایانەی كە فەرموویانە با صەلاواتەكە بە دەنگی بەرز بدرێت: پێشەوای پایەبەرز (خَطِيْب)ی (بَغْدَادِيّ)و، چەند زانایەكی تریش، كە فەرمایشتەكەیانم لە كتێبی (عُلُوْمُ الْحَدِيْث)ەوە نقلّ كردوە.

هەروەها زانایانی هاوەڵانو، زانایانی تریش فەرموویانە: لەدوای تەلبیە كردنەوە {واتە: لەدوای وتنی (لَبَّيْكَ اللّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ)ەوە} سونەتە بە دەنگی بەرز صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدرێت (دروودی خوای لەسەر بێت). خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

---

(١) چونكە خوای گەورە فەرمانی كردوە، كە هەردووكیان بەیەكەوە كۆبكرێنەوە. وەكو فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ [الأحزاب: ٥٦].

## باسی دەست پێکردنی نزاو پاڕانەوە بە سوپاس و ستایشی خوای گەورەو، صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)و (نَسَـائِيّ)دا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (فَضَـالَة)ی کـوڕی (عُبَيْـد)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، گوێی لە پیاوێك بوو، کە لە نوێژدا دوعای دەکردو دەپاڕایـەوە (واتـە: لـەدوای تـەحیاتی کۆتاییـەوە)، کەچـی ستایشی خوای گەورەی نەکردو، صەلاواتیشی لەسەر پێغەمبەری خـوا نـەدا. بۆیـە پێغەمبەری خوا فەرمووی: "ئەو پیاوە پەلەی کرد". پاشان بانگی کردو، بە ئەو، یان بە کەسێکی تری فەرموو: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، فَلْيَبْدَأْ بِتَمْجِيـدِ (أَوْ بِتَحْمِيـد) رَبِّـهِ سُبْحَانَهُ، وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ». واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی دوعا بکاتو بپاڕێتـەوە، بـا سـەرەتا بـە بەرزڕاگرتنو سوپاسو ستایشی خـوای پـەروەردگار دەسـت پـێ بکـاتو، ئـەوجا صەلاوات لـەسەر پێغەمبەری خوا بداتو، پاشان چی دەوێت با داوای بکاتو بـۆی بپاڕێتەوە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمـامی (عُمَـر)ی کوڕی (خَطَّاب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: نـزاو پاڕانـەوە لـە نێـوان ئاسمانەکانو زەویدا ڕادەوەستێنرێت، هیچی لێ بەرز نابێتەوە، هەتا صەلاوات لـەسـەر پێغەمبەرەکەت نەدەیت (دروودی خوای لەسەر بێت).[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٦٧ / بە ژمـارە: ١٤٨١، وَسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥١٧ / بـە ژمارە: ٣٤٧٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ٤٤ / بە ژمارە: ١٢٨٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٥٦ / بە ژمارە: ٤٨٦. حەدیسێکی لاوازە، بەڵام لـە چـەند ڕێگەیەکی ترەوە بە چەند دەقێکی جیاواز ڕیوایەت کراوە، بۆیە دەکرێت پلەی بەرز ببێتـەوە

منیش دەڵێم: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە سونەتە نزاو پاڕانەوە بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکات، پاشان بە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت). هەروەها کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە سونەتە بەو دوانەش کۆتایی پێ بهێنرێت و، فەرمایشتێکی زۆریش لەم بارەوە هاتون.

## باسی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەران و لەسەر خزم و کەس وکارەکانیشیان بە شوێن ئەواندا

زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (درودی خوایان لەسەر بێت) دروستە و سونەتیشە.

بە هەمان شێوە زانا متمانەدارەکان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەرەکانی تر، لەسەر فریشتەکانیش هەر دروستە و سونەتیشە.

بەڵام سەبارەت بە کەسانی تر بێجگە لە پێغەمبەران، ئەوە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن، کە نابێت سەرەتاو سەربەخۆ صەڵاوات بدرێت لەسەریان. بۆیە نابێت بوترێت: "ئیمامی (أبو بَكْر) (درودی خوای لەسەر بێت)".

جا بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بەم نا دروستی و ڕێگەپێنەدانە:

هەندێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: صەلاواتدان لەسەر ئەو کەسانە بەو جۆرە کارێکی حەرام و ناڕەوایە. بەڵام زۆرێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: کارێکی ناپەسەندەو، زۆرێکیشیان فەرموویانە: باشتر وایە کە نەکرێت، نەك ناپەسەند بێت.

---

بۆ پلەی حەدیسی (حَسَن). بڕوانە: كَنْزُ الْعُمَّال / ٢ / ٢٦٨ – ٢٧٠ / بە ژمارەکانی: ٣٩٨٤ – ٣٩٨٨.

بەڵام بۆچوونی ڕاستو درووست، کە زۆربەی زانایـانی لەسـەرە ئەوەیـە، کـە صەڵاواتدانی لەو جۆرە کارێکی ناپەسەندە. چونکە شیعاری خەڵکانی بیدعـەکارەو، ئێمەش نەهیمان لێکراوە، کە شوێن شیعاری ئەوان بکەوین. خۆ کاری ناپەسـەندیش هەر ئەو کارەیە، کە نەهیەکی تایبەتی لەبارەوە هاتبێت.

هاوەڵانمان فەرموویانە: بۆچوونی پشت پێ بەستراو لەم مەسـەلەدا ئەوەیـە، کـە زانایانی (سَلَف) صەلاواتیان تەنها بۆ پێغەمبەران بـەکار هێنـاوە (دروودی خوایـان لەسـەر بێـت). وەکو چۆن (عَزَّ وَجَلَّ)ش تایبەتە بـە خـوای گـەورەوە. جـا هـەروەکو چـۆن ناوترێت (مُحَمَّد -عَزَّ وَجَلَّ-)، ئەگەرچی کەسێکی گەورەو پایەداریشە. بـە هـەمان شێوە ناوترێت: (أَبُو بَكْر) یان (عَلِيّ) (دروودی خوایان لەسەر بێت)، ئەگەرچـی لـەڕووی مانەشەوە درووست بێت.

زانایانیش یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە درووستە لە صەلاواتداندا کەسانی تـر بکرێن بە شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکان. وەکو ئەوەی کە بوترێت: (اللّهُمَّ، صَلِّ عَلَـى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، وَأَصْحَابِهِ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِـهِ، وَأَتْبَاعِـهِ). چـونکە چـەند حەدیسێکی (صَحِيْح) لەوبارەوە هاتووەو، ئێمەش فەرمانمان پێ کراوە، کە لـە تەحیاتی نوێژدا صەلاواتی لەو جۆرە بدەینو، بەردەوامیش زانایـانی (سَـلَف) لـە دەرەوەی نوێژیشدا هەر صەلاواتی لەو جۆرەیان داوە.

سەبارەت بە سەلامیش، زانای پایەبەرز (أَبُو مُحَمَّد)ی (جُوَيْنِيّ) -کە یەکێکە لـە هاوەڵانمان- فەرموویەتی: ئەویش هەر مانای صەلاتی هەیە. بۆیـە بـۆ کەسـی غائـب بەکار ناهێنرێتو، بە تەنهاش بۆ غەیری پێغەمبەران بـەکار ناهێنرێـتو، ناشـوترێت: (عَلِيٌّ -عَلَيْهِ السَّلامُ-). جا لەم مەسەلەدا زیندوو مردوو وەکو یەك وەهان.

سەبارەت بە کەسی ئامادەش، درووستە ڕووی تـێ بکرێـتو، بوترێـت (سَـلامٌ عَلَيْكَ)، یان (سَلامٌ عَلَيْكُمْ)، یان (السَّلامُ عَلَيْكَ)، یان (السَّلامُ عَلَيْكُمْ). کـە ئەمـەش

کۆدەنگی لەسەرەو، لەمەولاش -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- لە باسەکانی سلاّو کردندا ڕوونی دەکەینەوە.

## باسێك: {داواکردنی ڕەزامەندی خوا بۆ هاوەڵانو، ڕەحمی خواش بۆ شوێنکەوتوان}

سونەتە داوای ڕەزامەندیو ڕەحمەتی خوا بکرێت بۆ سەر هاوەڵانو شوێنکەوتوانو زانایانو خواناسانو تێکڕای چاکەکارانی دوای ئەوانیش. بۆ نموونە بوترێت: (خوای لێ ڕازی بێت)، یان (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).... یان شتێکی لەو جۆرە.

سەبارەت بەوەش، کە یەکێك لە زانایان فەرموویەتی: "ڕستەی (خوای لێ ڕازی بێت) تایبەت بۆ هاوەڵان بەکاردەهێنرێتو، بۆ غەیری ئەوانیش تەنها دەوترێت (ڕەحمەتی خوای لێ بێت ")". ئەوە بەو شێوە نیە کە ئەو فەرموویەتیو، کەسیش ئەو بۆچوونەی ئەوی نیە. بەڵکو بۆچوونی درووست، کە زۆربەی زانایانی لەسەرە، ئەوەیە کە ڕستەی (خوای لێ ڕازی بێت) بۆ غەیری هاوەڵانیش هەر سونەتە بەکاربهێنرێتو، بەڵگەکانی بەکارهێنانیشی لەوە زۆرترن کە هەژمار بکرێن.

جا ئەگەر ئەو کەسەی باس دەکرێت، یەکێك بێت لە هاوەڵانو، کوڕی یەکێکیش بووبێت لە هاوەڵان، ئەوا با بوترێت: (عَبْدُاللّه)ی کوڕی ئیمامی (عُمَـر) (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت) فەرموویەتی.

بە هەمان شێوە: بۆ (ابْنُ عَبَّاس)و، (ابْنُ الزُّبَيْر)و، (ابْنُ جَعْفَر)و، (أُسَامَة)ی کوڕی (زَيْد)و، هاووێنەکانیشیان با هەر وا بوترێت. تاوەکو ڕستەکە داگرەوە بێت بۆ خۆیانو بۆ باوکیشیان.

## باسێك: {حوكمی صەلاواتدان لەسەر (لُقْمَان)ی داناو خاتوو (مَرْیَم)}

ئەگەر پرسیار بکرێت‌و بوترێت: باشە ئەگەر کەسێك ناوی (لُقْمَان)و، (مَرْیَم)ی برد، ئایا وەکو پێغەمبەران صەلاواتیان لەسەر بدات، یان وەکو هاوەڵانو ئەولیاکان داوای ڕەزامەندی پەروەردگاریان بۆ بکات، یان بڵێت: (عَلَیْهِمَا السَّلَامُ)؟

وەڵامەکەی ئەمەیە: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن، کە ئەو دوو پایەبەرزە پێغەمبەر نینو، ئەو کەسەش شازو نامۆیە، کە فەرموویەتی: هەردووکیان پێغەمبەرن. بۆیە لاناکرێتەوە بەلای فەرمایشتەکەیداو، پشتی پێ نابەسترێت. منیش ئەم مەسەلەیم لە کتێبی (تَهْذِیْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَاتِ)دا ڕوونکردۆتەوە.

ئەوجا یەکێك لە زانایان فەرمایشتێکی هەیە، کە وای لێوە وەردەگیرێت، ئەگەر کەسێك وتی: (قَالَ لُقْمَانُ)، ئەوا با بڵێت: (صَلَّى اللهُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ وَعَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، یان ئەگەر وتی: (قَالَتْ مَرْيَمُ)، ئەوا با بڵێت: (صَلَّى اللهُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ وَعَلَيْهَا وَسَلَّمَ). جا ئەو زانایە فەرموویەتی: چونکە (لُقْمَان)و (مَرْیَم) هەردووکیان پلەیان لە پلەی ئەو کەسە بەرزترە، کە دەرهەقی دەوترێت: (خوای لێ ڕازی بێت). چونکە لە قورئانی پیرۆزدا بەو جۆرە بە پلەبەرزی باسکراون.

منیش وای دەبینم، کە ئەم بۆچوونە خراپەیەکی تێدا نیە. بەڵام باشتر وایە بۆ هەردووکیان بوترێت: (خوای لێ ڕازی بێت). چونکە ئەم ڕستەیە بۆ غەیری پێغەمبەران بەکاردەهێنرێت. خۆ سابتیش نەبوە، کە ئەوان پێغەمبەر بن. بەڵکو زانای پایەبەرز (إِمَامُ الْحَرَمَيْنِ) کۆدەنگی زانایانی نقلّ کردوە لەسەر ئەوەی، کە خاتوو (مَرْیَم) پێغەمبەر نیە -ئەمەی لە کتێبی (الإِرْشَاد إِلَى قَوَاطِعِ الْأَدِلَّةِ فِي أُصُوْلِ الاعْتِقَاد)دا باس کردوە-.

ئەوجا ئەگەر بۆ (لُقْمَان) بوترێت: (عَلَيْهِ السَّلَام)و، بۆ (مَرْیَم)یش بوترێت (عَلَيْهَا السَّلَام)، ئەوە بە ڕواڵەت هیچ خراپەیەکی تێدا نیە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

بزانە، کە ئـەو زیکرانـەی لـە باسـەکانی پێشـوودا هێنـامن، لـە هـەموو ڕۆژو شەوێکدا دووبارە دەبنەوە، هەر بەو شێوەیەی، کە باسمان کردن.

سەبارەت بەوانەش، کە ئێستە باسیان دەکەم، کۆمەڵە زیکرو پاڕانەوەیەکن، لـە چەند کـاتێکی دیـاریکراودا، لەبـەر چـەند هۆکـارێکی تـازە پێشـهات. هـەر بۆیـە ڕیزبەندیەکی تایبەتیان تێدا ڕەچاو ناکرێت.

## باسی داواکردن لە خوای گەورە، کە چی چاکە ئەوەت بۆ بکات (دُعَاءُ الِاسْتِخَارَةِ)

بۆمان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی بوخاریـدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، بـۆ هـەموو کـارو فرمانێـك فێـری دوعـاو نوێـژی (اسْتِخَارَة)ی دەکردین، وەکو چۆن فێری سورەتێکی قورئانی پیرۆزی دەکردین. جـا دەیفـەرموو: «إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيْضَةِ، ثُـمَّ لِيَقُـلْ: "اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَسْتَخِيْرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيْمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ، وَلا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ، وَلا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوْبِ. اللَّهُمَّ، إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِيْ فِيْ دِيْنِيْ وَمَعَاشِيْ وَعَاقِبَةِ أَمْرِيْ، (أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِيْ وَآجِلِهِ)، فَاقْدُرْهُ لِيْ، وَيَسِّرْهُ لِيْ، ثُمَّ بَارِكْ لِيْ فِيْهِ. وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِـيْ فِـيْ دِيْنِـيْ وَمَعَاشِيْ وَعَاقِبَةِ أَمْرِيْ، (أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِيْ وَآجِلِهِ)، فَاصْرِفْهُ عَنِّيْ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِيْ بِهِ"». ئەوجا با پێویستیو مەبەستەکەی خۆی بڵێت.[1] واتـە: "ئەگەر یەکێك لـە ئێوە ویستی کارێك ئەنجام بدات، با دوو ڕکات نوێـژی سـونەت بکات، پاشان بڵێت: خوایە، من داوات لێ دەکـەم بـەو زانسـتەی کـە هەتـە دڵـم

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٩١ / بە ژمارە: ١١٠٩.

گوشاد بکە بۆ ئەوەی خەیری تێدایە لە کردن یان نەکردنی ئەم کارە، داوای هێزو پشتیوانیشت لێ دەکەم بەو هێزو توانایەی کە هەتە، لێشت دەپاڕێمەوەو داوات لێ دەکەم بەو نازو نیعمەتو بەخششو فەزڵە گەورەیەی کە هەتە، چونکە بەڕاستی تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو، منیش بە لوتفی تۆ نەبێت توانام بەسەر هیچ شتێکدا نیە، تۆ زاناو ئاگاداریت بە هەموو شتێكو، منیش بە لوتفی تۆ نەبێت ئاگام لە هیچ شتێك نیەو، تۆش زاناو شارەزای بە هەموو شتە پەنهانو شاراوەکان. خوایە، ئەگەر تۆ دەزانیت ئەم کارە خەیرو چاکەی تێدایە بۆ ئاینو ژیانو سەرەنجامی کارو پاشەڕۆژی من (یان بۆ دنیاو دوارۆژم)، ئەوا لە چارەمی بنوسەو، بۆشمی ئاسان بکەو، پاشان بەرەکەتیشی تێ بخە بۆم. ئەگەر دەشزانیت ئەم کارە شەڕو خراپەی تێدایە بۆ ئاینو ژیانو پاشەڕۆژی من (یان بۆ دنیاو دوارۆژم)، ئەوا لێمی لادەو، خەیرو چاکەش لە هەرکوێ بێت بۆمی ئاسان بکەو لە چارەمی بنووسەو، پاشان واشم لێ بکە کە پێی ڕازی بم".

زانایان فەرموویانە: سونەتە (اسْتِخَارَة) بە نوێژو بەو دوعایەی بکرێت، کە باسمان کرد. نوێژەکەش دوو ڕکات نوێژی سونەتەو، بۆچوونی بەهێزیش لەسەر ئەوەیە، کە ئەم نوێژە بە کردنی دوو ڕکات نوێژی سونەتی ڕاتبەی پێشو دوای نوێژە فەرزەکانیش هەر دێتەجێو، بە نوێژی سونەتی سلاوی چوونە ناو مزگەوت (تَحِيَّةُ الْمَسْجِد)و، بە سونەتەکانی تریش هەر دێتەجێ {ئەگەر نیەتی نوێژی (اسْتِخَارَة)شی لێ بهێنرێت}.

جا با نوێژخوێنەکە لە ڕکاتی یەکەمدا، لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنێتو، لە ڕکاتی دوەمیشدا سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ

أَحَدٌ﴾ بخوێنێت.[1] خۆ ئەگەر بۆی نەکرا نوێژەکە بکات، با دوعای (اسْتِخَارَة)کە بکات.

سونەتیشە لە سەرەتاو لە کۆتایی دوعاکەوە سوپاسو ستایشی خوای گەورە بکاتو، صەلاتو سەلامیش لەسەر پێغەمبەری خوا بدات.

ئەوجا (اسْتِخَارَة) لە هەموو کارێکدا سونەتە، وەکو لە دەقی حەدیسە (صَحِيْح)ـەکەدا بە ڕاشکاوی هاتبوو.

جا ئەگەر (اسْتِخَارَة)کەی کرد، ئیتر با بڕوات بەدەم ئەوەی، کە دڵی لەسەری دامەزراوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز – کە ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و غەیری ئەویش بە لاوازیان داناوە– لە ئیمامی (أَبُوْ بَكْر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بیوستایە کارێك بکات، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، خِرْ لِيْ، وَاخْتَرْ لِيْ».[2] واتە: "خوایە چی خەیرو چاکە ئەوەم بۆ هەڵبژێرە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَا أَنَسُ، إِذَا هَمَمْتَ بِأَمْرٍ، فَاسْتَخِرْ رَبَّكَ فِيْهِ

---

(١) هەندێکیش لە زانایان لە ڕکاتی یەکەمدا ئایەتەکانی (٦٨ – ٧٠)ی سورەتی (الْقَصَص)یان خوێندوەو، لە ڕکاتی دوەمیشدا ئایەتەکانی (٣٦ – ٣٨)ی سورەتی (الْأَحْزَاب)یان خوێندوە. هەندێکی تریش هەردوو سورەتی (الرَّحْمَن)و (الْحَشْر)یان تێدا خوێندوونو، هەندێکی تریش هەردوو سورەتی (الْأَعْلَى)و (اللَّيْل)یان تێدا خوێندوون. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ١ / ٤٩٥، وتُحْفَةُ الْأَبْرَار / ٨٤ – ٨٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٥ / بە ژمارە: ٣٥١٦.

سَبْعَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ انْظُرْ إِلَى الَّذِيْ سَبَقَ إِلَى قَلْبِكَ، فَإِنَّ الْخَيْـــرَ فِيْـــهِ».[1] واتـه: "ئـەی (أَنَس)، ئەگەر ویستت کارێك ئەنجام بدەیت، حەوت جار داوا لـە خـوا بکـە چـی چاکە ئەوەت بۆ بکات، پاشان تەماشای ئەوە بکە، کـە دڵـت بـۆی چـوە، چـونکە بەڕاستی خەیر لـەوەدایە".

ڕشتەکەی (غَرِيْب)ـەو، کەسانێکیشی تێدایە، کە نایانناسم.[2] خواش لە هـەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٢٨١ – ٢٨٢ / بە ژمارە: ٥٩٨.

(٢) شێخی عەسقەلانیو شێخ (بَدْرُ الدِّيْن)ی (عَيْنِيّ) فەرموویانە: مامۆستاکەمان (زَيْـــنُ الـــدِّيْن) {مەبەستیان حافظی عێراقیە} فەرموویەتی: تەواوی کەسەکانی ڕشتەی حەدیسەکە ناسراون، بەڵام یەکێکیان بەوە ناسراوە کە زۆر لاوازە، ئەویش بریتیە لە (إِبْرَاهِيْم)ی کـوڕی (بَـــرَاء)، کە کوڕەزازای هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ی کـوڕی (مَالِك)ـــەو، زانـای پایەبـەرز (أَبُـــو جَعْفَر)ی (عُقَيْلِيّ)و شێخی (ابْنُ حِبَّان)و (ابْن عَدِيّ)و (أَبُو الْفَتْح)ی (أَزْدِيّ) لـە ڕیـزی کەسـە لاوازەکاندا ناویان هێناوەو باسیان کردوە. بۆیـە حەدیسـەکە بـۆ بەڵگـە هێنانـەوە ناشـێت. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٦٩ – ٧٠، وعُمْدَةُ الْقَارِيْ / ٧ / ٢٢٥. هەروەها بڕوانە: تُحْفَةُ الْأَبْرَار / ٨٦.

# کۆمەڵە باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی، کە لەکاتی تەنگانەو نەهامەتیەکاندا دەخوێنرێن

## باسی دوعای خەمو خەفەتو، پاڕانەوە لەکاتی ناڕەحەتیدا

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لەکاتی خەمو خەفەتدا دەیفەرموو: «لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيْمُ الْحَلِيْمُ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيْمُ».(1) واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای مەزنی خاوەن حیلمو بەئارام. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای پەروەردگاری عەرشی مەزن. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویو عەرشی بەڕێزو پیرۆز".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەگەر شتێکی ناڕەحەتی بەسەردا بهاتایە، یان تووشی خەفەتێك بوایە، وای دەفەرموو.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەگەر شتێك خەمباری بکردایە، دەیفەرموو: «يَا حَيُّ، يَا قَيُّوْمُ،

---

(1) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٣٦ / بە ژمارە: ٥٩٨٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٩٢ / بە ژمارە: ٢٧٣٠.

بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيْثُ».[1] واته: "ئەی پەروەردگاری زیندوو، ئەی خواوەندی چاودێرو پارێزەری هەمیشەیی، داوات لێ دەکەم بە ڕەحمەتی خۆت بێیت بە هانامەوە".

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر شتێك پێغەمبەری خوای نارەحەت بکردایە (درودی خوای لەسەر بێت)، سەری بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمانو، دەیفەرموو: «سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيْمِ». ئەگەر زۆریش بپاڕایەتەوە، دەیفەرموو: «يَا حَيُّ، يَا قَيُّوْمُ».[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: زۆرترین دوعای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، بریتی بوو لە: «اللَّهُمَّ، آتِنَا فِيْ الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِيْ الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».[4] واتە: "خوایە، لە دنیادا بەشی باشو چاکمان خەڵات بکەو، لە دوارۆژیشدا هەر بەشی باشو چاکمان پێ ببەخشەو، لە سزای ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٣٩ / بە ژمارە: ٣٥٢٤.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٦٨٩ / بە ژمارە: ١٨٧٥. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئیمامی (حَاكِم) حەدیسەکەی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە ڕیوایەت کردوە، نەك لە ڕێگەی (أَنَس)ـەوە.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٥ / بە ژمارە: ٣٤٣٦. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (غَرِيْب)ـە. بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (إِبْرَاهِيم)ی کوڕی (فَضْل)ـەوە، کە زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کەسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٨٠ – ٨١.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٤٧ / بە ژمارە: ٦٠٢٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٠ / بە ژمارە: ٢٦٩٠.

ئیمامی موسلیم لە ڕیوایەتەکەی خۆیدا ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: جا (أَنس)یش ئەگەر بیویستایە تەنها یەك دوعا بکات، ئەو دوعایەی دەکردو، ئەگەر بیشیویستایە دوعا (زۆر) بکات، لەناو دوعاکانیدا ئەو دوعایەشی دەکرد.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (نَسَائِيّ)و کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (جَعْفَر){ی کوڕی (أَبو طَالِب)}ەوە، ئەویش لە ئیمامی (عَلِيّ)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەم وشانەی فێر کردمو، فەرمانیشی پێ کردم، کە ئەگەر خەمێك یان نارەحەتیەکم بەسەردا هات، بیانخوێنم: «لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْكَرِيْمُ الْعَظِيْمُ، سُبْحَانَهُ، تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِيْنَ». واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای بەخشندەی مەزن، پاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی، کە پەروەردگاری عەرشی مەزنە، سوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری عالەم".

جا (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (جَعْفَر)یش ئەو وشانەی دەخوێندو فووی دەکرد بەسەر کەسی تادارداو، فێری ئەو کچانەی خۆیشی دەکرد، کە شوویان بە کەسانی بێگانە کردبوو.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو بَكْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: دوعای کەسی خەمبار بریتیە لە: «اللّهُمَّ، رَحْمَتَكَ أَرْجُو، فَلا تَكِلْنِيْ إِلَى نَفْسِيْ طَرْفَةَ

(١) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ١٦٢ / بە ژمارە: ١٠٤٦٦، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٦٥ – ١٦٦ / بە ژمارە: ٣٤١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٨٤ – ٨٦.

عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِيْ شَأْنِيْ كُلَّهُ، لا إِلَـهَ إِلاَّ أَنْـتَ».[1] واتـه: "خوايـه، مـن هيـوام بـه ڕەحمەتو بەزەیی تۆ هەیە، تۆش بە ئەندازەی چاوتروکاندنێك مەمسپێرە بـە نەفسـی خۆمو، هـەموو کاروبارەکانیشـم بـۆ سـازو ڕێكوپێـك بکـە، هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لـە ژنـەهاوەڵی خۆشەویست (أَسْمَاء)ی کچی (عُمَيْس)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموويـەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێـت)، پێی فەرمووم: هەندێك وشەت فێر نەکـەم، کە لەکاتی نارەحەتیو خەمباریدا بیانخوێنێـت؟: بلّـێ: «اللهُ اللهُ رَبِّيْ، لا أُشْـرِكُ بِــهِ شَيْئاً».[2] واته: "خوا پەروەردگارمەو، هیچ شـتێکیش ناکـەم بـە شـەریكو هـاوەڵ بۆی".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو قَتَادَة)وە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموويـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموويەتی: «مَنْ قرأ: "آيَةَ الْكُرْسِــيِّ" وَ"خَــوَاتِيْمَ سُــورَةِ الْبَقَرَةِ" عِنْدَ الْكَرْب، أَغَاثَهُ (أَعَانَهُ) اللهُ -عَزَّ وَجَلَّ-».[3] واته: "ئەو کەسەی لـەکاتی خەمو پەژاردا (آيَةَ الْكُرْسِيّ)و هەردوو ئایاتی کۆتایی سـورەتی (الْبَقَــرَة) بخوێنێـت، خوای گەورە دێت بەهانایەوەو، هاوکاری دەکات".

---

(١) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٥ / بە ژمارە: ٥٠٩٠. شێخ (نُوْرُ الـدِّيْن)ی (هَيْثَمِــيّ)و شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (حَسَن)یان داناوە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٣٧ / بە ژمارە: ١٧١٣١، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٨٨.

(٢) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٧٧ / بە ژمارە: ١٥٢٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَــه / ٢ / ١٢٧٧ / بە ژمارە: ٣٨٨٢. شێخی عەسقەلانی فەرموويەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ــە. بڕوانـە: نَتَـائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٨٩ - ٩٠.

(٣) بڕوانه: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٦٧ / بـە ژمـارە: ٣٤٤. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٩٠.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبو وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: لـە پێغەمبـەری خـوام بیسـتوە (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، کـە فەرموویـەتی: مـن فەرمایشتێکت فێر دەکەم، هەر خەمبارێك بیخوێنێت، خەمەکەی لەسەر لادەچێت‌و، دەرووی خەیری لێ دەکرێتەوە. فەرمایشتەکەش بریتیە لەم فەرمایشتەی (یُـونُس)ی برام (دروودی خوای لەسەر بێت): ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّـي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ [الأَنْبِيَاء: ٨٧].(١) واتە: {حـەزرەتی (یُـونُس) لـە تاریکایـەکانی شەوو نـاو دەریـاو نـاو سـکی حوتەکـەدا دەپاڕایـەوەو دەیفـەرموو: خوایـە، هـیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە تۆ، پاك‌و بێگـەردی بـۆ تۆیـە، بەڕاسـتی مـن یەکێکم لەو کەسانەی ستەمیان لەخۆیان کردوە}.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش هەر ئەم حەدیسەی لـە (سَـعْد)ەوە ڕیوایـەت کـردوە، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «دَعْوَةُ ذِيْ النُّوْنِ، إِذْ دَعَا رَبَّهُ، وَهُوَ فِيْ بَطْنِ الْحُوْتِ: ﴿لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِيْ شَـيْءٍ قَـطُّ، إِلاَّ اسْـتَجَابَ اللهُ لَـهُ».(٢) واتـە: "نـزاو پاڕانەوەکەی حەزرەتی (یُونُس)، کاتێـك پێـی پاڕایـەوە لـە سـکی نەهەنگەکـەداو، فەرمووی: ﴿لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾، هەر موسوڵمانێك بـۆ هەر شتێك بیخوێنێت، خوای گەورە نزاو پاڕانەوەکەی گیرا دەکات".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٦٦ / بـە ژمـارە: ٣٤٣. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٩١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٢٩ / بە ژمارە: ٣٥٠٥. ئیمامی نەوەوی لە ((کتێبـی نـزاو پاڕانەوە گشتگیرەکان))دا جـارێکی تـر ئـەم حەدیسـە دەهێنێتـەوەو، دەفـەرموێت: ئیمـامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. هـەروەها شـێخی عەسـقەلانیش فەرموویـەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٩٣.

## ئەگەر شتێك ترساندی یان لە شتێك دەترسا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ثَوْبَان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەگەر ترسی لە شتێك هەبوایە، دەیفەرموو: «هُوَ اللّهُ، اللهُ رَبِّـي، لا شَـرِيْكَ لَهُ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، لە زانای پایەبەرز (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَيْب)ـەوە، ئەویش لە باوکی خۆیەوە، باوکیشی لە باپیرەی خۆیەوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، چەند وشەیەکی فێردەکردین بۆ کاتی ترسان، وشەکانیش ئەمانەبوون: «أَعُوْذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ، مِنْ غَضَبِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِيْنِ، وَأَنْ يَحْضُرُوْنِ». جا هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَمْرو) {کە باپیرەی (شُعَيْب)ـەو ڕاوی حەدیسەکەیە} ئەم وشانەی فێری منداڵە فامدارو ژیرەکانی خۆی دەکردو، ئەوانەشی، کە فامیان نەبوو، بۆی دەنووسینو، هەڵیدەواسی پێیاندا.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٦٢ / بە ژمارە: ٣٣٥. دەقی حەدیسەکە لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکەی ئەم کتێبەدا بەم جۆرە هاتوە: «هُوَ اللّهُ رَبِّي، لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا». شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٩٤ – ٩٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠٥ / بە ژمارە: ٣٨٩٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٤١ / بە ژمارە: ٣٥٢٨.

## ئەگەر خەمو خەفەتێکی تووشبوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ أصَابَهُ هَمٌّ أوْ حَزَنٌ، فَلْيَدْعُ بِهَذِهِ الْكَلِماتِ، يَقُوْلُ: "اللّهُمَّ، أنَا عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكَ، وَابْنُ أَمَتِكَ، فِـيْ قَبْضَـتِكَ، نَاصِيَتِيْ بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ؛ أسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أوْ أنْزَلْتَهُ فِيْ كِتَابِكَ، أوْ عَلَّمْتَه أحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أوِ اسْتَأثَرْتَ بِهِ فِيْ عِلْـمِ الغَيْبِ عِنْدَكَ، أنْ تَجْعَلَ الْقُرآنَ نُوْرَ صَدْرِيْ، وَرَبِيْعَ قَلْبِيْ، وَجَلاءَ حُزْنِـيْ، وَذَهَـابَ هَمِّيْ"». واتە: "ئەو کەسەی خەمو پەژارەیەکی تووشهات، با بەم چەند وشەیە بپاڕێتەوەو، بڵێت: (خوایە، من بەندەی تۆمو، کوڕی بەندەی تۆمو، کوڕی کەنیزەکی تۆشم، خۆمو چارەنووسم لە بەردەستی قودرەتی تۆدان، حوکمو فەرمانت لەبارەی منەوە جێگیرەو تێپەڕیوە، بڕیاریشت لەبارەی منەوە دادپەروەرانەیە، لێت دەپاڕێمەوە بۆ خاتری هەریەکە لەو ناوە پیرۆزانەی کە هەتنو، کردووتن بەناو بۆ خۆت، یان لە کتێبەکەتدا داتبەزاندوون، یان فێری کەسێك لە دروستکراوەکانی خۆتت کردوە، یان لە زانستە نهێنیەکەی لای خۆتدا هەڵت گرتوەو پاراستووتە، لێت دەپاڕێمەوە کە قورئانی پیرۆز بکەیتە ڕۆشنایی‌و بەهاری دڵمو، بیکەیتە ڕەوێنەرەوەی خەمو پەژارەو، لابەری دڵتەنگیم)".

جا پیاوێك عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی کەسی زەرەرمەند ئەو کەسەیە، کە ئاگای لەم وشانە نیە!" ئەویش فەرمووی: «أجَلْ. فَقُولُوهُنَّ وَعَلِّمُوهُنَّ، فإنَّهُ مَنْ قَالَهُنَّ الْتِماسَ ما فِيهِنَّ، أذْهَبَ اللهُ تَعالى حُزْنَهُ، وأطالَ فَرَحَهُ». واتە: "بەڵێ. دەی ئێوەش خۆتان بیڵێنو، خەڵکیش فێربکەن. چونکە هەر کەسێك ئەم وشانە

بلێت، بە هیوای دەستکەوتنی ماناو ناوەڕۆکەکانیان، خوای گەورە خەمو خەفەتەکەی لادابات و، دڵخۆش و ئاسوودەی دەکات.[١]

## ئەگەر کەوتە ناو نەهامەتی و کارەساتێکەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيِّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «يَا عَلِيُّ، ألا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، إِذَا وَقَعْتَ فِيْ وَرْطَةٍ، قُلْتَهَا؟». واتە: "ئەی عەلی، چەند وشەیەکت فێر نەکەم، ئەگەر کەوتیتە ناو نەهامەتی و کارەساتێکەوە، بیانخوێنێت؟" منیش عەرزم کرد: "بەڵێ فێرمکە، خوا بمکاتە قوربانت". ئەویش فەرمووی: ئەگەر کەوتیتە ناو نەهامەتی و کارەساتێکەوە، بڵێ: «بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيْمِ». چونکە خوای گەورە بەم چەند وشەیە، ئەوەندەی خۆی بیەوێت، جۆرەها بەڵاو نەهامەتی لادەدات.[٢]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ١٦٤ / بە ژمارە: ٣٣٩. شێخی عەسقەلانی ئەم حەدیسەی بە لاواز داناوەو، پاشان فەرموویەتی: شێخی (ابْنُ السُّنِّيِّ) لەدوای ئەم حەدیسەوە حەدیسێکی تری هاوشێوەی لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە ڕیوایەت کردوەو، حەدیسەکەی (ابْنُ مَسْعُوْد)یش لەڕووی ڕشتەوە سابت ترەو، کەسەکانیشی مەشهورترن و، هەندێکیش لە پێشەوایان بە حەدیسێکی (صَحِيْح)یان داناوە. جا سەیرە بەلامەوە ئیمامی نەوەوی خۆی لەو حەدیسە بەهێزە لاداوە بۆ ئەم حەدیسە لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٩٨.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ١٦٣ / بە ژمارە: ٣٣٦. حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٠٢ - ١٠٣.

## ئەگەر لە خەڵکانێك ترسا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، بە ڕشتەی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگـەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ترسی لە خەڵکانێك هەبوایـە، دەیفـەرموو: «اللّهُمَّ، إِنَّا نَجْعَلُكَ فِيْ نُحُوْرِهِمْ، وَنَعُوْذُ بِكَ مِنْ شُرُوْرِهِمْ».[1] واتـە: "خوایـە ئێمـە هێزو دەسەڵاتی تۆ دەدەین بەگژیانداو، پەناشت پێ دەگرین لە شەڕو خراپەیان".

## ئەگەر لە دەسەڵاتدارێك ترسا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەگەر لە دەسەڵاتدارێك یان لـە کەسـێکی تر ترسایت، بڵێ: «لا إِلهَ إِلاّ اللهُ الْحَلِيْمُ الْحَكِيْمُ، سُبْحَانَ اللّهِ رَبِّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، لا إِلهَ إِلاّ أَنْتَ، عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ (وَلا إِلَـهَ غَيْـرُكَ)».[2] واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوای بەحیلمو کاربـەجێ، پـاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە، کە پـەروەردگاری حـەوت ئاسمانـەکانو، پـەروەردگاری عەرشی مەزنە. خوایە بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، ئەو کەسـەش

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٤٨٠ / بە ژمـارە: ١٥٣٧، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ الْكُبْـرَى / ٥ / ١٨٨ / بە ژمارە: ٨٦٣١.

(٢) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٦٧ - ١٦٨ / بـە ژمـارە: ٣٤٥. حەدیسـێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٠٦.

لەپەنای تۆدایە کەسێکی بەهێزو بەڕێزەو، ستایشــی تـۆش زۆر مـەزنو گەورەیـەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە، بێجگە لە تۆ"

هـەروەها سـونەتە ئـەو زیکـرەش بکـات، کـە لـە باسـەکەی پێشـوودا لـە حەدیسەکەی (أَبُوْ مُوْسَى)دا هێنامان.

## ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: لـە یـەکێك لـە جەنگەکاندا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین (دروودی خوای لەسـەر بێـت)، جـا کـە ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە، گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا فـەرمووی: «يَا مَالِكَ يَوْمِ الدِّيْنِ، إِيَّاكَ أَعْبُدُ، وَإِيَّاكَ أَسْـتَعِيْنُ». واتـە: "ئـەی خـاوەنو پاشـای ڕۆژی جـەزاو پاداشت، تەنها تۆ دەپەرستمو، تەنها داوای یارمەتیو کۆمەکیش لە تۆ دەکەم". جـا (أَنَس) دەفەرموێت: چەندین کەسـم دەبینـی لـە دوژمنـەکان، کـە بەردەبوونـەوەو دەمردن، بەهۆی ئەوەی فریشتەکانی خوا لە پێشەوەو لە پشتەوە لێیان دەدان.[1]

هـەروەها سـونەتە ئـەو زیکـرەش بکـات، کـە لـە باسـەکەی پێشـووتردا لـە حەدیسەکەی (أَبُوْ مُوْسَى)دا هێنامان.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٦٢ / بـە ژمـارە: ٣٣٤. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١١١ - ١١٢.

## ئەگەر شەیتانێك خۆی پیشاندا، یان لە شەیتان ترسا چی بلێت؟

- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾. [فُصِّلَت: ٣٦]. واتە: {ئەگەر وەسوەسەو خەیالاتێك لە شەیتانەوە ڕووی لە دڵت کرد، پەنا بەخوا بگرە، چونکە بەڕاستی خوا بیسەرو زانایە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَاباً مَسْتُوراً﴾. [الإسْرَاء: ٤٥]. واتە: {ئەگەر تۆ قورئان بخوێنیت، ئێمەش پەردەو بەربەستێك لەنێوان تۆو ئەو کەسانەدا دادەنێین، کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە}.

جا بۆیە دەبێت (أَعُوْذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ) بکات، پاشان چەندی بۆ کرا قورئان بخوێنێت.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو الدَّرْدَاء)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هەستا نوێژ بکات، ئێمەش گوێمان لێی بوو، کە فەرمووی: «أعُوذُ بِاللهِ مِنْكَ». پاشان سێ جار فەرمووی: «أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللّهِ». ئەوجا دەستی درێژکرد، وەکو بڵێیت، شتێکی وەردەگرت. جا کە لە نوێژەکە بوویەوە، عەرزمان کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، گوێمان لێت بوو لە نوێژەکەدا شتێکت فەرموو، کە پێشتر لێما نەبیستبووی! چاویشمان لێت بوو دەستت درێژکردا!" ئەویش فەرمووی: «إنَّ عَدُوَّ اللهِ إِبْلِيْسَ جَاءَ بِشِهَاب مِنْ نَار، لِيَجْعَلَهُ فِيْ وَجْهِي، فَقُلْتُ: "أَعُوذُ بِاللهِ مِنْكَ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قُلْتُ: "أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللهِ التَّامَّةِ، فَاسْتَأْخَرَ، ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَرَدْتُ أَنْ آخُذَهُ، وَاللهِ لَوْلا دَعْوَةُ أخِيْ سُلَيْمَانَ، لَأَصْبَحَ مُوْثَقاً، تَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِيْنَةِ».[1] واتە: "(إِبْلِيْس)ی دوژمنی خوا کڵپەو بڵێسەی ئاگرێکی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٣٨٥ / بە ژمارە: ٥٤٢.

هێنا، تا بیدات بە دەم‌و چاومدا، منیش سێ جار وتم: (پەنا بەخوا دەگرم لە تۆ)، پاشان وتم: (منیش هەر بەو لەعنەتە تەواوەی خوای گەورە لەعنەتت لێ دەکەم‌و، داوا دەکەم خوای گەورە لە ڕەحمەتی خۆی دوورت بخاتەوە)، ئەوەبوو سێ جار کشایەوە پاش، ئەوجا ویستم بیگرم، سوێند بە خوا، لەبەر نزاو پاڕانەوەکەی (سُلَيْمَان)ی برام نەبوایە[1]، دەبوو (بە یەکێك لە پایەکانی مزگەوتەوە) بمبەستایەتەوەو، بەیانی منداڵانی مەدینە گەمەیان پێ بکردایە".

منیش دەڵێم: هەروەها باش وەهایە بانگێك بدات، هەر وەکو بانگی نوێژە فەرزەکان. چونکە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە زانای پایەبەرز (سُهَيْل)ی کوڕی (أَبُو صَالِح)ـەوە، کە فەرموویەتی: جارێك باوکم {کە ناوی (ذَكْوَان)ی کوڕی (عَبْدُالله)یەو، ناسراوە بە (أَبُو صَالِح)ی (سَمَّان)و، یەکێکە لە گەورە شوێنکەوتوان} ناردمی بۆلای هۆزی (بَنُو حَارِثَة)و، خزمەتکارێکی خۆمانم (یان هاوڕێیەکی خۆمم) لەگەڵدا بوو. جا بانگکەرێك لە پشتی دیواری باخێکەوە بانگی لە خزمەتکارەکە (یان لە هاوڕێکەم) کردو، ئەویش لەسەر دیوارەکەوە تەماشای کردو، هیچی نەبینی. منیش ئەم ڕووداوەم بۆ باوکم گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە تووشی ئەوە دەبیت، نەمدەناردیت. بەڵام ئەگەر لەمەولا گوێت لە دەنگێکی لەو جۆرەوە بوو، دەست بکە بە بانگدان. چونکە من گوێم لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە بوو (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لە پێغەمبەری خوای دەگێڕایەوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەو فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا نُودِيَ بِالصَّلَاةِ، أَدْبَرَ».[2] واتە: "بەڕاستی ئەگەر بانگ بدرێت، شەیتان پشت هەڵدەکات‌و دەڕوات".

---

(١) کە فەرموو بووی: ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِي﴾ [ص: ٣٥]. واتە: {ئەی پەروەردگارم، لێم خۆشبەو، دەسەڵاتێکی وەهام پێ ببەخشە، کە لەدوای من بەکەس نەدرێت}.

(٢) بڕوانە: صَحِيحُ مُسْلِم / ١ / ٢٩١ / بە ژمارە: ٣٨٩.

## ئەگەر كارێك زۆری بۆ هێنا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيْفِ، وَفِيْ كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَلا تَعْجِزَنَّ. وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ، فَلاَ تَقُلْ: "لَوْ أَنِّيْ فَعَلْتُ كَذَا، كَانَ كَذَا وَكَذَا"، وَلَكِنْ قُلْ: "قَدَّرَ اللّهُ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ"، فَإِنَّ "لَوْ" تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ».[1] واتە: "باوەڕداری بەهێزو بەتوانا بەلای خوای گەورەوە لە باوەڕداری بێهێزو نەتوانكار باشترو خۆشەویسترەو، هەردووكیشیان هەر خەیریان تێدایە. جا تۆش سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێتو، داوای كۆمەكو هاوكاری لە خوا بكەو، تەمبەڵو دەستەپاچە مەبە. ئەگەر شتێكیشت توشبوو، مەڵێ: (ئەگەر وەهام بكردایە، ئاوەهاوەها دەبوو). بەڵكو بڵێ: (خوا تەقدیری وەهایەو، چیشی بوێت ئەنجامی دەداتو دەیكات). چونكە وتنی وشەی (ئەگەر) دەرگا بۆ وەسوەسەی شەیتان دەكاتەوە (واتە: وەكو بڵێیت: تۆ بە تەقدیری خوا ڕازی نیت، بۆیە دەڵێیت: ئەگەر ئاوام بكردایە، ئاوا دەبوو)".

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَوْف)ی كوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، سەبارەت بە كێشەو ناكۆكی نێوان دوو پیاو لە بەرژەوەندی یەكێكیان بڕیاری دا، جا ئەوەیان كە بڕیارەكە لە دژی ئەو بوو، كاتێك پشتی هەڵكرد، وتی: (حَسْبِيَ اللّهُ، وَنِعْمَ الوَكِيْلُ). پێغەمبەریش فەرمووی: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى يَلُوْمُ عَلَى الْعَجْزِ، وَلَكِنْ عَلَيْكَ بِالْكَيْسِ، فَإِذَا غَلَبَكَ أَمْرٌ، فَقُلْ: حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكِيْلُ».[2] واتە: "بەڕاستی خوای گەورە لەسەر كەمتەرخەمیو نەتوانكاری لۆمەو سەرزەنشتی

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٥٢ / بە ژمارە: ٢٦٦٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٣٧٧ / بە ژمارە: ٣٦٢٧. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١١٨.

ئادەمیزاد دەکات. بۆیە دەبێت وریاو لەسەرخۆبیت. جا ئەگەر شتێك زۆری بۆ هێنایت و دەرەقەتی نەدەهاتیت، ئەوجا بڵێ: (حَسْبِيَ اللّهُ، وَنِعْمَ الوَكِيْلُ)".

منیش دەڵێم: (كَيْس) بۆ چەند مانایەك بەکار دەهێنرێت. یەکێك لەوانە بریتیە لە لەسەرخۆیی. جا مانای حەدیسەکە -خواش لە هەموو کەس زانا ترە- ئەوەیە، کە کارو فرمانت بە لەسەرخۆیی ئەنجام بدە، بەجۆرێك بتوانیت لەسەری بەردەوام بیت.

## ئەگەر کارێکی لەسەر گران بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اللّهُمَّ، لا سَهْلَ إِلاَّ مَا جَعَلْتَهُ سَهْلاً، وَأَنْتَ تَجْعَلُ الْحَزْنَ، إِذَا شِئْتَ، سَهْلاً».[1] واتە: "خوایە هیچ کارێك ئاسان نیە، بێجگە لەوەی تۆ ئاسانت کردوە، تۆش ئەگەر بتەوێت زەوی ڕەقان دەکەیت بە نەرمان".

منیش دەڵێم: (الْحَزْن) بریتیە لە زەوی ڕەقان.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٧١ / بە ژمارە: ٣٥١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١١٩.

## ئەگەر بژێوی لەسەر گران بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا يَمْنَعُ أحَدَكُمْ إذَا عَسُـرَ عَلَيْـهِ أمْـرُ مَعِيْشَتِهِ، أنْ يَقُولَ إذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ: "بِسْمِ اللهِ عَلَى نَفْسِيْ وَمَالِيْ وَدِيْنِيْ. اللّهُمَّ، رَضِّنِيْ بِقَضَائِكَ، وَبَارِكْ لِيْ فِيْمَا قُدِّرَ لِيْ، حَتَّى لا أُحِبَّ تَعْجِيْلَ مَا أخَّـرْتَ، وَلا تَـأْخِيْرَ مَـا عَجَّلْتَ"».[1] واتە: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە بژێوی ژیانی لەسەر گران بوو، چی شتێك ڕێگری لێ دەکات، کە لەو کاتەدا لەماڵ دەردەچێت، بڵێت: "(بِسْـمِ اللهِ) لەسەر خۆمو ماڵو ئاینم. خوایە ڕازیم بکە بە قەزاو بڕیاری خۆتو، بەرەکەتیشم بۆ بخەرە ئەوەی، کە لەچارەم نووسراوە، هەتا حەزم لە پێشخستنی ئەو کارە نەبێت، کە تۆ دوات خستوەو، حەزیشم لە دواخستنی ئەو کارە نەبێت، کە تۆ پێشت خستوە".

## چی بڵێت بۆ لادان و لەکۆڵبوونەوەی بەلاو نەگبەتی؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أنَس)ی کوڕی (مَالِك)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَا أنْعَمَ اللهُ –عَزَّ وَجَلَّ– عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً فِيْ أهْلٍ وَمَالٍ وَوَلَدٍ، فَقَالَ: "مَا شَاءَ اللهُ، لا قُوَّةَ إلاّ بِاللّهِ"، فَيَرَى فِيْهَا آفَـةً دُوْنَ الْمَوْتِ».[2] واتە: "ئەگەر خوای گەورە نازو نیعمەتێك بەسەر بەندەیەکیدا

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٧٠ – ١٧١ / بە ژمارە: ٣٥٠. حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ١٢١.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ١٧٣ / بە ژمارە: ٣٥٧. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ١٢٢ – ١٢٣.

بڕیژێت سەبارەت بە خێزانو ماڵو منداڵیو، ئەویش بڵێـت: (مَا شَاءَ اللهُ، لا قُوَّةَ إلاّ بِاللّهِ)، ئەوا بەر لـە مردنی خۆی، نابینێت ئەوانە تووشی هیچ بەڵاو نەگبەتیەك بن".

## ئەگەر بەڵاو نەگبەتیەکی کەم یان زۆری تووش بوو چی بڵێت؟

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِيْنَ * الَّذِيْنَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيْبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ * أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِـمْ وَرَحْمَـةٌ وَأُولَئِـكَ هُـمُ الْمُهْتَـدُونَ﴾ [الْبَقَـرَة: ١٥٥ - ١٥٧]. واتـە: {مـژدەش بـدە بـەو کەسـە ئـارامگرو خۆگرانەی، کە ئەگەر بەڵاو ناڕەحەتیەکیان تووشبێت، دەڵێن: "ئێمە موڵکی خـوای گـەورەینو، بـۆلای ئـەویش دەگەڕێنـەوە". ئەوانـە سـۆزو ڕەحمـەتیان لەلایـەن پەروەردگاریانەوە بەسەردا دەبارێتو، ئەوانەش ڕێگەپیشاندراوو هیدایەتدراون}.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویـەتی: «لِيَسْتَرْجِعْ أَحَدُكُمْ فِيْ كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّـى فِـيْ شِسْعِ نَعْلِهِ، فَإِنَّها مِنَ الْمَصَائِبِ».[1] واتە: "با هەریەکـە لـە ئێـوە بـۆ هـەموو بـەڵاو نەگبەتیەك (إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْـهِ رَاجِعُـونَ) بکـات، ئـیتر بـاوەکو بـۆ پچـڕانی پـەلکی نەعلەکەشی بێت، چونکە بچڕانی ئەویش یەکێکە لە بەڵاو نەگبەتیەکان".

منیش دەڵێم: (شِسْع) بریتیە لە پەلکەی نەعل.

(١) بڕوانـە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّـنِّيّ) / ١٧١ - ١٧٢ / بـە ژمـارە: ٣٥٢. شـێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی لاوازە، بەڵام پاڵپشتی هەیە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٢٣ - ١٢٦.

## ئەگەر قەرزێکی لەسەر بوو، نەیدەتوانی بیداتەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە کۆیلەیەکی نوسراوبۆکراو هات بۆ خزمەتیو، عەرزی کرد: "من توانای بەجێهێنانی ئەرکی ناو نوسراوەکەم نیە، جەنابت یارمەتیم بدە". ئیمامی (عَلِيّ)ش فەرمووی: "ئایا چەند وشەیەکت فێر نەکەم، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فێری کردوم؟ ئەگەر بە ئەندازەی کێوێك {لە هەندێك نوسخەدا نوسراوە: بە ئەندازەی کێوی (صِيْر)} قەرزت لەسەر بێت، خوای گەورە لەسەرتی لادەبات؟ بڵێ: «اللَّهُمَّ، اكْفِنِيْ بِحَلالِكَ عَنْ حَرَامِكَ، وَأَغْنِنِيْ بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ». واتە: "خوایە بەو شتانەی حەڵاڵت کردوون بێ نیازم بکە لەو شتانەی حەرامت کردونو، بە لوتفو فەزڵی خۆشت بێ نیازم بکە لە غەیری خۆت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[١]

پێشتریش لە (**باسی ئەوەی لە بەیانیانو ئێوارانـدا دەوترێـت**)، ئـەو حەدیسـەی (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)مان هێنا، لـە ڕێگـەی هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُـو سَـعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، سەبارەت بە چیرۆکی ئەو هاوەڵە خۆشەویستەی، کە پێی دەوترا (أَبُوْ أُمَامَة)و، عەرزی پێغەمبەری خوای کردبوو، کە خەمبارو قەرزارە.[٢]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٠ / بە ژمارە: ٣٥٦٣.

(٢) پێغەمبەری خواش پێی فەرموە: بەیانیانو ئێواران بڵێ: «اللَّهُمَّ، إِنِّيْ أَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوْذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ».

## ئەگەر كەسێك هەستی بە تەنهاییو دڵتەنگی دەكرد چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (وَلِيْد)ی كوڕی (وَلِيْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت) {كە برای (خَالِد)ی كوڕی (وَلِيْد) بوە}، ئەو عەرزی پێغەمبەری خوای كردوە (دروودی خوای لەسەر بێت): ئەی پێغەمبەری خوا، هەست بە تەنهاییو دڵتەنگی دەكەم! پێغەمبەریش فەرمووی: "ئەگەر چوویتە سەر جێگەی خەوتن، بڵێ: "أعُوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِيْنِ، وَأنْ يَحْضُرُوْنِ" ئیتر ئەو حاڵەتە زیانت پێ ناگەیەنێت، (یان گونجاوترە بوترێت) نزیكت نابێتەوە".[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَرَاء)ی كوڕی (عَـازِب)ـەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، سكاڵای دڵتەنگیو بێ تاقەتی دەكرد، پێغەمبەریش فەرمووی: ئەم زیكرە زۆر بكە: «سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوْسِ، رَبِّ الْمَلائِكَةِ وَالرُّوْحِ، جَلَّلْتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأرْضَ بِـالْعِزَّةِ وَالْجَبَرُوْتِ». جا پیاوەكەش زیكرەكەی كرد، ئیتر دڵتەنگیو بێ تاقەتیەكەی لەسەر لاچوو.[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٢ / بە ژمارە: ٦٣٨. حەدیسێكی (حَسَن)ـەو، پێشتریش هێنامان.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٢ - ٣٠٣ / بە ژمارە: ٦٣٩. حەدیسێكی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ١٢٨.

## ئەگەر کەسێك تووشی وەسوەسە بوو چی بڵێت؟

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾. [فُصِّلَت: ٣٦].

جا باشترین شتێك کە بوترێت، ئەوەیە کە خوای گەورە لەم فەرمایشتەدا ئێمەی لەسەر پەروەردە کردوەو، فەرمانی پێ کردوین. {کە ئەویش بریتیە لە: پەنا بەخوا گرتن لە شەیتان}

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَأْتِيْ الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ، فَيَقُوْلُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ مَنْ خَلَقَ كَذَا؟ حَتَّى يَقُوْلَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَ ذَلِكَ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللّهِ، وَلْيَنْتَهِ».[١] واتە: "شەیتان لە ڕێگەی وەسوەسەو خەیاڵاتەوە دێتەلای یەکێك لە ئێوەو، لێی دەپرسێتو دەڵێت: (کێ فلاّنە شتی درووست کردوە؟)، (کێ فیسارە شتی بەدیهێناوە؟)، هەتا دەگاتە ئەوە دەڵێت: (کێ پەروەردگاری تۆی درووست کردوە؟)، جا کە گەیشتە ئەوە، با کەسەکە پەنا بەخوا بگرێتو، واز لەو خەیاڵاتانە بهێنێت".

لە ڕیوایەتێکی صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە: «لا يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُوْنَ، حَتَّى يُقَالَ: "هَذَا خَلَقَ اللهُ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟" فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذلِكَ شَيْئاً، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ وَرُسُلِهِ». واتە: "بەردەوام خەڵکی لەیەکتری دەپرسن، هەتا دەوترێت: (ڕاستە کە خوا بوونەوەری بەدیهێناوە، ئەی کێ خوای درووست کردوە؟) جا ئەو کەسەی پرسیارێکی وای ڕووبەڕوو بوویەوە، یان خەیاڵو وەسوەسەیەکی لەم جۆرەی بۆ درووستبوو، با بڵێت: (من باوەڕی تەواوم بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هەیە)".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١١٩٤ / بە ژمارە: ٣١٠٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٢٠ / بە ژمارە: ١٣٤.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ وَجَدَ مِنْ هَذَا الْوَسْوَاسِ شَيْئاً، فَلْيَقُلْ: "آمَنَّا بِاللهِ وَبِرُسُلِهِ" ثَلاثاً. فَإِنَّ ذلِكَ يَذْهَبُ عَنْهُ».(١) واتە: "ئەو کەسەی وەسوەسەیەکی لەم جۆرەی بۆ درووست بوو، با سێ جار بڵێت: (باوەڕی تەواومان بە خواو بە پێغەمبەرەکانی هەیە)، ئیتر ئەو وەسوەسەیەی نامێنێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُثْمَان)ی کوڕی (أَبو الْعَاص)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، شەیتان نوێژ کردنو قورئان خوێندنم لێ تێکدەدات!" پێغەمبەری خوایش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «ذلِكَ شَيْطَانٌ، يُقَالُ لَهُ خِنْزَبٌ، فَإِذَا أحْسَسْتَهُ، فَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْهُ، وَاتْفُلْ عَنْ يَسَارِكَ ثَلاثاً». واتە: "ئەوە شەیتانێکە، پێی دەوترێت: (خِنْزَبٌ)، جا کە هەستت بە شتێکی وەها کرد، پەنا بەخوا بگرە لەو شەیتانەو، سێ تفیش بکەرە لای چەپتەوە".

(عُثْمَان) دەفەرموێت: منیش وەهام کرد، ئیتر خوای گەورە لەکۆڵی کردمەوە.(٢)

منیش دەڵێم: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە حەرەکەی (خَاء)ەکە لە وشەی (خِنْزَب)دا:

- هەندێکیان فەرموویانە: (فَتْحَة)ی لەسەرە. واتە: بە (خَنْزَب) دەخوێنرێتەوە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٥ / بە ژمارە: ٦٢٦. دەقی حەدیسەکە بەم جۆرە لاوازە، بەڵام لە ڕێگەیەکی ترەوە بە درێژتر ڕیوایەت کراوەو، تەنها باسی (سێ جار)ەکەی تێدا نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٣٢ – ١٣٣. هەروەها دەشکرێت حەدیسەکەی پێشوو ببێتە پاڵپشت بۆ ئەم حەدیسە.

(٢) بڕوانە: صَحِيحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٨ / بە ژمارە: ٢٢٠٣.

• هەنـدێکیش فەرموویانـە: (کَسْـــرَةٌ)ی لەژێردایـە. واتـە: بـە (خِنْـــزَب) دەخوێنرێتەوە.
• هەندێکیش فەرموویانە: (ضَمَّةٌ)ی لەسەرە. واتە: بە (خُنْزَب) دەخوێنرێتەوە.

زانای پایەبەرز (ابْنُ الْأثِيْر) لە کتێبی (النِّهَايَةُ فِيْ غَرِيْبِ الْحَدِيْثِ وَالْـأثَر)دا ئـەم شێوازەی سێیەمی باس کردوە. بەڵام دوانەکەی یەکەمیان مەشهورو ناسراون. واتە: (خَنْزَب)و، (خِنْزَب).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی جوان (جَيِّـد)، لە (أَبُو زُمَيْل)ـەوە، کە فەرموویەتی: عەرزی هـاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّـاس)م کرد: ئەو شتە چیە لە دڵمدا هەستی پێ دەکەم؟ ئـەویش فـەرمووی: چـیە؟ منـیش عەرزم کرد: سوێند بەخوا قسە ناکەم. ئەویش پێکەنیو فـەرمووی: چـیە، گومانـە؟ پاشان فەرمووی: خۆ کەس لەوە ڕزگاری نەبوە، هەتا خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿فَإِنْ كُنْتَ فِي شَكٍّ مِمَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِيْنَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكَ﴾ [يُونُس: ٩٤]. واتـە: {تـۆ ئەگـەر گومانـت هەیـە سـەبارەت بـەوەی بۆمـان دامانبەزاندویت، بڕۆ پرسیار لـەو کەسـانە بکـە، کـە بـەر لـە تـۆ کتێبـی خوایـان خوێندوەتەوە (مەبەست تەوراتو ئینجیلە)}. ئەوجا پێی فەرمووم: ئەگـەر شـتێکت لە دڵدا هەست پێکرد، بڵێ: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ [الْحَدِيْد: ٣]. واتە: {خوا ئەو زاتەیە، کە لـەپێش هـەموو شـتێکەوە هـەبوەو، لەدوای نەمانی هەموو شتەکانیش هەر دەمێنێتو، دەسەڵاتدارو زاڵە بەسەر هـەموو شـتێکداو، زاتێکـی ئاشـکرایەو، کـەیش دەرکـی حەقیقەتەکـەی ناکـاتو، زانـاو شارەزاشە بە هەموو شتێك}.[1]

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٥٠ / بە ژمارە: ٥١١٠. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسـێکی لاوازی داناوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ١٣٧.

بە ڕشتەیەکی (صَحِیْح)یش لە (رِسَالَة)کەی زانای پایەبەرز (أَبُــو الْقَاسِـــم)ی (قُشَیْرِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، ئەویش لە خواناسی پایەبەرز (أَحْمَد)ی کوڕی (عَطَاء)ی (رُوْذْبَارِيّ)ــەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویـەتی: لــە مەسەلەی خۆشۆردنو دەستنوێژ گرتندا زۆر زۆرم پێ دەچوو، شەوێکیان دڵــم زۆر توند بوو، چونکە ئاوێکی زۆرم ڕژانـدو، دڵیشـم هـەر دانەمرکایـەوە، بۆیـە لەبەر خۆمەوە وتم: "ئەی پەروەردگارم، داوای لێبوردنو لێخۆشـبوونت لێ دەکـەم". جـا گوێم لە دەنگێکەوە بوو، کە فەرمووی: "لێبوردن لە زانسـتدایە. (واتـە: لێبـوردن کاتێکە کە بزانیت ئەمەی تۆ خـەریکیتی وەسوەسـەیە، نـەك دینـداری)". ئیتر ئـەو حاڵەتەم لەکۆڵبوویەوە.

هەندێکیش لە زانایـان فەرموویانـە: ئـەو کەسـەی تووشـی وەسوەسـە بـوە لــە دەسنوێژدا، یان لە نوێژدا، یان لە هەر شتێکی تردا سـونەتە (لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّه) بکـات. چونکە ئەگەر شەیتان گوێی لە زیکر بێت، دەگەڕێتەوەو دوور دەکەوێتـەوە. وە (لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّه)یش سەری هەموو زیکرەکانە.

جا هەر لەبەر ئەمەشە، کە صۆفیە خواناسە پایەبـەرزەکان، بـۆ پـەروەردەکردنی موریدو شوێنکەوتوەکانیان زیکـری (لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّــه)یـان هەڵبـژاردوە، تـا لــەکاتی تەنهاییـدا بیکـەنو، فەرمانیشـیان پـێ کـردون، کـە بـەردەوام بـن لەسـەری‌و، فەرمووشیانە: بەسـوودترین چارەسـەر بـۆ لەکۆڵبوونـەوەی وەسوەسـە بریتیـە لــە: زیکری خوا زۆر کردن.

خواناسی پایەبەرز (أَحْمَد)ی کـوڕی (أَبُو الْحَـــوَارِيّ)ش فەرموویـەتی: سـکاڵای وەسوەسەم بردە خزمەتی خواناسـی پایەبـەرز (أَبُو سُـــلَیْمَان)ی (دَارَانِـــيّ)، ئـەویش فەرمووی: ئەگەر دەتەوێت لێت جیاببێتەوە، هەر کاتێك هەستت پێ کرد، هەوڵ بدە خۆت بە شادومانو دڵخۆش پیشان بـدەیت. چـونکە ئەگـەر دڵخـۆش‌و شـادومان بیت، وەسوەسەو خەیاڵاتت نامێنێت. چونکە هیچ شـتێك نیـە بەقـەدەر دڵخۆشـی‌و

شادومانی کەسی ئیماندار لای شەیتان ناخۆش‌و بێزراو بێت. خۆ ئەگەر غەمبارو دڵتەنگیش بیت، ئەوە وەسوەسەکەت زیاتر دەبێت.

منیش دەڵێم: ئەم فەرمایشتەش پشتگیری ئەو فەرمایشتەی یەکێکێك لە پێشەوایان دەکات، کە فەرموویەتی: "بەڕاستی وەسوەسە توشی ئەو کەسە دەبێت، کە ئیمانی تەواو بووبێت. چونکە دز ڕوو لە ماڵی وێران ناکات".

## ئەوەی بەسەر کەسی شێت‌و گەوج‌و، کەسی گەزێنراودا دەخوێنرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُـدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) چوون بۆ سەفەرێك، تا ڕێیان کەوتە لای خێڵە عەرەبێك‌و، داوایان لێ کردن میوانداریان بکەن، ئەوانیش ڕازی نەبوون‌و میوانداریان نەکردن. جا شتێك گەورەی هۆزەکەی گەست (واتە شتێك پێوەی دا)، خەڵکی خێڵەکەش بە هەموو شتێك لەگەڵیدا خەریکبوون، هیچ شتێك سوودی بۆی نەبوو! ئەوجا هەندێکیان وتیان: ئەوە بۆ ناچن بۆلای ئەو کۆمەڵە کەسەی، کە هاتون بۆ ئێرە، بەڵکو شتێکیان پێبێت. ئیتر هاتن بۆلایان‌و، وتیان: خەلکینە، شتێك گەورەکەمانی گەستوە، ئێمەش بە هەموو شتێك لەگەڵیدا خەریکبووین، هیچ شتێك سوودی پێ ناگەیەنێت! ئایا لای هیچکام لە ئێوە شتێك دەست ناکەوێت؟ یەکێکیش لە هاوەڵەکان فەرمووی: "بەڕێ وەڵا من دوعایەکم لا دەست دەکەوێت". بەڵام ئێمە داوای میوانداریمان لێ کردن‌و، ئێوەش میوانداریتان نەکردین. بۆیە بەخوا دوعاتان بۆ ناکەم، تا شتێکمان لە بەرامبەریەوە بۆ بڕیار نەدەن. ئەوەبوو لەگەڵیاندا ڕێککەوتن لەسەر گەلە مەڕێك‌و، پاشان هاوەڵەکە چوو بۆلای خێڵەکەو سورەتی (الْفَاتِحَة)ی بەسەر گەورەکەیاندا خوێندو، تفی خۆی

دەکرد بەسەر شوێنە گەزێنراوەکەداو، ئیتر گەورەی خێڵەکە هەستایەوەو، هەروەکو لە پەت بەربوبێت، دەستی کرد بە ڕۆیشتن‌و، هیچ ئازاری نەماو، خێڵەکەش ئەوەی کە ڕێککەوتبوون لەسەری دایان بە کۆمەڵە هاوەڵەکە. جا هەندێکیان فەرموویان: با مەڕەکان دابەش بکەین. بەلاّم ئەوەیان کە دوعاکەی کردبوو فەرمووی: وا مەکەن، تاوەکو دەچینەوە خزمەتی پێغەمبەری خواو، بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕینەوە، تا بزانین ئەو فەرمانی چیمان پێ دەکات. جا کە گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش بەو هاوەڵەی فەرموو، کە دوعاکەی کردبوو: "باشە چۆنت زانی، کە ئەو سوورەتە دوعایە؟!" ئەوجا بە پێکەنینەوە فەرمووی: "کارێکی ڕاست‌و درووستتان کردوەو، مەڕەکانیش دابەش بکەن‌و، لەگەڵ خۆتاندا بەشێکیش بۆ من دابنێن".[١]

جا ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریە، کە لە هەموو دەقەکانی تر تەواوترە.

لە یەکێك لە ڕیوایەتەکانیشدا هاتوە، کە هاوەڵەکە دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة)و، لیکی دەمی خۆی کۆدەکردەوەو، جێگە گەزێنراوەکەی پێ تەڕ دەکرد، ئیتر کابراش چاکبوویەوە.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە گەورەی خێڵەکە فەرمانی کرد سی (٣٠) مەڕ بدەن بە هاوەڵەکە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە زانای پایەبەرز (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبِيْ لَيْلَى)وە، ئەویش لە پیاوێکەوە، ئەویش لە باوکیەوە، کە وتوویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواو عەرزی کرد: "براکەم ئازاری هەیە". پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: "ئازاری چی هەیە؟"

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٧٩٥ / بە ژمارە: ٢١٥٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٧ / بە ژمارە: ٢٢٠١.

ئەویش عەرزی کرد: "جۆرە شێتیەکی هەیە". پێغەمبەریش فەرمووی: "دەی بنێرە بەشوێنیدا با بۆم بهێنن". جا براکەی هات‌و، لە بەردەستی پێغەمبەردا دانیشت‌و، ئەویش ئەم سورەت‌و ئایەتانەی بەسەردا خوێند:

- سورەتی: (الْفَاتِحَة).
- چوار ئایەت لە سەرەتای سورەتی (الْبَقَرَة) {کە بریتین لە: ﴿الم * ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ * الَّذِيْنَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ * وَالَّذِيْنَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ [الْبَقَرَة: ١ - ٤]. واتە: {الم. ئەو قورئانە پیرۆزە گومانی تێدا نیە کە لای خواوە هاتوەو، هیدایەتدەرو ڕێگەپیشاندەرە بۆ لە خواترسان. ئەوانەی باوەڕیان بە شتە پەنهانەکان هەیەو، نوێژەکان بەچاکی ڕادەپەڕێنن‌و، لەو ڕزق‌و ڕۆزیەش پێمان داون لەڕێگەی خەیرو چاکەدا خەرجی دەکەن. ئەوانەش کە باوەڕیان بەو قورئانە هەیە، کە بۆ تۆ دابەزێنراوەو، بەو کتێبانەش کە پێش تۆ دابەزێنراون‌و، باوەڕی تەواویشیان بە ڕۆژی دوایی هەیە}.
- دوو ئایەت لە ناوەڕاستی سورەتی (الْبَقَرَة): ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ * إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ [الْبَقَرَة: ١٦٣ - ١٦٤]. واتە: {خوای ئێوە تەنها یەك خوایەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لەو، کە زاتێکی بەخشندەی میهرەبانە. بەڕاستی لە بەدیهێنان‌و درووست کردنی ئاسمانەکان‌و زەویداو، لە جیاوازی شەوو ڕۆژداو، لەو کەشتیانەی بۆ بەرژەوەندی خەڵکی بەناو دەریادا دێن‌و دەچن‌و، لەو ئاوەی خوای گەورە لە ئاسمانەوە دایباراندوەو، زەوی لەپاش مردن پێ زیندوو کردۆتەوەو، لە هەموو جۆرە گیانلەبەرێکی بەسەردا بلاوکردۆتەوەو، لەو گۆڕانکاریەی، کە بەسەر

باو هەوری ڕامکراودا دێت لەنێوان ئاسمانو زەویدا چەندین بەڵگەی گەورەیان تێدایە بۆ ئەو کەسانەی، کە خاوەنی عەقڵو هۆشن}.

- (آيَةُ الْكُرْسِيِّ) {کە بریتیە لە: ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِيْ يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾. [الْبَقَرَة: ٢٥٥]}. واتە: {خوای گەورە ئەو خوایەیە، کە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، زاتێکی زیندووەو سەرپەرشتیارو چاودێری کاروباری بوونەوەرانە، وەنەوز نایگرێتو، خەویشی لێ ناکەوێت، ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە موڵکی ئەوە، ئەو کەسە کێیە، کە بێ ئیزنو ڕێگەپێدانی ئەو بتوانێت تکاو شەفاعەت بکات؟ زاتێکی زاناو ئاگادارە بە هەموو ئەوەی لەبەردەستی خەڵکیدایەو، ئەوەش کە لەدوای ئەوانەوە پەیدا دەبێت، خەڵکیش پەی بە هیچ شتێك لە زانستی ئەو نابەن، مەگەر ئەوەی کە خۆی ویستبێتیو ڕەزامەندی لەسەر هەبێت، کورسیەکەی فراوانەو جێگەی هەموو ئاسمانەکانو زەوی تێدا دەبێتەوەو، پاراستنی ئاسمانەکانو زەوی ئەو زاتە ماندوو ناکاتو، زاتێکی بالاّدەستو مەزنە}.
- سێ ئایەت لە کۆتایی سورەتی (الْبَقَرَة) {کە بریتین لە: ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ * آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ * لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾. [الْبَقَرَة: ٢٨٤ - ٢٨٦]}. واتە: {ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە موڵکی

خوایە، جا ئەو شتەی کە لە ناختاندایە چی ئاشکرای بکەن، یان بیشارنەوە، خوا هەر بەهۆیەوە لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات، ئەوجا لەو کەسە خۆش دەوێت، کە خۆی دەیەوێتو، سزای ئەو کەسەش دەدات، کە خۆی دەیەوێتو، خوای گەورەش توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پێغەمبەری خوا باوەڕی تەواوی بەوە هەیە، کە لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆی دابەزێنراوەو، ئیماندارانیش باوەڕیان پێیەتی، هەمووشیان باوەڕیان بەخوای گەورەو، بە فریشتەکانیو، بە کتێبەکانیو، بە پێغەمبەرەکانی هێناوەو، دەشڵێن: ئێمە جیاوازی لەنێوان هیچکام لە پێغەمبەرەکانی خوادا ناکەینو، وتووشیانە: ئێمە فەرمایشتی خوامان بیستوەو، گوێڕایەڵیشمان لیّ کردوە، ئەی پەروەردگارمان، لێمان خۆشبە، ئێمەش تەنها بۆلای تۆ دەگەڕێینەوە. خوای گەورە تەکلیف لە هیچ نەفسێك ناکات، بە کارێك نەبێت کە لەتوانایدا بێت، هەر نەفسێك پاداشتو سزای کارو کردەوەی خۆی وەردەگرێتەوە، باوەڕداران دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو، یان هەڵەیەکمان کرد لێمان مەگرە، ئەی پەروەردگارمان، باری گران مەخەرە سەرشانمان، وەکو خستبوتە سەر شانی ئەوانەی پێش ئێمە، ئەی پەروەردگارمان، بارێك مەخەرە سەر شانمان، کە توانای جێبەجیّ کردنو هەڵگرتنیمان نەبێتو، بمانبوورەو، لێمان خۆشبەو، بەزەییت پێماندا بێتەوە، تۆ گەورەو سەرپەرشتیارمانی، بەسەر کافرو بێباوەڕەکاندا سەرمان بخە}.

- ئایەتێك لە ئایەتە سەرەتاییەکانی سورەتی (آل عِمْرَان): کە بریتیە لە: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِماً بِالْقِسْطِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [آل عِمْرَان: ١٨]. واتە: {خوای گەورە شایەتی دەدات، کە بێجگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، فریشتەو زاناکانیش ئەو شایەتیە دەدەن، خوای گەورە بڕیارەکانی دادپەروەرانەیەو، بێجگە لە ئەویش هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، زاتێکی بەدەسەڵاتی کاربەجێیە}.

- ئایەتێك لە سورەتی (الْأعْرَاف): كە بریتیە لە: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللهُ الَّذِيْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ [الأعْرَاف: ٥٤]. واتە: {بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە بریتیە لەو خوایەی، كە لە شەش ڕۆژدا ئاسمانەكانو زەوی درووست كردووەو، پاشان باڵی دەسەڵاتی بەسەر عەرشدا ڕاكێشاوەو، شەو دەكات بە پەردە بۆ داپۆشینی ڕۆژو، بە پەلە شوێنی دەكەوێتو، خۆرو مانگو ئەستێرەكانیش بە فەرمانی ئەو ڕامو ملكەچ بوون، جا بزانن، كە بەدیهێنانو درووست كردنو فەرمانو بڕیار هەر بەدەستی ئەوە، جا پاكو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی، كە پەروەردگاری هەموو عالەمە}.
- ئایەتێك لە سورەتی (الْمُؤْمِنُوْن): كە بریتیە لە: ﴿فَتَعَالَى اللهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ [الْمُؤْمِنُوْن: ١١٦]. واتە: {بەرزو باڵایە ئەو خوایەی، كە پادشای ڕاستەقینەیەو، بێجگە لە ئەویش هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیەو، هەر ئەویش پەروەردگاری عەرشی بەڕێزو بەقەدرە}.
- ئایەتێك لە سورەتی (الْجِنّ): كە بریتیە لە: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلا وَلَداً﴾ [الْجِنّ: ٣]. واتە: {بەرزو بەڕێزە پایەو مەقامی پەروەردگارمان، كە نە هاوسەرو نە منداڵیشی بۆ خۆی بڕیار نەداوە}.
- دە ئایەت لە سەرەتای سورەتی (الصَّافَّات) {كە بریتین لە: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا * فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا * فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا * إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ * رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ * إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ * وَحِفْظًا مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ مَارِدٍ * لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ * دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ * إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾. [الصَّافَّات: ١ – ١٠]}. واتە: {سوێند بەو فریشتانەی بەڕیز وەستاون بۆ خواپەرستی. ئەوجا سوێند بەو فریشتانەی ڕێگری لە هەوری ئاسمان دەكەنو دەیهێنن و دەیبەن. سوێند بەو فریشتانەی فەرمایشتی خوا دەخوێننەوە. بەڕاستی

خوای ئێوه هەر یەك خوایە. پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویەو، پەروەردگاری ئەو بوونەوەرانەشە، کە لە نێوان ئاسمانەکانو زەویدانو، پەروەردگاری ئەو جێگایانەشە، کە خۆریان لێوه هەڵدێت. بەڕاستی ئێمە نزیکترین ئاسمانمان بە جوانی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوەو، پاراستووشمانە لە هەموو شەیتانێکی یاخیو لەفەرماندەرچوو. ئەو شەیتانانە ناتوانن گوێگرن لە فریشتەکانی ئاسمانە باڵاکانو، لە هەموو لایەکەوە ڕەجم دەکرێنو نەیزەکیان بۆ دەهاوێژرێت، تاوەکو بە سووکیو ڕیسوایی بگەڕێنرێنەوەو، سزایەکی ئازاراوی هەمیشەییشیان بۆ هەیە، تەنها ئەو شەیتانە نەبێت، کە لەپڕ قسەیەك لە دەمی فریشتەیەك دەفڕێنێت، ئەویش یەکسەر نەیزەکێکی پرشنگدار شوێنی دەکەوێت}.

- سێ ئایەت لە کۆتایی سورەتی (الْحَشْرِ) {کە بریتین لە: ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِيْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ * هُوَ اللَّهُ الَّذِيْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ * هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾. [الحشر: ٢٢ - ٢٤]}. واتە: {خوا ئەو خوایەیە، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە ئەو، زاناو ئاگادارە بە هەموو نهێنیو ئاشکرایەك، ئەو بەسۆزو میهرەبانە. خوا ئەو خوایەیە، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە ئەو، پاشای هەردوو جیهانە، لە هەموو کەموکورتیەك بەریو خاوێنە، ئاشتیبەخشە، پشتیوانی پێغەمبەرانە بە بەڵگەی ئاشکرا، چاودێرە بەسەر کارو کردەوەی بەندەکانی، بەدەسەڵاتە، زاڵە بەسەر هەموو بوونەوەردا، مەزنو باڵادەستە، پاكو بێگەردە لەوەی بێباوەڕان هاوبەشی بۆ دادەنێن. ئەو خوایە درووستکەرو بەدیهێنەرو وێنەکێشی هەموو بوونەوەرە، خاوەنی ناوە هەرەجوانەکانە، ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە تەسبیحاتی ئەو دەکەنو، ئەویش دەسەڵاتداری بەهێزی کاربەجێیە}.

- سورەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾.
- سورەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾.
- سورەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا بە ڕشتەیەکی (صَحِیْح)، لە (خَارِجَة)ی کوڕی (صَلْت)ـەوە، ئەویش لە مامەیەوە، کە فەرموویەتی: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو، موسوڵمان بوومو، دواتر گەڕامەوەو، لە ڕێگەدا بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕیم، پیاوێکی شێتیان لابوو، بە ئاسن کۆت کرابوو. جا خزمو کەس‌وکاری شێتەکە وتیان: بۆمان باس کراوە، کە ئەو کەسەی تۆ باسی دەکەیت، خەیری هێناوە، جا تۆ شتێکت لایە، چارەسەری ئەم شێتەی پێ بکەیت؟ مامەی دەڵێت: منیش سورەتی (الْفَاتِحَة)م بەسەریدا خوێند، ئەوەبوو دەستبەجێ چاکبوویەوەو، ئەوانیش سەد (١٠٠) سەر مەڕیان پێدامو، منیش هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواو، چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: "بێجگە لەو سورەتە هیچی ترت نەخوێند؟" منیش عەرزم کرد: نەخێر. ئەوجا فەرمووی: ئەوەی پێیان داویت بیبە بۆ خۆت، سوێند بە تەمەنی خۆم، ئەو کەسەی بە دوعای پوچەڵو درۆینە شتێکی خواردبێت، خۆی تاوانبار دەبێت، بەڵام ئەمەی تۆ دەیخۆیت بە دوعای حەق‌و ڕاستیە، بۆیە تاوانبار نابیت.[2]

هەروەها ئەم حەدیسەمان بە دەقێکی تر لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، کە ئەویش هەر ڕیوایەتێکی تری ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)ە. جا ئەو لە گێڕانەوەی حەدیسەکەدا فەرموویەتی: لە (خَارِجَة)وە، ئەویش لە مامەیەوە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خواوە گەڕاینەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، گەیشتین بە خێڵە عەرەبێك. پرسیاریان لێ کردین‌و وتیان: دەرمان‌و چارەسەرتان

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٨ – ٢٩٩ / بە ژمارە: ٦٣٢. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٤٦ – ١٤٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٤٠٥ / بە ژمارە: ٣٨٩٦.

پێیە؟ ئێمە شێتێکی کۆتکراومان لایە. جا کە شێتەکەیان بە کۆتکراوی هێنا، منیش سێ ڕۆژ بەیانی و ئێوارە سورەتی (الْفَاتِحَــةُ)م بەسـەردا خوێنـدەوەو، لیکـی خـۆمم کۆدەکردەوەو، پاشان دەمهێنا بە لاشـەی شـێتەکەدا. ئـەوجا شـێتەکە هەسـتایەوە، هەروەکو لـە پەت بەربووبێت. خەڵکی خێڵەکەش شتێکیان لـە بەرامبـەردا پێـدامو، منیش وتم: نەخێر نامەوێت. ئەوانیش وتیان: پرسیار بکە لـە پێغەمبـەری خـوا، بزانـە حەڵاڵە وەریگریت یا نا، منیش هاتم بۆ خزمەتی و پرسم پێکـرد، ئـەویش فـەرمووی: «كُلْ، فَلَعَمْرِي مَنْ أَكَلَ بِرُقْيَةِ بَاطِلٍ، لَقَدْ أَكَلْتَ بِرُقْيَةِ حَقٍّ». واتە: "بیخۆ، سـوێند بـە تەمەنی خۆم، ئەگەر کەسێك بە دوعای پوچەڵ شتێکی خواردبێـت، تـۆ بـە دوعـای حەق و ڕاستی خواردوتە".(١)

منیش دەڵێم: ناوی مامەکەی بریتیە لـە (عِلاقَة)ی کـوڕی (صُحَار). وتراویشـە: ناوی (عَبْدُالله) بوە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە ئـەو قورئـانی خوێندوە بە گوێی کەسێکی شێتداو، کەسەکەش چاك بوەتەوە، پێغەمبـەری خـوایش (درودی خوای لەسەر بێت) پرسـیاری لێ کـردوەو فەرموویـەتی: "چیـت خوێنـدوە بـە گوێیدا؟" ئەویش عەرزی کردوە: ئایەتەکانی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُـمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ * فَتَعَالَى اللهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ * وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللهِ إِلَهاً آخَرَ لا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ * وَقُلْ رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الـرَّاحِمِينَ﴾ [الْمُؤْمِنُـوْن: ١١٥ - ١١٨]. واتـە: {بۆچـی ئێـوە گومانتان وایە، کە ئێمە ئێوەمان بێهوودە درووست کـردوەو، ئێـوەش بـۆلای ئێمـە ناگەڕێنرێنەوە؟! جا بەرزو بالآیە ئـەو خوایـەی، کـە پاشـای ڕاسـتەقینەیەو، بێجگـە لـەویش هیچ پەرستراوێکی ڕاسـتەقینە نیـەو، هـەر ئـەویش پـەروەردگاری عەرشـی

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٧ - ٢٩٨ / بە ژمارە: ٦٣٠.

بەڕێزو بەقەدرە. هەرکەسێك لەگەڵ خوادا هاوار بکاتە شتێکی ترو، ئەویش بەخوا بزانێت‌و، هیچ بەڵگەیەکیشی لەسەر خوایەتی ئەو شتە بەدەستەوە نەبێت، ئەوە لێپرسینەوەی لای پەروەردگاری خۆیەتی‌و، بەڕاستی بێبڕواکان سەرفرازو سەرکەوتوو نابن. تۆش ئەی پێغەمبەری خوا بفەرموو: ئەی پەروەردگارم، لێم خۆشبەو، بەزەییت پێمدا بێتەوە، چونکە تۆ باشترین کەسی بەسۆزو میهرەبانیت} ئەوجا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: «لَوْ أنَّ رَجُلاً مُوْقِناً قَرَأَ بِهَا عَلَى جَبَلٍ، لَزَالَ». واتە: "ئەگەر پیاوێك بە باوەڕێکی تەواوەوە ئەو ئایەتانە بەسەر کێوێکدا بخوێنێتەوە، کێوەکە لادەچێت‌و نامێنێت".[1] خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## ئەو دوعایەی بۆ پاراستنی منداڵ‌و شتی تر بەکاردەهێنرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) دوعای پارێزگاری بەسەر (حَسَن)و (حُسَيْن)دا دەخوێندو، دەیفەرموو: «أُعِيذُكُما بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّةٍ». واتە: "پەناتان دەدەم بە فەرمایشت‌و سیفاتە تەواوەکانی خوای گەورە، لە هەموو شەیتان‌و گیانلەبەرێکی ژەهرداروو، لە هەموو چاوێکی پیس‌و زیانبەخش". هەروەها دەیفەرموو: «إنَّ أبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا إسْمَاعِيلَ وَإسْحَاقَ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِمْ أجْمَعِيْنَ

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٩٨ / بە ژمارە: ٦٣١. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ١٥٥.

وَسَلَّمَ-». [١] واته: (إِبْرَاهِيْم)ی باوەگەورەشتان ئەم دوعایەی دەکرد بۆ پاراستنی (إِسْمَاعِيْل)و (إِسْحَاق)ی کوڕی خۆی (دروودی خوایان لێ بێت).

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: (هَامَّة) بریتیە لە هەموو گیانلەبەرێکی خاوەن ژەهری کوشندە، وەکو مارو شتی تر. جەمعەکەشی بریتیە لە (هَـوَامّ). هەروەها فەرموویانە: هەندێك جار وشەی (هَوَامّ) بۆ ئەو گیانلەبەرانەش بەکار دەهێنرێت، کە بەسەر زەویدا دەڕۆن، ئیتر باوەکو کوشندەش نەبن. وەکو: حەشەراتو مێروو.

جا یەکێك لەو جێگایانەی کە وشەی (هَوَامّ) تێیدا بەم مانایە هاتوە، بریتیە لە حەدیسێکی هاوەڵی خۆشەویست (كَعْب)ی کوڕی (عُجْرَة) (خوای لێ ڕازی بێت)، {کە ئیمامی بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوەو، پێغەمبەری خوا بە (كَعْب)ی فەرموە}: «أَيُؤْذِيْكَ هَوَامُّ رأسِكَ؟» واته: "ئایا سپێکانی سەرت ئازارت دەدەن؟". [٢]

سەبارەت بە (عَيْنٍ لامَّةٍ)یش، بریتیە لەو چاوەی کە تەماشای هەر شتێك بکات تووشی زیانی دەکات.

## ئەو دوعایەی کە بەسەر دومبەڵو زیپکەو شتی لەو جۆرەدا دەخوێنرێت

سەبارەت بەم باسە حەدیسێکی دایکە (عَائِشَـة) هاتوە، کە لەم نزیکانەدا دەیهێنین، لە (باسی ئەوەی نەخۆش دەیڵێتو، ئەوەش بەسەر نەخۆشدا دەخوێنرێت).

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٣٣ / بە ژمارە: ٣١٩١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٥٣٤ / بە ژمارە: ٣٩٥٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٨٥٩ / ١٢٠١.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا تەشریفی هێنایە ژوورەوە بۆلامو، منیش زیبکەیەك لە یەکێك لە پەنجەکانم دەرهاتبوو. ئەویش فەرمووی: (ذَرِيْرَة)ت لایە؟ ئەوجا هەندێکی خستە سەر زیبکەکەو، فەرمووی: بڵێ: «اللّٰهُمَّ، مُصَغِّرَ الْكَبِيْرِ، وَمُكَبِّرَ الصَّغِيْرِ، صَغِّرْ مَا بِيْ». واتە: "خوایە، ئەی بچووککەرەوەی شتی گەورەو، گەورەکەری شتی بچووك، ئەم زیبکەیەی پەنجەم بچووك بکەرەوە". ئیتر زیبکەکە دامرکایەوە.[1]

منیش دەڵێم: (ذَرِيْرَة) بریتیە لە پرشو وردەی قامیشێکی بۆنخۆش، کە لە وڵاتی هیندەوە دەهێنرێت.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٠ - ٣٠١ / بە ژمارە: ٦٣٦. ئیمامی (حَاكِم)و شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (صَحِيْح)یان داناوە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٢٣٠ / بە ژمارە: ٧٤٦٣، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٥٧ - ١٥٨.

## سونەتە یادی مردن زۆر بکرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و، لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ». واتە: "یادی ئەو شتە زۆر بکەن، کە چێژو خۆشیەکانی دنیا دەبچڕێنێت". مەبەستی بەو شتە مردنە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## سونەتە لەبارەی نەخۆشەوە پرسیار لە خزم و کەس وکارەکەی بکرێت و، پرسیارلێکراوەکەش وەڵام بداتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئیمامی (عَلِيّ) کوڕی (أَبو طَالِب) (خوای لێ ڕازی بێت)، لەکاتی ئەو نەخۆشیو ئازارەدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو، کە تێیدا وەفاتی فەرموو، جا کە تەشریفی هێنایە دەرەوە، خەڵکەکە عەرزیان کرد: ئەی باوکی حەسەن، پێغەمبەری خوا چۆنە (دروودی خوای لێ بێت)؟ ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ خوا باشە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٥٣ / بە ژمارە: ٢٣٠٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ٤ / بە ژمارە: ١٨٢٤، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٣ / ١٤٢٢ / بە ژمارە: ٤٢٥٨. هەروەها بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٧ / ٢٥٩ / بە ژمارە: ٢٩٩٢، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٤ / ٣٥٧ / بە ژمارە: ٧٩٠٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦١٥ / بە ژمارە: ٤١٨٢.

## ئەوەی نەخۆش دەیلێتو، ئەوەش لەلای ئەودا دەوترێتو، ئەوەش بەسەر ئەودا دەخوێنرێتو، پرسینەوەش لە حاڵی نەخۆش

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیمانداڕانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)، ئەگەر تەشریفی ببردایەتە سەر جێگەی خەوتن، دەستەکانی پێکـەوە دەنـاو، فووی پێدا دەکردنو، هەرسێ سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُـلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ی دەخوێنـدو، پاشـان چـەندە لەتوانایـدا بوایـە، دەستە پیرۆزەکانی دەهێنا بە لاشەی پیرۆزیداو، بە سەریو دەمو چاویو بەشـەکانی پێشەوەی لاشەی دەستی پێدەکردو، ئەم کارەشی سێ بارە دەکردەوە.[1] جا کاتێـك نەخۆش کەوت، فەرمانی پێ کردم، کە من ئەو کارەی بۆ بکەم.

لە ڕیوایەتێکی صەحیحیشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) لەو نەخۆشیەدا کە تێیدا وەفاتی فەرموو، خۆی ئەو سێ سـوورەتەی دەخوێنـدو، فـووی دەکرد بە لاشەی پیرۆزیدا. دایکـە (عَائِشَةَ) فەرموویـەتی: جـا کاتێـك نەخۆشـیەکە لەسەری قورس بوو، من سورەتەکانم دەخوێندو، فووم دەکرد بە لاشەی پیرۆزیداو، لەبەر پیرۆزیش دەستەکانی خۆیم دەهێنا بە لاشەیدا.[2]

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کە ئەگەر ئازاری هەبوایە، ئەو سورەتانەی دەخوێنـدو، فووی دەکرد بە لاشەی خۆیدا.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٩ / بە ژمارە: ٥٤١٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٣ / بە ژمارە: ٢١٩٢. دەقەکەش هی ئیمامی بوخاریە.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٥ / بە ژمارە: ٥٤٠٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٣ / بە ژمارە: ٢١٩٢.

وتراوە بە {(ابْنُ شِهَاب)ی (زُهْرِيّ)}، کە یەکێکە لە ڕاویەکانی ئـەم حەدیسـە: چۆن فووی دەکرد بە لاشەیدا؟ ئەویش فەرمووی: فووی دەکرد بە دەسـتەکانیداو، پاشان ئەوانی دەهێنا بە دەمو چاویدا.[1]

منیش دەڵێم: لەم باسەدا ئەو حەدیسانەش هاتون، کە پێشتر لـە باسـی (ئـەوەی بەسەر کەسی شێتو گەوجدا دەخوێنرێت) هێنامانن، کە بریتی بـوو لـە خوێنـدنی سورەتی (الْفَاتِحَة)و، چەند ئایەتێکی تر.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخـاریو موسـلیمو، (سُـنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و لـە غەیری ئەوانیشدا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کە ئەگەر کەسێك سـکالآی ئـازاری ئەنـدامێکی لاشـەی یـان زامێـك، یـان برینێکی بهێنایەتە خزمەتی پێغەمبـەری خـوا، ئـەویش (دروودی خـوای لێ بێـت) پەنجـەی شایەتومانی دەخستە سەر زەویو، بەرزی دەکردەوەو، دەیفەرموو: «بِسْمِ اللّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيْقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى بِهِ سَقِيْمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَـــا». واتـە: "بـەناوی خـواوە، تـۆزو خاکی زەویەکەمان، بە لیكو تەڕایی دەمی هەندێکمان، بە ئیزنـی خـوا چارەسـەری نەخۆشمانی پێ دەکرێت".

لـە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «تُرْبَةُ أَرْضِنَا، وَرِيْقَةِ بَعْضِنَا».

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: (بِرِيْقَةِ بَعْضِنَا) واتە: بە لیکی هەندێکمان، کـە مەبەست لێی لیکی مرۆڤە.

زانای پایەبەرز {(ابْنُ فَارِس) لـە کتێبـی (مُجْمَلُ اللُّغَة)دا} فەرموویـەتی: (رِيـــق) لیکی ئادەمیزادو گیانلـەبەری تریش دەگرێتـەوەو، هەنـدێك جـاریش دەکرێـت بـە (مُؤَنَّث)و، دەوترێت (رِيْقَة).

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٥ / بە ژمارە: ٥٤٠٣.

شێخی (جَوْهَرِيّ)ش له {کتێبی (الصِّحَاح)دا} فەرموویەتی: (رِیْقَة) لـه (رِیْـق) تایبەتترە.

بۆشمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت)، دوعای پارێزگاری دەخوێند بەسەر یەکێك لـه خێزانەکانیداو، دەستی ڕاستی دەهێنا بە جێگەی ئازارەکەی لاشەیداو، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، رَبَّ النَّـاسِ، أَذْهِـبِ الْبَاسَ، اشْفِ، أَنْتَ الشَّافِيْ، لا شِفاءَ إِلاّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لا يُغَـادِرُ سَـقَماً».[1] واتـە: "خوایە، ئەی پەروەردگاری خەڵکی، نەخۆشیو ئازار لەم خێزانـەم دووربخـەرەوەو، شیفای بدەو چاکی بکـەرەوە، چـونکە هـەر تـۆ شـیفادەرو چارەسـەرکەری، هـیچ چارەسەرێك نیە بێجگە لـە چارەسەری تۆ، چارەسەرێکی وا، کـە هـیچ نەخۆشـیەك بەجێ نەهێڵێت".

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە: کـە پێغەمبـەری خـوا دوعـای دەکـردو، دەیفـەرموو: «امْسَحِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، بِيَدِكَ الشِّفاءُ، لا كَاشِفَ لَهُ إِلاّ أَنْـتَ».[2] واتـە: "ئـەی پەروەردگاری خەڵکی، نەخۆشیو ئازاری پێوە مەهێڵە، شیفاو چاکبوونەوە تەنها بـە دەستی تۆیەو، بێجگە لـە تۆش هیچ کەسێك نەخۆشیو ئازارمان لەکۆڵ ناکاتەوە".

بۆشمان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی بوخاریـدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی بە شـوێنکەوتووی پایەبـەرز (ثَابِت)ی (بُنَانِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت): ئایا دوعاکەی پێغەمبەری خـوات (درودی خـوای لێ بێت) بەسـەردا نـەخوێنم؟ ئـەویش عـەرزی کـردوە: "بـەڵێ، بیخوێنـە". (أَنَـس)یـش

(١) بروانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٨ / به ژماره: ٥٤١١، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢١ / به ژماره: ٢١٩١.
(٢) بروانه: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٨ / به ژماره: ٥٤١٢.

فەرموویەتی: «اللّهُمَّ، رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ الْبَاسِ، اشْفِ، أنْتَ الشَّافِيْ، لا شَافِيَ إلاّ أَنْتَ، شِفَاءً لا يُغَادِرُ سَقَماً». [1]

منیش دەڵێم: (لا يُغَادِرُ) واتە: جێی نەهێڵێت‌و، لێی نەگەڕێت. (الْبَاس)یش واتە: ناڕەحەتی‌و نەخۆشی.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُثْمَان)ی کوڕی (أَبو الْعَاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە سکاڵای ئازارێکی لاشەی خۆی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)، ئەویش پێی فەرموو: دەستت بخەرە سەر ئەو جێگەیەی لاشەت کە ئازارەکەی هەیەو، سێ جار بڵێ (بِسْمِ اللهِ)و، حەوت جاریش بڵێ: «أَعُوْذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وأُحَاذِرُ». [2] واتە: "پەنا دەگرم بە گەورەیی‌و دەسەڵات‌و توانای خوای گەورە لە شەڕو زیانی ئەم ئازارەی هەستی پێ دەکەم‌و لێی دەترسم".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبو وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت)، لەکاتی نەخۆشیدا تەشریفی هێناوە بۆلای‌و، سێ جار فەرموویەتی: «اللّهُمَّ، اشْفِ سَعْداً». [3] واتە: "خوایە شیفای سەعد بدەیت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ عَادَ مَرِيْضاً لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ، فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ: "أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيْمَ، رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ، أَنْ يَشْفِيَكَ"، إلاّ عَافَاهُ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مِنْ ذلِكَ الْمَرَضِ». واتە: "ئەو کەسەی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٦٧ / بە ژمارە: ٥٤١٠.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧٢٨ / بە ژمارە: ٢٢٠٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٥٣ / بە ژمارە: ١٦٢٨.

سەردانی نەخۆشێك بكات، كە ئەجەلی نەهاتبێت، جا حەوت جار لەلایدا بلێت: (داوا لە خوای مەزن دەكەم، كە پەروەردگاری عەرشی مەزنە، شیفات بدات) خوای گەورە لەو نەخۆشیە چاكی دەكاتەوەو شیفای بۆ دەنێرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ـەو، ئیمامی (حَاكِم)یش لە كتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْنِ)دا فەرموویەتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری.(١)

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە (سُنَن)ی (أَبُـوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی كوڕی (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوكیشی ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ يَعُوْدُ مَرِيْضاً، فَلْيَقُلْ: اللّٰهُمَّ، اشْفِ عَبْدَكَ، يَنْكَأُ لَكَ عَدُوّاً، أَوْ يَمْشِيْ لَكَ إِلَى صَلاةٍ».
واتە: "ئەگەر كەسێك چوو بۆ سەردانی نەخۆشێك، با بلێت: (خوایە، ئەم بەندەیەت چاك بكەرەوەو شیفای بدە، تا ئێشو ئازار بگەیەنێتە دوژمنەكەت، یان لەبەر تۆ بچێت بۆ نوێژ كردن)".

ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد) بە (ضَعِيْف)ی دانەناوە.(٢)

منیش دەڵێم: (يَنْكَأُ) واتە: ئێشو ئازار بگەیەنێت.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئازارێكم هەبوو، پێغەمبەری خوایش (درودی

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٤ / بە ژمارە: ٣١٠٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٤١٠ / بە ژمارە: ٢٠٨٣، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٤٩٣ / بە ژمارە: ١٢٦٨.
(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٤ / بە ژمارە: ٣١٠٧. ئیمامی (حَاكِم) بە حەدیسێكی (صَحِيْح)ی داناوەو، شێخی عەسقەلانیش بە حەدیسێكی (حَسَن). بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٤٩٥ / بە ژمارە: ١٢٧٣، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ١٨٨ – ١٨٩.

خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنا بۆلامو، منیش لەو کاتەدا دەموت: (اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَجَلِي قَدْ حَضَرَ فَأَرِحْنِي، وَإِنْ كَانَ مُتَأَخِّرًا فَارْفَعْنِي، وَإِنْ كَانَ بَلَاءً فَصَبِّرْنِي) واتە: "خوایە، ئەگەر کاتی مردنم هاتوە، ئەوا لەم ئازارو ناڕەحەتیە ڕزگارم بکەو، ئەگەر ماویشێتی، ئەوا لەکۆڵم بکەرەوەو لەسەرمی لابەو، ئەگەر تاقیکردنەوەشە، ئەوا خۆڕاگریم پێ ببەخشە". جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: "ئەوە وتت چی؟" ئەویش چی وتبوو بۆی دوبارە کردەوەو، پێغەمبەریش بە قاچی موبارەکی لێیداو، فەرمووی: «اللَّهُمَّ، عَافِهِ -أَوْ اشْفِهِ-». -گومانەکە لە ئیمامی (شُعْبَة)وەیە، کە ئایا پێغەمبەری خوا فەرمووی (عَافِهِ) یان (اشْفِهِ)-. جا ئیمامی (عَلِيّ) فەرمووی: ئیتر دوای ئەوە هەستم بەو ئازارە نەکردەوە.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)و (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەوان شایەتن لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ"، صَدَّقَهُ رَبُّهُ، فَقَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا، وَأَنَا أَكْبَرُ" وَإِذَا قَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيْكَ لَهُ" قَالَ: يَقُولُ: "لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا وَحْدِيْ، لا شَرِيْكَ لِيْ". وَإِذَا قَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ"، قَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا، لِيَ الْمُلْكُ، وَلِيَ الْحَمْدُ". وَإِذَا قَالَ: "لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ"، قَالَ: لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِيْ" وَكَانَ يَقُوْلُ "مَنْ قَالَهَا فِيْ مَرَضِهِ، ثُمَّ مَاتَ، لَمْ تَطْعَمْهُ النَّارُ». واتە: "هەر کەسێك بڵێت: (لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، خوای پەروەردگاریش تەصدیقی دەکاتو، دەفەرموێت: (لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا، وَأَنَا أَكْبَرُ). خۆ ئەگەر بڵێت: (لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لا شَرِيْكَ لَهُ)، خوای گەورەش دەفەرموێت: (لا إِلهَ إِلاَّ أَنَا وَحْدِيْ، لا شَرِيْكَ لِيْ). ئەگەر بشڵێت: (لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، لَهُ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٠ / بە ژمارە: ٣٥٦٤.

الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ)، خوای گەورەش دەفەرموێت: (لا إلهَ إلاّ أنا، لِيَ الْمُلْكُ، وَلِيَ الْحَمْدُ). ئەگەر بشلێت: (لا إلهَ إلاّ اللّهُ، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ باللّهِ)، خوای گەورەش دەفەرموێت: (لا إلهَ إلاّ أنا، وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِيْ). جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەر کەسێك لەکاتی نەخۆشیدا ئەم زیکرانە بکاتو، پاشان بمرێت، ئاگری دۆزەخ نایسووتێنێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو، کتێبەکانی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، بە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە جوبرەئیل تەشریفی هێناوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، پێی فەرموە: "ئەی موحەممەد، چیە ناساغو نەخۆشیت؟" پێغەمبەریش فەرموویەتی: "بەڵێ". ئەویش فەرموویەتی: (بِسْمِ اللهِ أَرْقِيْكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيْكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أو عَيْنِ حَاسِدٍ، اللهُ يَشْفِيْكَ، بِسْمِ اللهِ أرْقِيْكَ). واتە: "بەناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم، تا لە هەموو ئەو شتانە بتپارێزێت، کە ئازارت دەدەنو، بشتپارێزێت لە خراپەی هەموو نەفسێکی خراپ، یان لە هەموو چاوێکی حەسود (یان لە چاوی هەموو حەسودێك)، خوا شیفات بدات، بەناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٩٢ / بە ژمارە: ٣٤٣٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٤٦ / بە ژمارە: ٣٧٩٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٧١٨ / بە ژمارە: ٢١٨٦، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٠٣ / بە ژمارە: ٩٧٢، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٣٩٣ / بە ژمارە: ٧٦٦٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١١٦٤ / بە ژمارە: ٣٥٢٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی برد بۆلای عەرەبێکی دەشتەکی، کە نەخۆش بوو. (ابْنُ عَبَّاس) فەرمووی: پێغەمبەری خوا هەرکاتێك تەشریفی ببردایە بۆلای نەخۆشێك، پێی دەفەرموو: «لا بَأْسَ، طَهُوْرٌ، إنْ شَاءَ اللّهُ». واتە: "قەیناکە هیچ نیە، ئەگەر خوا بیەوێت ئەم نەخۆشیە پاکەوەکەرەو کەفارەتی گوناهە".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی برد بۆلای عەرەبێکی دەشتەکی، کە تای هەبوو، جا پێی فەرموو: «كَفَّارَةٌ وَطَهُوْرٌ». واتە: "کەفارەتی گوناهەو، پاکەوەکەریشە".[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو أُمَامَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «تَمَامُ عِيَادَةِ الْمَرِيْضِ أنْ يَضَعَ أحَدُكُمْ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، أوْ عَلَى يَدِهِ، فَيَسْأَلَهُ: كَيْفَ هُوَ». واتە: "سەردانی کردنی تەوای نەخۆش ئەوەیە، کە یەکێك لە ئێوە دەستی بخاتە سەر تەوێڵ و نێوچاوانی یان سەر دەستی نەخۆشەکەو، پرسیاری لێ بکات، کە چۆنە".

ئەمە دەقی ڕیوایەتەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ـە.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٤١ / بە ژمارە: ٥٣٣٢.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٢ / بە ژمارە: ٥٣٥. شێخ (نُوْرُ الدِّيْن)ی (هَيْثَمِيّ) فەرموویەتی: ئیمامی (أَحْمَد) ڕیوایەتی کردووە، کەسەکانی ڕشتەکەشی متمانەدارن. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی (حَسَن)ی داناوە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٢ / ٢٩٩ / بە ژمارە: ٣٧٨١، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٢٠٤.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٧٦ / بە ژمارە: ٢٧٣١.

لە ڕیوایەتەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)شدا بەم جۆرە هاتوە: «مِنْ تَمَامِ الْعِيَادَةِ أنْ تَضَعَ يَدَكَ عَلَى الْمَرِيْضِ، فَتَقُوْلَ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟ أوْ كَيْفَ أَمْسَيْتَ؟».[1]

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی ئەوە نیە (واتە: بەهێز نیەو لاوازە).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلْمَان)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك نەخۆش بووم، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنا بۆلامو، فەرمووی: «يَا سَلْمَانُ، شَفَى اللهُ سَقَمَكَ، وَغَفَرَ ذَنْبَكَ، وَعَافَاكَ فِيْ دِيْنِكَ وَجِسْمِكَ إِلَى مُدَّةِ أجَلِكَ».[2] واتە: "ئەی (سَلْمَان) خوا شیفای نەخۆشیەکەت بداتو، لە تاوانت خۆشبێتو، هەتا ماویشیت دینو لاشەت ساغو سەلامەت بکات".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە ئیمامی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَفَّان)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك نەخۆش کەوتمو، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی دەهێنا بۆلام، جا ڕۆژێکیان ئەم دوعایەی بۆ کردم: «بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيْمِ، أُعِيْذُكَ بِاللهِ الْأَحَدِ الصَّمَدِ، الَّذِيْ لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُوْلَدْ، ولَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحَدٌ، مِنْ شَرِّ مَا تَجِدُ». واتە: "بەناوی خوای بەسۆزی میهرەبانەوە، داوا دەکەم لە خوای تاكو تەنهای بێ نیازی جێگەنیاز، کە کەسی لێ نەبوەو، لە کەسیش نەبوەو، کەسیش هاووێنەو هاوتای ئەو نیە، تا لە شەڕو زیانی ئەم نەخۆشیو ئازارە بتپارێزێت". ئەوجا کە پێغەمبەری خوا هەستایەوە تەشریف ببات، فەرمووی: ئەی (عُثْمَان) بەم زیکرە پەنا بەخوا بگرە.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٢ – ٢٥٣ / بە ژمارە: ٥٣٦.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٧ – ٢٥٨ / بە ژمارە: ٥٤٨. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٢٠٧ – ٢٠٨.

چونکە هیچ کەسێك لە ئێوە پەنای بەخوا نەگرتوە بە زیکرێکی هاوێنەی ئەم زیکرە.[1]

## سونەتە وەسیێت بکرێت بۆ کەس وکاری نەخۆش و، ئەو کەسەش خزمەتی دەکات، کە لەگەڵیدا باش بن و، ئارام بگرن لەسەر ئەو زەحمەت و ناڕەحەتیانەی بەهۆی ئەوەوە تووشیان دەبێت. بە هەمان شێوە وەسیێت بکرێت بۆ ئەو کەسەش، کە بەهۆی جێبەجێ کردنی حەدی شەرعی و، تۆڵەی کوشتن و، شتی ترەوە مردنی نزیك بوەتەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عِمْرَان)ی کوڕی (حُصَيْن)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئافرەتێك لە هۆزی (جُهَيْنَة) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت)و، بەهۆی زیناکردنەوە سکی پڕبووبوو، جا عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، تاوانێکم کردوەو، شایستەی حەدی شەرعیم، تۆش جێبەجێی بکە لەسەرم. پێغەمبەری خواش سەرپەرشتیاری ئافرەتەکەی بانگ کردو، فەرمووی: "بەباشی لەگەڵ ئەم ژنەدا بجووڵێرەوە. کاتێکیش سکەکەی داناو، منداڵەکەی بوو، بیهێنەرەوە بۆلام". سەرپەرشتیارەکەشی وەهای کرد، کە پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکرد. جا کە ژنەکەی هێنایەوە، پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد، جلو بەرگەکەی خۆیان لەبەریدا

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٦٠ / بە ژمارە: ٥٥٣. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٢١٠.

**توند كردو، پاشان فەرمانی كرد كە بەردبارانی بكەن، ئـەوجا بـەردبارانیان كـردو، دواتریش كە مرد، پێغەمبەری خوا نوێژی لـەسەر كرد.**[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٣٢٤ / بە ژمارە: ١٦٩٦.

## ئەگەر کەسێك تووشی سەرئێشە، یان تا، یان هەر ئازارێکی تر بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْــنُ السُّــنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فێری دەکردن، کە بۆ هەموو ئازارێك و، بۆ (تا)، ئەم زیکرە بکات و، بڵێت: «بِسْمِ اللهِ الْكَبِيْرِ، نَعُوْذُ بِاللهِ الْعَظِيْمِ، مِنْ شَرِّ عِرْقٍ نَعَّارٍ، وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّارِ».[1] واتە: "بەناوی خوای گەورە، پەنا دەگرین بەخوای مەزن، لە زیانی دەمارێك کە بەفیچقەو هورووژم خوێنی بەربێت و، لە شەڕو زیانی گەرمایی ئاگری دۆزەخیش"

هەروەها دەشکرێت سورەتی (الْفَاتِحَة)و، ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ بەسەر خۆیدا بخوێنێت و، فوو بکات بە هەردوو دەستیدا، وەکو پێشتر باسمان کرد.

هەروەها دەکرێت ئەو نزاو پاڕانەوانەش بکات، کە بۆ خەم و خەفەت بەکاردەهێنرێن و، پێشتریش باسمان کرد.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٦٧ / بە ژمارە: ٥٦٦. شێخی عەسقەلانی بە حەدیسێکی لاوازی داناوەو، فەرمووشێتی: ئیمامی (أَحْمَد)و (تِرْمِـذِيّ)و (ابْـنُ مَاجَـه)و (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوە، جا سەیرە بەلامەوە کە ئیمامی نەوەوی تەنها لە ڕێگەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)ـەوە هێناویەتی!!! بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٢١٣ - ٢١٤.

## درووستە نەخۆش بڵێت: ئازارم زۆرە، یان تام هەیە، یان ئای سەرم... یان شتێکی لەو شێوە. هیچیکیش لەوانە ناپەسەند نین، ئەگەر بەشێوەی تووڕەیی و، دەربڕینی وەڕەسی نەبێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تای هەبوو، منیش چوومە خزمەتی و، دەستم لە لاشەی پیرۆزی داو، عەرزم کرد: قوربان تایەکی زۆر توندت هەیە. ئەویش فەرمووی: «أَجَلْ، كَمَا يُوْعَكُ رَجُلانِ مِنْكُمْ». واتە: "بەڵێ، بەقەدەر دوو پیاو لە ئێوە (تا) دەمگرێت".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك ئازارێکی زۆرم هەبوو، پێغەمبەری خوایش (درودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێنا بۆلام، منیش عەرزم کرد: قوربان دەبینیت چەندە ئازارم هەیەو، کەسێکی دەوڵەمەندیشم و، تەنها یەك کچیش میراتبەرم هەیە.... هتد.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە زانای پایەبەرز {(قَاسِم)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی ئیمامی (أَبو بَكْر)}ەوە، کە فەرموویەتی: (عَائِشَة)ی دایکی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئای سەرم! پێغەمبەری خوایش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: بەڵکو من ئای سەرم.....هتد.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٣٩ / بە ژمارە: ٥٣٢٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٩١ / بە ژمارە: ٢٥٧١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٤٥ / بە ژمارە: ٥٣٤٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٥٠ / بە ژمارە: ١٦٢٨.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٤٥ / بە ژمارە: ٥٣٤٢.

ئەم حەدیسە بەم دەقە حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە.[1]

## ناپەسەندە کەسێك ئاواتی مردن بخوازێت، بەهۆی ئەوەی کە تووشی ناڕەحەتیەك بوە. بەڵام ئەگەر ترسی فیتنەی هەبوو لە دینەکەی، ئەوا دروستە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لا بُدَّ فَاعِلاً، فَلْيَقُلْ: اللّهُمَّ، أَحْيِنِي، مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِيْ، وَتَوَفَّنِيْ إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِيْ».[2] واتە: "با هیچ کەسێك لە ئێوە مردن بەئاوات نەخوازێت بەهۆی ئەوەی کە تووشی ناڕەحەتیو ناخۆشیەك بوە، خۆ ئەگەر هەر دەبوو وا بکات، ئەوا با بڵێت: (خوایە، ئەگەر ژیان بۆ من باشترە، بە زیندوویی بمهێڵەرەوەو، ئەگەر مردنیش باشترە، بمرێنە)".

---

(١) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: مەبەستی ئیمامی نەوەوی ئەوەیە، کە (قَاسِم) چیرۆکو باسێکی گێڕاوەتەوە، کە خۆی لەو کاتەدا ئامادەی نەبوەو، نەشی فەرموە: دایکە (عَائِشَة) بۆی گێڕاوەتەوە. بەڵام ئیمامی بوخاری پشتی بەوە بەستوە کە وا مەشهوورە (قَاسِم) لەخزمەتی پورە (عَائِشَة)یدا زۆر بوەو، حەدیسی زۆریشی لێوە ڕیوایەت کردوەو، هەر پووریشی لەدوای باوکی سەرپەرشتی پەروەردەکردنی کردوە، هەتا وەفاتی فەرموە. پاشان فەرموویەتی: ئەم حەدیسە مەشهورە لە دایکە (عَائِشَة)وە، کە لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە لێیەوە ڕیوایەت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٢١٨.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢١٤٦ / بە ژمارە: ٥٣٤٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٦٤ / بە ژمارە: ٢٦٨٠.

زانایانی هاوەڵانو زانایانی تریش فەرموویانە: ئەمە ئەگەر ئاواتخواستنەکەی بەهۆی نارەحەتیو شتی واوە بوو. بەڵام ئەگەر ترسی لە دینەکەی هەبوو، بەهۆی خراپی زەمانەوە، یان بەهەر هۆیەکی تری هاوشێوەوە، ئەوە ناپەسەند نیە.

## سونەتە کەسێك بپاڕێتەوە، کە لە شارە پیرۆزمکەی پێغەمبەری خوادا بمرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە دایکی ئیماندارانەوە (حَفْصَة)ی کچی ئیمامی (عُمَر) (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئیمامی (عُمَر) (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: خوایە، شەهیدبوونم لە ڕێگەی خۆتدا پێ ببەخشەو، مردنەکەشم بخەرە شارە پیرۆزەکەی پێغەمبەرەکەتەوە. منیش عەرزم کرد: جا ئەوە چۆن دەبێت؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر خوا بیەوێت، بۆم دەکات.(١)

## سونەتە دڵنەوایی نەخۆش بکرێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَهْ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى مَرِيْضٍ، فَنَفِّسُوا لَهُ فِيْ أَجَلِهِ، فَإِنَّ ذلِكَ لا يَرُدُّ شَيْئاً، وَيُطَيِّبُ نَفْسَهُ».(٢)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٦٨ / بە ژمارە: ١٧٩١. پرسیارەکەی (حَفْصَة)و وەڵامەکەی ئیمامی (عُمَر) لە صەحیحی بوخاریدا نیە.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٤١٢ / بە ژمارە: ٢٠٨٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٦٢ / بە ژمارە: ١٤٣٨.

واتە: "ئەگەر چوونە لای نەخۆش، بە قسەی خۆش دڵنەوایی بکەن و، هیوای تەمەندرێژی بۆ بخوازن. خۆ ئەوەی ئێوە دەیکەن هیچ شتێك لە قەزاو قەدەری خوا ڕەد ناکاتەوە، بەڵام دڵی نەخۆشەکە خۆش دەکات".

جا ئەم حەدیسە ئەگەر نەشهێنرایە هەر دەبوو. چونکە پێشتر لە (باسی ئەوەی بە نەخۆش دەوترێت) حەدیسێکی (ابْنُ عَبَّاس)مان هێنا، کە دەقەکەی بەم شێوە بوو: «لا بَأْسَ، طَهُوْرٌ، إنْ شَاءَ اللّٰهُ».

## دروستە ستایشی نەخۆش بکرێت و، باسی کردەوەو سیفەتە باشەکانی بکرێت، ئەگەر بینرا کە دەترسێت، بەڵکو ترسەکەی بڕەوێتەوەو، گومانیشی باش ببێت بە خوای پەروەردگاری

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە لە کاتی پێکرانەکەی ئیمامی (عُمَر)ی کوڕی (خَطَّاب)دا (خوای لێ ڕازی بێت)، بۆ دڵنەوایی و سەبووری پێدان عەرزی کردوە: ئەی فەرمانڕەوای ئیمانداران، زۆر نیگەران و ناڕەحەت مەبە بەمەی هاتوە بەسەرتدا، خۆ جەنابت هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوویت و، زۆریش بە جوانی هاوەڵایەتیت کردوەو، کاتێکیش لێت جیابوویەوە، لێت ڕازی بوە. پاشان بە جوانی ڕەفاقەتی ئیمامی (أبو بَكْر)یشت کردوەو، ئەویش کە لێت جیابوویەوە، هەر لێت ڕازی بوە. پاشان بە جوانی ڕەفاقەتی موسوڵمانانیشت کردوە، خۆ ئەگەر لێیشیان جیا ببیتەوە، ئەوانیش هەر لێت ڕازین....... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد. ئیمامی

(عُمَر)یش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ئەوە یەکێکە لە منەتەکانی خوای گەورە بەسەرمەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (ابْنُ شُمَاسة یان شَمَاسة)وە، کە فەرموویەتی: لە خزمەتی هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)دا بووین‌و، ئەویش لە سەرەمەرگدا بوو، جا زۆر دەگریاو، ڕووی وەرگێڕابوو بۆلای دیوارەکەو، کوڕەکەشی عەرزی دەکرد: باوە گیان، ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فلاَنە مژدەو فیسارە مژدەی پێ نەدایت؟ ئەوجا ئەویش ڕووی تێکردینەوەو، فەرمووی: باشترین‌و گەورەترین شتێك کە بۆ پاشەڕۆژمان ئامادەمان کردبێت، بریتیە لە شایەتیدان لەسەر ئەوەی، کە بێجگە لە خوای گەورە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە.... ئەوجا تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە زانای پایەبەرز (قَاسِم)ی کوڕی (مُحَمَّد)ی کوڕی ئیمامی (أَبو بَكْر)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە (عَائِشَة)ی دایکی ئیمانداران (خوای لێ ڕازی بێت)، نەخۆش کەوتبوو، هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)یش (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) تەشریفی هێنا بۆ خزمەتی‌و، عەرزی کرد: ئەی دایکی ئیمانداران، جەنابیشت تەشریف دەبەیت بۆ خزمەتی پێشینە ڕاساڵەکان: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، ئیمامی (أَبو بَكْر) (خوای لێ ڕازی بێت).[3]

دیسان ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگەی زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِي مُلَيْكَة)وە، کە دایکە (عَائِشَة)، بەر لەوەی وەفات بکات، نەخۆشی سەرەمەرگ زۆری بۆ هێنابوو، هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)یش (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٥٠ / بە ژمارە: ٣٤٨٩.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١١٢ / بە ژمارە: ١٢١.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٧٥ / بە ژمارە: ٣٥٦٠.

داوای مۆڵەتی کرد، تا بێتە خزمەتی. ئەویش فەرمووی: ئەترسم وەسفو سەنام بکات. جا کەسێك {واتە: (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی ئیمامی (أَبو بَكْر)ی برازای خۆی} عەرزی کرد: ئەوە ئامۆزای پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت)و، یەکێکیشە لە کەسایەتیە دیارەکانی موسوڵمانان. ئەویش فەرمووی: دەی ڕێگەی پێ بدەن با بێتە ژوورەوە. جا کە تەشریفی هێنایە ژوورەوە، عەرزی دایکە (عَائِشَة)ی کرد: حاڵت چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: باشم، ئەگەر بە ئەهلی تەقوا حسێب بکرێم. (ابْنُ عَبَّاس)یش فەرمووی: دەی ئەگەر خوا بیەوێت، تۆ باشیت، چونکە هاوسەرو خێزانی پێغەمبەری خوا بوویت‌و، بێجگە لە تۆش هیچ کچێکی تری نەهێناوەو، پاکایەتی‌و بەرائەتەکەشت لە ئاسمانەوە دابەزیوە.[(1)]

## باسی ئارەزووی خواردن لای نەخۆش

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی برد بۆ سەردانی پیاوێکی نەخۆش‌و، پێی فەرموو: حەز لە هیچ دەکەیت؟ حەز لە کێك دەکەیت؟ پیاوەکەش عەرزی کرد: بەڵێ. پێغەمبەری خواش داوای کرد کێکی بۆ بێنن.[(2)]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُقْبَة)کوڕی (عَامِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٧٧٩ / بە ژمارە: ٤٤٧٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١١٣٨ / بە ژمارە: ٣٤٤١، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٥٤ / بە ژمارە: ٥٤٠. حەدیسێکی لاوازە، بەڵام پاڵپشتی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٢٣٦ - ٢٣٧.

فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: «لا تُكْرِهُــوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ، فَــإِنَّ اللهَ يُطْعِمُهُــمْ، وَيَسْــقِيْهِمْ». واتـە: "لـەسـەر خواردنو خواردنەوە زۆر لـە نەخۆشەکانتان مەکەن. چونکە خـوای گـەورە هێـزی خواردنو خواردنەوەیان دەداتیٚو، توانای بەرگـەگرتنی ئـازاری برسـێتیو تینوێتیـان دەداتیٚ".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

## با ئەو کەسەی سەردانی نەخۆشێك دەکات، داوای دوعا خەیری لیٚ بکات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (ابْنُ مَاجَه)و شـێخی (ابْــنُ السُّنِّيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح) یان (حَسَن)، لـە زانای پایەبەرز (مَيْمُوْن)ی کوڕی (مِهْرَان)ـەوە، ئەویش لـە ئیمامی (عُمَــر)ەوە (خـوای لیٚ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا دَخَلْتَ عَلَى مَرِيْضٍ، فَمُرْهُ، فَلْيَدْعُ لَكَ، فَإِنَّ دُعَاءَهُ كَدُعَاءِ الْمَلَائِكَةِ».[2] واتە: "ئەگـەر چـویتە لای نەخۆشـێك، داوای لیٚ بکە با دوعای خەیرت بـۆ بکـات. چـونکە دوعـای خـەیری ئـەو وەکـو دوعای فریشتەکان وەهایە". بەڵام ئەوەندە هەیە، کە (مَيْمُوْن)ی کوڕی (مِهْرَان) بـە خزمەتی ئیمامی (عُمَر) نەگەیشتوە.[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٣٨٤ / بە ژمارە: ٢٠٤٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١١٤٠ / بە ژمارە: ٣٤٤٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٦٣ / بە ژمـارە: ١٤٤١، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٦٢ – ٢٦٣ / بە ژمارە: ٥٥٧.

(٣) بەمەش ڕشتەکەی بچـڕانی تێدایـە. کەواتـە وەکـو شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: ئـەم حەدیسە نە (صَحِيْح)ـەو، نە (حَسَن)یشە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٢٤٣ – ٢٤٥.

## با دوای ئەوەی نەخۆش چاکبوویەوە ئامۆژگاری بکرێت‌و، ئەوەشی بەبیربهێنرێتەوە، کە ئەگەر لە ماوەی نەخۆشیەکەیدا تەوبەی کردوە، یان هەر پەیمان‌و بەڵێنێکی بەخوای گەورە داوە، با جێبەجێی بکات‌و پێیەوە پابەندبێت

- خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾ [الإسْرَاء: ٣٤]. واتە: {وەفا بکەن بەو پەیمانەی کـە داوتانـە، بیبەنەسـەرو مەیشـکێنن، چونکە بەڕاستی پەیمان لێپرسینەوەی لەسەرە}.
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا﴾ [الْبَقَرَة: ١٧٧]. واتـە: {ئەوانەی ئەگەر پەیمانیان دابێت، پەیمانەکەیان جێبەجێ دەکەن}.

هەروەها چەندین ئایەتی تریش لەمبارەوە هاتوون.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی شـێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (خَوَّات)ی کوڕی (جُبَيْـر)ەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، کـە فەرموویـەتی: نەخۆش کەوتم‌و، پێغەمبەری خوایش (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنـا بـۆلام‌و، فەرمووی: "لاشەت ساغ بێـت، ئـەی (خَـوَّات)". منـیش عـەرزم کـرد: "لاشـەی جەنابیشت، ئەی پێغەمبەری خوا". ئەویش فـەرمووی: «فَفِ اللهَ بِمَا وَعَدْتَهُ». واتـە: "ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکە، کە بە خوات دابوو". منیش عەرزم کرد: "هیچ بـەڵێنێکم بە خوای گەورە نەداوە". ئەویش فەرمووی: "بەڵێنت داوە. چونکە هـیچ بەندەیـەك

نیه، کە نەخۆش بکەوێتو، بەڵێنی چاکە بە خـوا نـەدات. بۆیـە تـۆش ئـەو بەڵێنـە جێبەجێ بکە، کە بە خوات دابوو".[1]

## ئەگەر کەسێك لە ژیانی خۆی نائومێد بوو چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لـە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِـذِيّ)و (ابْـنُ مَاجَـه)دا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام لەکاتی سەرەمەرگیدا بینی (دروودی خوای لەسەر بێت)، جامێك ئاوی لەلادا بوو، دەستی دەکرد بەناویداو، دەیهێنا بە دەمو چاویداو، پاشان دەیفەرموو: «اللّٰهُمّ، أعِنِّيْ عَلَـى غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَسَكَرَاتِ الْمَوْتِ».[2] واتە: "خوایە، یارمەتیم بدە لـەسەر زەحمـەتو ناڕەحەتیەکانی مردن".

بۆشـان ڕیوایـەت کـراوە لـە هـەردوو صـەحیحی بوخـاریو موسـلیمدا، لـە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێـت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت) -لە کاتی سەرەمەرگیدا- لـە باوەشـمدا پـاڵی دابوویـەوەو، گوێم لـێبوو دەیفەرموو: «اللّٰهُمّ، اغْفِرْ لِيْ، وَارْحَمْنِيْ، وَأَلْحِقْنِيْ بِالرَّفِيْقِ الْـأعْلَى».[3]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّـنِّيّ) / ٢٦٣ / بـە ژمـارە: ٥٥٨. حەدیسـێکی لاوازە. بڕوانە: مَجْمَعُ الزَّوَائِد / ٤ / ١٩٠ / بە ژمارە: ٦٩٧٦، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٢٤٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٠٨ / بە ژمارە: ٩٧٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ١ / ٥١٩ / بـە ژمارە: ١٦٢٣. ئیمامی (حَاكِم)و شێخی (مُنَاوِيّ) ڕشتەکەیان بـە (صَحِيْح) دانـاوە. بڕوانـە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ٥٠٥ / بە ژمارە: ٣٧٣١، وَالتَّيْسِـيْرُ بِشَـرْحِ الْجَـامِعِ الصَّغِيْر / ١ / ٤١٦.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٤ / ١٦١٤ / بە ژمارە: ٤١٧٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٩٣ / بە ژمارە: ٢٤٤٤.

واتە: "خوایە لێم خۆشبەو، بەزەییت پێمدا بێتەوەو، بمگەیەنە بە دۆستو هاوەڵی بەرزو بڵند".

هەروەها سونەتە قورئان زۆر بخوێنێتو، زیکریش زۆر بکات.

ناپەسەندیشە کە نائارامی دەرببڕێتو، ڕەوشتی خراپی لێوە دەربکەوێتو، قسە بڵێتو، کێشەو ناکۆکی بەرپا بکات لە شتانێکدا کە ئاینی نەبن.

سونەتیشە بە دڵو بە زمان شوکرانە بژێری خوای گەورە بکاتو، ئەوەشی لەبیردابێت کە ئەمە دوایین کاتەکانی ژیانی دنیایەتی. بۆیە با بە کردەوەی چاکو کاری باش کۆتایی پێ بهێنێتو، پەلە بکات لە دانەوەی مافەکان بە خاوەنەکانیان: ئیتر مافی کەسێکی لابێت، یان ئەمانەتێك، یان شتێکی خوازراو. هەروەها داوای گەردن ئازاییش لە کەسوکاری خۆی بکات: لە هاوسەرەکەیو، لە دایكو باوکیو، لە منداڵەکانیو، لە خزمەتکارەکانیو، لە دراوسێکانیو، لە هاوەڵو دۆستەکانیو، لە هەموو ئەو کەسانەش، کە لەگەڵیاندا مامەڵە یان ڕەفاقەت، یان هەر جۆرە پەیوەندیەکی هەبووبێت.

هەروەها دەبێت وەسێت بکات بۆ چاودێریو سەرپەرشتیاری کاروباری منداڵەکانی، ئەگەر باپیرەیەکی وایان نەبوو، کە بۆ سەرپەرشتیاری بشێتو، وەسێتیش بکات بۆ ڕاپەڕاندنو ئەنجامدانی ئەو کارەی، کە خۆی لەو کاتەدا ناتوانێت جێبەجێی بکات: وەکو بژاردنەوەی قەرزو، شتی لەو جۆرە.

هەروەها دەبێت گومانی باش بەخوای گەورە بیات، کە بەزەیی پێیدا دێتەوەو، ڕەحمی پێ دەکاتو، ئەوەشی لەبیردا بێت، کە ئەو درووستکراوێکی بچوكو کەمبایەخی خوای گەورەیەو، خوای گەورەش پێویستی بە سزادانو بە گوێڕایەڵی ئەو نیە. هەروەها ئەو بەندەی خوایەو، نابێت داوای لێبوردنو چاکەو چاوپۆشیو فەزڵو منەت لە کەسێکی تر بکات.

هەروەها سونەتە بەردەوام ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە، کە لەبارەی ئومێدو هیواوە هاتونو، خۆی بە دەنگێکی نەرمو ناسك بیانخوێنێت، یان کەسێك بۆی بخوێنێتو، ئەویش گوێی لیّ بگرێت.

بە هەمان شێوە سونەتە داوا بکات لەکاتی سەرەمەرگیدا ئەو حەدیسانەی بۆ بخوێنرێتەوە، کە لەبارەی ئومێدو هیواوە هاتونو، چیرۆكو بەسەرهاتی پیاوچاکانو، فەرمایشتەکانی ئەوانیشی بۆ بگێڕدرێتەوە.

هەروەها دەبێت هەتاوەکو ماوە کاری چاکە زۆر بکاتو، پارێزگاری لە نوێژەکانی بکاتو، خۆی لە خراپەو ناشەرعی بپارێزێتو، پارێزگاریش لە سەرجەم ئەرکو وەزیفە ئاینیەکانی بکاتو، بە ئارام بێت لە بەرامبەر ڕاپەڕاندنیانو، خۆی لە کەمتەرخەمی تێداکردنیان بپارێزێت. چونکە یەکێك لە ناشیرینترینی کارە ناشیرینەکان ئەوەیە، کە دوایین پەیمانی ئەو کەسە لە دنیادا -کە کێلگەی دوارۆژە- بریتی بێت لە کەمتەرخەمی کردن لە جێبەجێ کردنی واجبەکانو سونەتەکاندا.

هەروەها دەبێت قسەی ئەو کەسەش قبولّ نەکات، کە تەمەڵو تەوەزەلی دەکات لە ڕاپەڕاندنو جێبەجێ کردنی ئەمانەی باسمان کردن. چونکە بەم جۆرە کەسانەش تاقی دەکرێتەوە، کە هاوڕێی نەزانو دوژمنی شاراوەن. بۆیە نابێت ئەو جۆرە قسانەیان لیّ قبولّ بکاتو، هەولّیش بدات تەمەنی خۆی بە چاکترینو تەواوترین شێوە کۆتایی پیّ بهێنێت.

سونەتیشە نەخۆشەکە وەسێت بکات بۆ کەسوکاریو، بۆ هاوەڵەکانی، کە بەئارام بن لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا لە کاتی نەخۆشیەکەیداو، بەرگەی ئەوەش بگرن، کە لێیەوە دەردەکەوێت. دیسان وەسێتیان بۆ بکات، کە ئارامیان هەبێت لەسەر ئەو ناڕەحەتیو زەحمەتەی بەهۆی مردنی ئەوەوە توشیان دەبێتو، لە وەسێتەکەشیدا زۆر ئەوە دوپات بکاتەوە، کە لەسەری نەگرینو، پێیان بڵێت: لە

حەدیسی (صَحِيْح)ی پێغەمبەری خوادا هاتوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ».[1] واتە: "مردوو سزا دەدرێت بەهۆی گریانی کەسوکارەکەی لەسەری" بۆیە وریا بن خۆشەویستەکانم، ئەو کارانە نەکەن، کە هۆکارن بۆ سزادانی من.

هەروەها وەسێتیشیان بۆ بکات، کە نەرمونیانو لەسەرخۆ بن لەگەڵ ئەو منداڵو، خزمەتکارو، کارەکەرو، شتانەی تر کە بەجێیان دەهێڵێتو، وەسێتیشیان بۆ بکات، کە چاك بن لەگەڵ هاوڕێکانیداو، ئەوەشیان فێر بکات، کە لە حەدیسی (صَحِيْح)ی پێغەمبەری خوادا هاتوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ أَنْ يَصِلَ الرَّجُلُ أَهْلَ وُدِّ أَبِيْهِ».[2] واتە: "یەکێك لە باشترین کاری چاکە ئەوەیە، کە کەسێك پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەدا بهێڵێتەوە، کە دۆستو خۆشەویستی باوکی بوون". هەروەها لە حەدیسی (صَحِيْح)ی پێغەمبەری خوادا هاتوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لەدوای وەفاتی دایکە (خَدِيْجَة) (خوای لێ ڕازی بێت)، ڕێزی لە هاوڕێکانی ئەو گرتوە.[3]

هەروەها زۆر سونەتە، کە وەسێتیان بۆ بکات خۆیان لەو داب‌و نەریتانە بەدوور بگرن، کە لە بەڕێکردنی لاشەی مردوودا داهێنراونو، هەرگیز توخنیان نەکەون. هەوەرها وەسێتیشیان بۆ بکات، کە هەمیشە دوعای خەیری بۆ بکەنو، بە تێپەڕینی کات لەبیری نەکەن.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٩ / بە ژمارە: ١٢٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٨ / بە ژمارە: ٩٢٧.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٩٧٩ / بە ژمارە: ٢٥٥٢.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٣٨٩ / بە ژمارە: ٣٦٠٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ١٨٨٨ / بە ژمارە: ٢٤٣٥.

سونەتیشە ماوە لەدوای ماوە پێیان بڵێت: هەر کاتێك لە کارێکدا کەمتەرخەمیەکتان لە من بینی، بە نەرمیو لەسەرخۆیی ئاگادارم بکەنەوەو، ئامۆژگاریم بکەن. چونکە منیش دەکرێت تووشی بێئاگاییو تەمەڵیو ئیهمالی ببم. بۆیە ئەگەر کەمتەرخەمیم کرد، چالاكو وریام بکەنەوەو، هاوکاریم بکەن لەسەر خۆئامادەکردن بۆ ئەم سەفەرە دوورو درێژەم.

جا هەموو ئەمانەی باسم کردن بەڵگەکانیان زانراوو مەشهورن، منیش لەبەرئەوەی کتێبەکەم کورتو پوخت بێت باسم نەکردوونو نەمهێناون، ئەگینا باسکردنیان چەندین لاپەڕەی دەوێت.

ئەوجا ئەگەر کاتی گیاندەرچوونی نزیکبوویەوە، با (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) زۆر بکات، تاوەکو ئەو زیکرە ببێت بە دوایین قسەی لە دنیادا. چونکە لە حەدیسێکی مەشهوردا لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاذ)ی کوڕی (جَبَل)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ آخِرُ كَلامِهِ "لا إِلهَ إِلاّ اللهُ" دَخَلَ الْجَنَّةَ».[1] واتە: "ئەو کەسەی دوایین قسەی بریتی بێت لە (لا إِلهَ إِلاّ اللهُ) دەچێتە بەهەشتەوە".

ئیمامی (حَاكِم) لە کتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْنِ)دا فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمو، (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٧ / بە ژمارە: ٣١١٦.

(٢) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٥٠٣ / بە ژمارە: ١٢٩٩.

بێت) فەرموویەتی: «لَقِّنُوا مَوْتاكُمْ: لا إِلــهَ إِلاّ اللهُ». واتە: "(لا إِلــهَ إِلاّ اللهُ) بدەن بەگوێی ئەو کەسانەتاندا، کە لە سەرەمەرگ‌و گیانەڵادان".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە صەحیحی موسلیمدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت).[2]

زانایان فەرموویانە: ئەگەر کەسە نەخۆشەکە خۆی (لا إِلهَ إِلاّ اللهُ)ی نەکرد، با کەسێکی ئامادە تەڵقینی بکات‌و بیخاتە سەر زمانی‌و، بە نەرم‌ونیانی‌و لەسەرخۆییەوە فێری بکات، نەوەکو بێتاقەت ببێت‌و، نەیڵێت. خۆ ئەگەر یەك جار وتی، ئیتر لێی دووبارە نەکاتەوە، مەگەر دوای ئەوە قسەیەکی تر بکات.

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە ئەو کەسەی تەڵقینەکەی دەکات، هیچ گومان‌و تۆمەتێکی خراپی لەسەر نەبێت، نەوەکو نەخۆشەکە ئیحراج بکات‌و، تۆمەتباری بکات.

هەروەها بزانە، کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: ئێمە لە تەڵقینی نەخۆشدا دەڵێین: (لا إِلهَ إِلاّ اللهُ مُحَمَّدٌ رَسُوْلُ اللهِ). بەڵام زۆربەی زانایان تەنها باسی (لا إِلهَ إِلاّ اللهُ)یان کردوە. منیش لە (كِتَابُ الْجَنَائِزِ)ی شەرحی (الْمُهَــذَّب)دا ئەم مەسەلەم بە درێژی باس کردوە، بە خاوەنی بۆچوونەکان‌و بە بەڵگەکانیشیانەوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣١ / بە ژمارە: ٩١٦، وسُنَنُ أَبِــيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٧ / بە ژمارە: ٣١١٧، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٠٦ / بە ژمارە: ٩٧٦، وسُنَنُ النَّســائِيّ / ٤ / ٥ / بە ژمارە: ١٨٢٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣١ / بە ژمارە: ٩١٧.

## دوای ئەوەی کەسێك چاوی مردوویەك دادەخات چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایکی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت) -کە ناوی (هِنْد)ە-، ئەو فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، تەشریفی هێنا بۆلای (أَبو سَلَمَة)و، ئەویش گیانی دەرچووبوو، چاویشی کردبووەوەو دەیڕوانی، جا پێغەمبەری خوا چاوەکانی داخستن‌و، فەرمووی: «إنَّ الرُّوْحَ إذَا قُبِضَ، تَبِعَهُ الْبَصَرُ». واتە: "ئەگەر گیان بکێشرێت، چاو شوێنی دەکەوێت". ئیتر کۆمەڵێك لە کەس‌وکارەکەی (أَبو سَلَمَة) دەستیان کرد بە هاوار هاوارو، پێغەمبەری خواش پێی فەرموون: «لا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إلاّ بِخَيْرٍ، فَإنَّ الْمَلائِكَةَ يُؤَمِّنُوْنَ عَلَى مَا تَقُوْلُوْنَ». واتە: "دوعا لە خۆتان مەکەن، مەگەر دوعای خەیر نەبێت. چونکە فریشتە ئامین دەکەن لەسەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن". پاشان فەرمووی: «اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِأَبِيْ سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّيْنَ، وَاخْلُفْهُ فِيْ عَقِبِهِ فِيْ الْغَابِرِيْنَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ، يَا رَبَّ الْعَالَمِيْنَ، وَافْسَحْ لَهُ فِيْ قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيْهِ». واتە: "خوایە لە (أَبو سَلَمَة) خۆشبەو، پلەشی بەرز بکەرەوە لەناو ئەو کەسانەی ڕێگەی ڕاستت پیشان داون‌و، ئاگاشت لەو کەس‌وکارەی بێت کە لێی بەجێدەمێنن‌و، لە ئێمەو لە ئەویش خۆشبە، ئەی پەروەردگاری عالەم، گۆڕەکەشی بۆ گوشادو فراوان بکەو، پڕی بکە لە ڕۆشنایی بۆی".[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە، لە (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان (بَكْر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی (مُزَنِيّ)ـەوە، کە ئەو فەرموویەتی: ئەگەر چاوی مردووت داخست، بڵێ: (بِاسْمِ اللهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُوْلِ اللهِ). واتە: بەناوی خوداوەو، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٤ / بە ژمارە: ٩٢٠.

بێت). ئەوجا ئەگەر هەڵیشت گرت، بڵێ: بەناوی خوداوە، پاشان هەتا هەڵتگرتوە هەر تەسبیحات بکە.(١)

## ئەوەی لای کەسی مردوودا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (أُمُّ سَلَمَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەگەر لای نەخۆش یان مردوو ئامادەبوون، قسەی خەیر بکەن. چونکە فریشتە ئامین دەکەن لەسەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن. جا (أُمُّ سَلَمَة) فەرمووی: کاتێك (أَبو سَلَمَة) وەفاتی کرد، هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەرو، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، (أَبو سَلَمَة) وەفاتی کرد. ئەویش فەرمووی: بڵێ: "اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً". واتە: "خوایە لە منیش و لە ئەویش خۆشبەو، بە کەسێکی باش جێگەکەیم بۆ پڕ بکەرەوە". (أُمُّ سَلَمَة) دەفەرموێت: منیش وام وت، ئەوەبوو خوای گەورە بە کەسێکی لەو باشتر جێگەکەی بۆ پڕ کردمەوە، کە بریتی بوو لە پێغەمبەری خوا.(٢)

منیش دەڵێم: لە ڕیوایەتەکەی صەحیحی موسلیمدا بەم جۆرە هاتوەو، لای ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش هەر بەم جۆرەیە: (ئەگەر لای نەخۆش یان مردوو ئامادەبوون). واتە: گومانێك هەیە، کە ئایا باسی نەخۆشە یان باسی مردوە. بەڵام لە (سُنَن)ی (أَبو

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٣ / ٣٨٥ / بە ژمارە: ٦٤٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٣ / بە ژمارە: ٩١٩. واتە: دواتر شووی کردوە بە پێغەمبەرو، بوە بە یەکێك لە دایکانی ئیمانداران. ﴿ذَلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ﴾.

دَاوُد)و لە غەیری ئەویشدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، کە هیچ گومانێکی تێدا نیەو، باسەکە تەنها باسی مردوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (مَعْقِل)ی کوڕی (یَسَار)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اقْرَؤُوا "يس" عَلَى مَوْتَاكُمْ».[2] واتە: "سورەتی (یس) بخوێنن بەسەر ئەو کەسانەی کە لە سەرەمەرگدان".

منیش دەڵێم: ڕشتەکەی لاوازە. دوو کەسی نەناسراوی تێدایە. بەڵام ئیمامی (أَبُو دَاوُد) بە لاوازی دانەناوە.[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٧ / بە ژمارە: ٣١١٥، وسُنَنُ الْبَيْهَقِـيّ الْكُبْـرَى / ٣ / ٣٨٣ / بە ژمارە: ٦٣٩٣، وصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٧ / ٢٧٤ / بە ژمارە: ٣٠٠٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٨ / بە ژمارە: ٣١٢١، وسُنَنُ النَّسَـائِيّ الْكُبْـرَى / ٦ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ١٠٩١٣.

(٣) هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمامی (حَاكِم) بە (صَحِيْح)یان داناوە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْـنِ حِبَّان / ٧ / ٢٦٩ / بە ژمارە: ٣٠٠٢، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَـى الصَّـحِيْحَيْن / ١ / ٧٥٣ / بە ژمارە: ٢٠٧٤.

بەڵام شێخی عەسقەلانیش هەر وەکو ئیمامی نەوەوی بە حەدیسێکی لاوازی داناوە، پاشان پاڵپشتێکی بۆ هێناوەو، فەرموویەتی: (صَفْوان)ی کوڕی (عَمْـرو) -کە یەکێکە لە شوێنکەوتوە بچووکە متمانەدارەکان- گێڕاویتیەوە لە کۆمەڵێك لە زانا پایەبەرزەکانەوە - کە دەگونجێت لە چینی هاوەڵان یان شوێنکەوتوان بووبن-، ئەوان ئامادەبوون لای هاوەڵی خۆشەویست (غُضَيْف)ی کوڕی (حارِث)، کاتێك کە نەخۆشی زۆری بۆ هێنابوو، ئەو لێی پرسین: کەستان تێدایە سوورەتی (یس) بخوێنێت؟ جا شوێنکەوتووی پایەبەرز (صَـالِح)ی کوڕی (شُرَيْح)ی (سَكُونِيّ) دەستی کرد بە خوێندنی، هەتا گەیشتە چل (٤٠) ئایەت، ئیتر (غُضَيْف) وەفاتی فەرموو. ئەوجا زانا پایەبەرزەکان فەرموویان: ئەگەر سوورەتی (یس) بخوێنرێت لای ئەو کەسەی لەسەرەمەرگدایە، خوای گەورە بە بەرەکەتی ئەو سوورەتە مردنەکەی لەسەر سووك دەکات.

هەروەها زانای پایەبەرز (ابْنُ أَبِي دَاوُد) لە (مُجَالِد)ەوە ڕیوایەتی کردوە، ئەویش لە (شَعْبِيّ)ــەوە، کە فەرموویەتی: ئەگــەر پشــتیوانان (أَنْصَـــار) لەســەر مردوویــەك ئامادەبوونایە، سورەتی (الْبَقَرَة)یان لەسەر دەخوێند.

جا (مُجَالِد) {واتە: (مُجَالِد)ی کوڕی (سَعِيْد)ی (هَمْدَانِيّ)} کەسێکی لاوازە.

---

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (مَوْقُوْف)ــەو، ڕشــتەکەی (حَسَن)ـــە. پاشان فەرموویەتی: حوکمی حەدیسی (مَرْفُوْع)ی هەیە، چــونکە بابــەتی لــەم جــۆرە بــواری دەربڕینی ڕاو بۆچوونی تێدا نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٠٨ – ٣١٢.

## ئەوەی خاوەنی مردوو دەیڵێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (أُمُّ سَلَمَةَ)ی دایکی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام (دروودی خوای لەسەر بێت) بیستوە، کە فەرموویەتی: «مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيْبُهُ مُصِيْبَةٌ، فَيَقُوْلُ: "إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ. اللّهُمَّ، أجرْنِيْ فِيْ مُصِيْبَتِيْ، وَأَخْلِفْ لِيْ خَيْراً مِنْها" إلاّ أَجَرَهُ اللهُ تَعَالَى فِيْ مُصِيْبَتِهِ، وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْراً مِنْهَا».[1] واتە: "هەر بەندەیەك بەڵاو نەهامەتیەکی تووش ببێت و، بڵێت: {(إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ). خوایە، لەم بەڵاو نەهامەتیەدا پاداشتی خەیرم بدەرەوەو، بە شتێکی باشتر جێگەکەیم بۆ پڕ بکەرەوە}، ئەوا خوای گەورە پاداشتی خەیری دەداتەوەو، جێگەکەشی بە باشتر بۆ پڕ دەکاتەوە".

(أُمُّ سَلَمَةَ) دەفەرموێت: کاتێك (أَبُو سَلَمَةَ) وەفاتی کرد، منیش وام وت، کە پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردبووم. ئەوە بوو خوای گەورە بە کەسێکی لەو باشتر جێگەکەی بۆ پڕ کردمەوە، کە بریتی بوو لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا، لە (أُمُّ سَلَمَةَ)ی دایکی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمْ مُصِيْبَةٌ، فَلْيَقُلْ: "إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ، اللّهُمَّ، عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيْبَتِيْ، فَأْجُرْنِيْ فِيْهَا، وَأَبْدِلْنِيْ بِهَا خَيْراً مِنْهَا».[2] واتە: "ئەگەر بەڵاو نەهامەتیەك تووشی یەکێکتان بوو، با بڵێت: {(إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ). خوایە، تەنها لای تۆ چاوەڕێی پاداشتی ئەم بەڵاو نەهامەتیە دەکەم، تۆش پاداشتی خەیرم بدەرەوەو، بە شتێکی باشتر جێگەکەیم بۆ پڕ بکەرەوە}".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٢ / بە ژمارە: ٩١٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٨ / بە ژمارە: ٣١١٩، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ٦ / ٢٦٥ / بە ژمارە: ١٠٩١٣.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِذَا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى لِمَلائِكَتِهِ: "قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِيْ؟" فَيَقُوْلُوْنَ: "نَعَمْ". فَيَقُوْلُ: "قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ؟" فَيَقُوْلُوْنَ: "نَعَمْ". فَيَقُوْلُ: "فَمَاذَا قَالَ عَبْدِيْ؟" فَيَقُوْلُوْنَ: "حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ". فَيَقُوْلُ اللهُ تَعَالَى: "ابْنُوا لِعَبْدِيْ بَيْتاً فِيْ الْجَنَّةِ، وَسَمُّوْهُ: بَيْتَ الْحَمْدِ"». واتە: "ئەگەر منداڵی بەندەیەك بمرێت، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: (گیانی منداڵی بەندەکەمتان کێشا؟ بەروبوومی دڵیتان لێ وەرگرتەوە؟) ئەوانیش عەرزی دەکەن: (بەڵێ). خوای گەورەش دەفەرموێت: (ئەی بەندەکەم چی وت؟) ئەوانیش عەرزی دەکەن: (سوپاسو ستایشی تۆی کردو، ئەوەشی وت کە هەموومان موڵکی خواینو، بۆ خزمەتی ئەویش دەگەڕێینەوە: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ). ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێت: (ئێوەش لە بەهەشتداماڵو خانوویەك بۆ بەندەکەم درووست بکەنو، ناوی بنێت: ماڵو خانووی سوپاسو ستایش)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

هەر لە مانای ئەم حەدیسەشدا، حەدیسێکمان بۆ ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «يَقُوْلُ اللهُ تَعَالَى: مَا لِعَبْدِيْ الْمُؤْمِنِ عِنْدِيْ جَزَاءٌ، إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، ثُمَّ احْتَسَبَهُ، إِلاَّ الْجَنَّةُ».[2] واتە: "خوای گەورە دەفەرموێت: (تەنها بەهەشت پاداشتی ئەو بەندە باوەڕدارەمە، کە خۆشەویستەکەی لە دنیادا لێ دەسێنمەوەو، ئەویش ئارام دەگرێتو چاوەڕێی پاداشت لە من دەکات)".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٤١ / بە ژمارە: ١٠٢١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٥ / ٢٣٦١ / بە ژمارە: ٦٠٦٠.

## ئەوەی کەسێك دەیلێت، کە هەواڵی مردنی هاوڕێیەکی پێ دەگات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «الْمَوْتُ فَزَعٌ، فَإِذَا بَلَغَ أَحَدَكُمْ وَفَاةُ أَخِيْهِ، فَلْيَقُلْ: "إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُوْنَ" اللّهُمَّ، اكْتُبْهُ عِنْدَكَ فِيْ الْمُحْسِنِيْنَ، وَاجْعَلْ كِتَابَهُ فِيْ عِلِّيِّيْنَ، وَاخْلُفْهُ فِيْ أَهْلِهِ فِيْ الْغَابِرِيْنَ، وَلا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ».[1] واتە: "مردن شتێکی ترسناکە، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەواڵی مردنی برایەکی پێگەیشت، با بڵێت: {(إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُوْنَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُوْنَ). خوایە، لای خۆت لە ڕیزی چاکەکاراندا ناوی تۆمار بکەو، دەفتەری کردەوەکانیشی لەو جێگەدا دابنێ، کە دەفتەری باوەڕدارە چاکەکارەکانی تێدا دادەنێت‌و، ئاگاشت لەو کەس‌وکارەی بێت کە لێی بەجێماون‌و، لە پاداشتی خەیری لەدەستدان‌و مردنیشی بێبەشمان مەکەو، لەدوای ئەویش تووشی فیتنەو ئاشووبمان مەکە} ".

## ئەوەی کەسێك دەیلێت، کە هەواڵی مردنی دوژمنێکی ئیسلامی پێ دەگات

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٦٤ - ٢٦٥ / بە ژمارە: ٥٦١. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٢٠ - ٣٢١.

گەورە (أَبُو جَهْل)ی کوشت. ئەویش فەرمووی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ نَصرَ عَبْدَهُ، وَأَعَزَّ دِيْنَـــهُ».[1] واتــە: "ســوپاس و ســتایش بــۆ ئــەو خوایــەی، کــە بەندەکــەی خــۆی سەرخست و، ئاینەکەی خۆیشی بەهێز کرد".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّــنِّيّ) / ٢٦٥ / بـە ژمـارە: ٥٦٢. حەدیسـێکی لاوازە. چونکە ڕشتەکەی بچڕانی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ /٣٢١.

## حەرامە بە دەنگی بەرز مردوو بلاوێنرێتەوەو، هاوار بکرێت بەشێوەی سەردەمی نەفامی

تەواوی ئومەتی ئیسلام کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە لەکاتی لێقەومانـدا لاواندنەوەی مردوو بە دەنگی بەرزو، گریان لەسەری‌و، ژماردنی چاکەکانی‌و، هاوار هاواری شێوازی سەردەمی نەفامی‌و، داوای ماڵ کاولبوون حەرامەو ناڕەوایە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُوْدَ، وَشَقَّ الْجُيُوْبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی بە ڕوومەتی خۆیدا بکێشێت‌و، یەخەی خۆی دابدڕێت‌و، هاوار هاواری سەردەمی نەفامی بکات، لە ئێمە نیەو پەیڕەوی لە سونەت‌و ڕێبازی ئێمە نەکردوە".

لە ڕیوایەتێکی ئیمامی موسلیمدا بەم جۆرە هاتوە: «أَوْ دَعَا ، أَوْ شَقَّ». واتە: ئەگەر یەکێك لەو کارانە بکات لە ئێمە نیە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەم سێ جۆرە کەسە خۆی بەری کردوە: (الصَّالِقَة)و، (الْحَالِقَة)و، (الشَّاقَّة).[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٥ / بە ژمارە: ١٢٣٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٩٩ / بە ژمارە: ١٠٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٦ / بە ژمارە: ١٢٣٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١٠٠ / بە ژمارە: ١٠٤.

منیش دەڵێم: (الصَّالِقَة) ئەو کەسەیە، کە بە دەنگی بەرز مردوو دەلاوێنێتەوەو، (الْحَالِقَة)ش: ئەو کەسەیە، کە لە کاتی لێقەوماندا قژی خۆی دەرنێتەوەو، (الشَّاقَّة)ش: ئەو کەسەیە، کە لەکاتی لێقەوماندا یەخەی خۆی دادەدڕێت.

جا زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە هەموو ئەم کارانە حەرامو ناڕەوان.

بە هەمان شێوە پەرتوبلاوکرنی قژو، بە ڕوومەتدا کێشانو، دەمو چاو رووشاندنو، دوعای ماڵکاولبوونیش هەر حەرامو ناڕەوایە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە ژنەهاوەڵی خۆشەویست (أُمُّ عَطِيَّة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە بەیعەتەکەدا پەیمانی ئەوەی لێ وەرگرتین، کە بە دەنگی بەرز مردوو نەلاوێنینەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اثْنَتَانِ فِيْ النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: "الطَّعْنُ فِيْ النَّسَبِ" وَ"النِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ"».[2] واتە: "دوو سیفەتو خووی ناشیرین لەناو خەڵکیدا هەن، لە سیفەتی کافرو بێباوەڕەکانن: تانەدان لە نەسەبو ڕەچەڵەکو، لاواندنەوەو کردنی شینو زاری لەسەر مردوو".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٤٠ / بە ژمارە: ١٢٤٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٤٥ / بە ژمارە: ٩٣٦.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٨٢ / بە ژمارە: ٦٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا نەفرەتی کردوە لەو ژنەی، کە مردوو دەلاوێنێتەوەو، لەوەش، کە گوێی لێ دەگرێت.[1]

بزانە، کە لە زمانی عەرەبیدا بە باسکردنو هەژماردنی چاکەکانی کەسی مردوو بە دەنگی بەرز دەوترێت (نِيَاحَة). وتراویشە: بە گریانو هەژماردنی چاکەکانی کەسە مردوەکە دەوترێت (واتە: ئیتر با بەدەنگی بەرزیش نەبێت).

هاوەڵانمان فەرموویانە: حەرامە لە گریاندا دەنگ زۆر بەرز بکرێتەوە.

بەڵام گریان لەسەر مردوو حەرام نیە، ئەگەر بەبێ دەنگ بەرز کردنەوە بێتو، باسی چاکەکانی مردوەکەش نەکرێت.

چونکە بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی برد بۆ سەردانی نەخۆشی هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (عُبَادَة)و، هەرسێ هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمن)ی کوڕی (عَوْف)و، (سَعْد)ی کوڕی (أَبو وَقَّاص)و، (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسعُوْد)ی لەخزمەتدا بوو، جا کە پێغەمبەری خوا چاوی بە (سَعْد) کەوت، دەستی کرد بە گریانو، هاوەڵانیش کە چاویان بە گریانەکەی پێغەمبەری خوا کەوت، ئەوانیش دەستیان کرد بە گریانو، پێغەمبەریش فەرمووی: «أَلا تَسْمَعُوْنَ، إِنَّ اللهَ لا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ، وَلا بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا، أَوْ يَرْحَمُ».[2] واتە: "ئا گوێ بگرن، بەڕاستی خوای گەورە بە فرمێسکی چاو سزا نادات‌و، بە خەمو پەژارەی دڵیش سزا نادات.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢١١ / بە ژمارە: ٣١٢٨. حەدیسێکی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٣٢ – ٣٣٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣٩ / بە ژمارە: ١٢٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٦ / بە ژمارە: ٩٢٤.

بەلاَم ئا (بەمە) سزا دەدات، یان ڕەحم دەكات. جا ئاماژەی كرد بە زمانی پـیرۆزی. (واتە: ئەگەر زمان خراپ بلێت خاوەنەكەی سزا دەدرێت‌و، ئەگەر باشیش بلێـت، پاداشتی چاكە وەردەگرێت).

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أسَامَة)ی كوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لـە هـەردووكیان ڕازی بێت)، كـە جارێـك كوڕێكی (زەینەب)ی كچی پێغەمبەری خوا لەكاتی سەرەمەرگیدا خرایە خزمـەتی‌و، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) فرمێسك بە چاوە پیرۆزەكانیدا هاتە خـوارەوەو، (سَعْد)ی كوڕی (عُبَادَة)ش عەرزی كرد: ئەم گریانـە چـیە، ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ ئەویش فـەرمووی: «هَذِهِ رَحْمَةٌ، جَعَلَهَا اللهُ تَعَالَى فِيْ قُلُوْبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَـرْحَمُ اللهُ تَعَالَى مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ».[1] واتە: "ئەم فرمێسكە ڕەحم‌و بەزەییەكە خـوای گـەورە خستویەتیە دڵی بەندەكانیەوە، خوای گەورەش لە بەندەكانیدا تەنها ڕەحم بە خاوەن بەزەییەكان دەكات".

منیش دەڵێم: وشەی (الرُّحَمَاء) بە مەنصوبی‌و بە مـەرفوعیش ڕیوایـەت كـراوە. مەنصوبی لەسەر ئەوەی، كە مەفعولی (يَرْحَمُ)ە. مـەرفوعیش لەسـەر ئـەوەی، كـە خەبەری (إنَّ)یەو، ئەو كاتەش (مَا)كە بە مانای (الَّذِيْ)ـە.

بۆشمان ڕیوایـەت كـراوە لــە صـەحیحی بوخاریـدا، لــە هـاوەڵی خۆشەویسـت (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێت) تەشریفی بردە ژوورەوە بۆلای (إِبْرَاهِيْم)ی كوڕی، كە لەو كاتەدا گیـانی دەدا، ئـیتر فرمێسـك بـە چـاوە پیرۆزەكانیـدا هاتـەخوارەوەو، هـاوەڵی خۆشەویسـت (عَبْدُالرَّحْمن)ی كوڕی (عَوْف)یش عەرزی كرد: جەنابیشت ئەی پێغەمبەری خـوا؟! (واتە: جەنابیشت دەگریت). ئـەویش فـەرمووی: «يَا بْنَ عَوْفٍ، إِنَّهَا رَحْمَةٌ». واتـە:

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٣١ / بە ژمارە: ١٢٢٤، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٦٣٥ / بە ژمارە: ٩٢٣.

"ئەی کوڕی عەوف، ئەوە سۆزو بەزەییە". پاشان فەرمایشتێکی تری کرد (یان جارێکی تر فرمێسك بەچاوی پیرۆزیدا هاتە خوارەوە)و، فەرمووی: «إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُوْلُ إِلاَّ مَا يُرْضِيْ رَبَّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ، يَا إِبْرَاهِيمُ، لَمَحْزُوْنُوْنَ».[1] واتە: "بەڕاستی چاو فرمێسك دەڕێژێت‌و، دڵیش تەنگ‌و خەفەتبار دەبێت‌و، ئێمەش تەنها شتێك دەڵێین، کە خوای گەورە پێی ڕازی بێت، بەڕاستی ئێمە بە بەلەدەستدان‌و مردنی تۆ خەفەتبارین، ئەی (إِبْرَاهِيمُ)".

هەروەها زۆرێك حەدیسی مەشهووری تریش بە مانای ئەم حەدیسانە هاتوون.

سەبارەت بەو حەدیسە (صَحِيْح)انەش، کە مردوو سزا دەدرێت بە گریانی کەس‌وکارەکەی لەسەری، ئەوە نە بە ڕواڵەتەکەیان وەردەگیرێت‌و، نە بە ڕەهاییش. بەڵکو تەئویل دەکرێن‌و، زانایانیش چەند بۆچوونێکی جیاوازیان هەیە لە چۆنێتی تەئویل کردنیاندا: بەهێزترینیان -خواش لە هەموو کەس زاناترە- ئەوەیە، کە گریانەکە هۆکارێکی هەبێت، وەکو ئەوەی کە کەسەکە خۆی وەسیێتی بۆ کەس‌وکارەکەی کردبێت بۆی بگرین، یان هەر هۆکارێکی تر (وەکو ئەوەی کە بە دەنگی بەرز بۆی بگرین). جا منیش لە (كِتَابُ الْجَنَائِز)ی شەرحی (الْمُهَذَّب)دا تەواوی یان زۆربەی بۆچوونەکانم هێناوە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: گریان لەپێش‌و لەدوای مردنی کەسەکەوە هەر درووستە. بەڵام لەپێشەوە باشترە. چونکە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «فَإِذَا وَجَبَتْ، فَلاَ تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ». واتە: "ئەگەر کەسەکە مرد، ئیتر با کەس بۆی نەگری".[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ١ / ٤٣٩ / بە ژمارە: ١٢٤١. هەروەها ئیمامی موسلیمیش هەندێکی هێناوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٣ / ١٢٥٠ / بە ژمارە: ١٦٢٨.

(٢) پوختەی ئەم حەدیسە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا لەکاتی سەرەمەرگی هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (ثَابِت)ی کوڕی (قَيْس)ی (الْأَنْصَارِيّ)دا تەشریفی هێنا بۆلای‌و، بینی وا لە

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)و، هاوەڵانیش فەرموویانە: گریان لەدوای مردن ناپەسەندە، حەرام نیە. ئەو نەهیەش کە لە حەدیسەکەی (فَلاَ تَبْكِيَنَّ بَاكِيَةٌ)دا هاتوە بە ناپەسەند لێکیانداوەتەوە.

## باسی پرسەو سەرەخۆشی کردن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (السُّنَنُ الْكُبْرَى)ی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ عَزَّى مُصَاباً، فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی پرسەو سەرەخۆشی لە خاوەن مردوویەك بکات، وەکو ئەو پاداشتی دەست دەکەوێت". ڕشتەکەی لاوازە.[2]

---

سەرەمەرگدایەو ئازار زۆری بۆ هێناوە، جا کە بانگی کرد، ئەو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)ی کردو، فەرمووی: بەڕاستی دەسەڵاتی گۆڕینی بڕیاری خوای گەورەمان نیە. ئەوەبوو ئافرەتەکان قیژاندیانو دەستیان کرد بە گریانو، کەسێکیش هەولیدا بێدەنگیان بکات، جا پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: "لێیانگەڕێ با بگرین، بەڵام کە مرد، ئیتر با کەس نەگری". بڕوانە: **سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٥** / بە ژمارە: **٣١١١**، **وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ١٣** / بە ژمارە: **١٨٤٦**، **وصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٧ / ٤٦١** / بە ژمارە: **٣١٨٩**، **والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٥٠٣** / بە ژمارە: **١٣٠٠**.

(١) بڕوانە: **سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٨٥** / بە ژمارە: **١٠٧٣**، **وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٥٩** / بە ژمارە: **٦٨٨٠**.

(٢) بەڵام لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە. بەمەش حەدیسەکە پاڵپشتی هەیە. بڕوانە: **النَّقْدُ الصَّحِيْحُ لِمَا اعْتُرِضَ مِنْ أَحَادِيْثِ الْمَصَابِيْح (صَلاحُ الدِّيْنِ الْعَلائِيّ) / ١ / ٣٣ - ٣٤** / بە ژمارە: **٤**، **والْجَوْهَرُ النَّقِيُّ عَلَى سُنَنِ الْبَيْهَقِيّ (ابْنُ التُّرْكُمَانِيّ) / ٤ / ٥٩**، **وتُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ إِلَى أَدِلَّةِ الْمِنْهَاج (ابْنُ الْمُلَقِّن) / ١ / ٦١٤** / بە ژمارە: **٨٢٩**.

دیسان لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو بَرْزَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ عَزَّى ثَكْلَى، كُسِيَ بُرْداً فِيْ الْجَنَّةِ». واتە: "ئەو کەسەی پرسەو سەرەخۆشي لە ئافرەتێکی منداڵمردووی جگەرسووتاو بکات، لە بەهەشتدا عابایەکی ڕێزو حورمەتی لەبەردەکرێت".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ڕشتەکەی بەهێز نیە.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆیو باوکیشی ڕازی بێت)، کە حەدیسێکی درێژی ڕیوایەت کردوەو، تێیدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بە (فَاطِمَة)ی کچی خۆی فەرموە (خوای لێ ڕازی بێت): (ئەی فَاطِمَة، چی لە ماڵی خۆت هێناویتیێ دەرەوە؟) ئەویش عەرزی کرد: هاتم بۆلای کەس‌وکاری ئەو مردوەو، پرسەو سەرەخۆشیم لێ کردن.(٢)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (ابْنُ مَاجَه)و (بَيْهَقِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی کوڕی (حَزْم)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٨٧ / بە ژمارە: ١٠٧٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٠٩ / بە ژمارە: ٣١٢٣، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ٢٧ / بە ژمارە: ١٨٨٠. ئیمامی نەوەوی خۆی فەرموویەتی: ڕشتەکەی لاوازەو، ئیمامی (حَاكِم)و (ابْنُ حِبَّان)یش بە (صَحِيْح)یان داناوەو، شێخی (ابْنُ الْقَطَّان)و شێخی عەسقەلانیش بە (حَسَن)یان داناوە. بڕوانە: خُلاصَةُ الْأَحْكَام / ٢ / ١٠٠٥ / بە ژمارە: ٣٥٩٥، وبَيَانُ الْوَهْمِ وَالْإِيْهَامِ فِيْ كِتَابِ الْأَحْكَامِ (ابْنُ الْقَطَّان) / ٥ / ٦١٧ - ٦٢٠، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٤٩ - ٣٥٠. هەروەها بڕوانە: الْمُحَرَّرُ فِيْ الْحَدِيْث (ابْنُ عَبْدِ الْهَادِيْ الْحَنْبَلِيّ) / ١ / ٣٢٧ - ٣٢٩ / بە ژمارە: ٥٥٥، وتُحْفَةُ الْمُحْتَاجِ إِلَى أدِلَّةِ الْمِنْهَاج / ١ / ٦١٦ - ٦١٧ / بە ژمارە: ٨٣٢.

يُعَزِّيْ أخَاهُ بِمُصِيْبَتِهِ، إِلاّ كَسَاهُ اللهُ -عَزَّ وَجَلَّ- مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».(١)
واته: "هەر ئیمانداریێك دڵنەوایی‌و سەرەخۆشی لە برایەکی لێقەوماوی خۆی بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بە جلو بەرگی ڕازاوەی بەهەشت پۆشتەی دەکاتەوە".

بشزانە، کە پرسەکردن بریتیە لە: ئارامی پێبەخشین‌و، دڵنەوایی کردنی خاوەنی مردوەکەو، سوك کردنی غەمباریەکەی‌و، ئاسان کردنی لێقەومیانەکەی.

جا پرسەکردنیش سونەتە. چونکە فەرمان بە چاکەو، نەهی لە خراپەی تێدایەو، لەژێر ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەدا جێگەی دەبێتەوە، کە فەرموویەتی: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾ [الْمَائِدَة: ٢]. واتە: {پشتیوان‌و هاوکاری یەکتربن لەسەر چاکەکاری‌و لە خواترسان}. ئەمەش باشترین بەڵگەیە بۆ درووستی پرسەکردن.

هەروەها لە حەدیسی (صَحِيْح)یشدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «وَاللهُ فِيْ عَوْنِ الْعَبْدِ، مَا كَانَ الْعَبْدُ فِيْ عَوْنِ أخِيْهِ».(٢) واتە: "خوای گەورە لە پشتیوانی‌و هاوکاری بەندەدایە، مادام بەندەش لە پشتیوانی‌و هاوکاری برای خۆیدا بێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٥١١ / بە ژمارە: ١٦٠١، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٤ / ٥٩ / بە ژمارە: ٦٨٧٩. ڕشتەکەی (حَسَن) نیە، چونکە وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: سەرەڕای ئەوەی یەکێك لە ڕاویەکانی قسەی لەسەرە، بچڕانیشی تێدایە. بەڵام لەبەرئەوەی لە چەند ڕێگەیەکی ترەوە پاڵپشت کراوە، بۆیە هەندێك لە زانایان بە حەدیسێکی (حَسَن)ی دادەنێن. بڕوانە: مِصْبَاحُ الزُّجَاجَةِ فِيْ زَوَائِدِ ابْنِ مَاجَه (الْبُوْصِيْرِيّ) / ٢ / ٥٠ – ٥١ / بە ژمارە: ٥٨٦، ونَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٣٤٧ – ٣٤٩.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٧٤ / بە ژمارە: ٢٦٩٩.

بشزانە، کە پرسەکردن سونەتە لەپێش بەخاك سپاردنی مردوەکەو، لەدوای بەخاك سپاردنیشی.

هاوەڵانمان فەرموویانە: کاتی پرسەکردن لە کاتی مردنی کەسەکەوە دەست پێدەکاتو، تا سێ ڕۆژیش لە بەخاك سپاردنەکەوە دەمێنێتەوە. سێ ڕۆژەکەش بە نزیکیە، نەك بە دیاری کردن (واتە: مەرج نیە سێ ڕۆژو سێ شەوی تەواو بێت، کە دەکاتە: ٧٢ سەعات). ئەمە فەرمایشتی زانای پایەبەرز (أَبُو مُحَمَّد)ی (جُوَيْنِيّ)ـە – کە یەکێکە لە هاوەڵانمان–.

هاوەڵانمان فەرموویانە: پرسەکردن لەدوای سێ ڕۆژ ناپەسەندە. چونکە پرسە بۆ ئارام کردنەوەی دڵی لێقەوماوەکەیەو، بەزۆریش لەدوای سێ ڕۆژەوە دڵی ئارام دەبێتەوە. بۆیە نابێت خەفەتەکەی بۆ تازە بکرێتەوە، وەکو زۆربەی هاوەڵانمان فەرموویانە.

زانای پایەبەرز (أَبُو الْعَبَّاس)ی ناسراو بە (ابْنُ الْقَاص) –کە یەکێکە لە هاوەڵانمان– فەرموویەتی: قەیناکە پرسە لەدوای سێ ڕۆژیشەوە بکرێت. بەڵکو پرسەکردن هەر دەمێنێتەوە، باوەکو ماوەیەکی زۆریش بەسەر مردنی کەسەکەدا تێپەڕ بووبێت.

هەروەها زانای پایەبەرز (إِمَامُ الْحَرَمَيْنِ)یش ئەم بۆچوونەی لە هەندێك لە هاوەڵانمانەوە گێڕاوەتەوە.

بەڵام بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە، کە نابێت لەدوای سێ ڕۆژەوە پرسەو سەرەخۆشی لە خاوەن مردوەکە بکرێت، تەنها لە دوو شێوازدا نەبێت، کە هاوەڵانمان یان کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان هەڵاوێریان کردون. ئەوانیش: ئەگەر پرسەکەرەکە، یان خاوەن مردوەکە لەکاتی بەخاك سپاردنەکەدا لەوێ نەبێتو، واش ڕێکبکەوێت، کە لەدوای سێ ڕۆژ بگەڕێتەوە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: پرسەکردن لەدوای بەخاك سپاردن باشترە وەك لـەپێش بـەخاك سـپاردن. چـونکە لەلایەکـەوە کـەس‌وکاری مردوەکـە لـەپێش بـەخاك سـپاردنەکەوە سـەرقاڵی ئامـادەکردنی مردوەکـەیانن بـۆ ناشـتن‌و ئەسـپەردەکردن، لەلایەکی تریشەوە خەمباربوونیان بۆ جیابوونەوەو لەدەسـتدانی مردوەکـە لـەدوای ناشتنەکەوە زیاترە.

جا ئەمەی کە وتمان بۆ کاتێکە، کەس‌وکاری مردوەکـە زۆر پەرێشـان‌و خـەمبار نەبن. ئەگینا باشتر وایە پرسە کردنەکە لەپێش بـەخاك سـپاردنەکەوە بێـت، بـەڵکو ببێت بەهۆی ئارام کردنەوەو سەبووری بۆهاتنیان. خوای گەورەش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك: { پرسەو سەرەخۆشی کردن لە تەواوی کەس‌وکاری مردوەکە}

سونەتیشە پرسـە لـە هـەموو کـەس‌وکارو خزمـە گـەورەو بچـووك‌و نێرینـەو مێینەکانی مردوەکە بکرێت، مەگەر پرسەلێکراوەکە ئافرەتێکی گەنج بێت، کە ئەم بێجگە لە مەحرەمی خۆی، نابێت کەسی تر پرسەی لێ بکات.

هاوەڵانیشمان فەرموویانە: پرسەکردن لە خـەڵکانی چـاکەکارو، لـە خـەڵکانی لاوازو بێدەسەڵات بۆ خۆگرتنیان بەرامبەر لێقەومانەکەو، لە منداڵان زیاتر سونەتەو جەختی لەسەر کراوەتەوە.

## باسێك: {دانیشتن بۆ پرسە}

ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵانمان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: دانیشتن بۆ پرسە ناپەسەندە. جا فەرموویانە: مەبەست بە دانیشتن ئەوەیە، کە کەس‌وکاری مردووەکە لە ماڵێکدا کۆببنەوە، تاوەکو ئەو کەسەی دەیەوێت پرسەیان لێ بکات، بچێت بۆلایان. بەڵکو دەبێت کەس‌وکاری مردووەکە بچن بەدەم پێویستیەکانی خۆیانەوە.

جا سەبارەت بەم ناپەسەندی دانیشتنە هیچ جیاوازیەك لە نێوان پیاوان‌و ژناندا نیە، وەکو شێخی (مَحَامِلِيّ) فەرموویەتی‌و، نقلیشی کردوە لە ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت).

ئەوجا ئەم ناپەسەندیە کاتێکە، کە پرسەکە شتی داهێنراوی تری لەگەڵدا نەبێت. خۆ ئەگەر شتێکی داهێنراوی حەرامی لەگەڵدا بوو، وەکو زۆر جار عادەت وەهایە، ئەوا دانیشتنەکە دەبێتە یەکێك لە حەرامە ناشیرینەکان. چونکە کارێکی داهێنراوەو، لە حەدیسی (صَحِيح)یشدا هاتوە، کە «إِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ».[1]

## باسێك: {ئەو لەفزو تەعبیرانەی بۆ پرسەکردن بەکاردەهێنرێن}

سەبارەت بەو وتەیەی، کە بۆ پرسەکردن‌و دڵنەوایی کردن بەکار دەهێنرێت، ئەوە هیچ جۆرە کۆت‌و ڕێگریەکی لەسەر نیە. بۆیە بە هەر وتەیەك پرسە لە کەس‌وکاری مردووەکە بکات، هەر دەبێت.

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦١٠ / بە ژمارە: ٤٦٠٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ١ / ١٨ / بە ژمارە: ٤٦، وسُنَنُ النَّسَائِيِّ الْكُبْرَى / ١ / ٥٥٠ / بە ژمارە: ١٧٨٦، وصَحِيْحُ ابْنِ حِبَّـان / ١ / ١٧٨ – ١٧٩ / بە ژمارە: ٥، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٣ / ٢١٤ / بە ژمارە: ٥٥٩١.

هاوەڵانمان فەرموویانە:

- بۆ دڵنەوایی کردنی موسوڵمانێك، بە مردنی خزمێکی موسوڵمانی، سونەتە کەسی پرسەکەر پێی بڵێت: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ، وَأَحْسَنَ عَزَاءَكَ، وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ). واتە: (خوا پاداشتی گەورەت بداتەوەو، ئارامیو سەبووری باشت بداتو، لە مردوەکەشت خۆش ببێت).
- بۆ دڵنەوایی کردنی موسوڵمانێك، بە مردنی خزمێکی کافری، سونەتە کەسی پرسەکەر پێی بڵێت: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ، وَأَحْسَنَ عَزَاءَكَ).
- بۆ دڵنەوایی کردنی کافرێك، بە مردنی خزمێکی موسوڵمانی، سونەتە کەسی پرسەکەر پێی بڵێت: (أَحْسَنَ اللهُ عَزَاءَكَ، وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ).
- بۆ دڵنەوایی کردنی کافرێك، بە مردنی خزمێکی کافری، سونەتە کەسی پرسەکەر پێی بڵێت: (أَخْلَفَ اللهُ عَلَيْكَ). واتە: خوا بە کەسێکی تری جێگەکەیت بۆ پڕ بکاتەوە، یان خوا جێگەی ئەوت بۆ بگرێتەوە.

جوانترین وتەش بۆ پرسەکردنو دڵنەوایی کردن بریتیە لەوەی، کە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَةَ)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کەسێکی نارد بەشوێنی پێغەمبەردا، تا تەشریف بهێنێتو، خەبەری پێبدات، کە منداڵێکی -یان کوڕێکی- لە سەرەمەرگدایە. پێغەمبەریش فەرمووی: «ارْجِعْ إِلَيْهَا، فَأَخْبِرْهَا: "أَنَّ لِلَّهِ تَعَالَى مَا أَخَذَ، وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى"، فَمُرْهَا، فَلْتَصْبِرْ، وَلْتَحْتَسِبْ».(١)
واتە: "بگەڕێرەوە بۆلایو، خەبەری پێ بدە، کە ئەوەی خوا بردوویەتی، هی خۆیەتیو، ئەوەش دەیدات هەر هی خۆیەتیو، هەموو شتێکیش لای ئەو بۆ ماوەو

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٦ / ٢٦٨٦ / بە ژمارە: ٦٩٤٢، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٥ / بە ژمارە: ٩٢٣.

مودەتێکی دیاریکراوە. بۆیە فەرمانی پیٚ بکە، با ئارام بگرێت و، چاوەڕوانی پاداشت لە خوای گەورە بکات".

منیش دەڵێم: ئەم حەدیسە یەکێکە لە گەورەترین یاساو ڕێساکانی ئیسلام، کە داگرەوەیە بەسەر زۆرێك لە بابەتە گرنگەکانی عەقیدەو شەرع و، ویَلَو ئاداب و ئارام گرتن لەسەر هەموو لێقەومان و خەفەت و نەخۆشی و ناڕەحەتیەکانی تریش.

مانای «أنَّ لِلَّهِ تَعَالَى مَا أخَذَ»، ئەوەیە: کە دنیا هەمووی موڵکی خوای گەورەیە. بۆیە شتێکی نەبردوە، کە هی ئێوە بێت. بەڵکو شتێکی خۆی بردۆتەوە، کە لای ئێوە دایانابوو.

مانای «وَلَهُ مَا أعْطَى»ش، ئەوەیە: کە ئەوەی بە ئێوەی بەخشیوە، شتێك نیە لە دەرەوەی موڵکی ئەو بێت. بەڵکو هی خۆیەتی و، چیشی بوێت پێی دەکات.

«وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِأجَلٍ مُسَمًّى» واتە: خەمبارو دڵتەنگ مەبن، چونکە ئەوەی خوا مراندویەتی و بردوویەتیەوە، ئەجەلو ماوە دیاریکراوەکەی ژیانی تەواو بوە. بۆیە هەرگیز ناگونجێت لەوە دوا بکەوێت، یان لەوە پێش بکەوێت.

جا ئەگەر هەموو ئەمانەتان زانی، ئیتر ئارام بگرن و، چاوەڕێی پاداشتی خوا بکەن، لە بەرامبەر ئەو ناڕەحەتیەی بەسەرتاندا هاتوە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە زانای پایەبەرز (مُعَاوِيَة)ی کوڕی (قُـرَّة)ی کوڕی (إِيَـاس)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوە (خوای لیٚ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەواڵی یەکێك لە هاوەڵانی پرسی، کە دیار نیە. هاوەڵانیش عەرزیان کرد: "ئەو منداڵەی مردوە، کە جەنابت بینیبووت". جا کە پێغەمبەری خوا بە هاوەڵەکەی گەیشت، پرسیاری منداڵەکەی لیٚ کردو، ئەویش عەرزی کرد، کە مردوە. پێغەمبەریش

پرسەو سەرەخۆشی لێ کردو، فـەرمووی: «يَا فُلانُ، أَيُّمَا كَانَ أَحَبَّ إِلَيْكَ؟: أَنْ تَمَتَّعَ بِهِ عُمُرَكَ، أَوْ لا تَأْتِيَ غَداً بَاباً مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، إِلاَّ وَجَدْتَهُ قَدْ سَبَقَكَ إِلَيْـهِ، يَفْتَحُـهُ لَكَ». واته: "ئەی فلان، کامیانت پێ خۆشترە: کوڕەکەت بە درێژایی تەمەنت بمایـە، یان سبەینێ بەرەو هەر دەرگایەکی بەهەشـت بچیت، ببینیـت ئـەو لـەپێشـتەوەیەو، دەرگاکەت بۆ دەکاتەوە؟" هاوەڵەکەش عەرزی کرد: "ئەی پێغەمبەری خوا، بـەڵکو پێم خۆشترە، کە لـەپێش منەوە بچێتە بەهەشتەوەو، دەرگای بەهەشتم بـۆ بکاتـەوە". پێغەمبەریش فەرمووی: "دەی ئەوەت دەست دەکەوێت".(١)

ئیمامی (بَيْهَقِيّ)ش لـە کتێبی (مَنَاقِبُ الشَّافِعِيّ)دا (ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێـت) بـە ڕشتەی خۆی ڕیوایەتی کردوە: کە ئیمامی (شَـافِعِيّ) خەبـەری پـێ گەیشـت، کـە کوڕێکی زانای پایەبـەرز (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کـوڕی (مَهْـدِيّ) مـردوەو، ئـەویش زۆر خەمبارو ناڕەحەت بوە بۆی (دەوترێت: وازی لـە خواردنو خواردنەوە هێناوە). جـا ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نامەیەکی بۆ ناردو، تێیـدا فـەرمووی: براکـەم، دڵنەوایی خـۆت بکـە بـەوەی، کـە دڵنـەوایی کەسـانی تـری پـێ دەکـەیتو، لـە کردەوەی خۆشتدا ئەوە بە خراپ بزانە، کە لـە کردەوەی کەسانی تـردا بـە خراپـی دەزانیتو، بزانە، کە ناڕەحەتترینو بە ئازارترین لێقـەومان بریتیـە لـە لـەدەسـتدانی دڵخۆشـیو، بێبەشـبوون لـە پاداشـت. جـا چـۆنە ئەگـەر هـەردووکیان لـەگـەڵ گوناهباربوونیشدا کۆببنەوە؟! براکەم، دەست بـە بۆ بەختو بەشی خـۆت، ئەگـەر لێت نزیکبوویەوە، بەرلـەوەی بەشوێنیدا بگەڕێیتو، ئەویش لێـت دورکەوتبێتـەوە. خوای گەورە لـەکاتی لێقەوماندا ئارامی بـە دڵـت ببەخشـێتو، پاداشـتی ئێمـەشو تۆش بەو ئارامیە بداتەوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ١١٨ / بە ژمـارە: ٢٠٨٨. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویـەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـەو، سەیریشە بەلامەوە کە ئیمامی نـەوەوی ڕشـتەکەی بـە (حَسَـن) داناوە. ئەوجا فەرموویەتی: ئیمامی (ابْنُ حِبَّان)و (حَاكِم)یش بە (صَحِيْح)یان داناوە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٥٨ - ٣٥٩.

هەروەها بۆی نوسیبوو:

إِنِّيْ مُعَزِّيْكَ لا أَنِّيْ عَلَــى ثِقَــةٍ مِنَ الْخُلُودِ وَلَكِنْ سُــنَّةُ الــدِّيْنِ
فَمَا الْمُعَزَّى بِبَاقٍ بَعْــدَ مَيِّتِــهِ وَلا الْمُعَزِّي وَلَوْ عَاشَا إِلَى حِيْنِ

واتە: من پرسەو سەرەخۆشیت لێ دەکەم، نەك لەبەرئەوەی متمانەم بە مانەوەو نەمری تۆ هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی سونەتی دینە. چونکە نە پرسەلێکراو لەدوای مردووەکەیەوە دەمێنێتەوەو، نە پرسەکەریش، باوەکو ماوەیەکی زۆریش بژین.[1]

پیاوێکیش نامەیەکی ناردبوو بۆ یەکێك لە براو دۆستەکانی خۆی، پرسەو سەرەخۆشی لێ دەکرد بەبۆنەی مردنی کوڕێکیەوە. تێیدا نوسیبووی: پاشان، منداڵ هەرچەندە بژی، هەر خەم‌و فیتنەیە بۆ باوکی. جا ئەگەر لەپێش باوکیەوە مرد، ئەوا دەبێتە ڕەحمەت بۆی. بۆیە دڵتەنگ مەبە، کە خەم‌و فیتنەی ئەوت لەکۆڵ بوەتەوەو، ئەو ڕەحمەتە خۆاییەش لە دەستی خۆت مەدە، کە لە بەرامبەر مردنی ئەوەوە دەستت دەکەوێت.

(مُوْسَى)ی کوڕی (مَهْدِيّ) (کە یەکێك بوە لە فەرمانڕەوا عەباسیەکان)، پرسەو سەرەخۆشی کردوە لە (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (سَالِم)، بەهۆی مردنی کوڕێکیەوەو، پێی وتوە: لەدایکبوونی کوڕەکەت دڵخۆشی کردیت، لەکاتێکدا کە پەیدابوونەکەی نارەحەتی‌و فیتنەیە بۆت‌و، مردنیشی خەمباری کردیت، لەکاتێکدا کە مردنەکەی ڕەحمەتە بۆت.

پیاوێکیش پرسەو سەرەخۆشی کرد لە پیاوێکی ترو، پێی وت: پێویستە لە خوا بترسیت‌و، ئارام بگریت. چونکە بە لە خواترسان، ئەو کەسەی چاوەڕێی پاداشتی

---

(١) منیش دەڵێم:

پرسەت لێ دەکەم، سونەتی دینە نامێنیٚ بۆ تۆو بۆ من، ئەم ژینە

ئەوە، ڕەحمەتی ئەو دەست دەخاتو، کەسـی خەفـەتباریش هـەر بـەرەو ئـارامگرتن دەگەڕێتـەوە (چـونکە بەرەبـەرە خـوای گـەورە سـەبووری دەداتو، بـە تێپـەڕینی کاتیش، لێقەومانەکەی لەبیر دەچێتەوە).

پیاوێکیش پرسەو سەرەخۆشی کرد لە پیاوێکی ترو، پێی وت: ئەو کەسـەی لـە دواڕۆژدا دەبێتە پاداشـت بـۆت، باشـترە لـەو کەسـەی لـە دنیـادا دەبێتـە مایـەی دڵخۆشی بۆت.

لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللہ)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)یشـەوە هـاتوە (خـوا لـە هـەردوکیان ڕازی بێـت)، کـە کـوڕێکی خـۆی بـەخاك سـپاردوەو، لای گۆڕەکەشـیدا پێکەنیوە. جا (بە سەرسـووڕمانێکەوە) عـەرزی کـراوە: ئـەوە لای گۆڕەکەیـدا پـێ دەکەنێت؟! ئەویش فەرمووی: ویستم لوتی شەیتان بکەم بـە خـۆڵا (واتـە: ویسـتم شەیتان سووكو ڕیسوا بکەم).

لە زانای پایەبەرز (ابْنُ جُرَيْج)یشـەوە هـاتوە، کـە فەرموویـەتی: ئـەو کەسـەی لەکاتی لێقەوماندا دڵنـەوایی خـۆی نـەکات بـەو پاداشـتەی خـوا بـۆی دانـاوەو، چاوەڕێی خەڵاتی خوایی نەبێت، ئەوا مردوەکەی خۆی لەبیر دەچێتەوە، هەر وەکـو چۆن ئاژەڵەکان لەبیریان دەچێتەوە(و، هیچ پاداشتێکیان دەست ناکەوێت).

لە (حُمَيْد)ی (أعْرَج)یشەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: زانای پایەبـەرز (سَـعِيْد)ی کوڕی (جُبَيْر)م بینی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت)، تەماشـای کوڕەکـەی خـۆی دەکـردو، دەیفەرموو: من باشـترین سـیفەتت تێـدا دەبیـنم. وتـرا: چـیە؟ ئـەویش فـەرمووی: دەمرێتو، منیش تەنها چاوەڕێی پاداشت لە خوای گەورە دەکەم.

لە زانای پایەبەرز شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)شەوە هاتوە، کە پیاوێك زۆر خـەمبار بوە بۆ مردنی کوڕەکەیو، سکاڵاشی هێناوەتە لای ئـەو، ئـەویش لێـی پرسـی: ئایـا پێشتر کوڕەکەت لێت دوردەکەوتەوە؟ پیاوەکەش عەرزی کرد: بەڵێ، زۆرتـر لـێم

دووردەکەوتەوە، وەك لەوەی لام بێت. شێخ (حَسَن)یش فەرمووی: دەی لێیگەڕێ، با هەر دوور بێت. چونکە هیچ جارێك لێت دوور نەبوە، کە پاداشتی گەورەتر بێت لەم جارەیان. پیاوەکەش عەرزی کرد: ئەی باوکی سەعید (کە کونیەی شێخ حەسەن بوە)، شەوق و شەیداییەکەمت بۆ کوڕەکەم کەمکردەوە.

لە زانای پایەبەرز (مَيْمُوْن)ی کوڕی (مِهْرَان)یشەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: پیاوێك پرسەو سەرەخۆشی کرد لە پێشەوای موسوڵمانان (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز) بەهۆی مردنی (عَبْدُالْمَلِك)ی کوڕیەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە تووشی (عَبْدُالْمَلِك) بوە، شتێك بوە، کە دەمانزانی. بۆیە کە ڕوویدا، پێمان ناخۆش نەبوو.

لە (بِشْر)ی کوڕی (عَبْدُالله)شەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز) لەسەر گۆڕی (عَبْدُالْمَلِك)ی کوڕیدا ڕاوەستاو، فەرمووی: کوڕم، خوا ڕەحمت پێ بکات، کاتێك لەدایك بوویت دڵخۆشکەر بوویت و، کاتێکیش پێگەیشتیت باش بوویت و، ئەوەشم پێ خۆش بوو، کە بانگم دەکردیت، یەکسەر دەهاتیت بەدەممەوە.

لە (مَسْلَمَة)شەوە هاتوە، کە فەرموویەتی: کاتێك (عَبْدُالْمَلِك)ی کوڕی (عُمَر) مرد، باوکی سەری لاداو، فەرمووی: کوڕم، خوا ڕەحمت پێ بکات، بەڕاستی ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆشبووم، کە مژدەی لەدایکبوونی تۆم پێدراو، چەنێکیش تەمەنت کردو ژیایت هەر مایەی خۆشحاڵی و دڵخۆشی بوویت و، هیچ ساتێکیشم بەسەردا نەهاتوە، لەم ساتەی ئێستا دڵخۆشتر بم، چونکە سوێند بە خوا، تۆ باوکت بانگێشت دەکەیت بۆ بەهەشت.

زانای پایەبەرز (أَبُو الْحَسَن)ی (مَدَائِنِيّ) فەرموویەتی: (عُمَر)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز) لەکاتی سەرەمەرگی کوڕەکەیدا تەشریفی بردە لایو، فەرمووی: کوڕم، چۆنی؟ ئەویش عەرزی کرد: وا دەزانم کاتی مردنمە. (عُمَر)یش فەرمووی:

کوڕم، ئەگەر تۆ لە ترازووی کردەوەکانی مندا بیت، پێم خۆشترە، کە من لە ترازووی کردەوەکانی تۆدا بم. ئەویش عەرزی کرد: باوە گیان، ئەوەی تۆ پێت خۆشە ببێت، من لەوە پێم خۆشترە کە خۆم پێم خۆشە ببێت.

لە زانای پایەبەرز (جُوَيْرِيَة)ی کوڕی (أسْمَاء)یشەوە هاتوە، ئەویش لە مامەیەوە، کە سێ برا لە جەنگی ئازاد کردنی شاری (تُسْتَر)دا بەشداریان کردو، هەر سێکەشیان شەهید بوون. جا دایکیان ڕۆژێك بۆ هەندێك پێداویستیو ئیشی خۆی چوو بۆ بازاڕو، لەوێ پیاوێکی پێ گەیشت، کە بەشداری جەنگەکەی کردبوو، جا پیاوەکەی ناسیەوەو، پرسیاری وەزعی کوڕەکانی لێ کرد؟ ئەویش وتی: شەهید بوون. دایکیشیان وتی: لە پێشەوەو ڕووبەڕوو، یان لە دواوەو لە ڕاکردندا؟ پیاوەکەش وتی: لە پێشەوەو ڕووبەڕوو. دایکیشیان وتی: سوپاس بۆ خوا، کە بە سەرفرازی گەیشتن‌و، خزم‌و کەس‌وکارەکانی خۆیشیان پاراست. دەی بە خۆم‌و باوکم‌و دایکیشمەوە بەقوربانیان بم.

کوڕێکی ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (خوای لێ ڕازی بێت) مرد، جا ئەویش ئەم دێڕە هۆنراوەیەی فەرموو:

وَمَا الدَّهْرُ إِلاّ هكَذَا فَاصْطَبِرْ لَهُ    رَزِيَّةُ مَالٍ أوْ فِرَاقُ حَبِيْبِ

واتە: زەمانە هەر وایە، بۆیە ئارامت هەبێت‌و بەرگەی بگرە، چونکە یان لێقەومان‌و لەدەستدانی ماڵە، یان جیابوونەوەی خۆشەویستە.[1]

زانای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن)ی (مَدَائِنِيّ)ش فەرموویەتی: (حَسَن)ی باوکی (عُبَيْدُ الله)ی کوڕی (حَسَن) وەفاتی کردبوو، (عُبَيْدُ الله)یش لەو کاتەدا قاضی‌و فەرمانڕەوای شاری بەصرە بوو. ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر پرسەو سەرەخۆشیان لێ

---

(١) منیش دەڵێم:

باش خۆت ڕاگرە، زەمانە وایە    تیاچوونی ماڵ‌و دۆستانی تیایە

کردو، باسی ئـەوەیان کـرد، کـە بەچیدا دەردەکـەوێت کەسـێك خەفـەتبارە یـان ئارامگرە؟ جا کۆدەنگبوون لـەسەر ئەوە، کە ئەگەر وازی لـە شتێك هێنا، کە پێشـتر دەیکرد، ئەوە مانای وایە خەفەتبارە.

منیش دەڵێم: فەرمایشتی زانایان لـەمبارەوە زۆرن، جـا منـیش بۆیـە ئـەم چـەند دانەیانم هێنا، تاوەکو ئـەم کتێبـە خـاڵی نـەبێت لـە ئامـاژەکردن بـە بەشـێك لـەو فەرمایشتانە. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

## باسێك سەبارەت بەو تاعونانەی لە سەردەمی ئیسلامدا هاتون:

مەبەست لـە باسکردنی ئەو تاعونانە لێرەدا ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان دەبێـت خۆڕاگربێت‌و، چاو لـە کەسانی تر بکـات‌و، بشـزانێت کـە نەهامـەتی‌و لێقـەومانی هەموو کەسێك نیسبەت بە نەهامەتی‌و لێقەومانی کەسانی تر زۆر کەمە.

زانای پایەبەرز شێخ (أَبُو الْحَسَن)ی (مَــدَائِنِيّ) فەرموویـەتی: تاعونـە مەشـهورە گەورەکانی سەردەمی ئیسلام پێنج دانەن:

١) تاعونی (شِيْرَوَيْه یان شِيْرُوْيَه) لە ناوچەی (مَدَائِن) لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خوادا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا ڕوویدا.

٢) تاعونی (عَمَوَاس یـان عَمْــوَاس) لــە سـەردەمی ئیمـامی (عُمَــر)ی کـوڕی (خَطَّاب)دا (خوای لێ ڕازی بێت)، کە لـە وڵاتی (شَام)دا ڕوویداو، بیست‌و پێنج هەزار (٢٥٠٠٠) کەس تێیدا مردن.

٣) تاعونێك لە سەردەمی (عَبْدُالله)ی کـوڕی (زُبَيْر)دا، لــە مـانگی (شَــوَّال)ی ساڵی شەست‌ونۆ (٦٩)ی کۆچـیدا ڕوویـدا، لــە سـێ ڕۆژدا، هـەر ڕۆژەی حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) کەس مـردن‌و، هەشـتاو سـێ (٨٣) -وترـاویشـە: حەفتاو سێ (٧٣)- کوڕی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ی کـوڕی (مَالِــك)

تێیــدا مــردن‌و، چــل (٤٠) کــوڕی زانــای پایەبــەرزی شــوێنکەوتوان (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (أَبِي بَكْرَة)ش تێیدا مردن.

٤) تاعونی (فَتَيَات) لە مانگی (شَوَّال)ی ساڵی حەفتاو هەشت (٧٨)ی کۆچیدا ڕوویدا.

٥) تاعونێکیش لە مانگی (رَجَب)ی ساڵی سـەدو سـی‌ویەك (١٣١)ی کۆچـی {لـە شاری (بَصْرَة)دا} ڕوویداو، لـە مـانگی ڕەمەزانـدا تـەواو تونـد بـوو، هەموو ڕۆژێك لە ڕێگـەی گۆڕسـتاندا هـەزار (١٠٠٠) تـەرم دەژمێـردرا، دواتریش لە مانگی (شَوَّال)دا کەمێك سووك بوو.

هەروەها لە شاری (كُوْفَة)ش لـە ساڵی پەنجا (٥٠)ی کۆچیدا تاعونێك ڕوویداو، تێیدا هاوەڵی خۆشەویست (مُغِيْرَة)ی کوڕی (شُعْبَة) وەفاتی کرد.

ئەمە کۆتایی فەرمایشتەکەی شێخی (مَدَائِنِيّ)ـە.

زانای پایەبەرز (ابْنُ قُتَيْبَة)ی (دِيْنَوَرِيّ)ش لـە کتێبی (الْمَعَـارِف)دا، لـە ڕێگـەی زانای پایەبەرز (أَصْمَعِيّ)ـەوە هەر بەم جۆرە باسی ژمارەی تاعونەکانی کردوە، بەڵام زیادو کەمی تێدایە. ئەو فەرموویەتی: بۆیە تـاعوونی (فَتَيَات) بـەو جـۆرە نـاونراوە، چونکە سەرەتا بە کچی گەنج دەستی پێکرد، لە شـاری (بَصْرَة)و (وَاسِط)و (شَام)و (كُوْفَة)دا.

هەروەها پێیشی دەوترێـت: تـاعونی (أَشْـرَاف)، چـونکە کەسـانێکی گـەورەو پایەبەرز تێیدا مردن.

پاشان فەرموویەتی: هەرگیز لە شاری (مَدِيْنَة)و (مَكَّة)ی پیرۆزدا تاعون ڕووی نەداوە.[1]

جا ئەمە باسێکی فراوانەو، لەوەشدا کە باسم کردوە هۆشداری تێدایە بۆ ئەوەی، کە باسم نەکردوە.

ئەم بابەتەشم لە سەرەتای کتێبی (شَرْحُ صَحِيْحِ مُسْلِم)دا بە درێژتر باسکردوە. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## درووستە خزم و کەس وکاری مردوو ئاگادار بکرێنەوە بە مردنی کەسەکەیان و، نا پەسەندیشە بانگەواز بکرێت بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر مردم، کەسم لێ ئاگادار مەکەنەوە. چونکە دەترسم ئەو ئاگادار کردنەوە بە (نَعْي) دابنرێت. بیستوشمە لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، کە نەهی کردوە لە (نَعْي).

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

---

(١) بڕوانە: الْمَعَارِف / ٦٠١ – ٦٠٢ / أَبُو مُحَمَّد عَبْدُاللهِ بْنُ مُسْلِمِ بْنِ قُتَيْبَةَ الدِّيْنَوَرِيّ / تَحْقِيْق: ثَرْوَت عُكَّاشَة / الْهَيْئَةُ الْمِصْرِيَّةُ الْعَامَّةُ لِلْكِتَاب – الْقَاهِرَة / الطَّبْعَةُ الثَّانِيَة / ١٩٩٢ م.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣١٣ / بە ژمارە: ٩٨٦، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٧٤ / ١٤٧٦.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِيَّاكُمْ وَالنَّعْيَ، فَإِنَّ النَّعْيَ مِنْ عَمَلِ الْجَاهِلِيَّةِ». واتە: "دەخیل خۆتان لە (نَعْي) بپارێزن، چونکە یەکێکە لە کارو کردەوەکانی سەردەمی نەفامی".

لە ڕیوایەتێکیشدا وا هاتوە، کە ئەمە فەرمایشتی (عَبْدُالله) خۆی بێت، نەك هی پێغەمبەری خوا.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمەیان لەوی تریان صەحیح ترەو، هەردوو ڕیوایەتەکەشی بە لاواز داناوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەواڵی مردنی نەجاشی بە هاوەڵەکانی خۆی ڕاگەیاند.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، سەبارەت بە مردوویەك، کە شەو ناشتبوویانو، ئەو نەیزانیبوو، فەرمووی: «أَفَلا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي بِهِ».[3] واتە: "ئەی بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە بە مردنی ئەو کەسە؟!"

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣١٢ / بە هەردوو ژمارە: ٩٨٤ و ٩٨٥.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٢٠ / بە ژمارە: ١١٨٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٥٦ / بە ژمارە: ٩٥١.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٧٥ / بە ژمارە: ٤٤٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٥٩ / بە ژمارە: ٩٥٦.

زانا (مُحَقِّق)ـەکانو زۆرێکیش لە هاوەڵانمانو لە غەیری ئەوانیش فەرموویانە: لەبەر ئەم دوو حەدیسە، سونەتە خزمو کەسوکارو دۆستەکانی مردوەکە ئاگادار بکرێنەوە. فەرمووشیانە: ئەوەی کە نەهی لێ کراوە، ئەوەیە، کە وەکو سەردەمی نەفامی بکرێت، کە ئەوان عادەتیان وەها بوو، ئەگەر کەسێکی گەورەو ناوداریان لێ بمردایە، کەسێکیان بە سواری دەنارد بۆلای خێڵەکانی ترو، دەیوت (ئای فلانە کەس تیاچوو)، (ئای عەرەب تیاچوو بە مردنی فلانە کەس)و، هاوارو گریانیشی لەگەڵدا بوو.

ئیمامی (مَاوَرْدِيّ) خاوەنی کتێبی (الْحَاوِي) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان- باسی ئەوەی کردوە، کە هاوەڵانمان دوو بۆچوونیان هەیە، سەبارەت بە سونەتبوونی ڕاگەیاندنو ئاگاداریو بانگەواز کردن بۆ مردنی کەسێك:

هەندێکیان ئەو ئاگارداریو بانگەواز کردنەیان بە سونەت داناوە بۆ مردووی بێگانەو، بۆ مردووی خزمو کەسوکاریش. چونکە بەهۆی ئاگاداریو بانگەوازەکەوە خەڵکانێکی زۆر ئامادە دەبن بۆ نوێژ کردن لەسەر مردوەکەو، بۆ دوعا بۆکردنی.

هەندێکیشیان فەرموویانە: ئاگاداریو بانگەواز کردن بۆ مردووی بێگانە سونەتە، بەڵام بۆ مردووی تر سونەت نیە.

منیش دەڵێم: بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە کە ئاگارداریو بانگەواز کردن بە ڕەهایی سونەتە (چی بۆ مردووی بێگانەو، چی بۆ مردووی خزمو خوێش)، بە مەرجێك تەنها ئاگادار کردنەوە بێت.

## ئەوەی لەکاتی شۆردن و کفن کردنی مردوودا دەوترێت

سونەتە لەکاتی شۆردنو کفن کردنی مردوودا زیکری خوا زۆر بکرێتو، دوعاش بۆ مردوەکە زۆر بکرێت.

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر کەسی مردووشۆر شتێکی سەرسووڕهێنەری لە مردوەکە بینی، وەکو شەوقدانەوەی دەمو چاوی‌و، بۆنی خۆشی لاشەی‌و،... هەر شتێکی تری هاوشێوە، ئەوا سونەتە بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە.

بەڵام ئەگەر شتێکی بینی، کە پێی ناخۆش بوو، وەکو ڕەشبوونەوەی دەمو چاوی‌و، ناخۆشی بۆنی لاشەی‌و، گۆڕانی ئەندامێکی‌و، گۆڕانی شێوەی‌و،... هەر شتێکی تری هاوشێوە، ئەوا حەرامە بۆ هیچ کەسێکی بگێڕێتەوە.

بەڵگەشیان بەو حەدیسە هێناوەتەوە، کە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (تِرْمِـذِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اذْكُـرُوا مَحَاسِـنَ مَوْتَاكُمْ، وَكُفُّوا عَنْ مَسَاوِيْهِمْ». واتە: "باسی چاکەکانی مردوەکانتان بکەن‌و، واز لە خراپەکانیان بهێنن".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) بە لاوازی داناوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبی (السُّنَنُ الْكُبْـرَى)ی ئیمامی (بَيْهَقِـيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو رَافِع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێی وتراوە (مَوْلَى رَسُوْلِ اللهِ)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَنْ غَسَّلَ مَيِّتاً، فَكَتَمَ عَلَيْهِ، غَفَرَ اللهُ لَهُ أَرْبَعِيْنَ مَرَّةً». واتە: "ئەو کەسەی مردوویەك بشۆرێت‌و، عەیب‌و نوقسانی بپۆشێت، خوای گەورە چل جار لێی خۆش دەبێت".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٢ / ٤٩٠٠، وسُنَنُ التِّرْمِـذِيّ / ٣ / ٣٣٩ / بە ژمارە: ١٠١٩. حەدیسێکی لاوازە، بەڵام پاڵپشتی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٧٢.

ئیمامی (حَاكِم)یش لە كتێبی (الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن)دا ڕیوایەتی كردوەو، فەرمووشێتی: حەدیسێكی (صَحِيْح)ـە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم.[1]

پاشان، زۆرێك لە هاوەڵانمان مەسەلەكەیان هەر بەم جۆرە بە ڕەهایی باس كردوە. بەڵام زانای پایەبەرز (أَبو الْخَيْر)ی (يَمَنِيّ) خاوەنی كتێبی (الْبَيَان) -كە یەكێكە لە هاوەڵانمان- فەرموویەتی: ئەگەر مردوەكە ئەهلی بیدعە بوو، بە ئاشكراش بیدعەی دەكردو، مردووشۆرەكەش شتێكی لێ بینی، كە پێی ناخۆش بوو، ئەوا قیاس وا دەخوازێت، كە لەناو خەڵكیدا باسی بكات، تاوەكو ئەو باسكردنە ببێتە ڕێگرێك لە كردنی بیدعەكەی.[2]

## زیكرەكانی نوێژی مردوو

بزانە كە كردنی نوێژ لەسەر مردوو فەرزی كیفایەیە. بە هەمان شێوە شۆردنیو، كفن كردنیو، بەخاك سپاردنیشی هەر فەرزی كیفایەن. هەموو ئەمانەش كۆدەنگی زانایانیان لەسەرە.

جا ئایا دەبێت چەند كەس نوێژەكە بكات، تا فەرزی كردنی نوێژەكە لەسەر تەواوی موسوڵمانان دابكەوێت؟ ئەوە چوار بۆچوونی لەسەرە:

١) درووستترینیان بەلای زۆربەی هاوەڵانمانەوە ئەوەیە، كە بە كردنی نوێژەكە لەلایەن تەنها كەسێكەوە فەرزی نوێژەكە لەسەر موسوڵمانان دادەكەوێت.

٢) بۆچوونی دوەمیش ئەوەیە، كە بەمەرج گیراوە نوێژخوێنەكان دوو كەس بن.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٣ / ٣٩٥ / ٦٤٤٧، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٥٠٥ / ١٣٠٧.

(٢) بڕوانە: الْبَيَان فِيْ مَذْهَبِ الْإِمَامِ الشَّافِعِيِّ / ٣ / ٣٨.

٣) بۆچوونی سێیەمیش سێ کەس.
٤) بۆچوونی چوارەمیش چوار کەس. ئیتر ئایا بە کۆمەڵ نوێـژی لەسـەر بکـەن، یان بە تاکە تاکە.

سەبارەت بە چۆنێتی کردنی نوێژەکەش، ئەوە دەبێت نوێژخوێنەکـە چـوار جـار (اللهُ أَكْبَر) بکات. خۆ ئەگەر یەکێکیانی نەکرد، ئەوا نوێژەکەی درووست نیە. بەڵام ئەگەر یەکێکی تری زیاد کردو، کردنی بە پێنج، ئـەوە ئایـا نوێژەکـەی پـێ بـەتاڵ دەبێتەوە یان نا، دوو بۆچـوونی هاوەڵانمـانی لەسـەرە: درووسـتترینیان ئەوەیـە، کـە نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە.

جا ئەگەر کەسێك لەدوای پێشنوێژێکەوە نوێـژی دەکـردو، ئـەویش پێـنج (اللهُ أَكْبَر)ی کرد، ئەوا ئەگەر بڵێین (اللهُ أَكْبَر) پێنجەم نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، پێویسـتە کەسە شوێنکەوتوەکە نیەتی جیابوونەوە بهێنێت، هەروەکو چۆن ئەگەر پێشـنوێژەکە هەستێتەوە بۆ ڕکاتی پێنجەم، ئەو دەبێت نیەتی جیابوونـەوە بهێنێـت. بـەڵام ئەگـەر بەپێی بۆچوونە درووستترینەکەیان بێت، کە نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئـەوا -بـەپێی بۆچوونی درووستی مەشهور- نابێت شوێنکەوتوەکە نیـەتی جیابوونـەوە بهێنێـتو، نابێـت شـوێنی پێشـنوێژەکەش بکـەوێت. بـەڵام بۆچـوونێکی لاوازی هەنـدێك لـە هاوەڵانمان هەیە، کە دەڵێت: لەم حاڵەتەشدا دەبێت کەسـەکە شـوێنی پێشـنوێژەکە بکەوێت.

ئەوجا ئەگەر ئێمە بە مەزهەبـە درووسـتەکە وەربگـرین، کـە پێـی وایـە نابێـت کەسەکە شوێنی پێشنوێژەکە بکەوێت، ئەوا ئایا چـاوەڕوانی پێشـنوێژەکە بکـات تـا سڵاو دەداتەوە، یان دەستبەجێ سڵاو بداتەوە؟ دوو بۆچوونی لەسەر: درووستترینیان ئەوەیە، کە با چاوەڕوانی بکات.

منیش هەموو ئەم بۆچوونانەم بە بەڵگەکانیانەوە لە کتێبی (شَـرْحُ الْمُهَـذَّب)دا بەڕوونی باس کردوە.

هەروەها سونەتە لەگەڵ هەموو (اللهُ أَكْبَر)ێكدا دەست بەرز بكاتەوە.

سەبارەت بە سیفەتی (اللهُ أَكْبَر)ەكەو، ئەوەی تێیدا سونەتەو، ئەوەی پێی بەتاڵ دەبێتەوەو، سەرجەم لقە باسەكانی تریش، ئەوە هەر بەو جۆرەیە، كە لە باسی شێوازی نوێژو زیكرەكانیدا باسمان كرد.

ئەو زیكرانەش كە لە نوێژی مردوودا لە نێوان (اللهُ أَكْبَر)ەكاندا دەكرێن بریتین لەمانە:

١) لەدوای (اللهُ أَكْبَر)ی یەكەمەوە سوورەتی (الْفَاتِحَة) دەخوێنرێت.
٢) لەدوای (اللهُ أَكْبَر)ی دوەمیشەوە صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەدرێت.
٣) لەدوای (اللهُ أَكْبَر)ی سێیەمیشەوە دوعا بۆ مردوەكە دەكرێت. جا واجبەكە ئەوەیە كە شتێك بڵێت پێی بوترێت دوعا.
٤) سەبارەت بە (اللهُ أَكْبَر) چوارەمیش، هیچ زیكرێك لەدوایەوە واجب نیە. بەڵام ئەو زیكرە سونەتە، كە -ئەگەر خوای گەورە بیەوێت- دواتر باسی دەكەم.

هاوەڵانمان بۆچوونی جیاوازیان هەیە، سەبارەت بەوەی، كە ئایا وتنی (أَعُوْذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ)و، كردنی دوعای سەرەتای دەست پێكردنی نوێژ لەدوای (اللهُ أَكْبَر)ی یەكەمەوەو، لە پێش سوورەتی (الْفَاتِحَة)وە سونەتن، یان نا؟ هەروەها بۆچوونی جیاوازیشیان هەیە سەبارەت بە خوێندنی سورەتێك لەدوای سوورەتی (الْفَاتِحَة)وە. بۆچوونەكانیشیان ئەم سیانەن:

- یەكێكیان ئەوەیە كە هەموو ئەوانە سونەتن.
- دوەمیشیان ئەوەیە كە هیچكامیان سونەت نین.

- سێیەمیشیان –کە درووستترینیانە– ئەوەیە، کە (أَعُوْذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيْمِ) سونەتەو، دوعاکەو سورەتەکە سونەت نین.

بەڵام هاوەڵانمان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە سونەتە لەدوای سوورەتی (الْفَاتِحَة)وە (آمِيْن) بکرێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە نوێژی لەسەر مردوویەك کردو، سورەتی (الْفَاتِحَة)ی خوێندو، پاشان فەرمووی: تاوەکو بزانن، کە خوێندنی ئەو سوورەتە سونەتە.[1] واتە: (داهێنراو نیە، نەك سونەتە، واتە: واجب نیە).

جا ئەو فەرمایشتەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)، کە فەرموویەتی: (سونەتە). هەر هەمان ئەو مانایە دەگەیەنێت، کە یەکێك لە هاوەڵان بفەرموێت: (مِنَ السُّنَّةِ كَذَا وَكَذَا). (واتە: هەر حیسابی ئەوەی بۆ دەکرێت، کە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا بێت).

هەروەها لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)یشدا هاتوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: "خوێندنی سورەتی (الْفَاتِحَة) سونەتە".[2] بەمەش وا دادەنرێت، کە حەدیسی پێغەمبەری خوایە (دروودی خوای لەسەر بێت)، وەکو لە کتێبەکانی فەرموودەو کتێبە ئوصولیەکاندا باس کراوە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە سورەتی (الْفَاتِحَة) بە دەنگی نزم بخوێنرێت، نەك بە دەنگی بەرز، ئیتر چی نوێژەکە لە شەودا بکرێت، یان لە ڕۆژدا. ئەمەش ئەو مەزهەبە درووستە مەشهورەیە، کە بۆچوونی زۆرێك لە هاوەڵانمانی لەسەرە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٤٨ / بە ژمارە: ١٢٧٠.
(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٢٨ / ٣١٩٨.

هەنـدێکیش لـە هاوەڵانمان فەرموویانـە: ئەگـەر نوێژەکـە لـە ڕۆژدا بـوو، بـا سورەتەکە بە دەنگی نزم بخوێنرێت‌و، ئەگەر لە شەویشدا بوو، ئەوا بە دەنگی بـەرز بیخوێنرێت.

سەبارەت بە (اللهُ أكْبَر)ی دوەمیش، ئەوە کەمترین واجب لەدوایەوە، ئەوەیە کە بڵێت: (اللّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ). سونەتیشە بڵێـت: (وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ). جـا بـەلای زۆرینەی هاوەڵانمانەوە ئەم بەشەیان واجب نیە. بەڵام هەندێکیان فەرموویانە: واجبە. کە ئەمەش بۆچوونێکی نامۆو لاوازە.

هەروەها ئەگەر کاتەکە بەشی کرد، سونەتە لەدوای ئـەم (اللهُ أكْبَـــر)ەوە دوعـا بکات بۆ باوەڕدارانی نێرینەو مێینە. ئەمەش فەرمایشتی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەســەرەو، هاوەڵانیشمان یەك دەنگن لەسەری.

هەروەها ئیمامی (مُزَنِيّ) نقڵی کردوە لە ئیمـامی (شَـــافِعِيّ)ـــەوە، کـە سـونەتە لەدوای ئەم (اللهُ أكْبَر)ەوە ســوپاس‌و ستایشــی خــوای گـەورە بکرێـت. هــەروەها زۆرێکیش لـە هاوەڵانمان هەر فەرموویانە سونەتە. بەڵام زۆربەی زۆریان بە سونەتیان دانەناوە.

جا ئەگەر ئێمەش بڵێین سونەتە، ئەوا بـا ســەرەتا بــە ســوپاس‌و ستایشــی خــوای گەورە دەست پێ بکات‌و، پاشان بە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبــەری خــواو، پاشـان دوعا بکات بۆ باوەڕدارانی نێرینەو مێینە. خۆ ئەگـەر نوێژخوێنەکـە ئـەم تەرتیبـەی ڕەچاو نەکرد، ئەوە هەر دروستە. بەڵام وازی لە شێوازە باشترینەکەیان هێناوە.

ئەوجا چەندین حەدیس سەبارەت بە صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتوون، کە هــەموویانمان لــە (سُـــنَن)ی (بَيْهَقِـــيّ)دا بـۆ ڕیوایـەت

کراوه.[1] بەڵام من ویستم ئەم باسە بە کورتی بهێنم. چونکە جێگەی بە درێژی باسکردنی بریتیە لە کتێبە فیقهیەکانو، لە کتێبی (شَرْحُ الْمُهَذَّب)یشدا بەڕوونی باسم کردوه.

سەبارەت بە (اللهُ أكْبَر)ی سێیەمیش، واجبە لەدوایەوە دوعا بۆ مردوەکە بکرێت. وەکو ئەوەی بوترێت: (رَحِمَهُ اللهُ)، یان (غَفَرَ اللهُ لَهُ)، یان (اللّهُمَّ، اغْفِرْ لَهُ)، یان (اللّهُمَّ، ارْحَمْهُ)، یان (اللّهُمَّ، الْطُفْ بِهِ)، یان هەر تەعبیرێکی تری وەکو ئەمانە.

جا چی دوعایەك سونەتە؟ ئەوە چەندین حەدیسو فەرمایشتی لەبارەوە هاتوە.

سەبارەت بە حەدیسەکان: درووستترینیان ئەوەیە، کە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَوْف)ی کوڕی (مَالِك)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) نوێژی لەسەر تەرمێك دەکرد، منیش لەو دوعایەی کە کردی، ئەمەم لەبەر کردوە، کە فەرمووی: «اللّهُمَّ، اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَأكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأبْيَضَ مِنَ الدَّنَس، وَأبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأهْلاً خَيْراً مِنْ أهْلِهِ، وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ، وَأدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، أوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ». واتە: "خوایە لێی خۆشبەو، ڕەحمی پێ بکەو، لە سزاو ناڕەحەتی سەلامەتی بکەو، لێی ببورەو، میوانداری باشی لێ بکەو، گۆڕەکەی فراوانو گوشاد بکەو، بە ئاوی خاوێنو بەفرو تەرزە بیشۆرەو، لە هەڵەو تاوان پاکی بکەرەوە، وەکو چۆن پۆشاکی سپیت لە چڵكو پیسی پاککردۆتەوەو،ماڵو خێزانو هاوسەرێکی بدەرێ لە ماڵو خێزانو هاوسەرەکەی خۆی باشتر بن، بیشیخەرە بەهەشتەوەو، لە سزای گۆڕ، یان لە سزای ئاگری دۆزەخ پەنای بدەو بیپارێزە".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيِّ الْكُبْرَى / ٤ / ٣٩ – ٤٠ / بە ژمارەکانی: ٦٧٥٣ و ٦٧٥٤. بۆ تەخریجی حەدیسەکانیش بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٣٧٨ – ٣٨٧.

جا (عَوْف) دەفەرموێت: خۆزگەم دەخواست، کە من ئەو مردوە بوومایە.[1]

لە ڕیوایەتێکی تری صەحیحی موسلیمدا هاتوە: «وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَ النَّارِ».[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (بَيْهَقِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە نوێژی لەسەر تەرمێك کردو، فەرمووی: «اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيْرِنَا وَكَبِيْرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا. اللّهُمَّ، مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا، فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا، فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِيْمَانِ. اللّهُمَّ، لا تَحْرِمْنا أجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ».[3] واتە: "خوایە لە زیندوەکانمان‌و لە مردوەکانمان‌و لە بچووکەکانمان‌و لە گەورەکانمان‌و لە نێرینەکانمان‌و لە مێینەکانمان‌و لە ئامادەبوانمان‌و لە غائیبەکانیشمان خۆشبە. خوایە، هەر کەسێك لە ئێمەت زیندوو کردەوە، لەسەر ئیسلامەتی زیندووی بکەرەوەو، هەر کەسێکیش لە ئێمەت مراند، لەسەر ئیمان بیمرێنە. خوایە لە پاداشتی خەیری لەدەستدانی ئەم مردوە بێبەشمان مەکەو، لەدوای ئەویش تووشی ئاشووب‌و نەهامەتیمان مەکە".

ئیمامی (حَاکِم) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (صَحِيْح)ە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری‌و موسلیم.[4]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٦٢ / بە ژمارە: ٩٦٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٦٣ / بە ژمارە: ٩٦٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٢٩ / ٣٢٠١، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٤٣ / بە ژمارە: ١٠٢٤، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤١ / بە ژمارە: ٦٧٦٢.

(٤) بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٥١١ / بە ژمارە: ١٣٢٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: بەو جۆرە نیە کە ئیمامی (حَاکِم) فەرموویەتی. چونکە ئیمامی بوخاری خۆی فەرموویەتی: (صَحِيْح) نیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٩٣ - ٣٩٥.

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (سُنَن)ی (بَیْهَقِيّ)و لە غەیری ئەویشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ قَتَادَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت).(١)

هەروەها لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)شدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە ڕێگەی (أَبُو إِبْرَاهِيْم)ی (أَشْهَلِيّ)ـەوە، ئەویش لە باوکیەوە -کە باوکی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوە- (خوای لێ ڕازی بێت).(٢)

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: (مُحَمَّد)ی کوڕی (إِسْمَاعِيْل) -مەبەستی ئیمامی بوخاریە- فەرموویەتی: درووستترینی ڕیوایەتەکان لە حەدیسی «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا.....». بریتیە لە ڕیوایەتەکەی (أَبُو إِبْرَاهِيْم)ی (أَشْهَلِيّ) لە باوکیەوە.

ئیمامی بوخاری فەرموویەتی: درووستترین حەدیسیش لەبارەی دوعای دوای (اللهُ أَكْبَر)ی سێیەمەوە بریتیە لە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (عَوْف)ی کوڕی (مَالِك).

ئەوجا لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی (أَبُوْ دَاوُد)دا دوعاکە بەم جۆرە هاتوە: «فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِيْمَانِ، وَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِسْلامِ». بەڵام وەکو باسمان کرد، لە زۆربەی سەرچاوەکانی حەدیسدا بەم جۆرە هاتوە: «فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِسْلامِ، وَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِيْمَانِ».

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ، فَأَخْلِصُوا

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤١ / ٦٧٦٥.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٤٣ / بە ژمارە: ١٠٢٤.

لَهُ الدُّعَاءَ».[1] واته: "ئەگەر نوێژتان لەسەر مردوو کرد، بە دڵسۆزیو بە کوڵەوە دوعای بۆ بکەن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە نوێژی سەر مردوودا دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، أَنْتَ رَبُّهَا، وَأَنْتَ خَلَقْتَهَا، وَأَنْتَ هَدَيْتَهَا لِلْإِسْلام، وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوْحَها، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّهَا وَعَلانِيَتِهَا، جِئْنَا شُفَعَاءَ، فَاغْفِرْ لَهُ».[2] واته: "خوایە تۆ پەروەردگاری ئەم مردووەیو، تۆش بەدیتهێناوەو، تۆش هیدایەتت داوە بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلامو، تۆش گیانت کێشاوەو، تۆش زاناتریت بە نهێنیو ئاشکرای ئەم مردوە، ئێمەش هاتووین وەکو تکاکار تا لێی خۆشبیت، دەی تۆش لێی خۆشبە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (وَاثِلَة)ی کوڕی (أَسْقَع)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، نوێژی پێ کردین لەسەر پیاوێکی موسوڵمان، منیش گوێم لێی بوو، کە دەیفەرموو: «اللّٰهُمَّ، إِنَّ فُلانَ ابْنَ فُلانَةٍ فِيْ ذِمَّتِكَ، وَحَبْلِ جِوَارِكَ، فَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ، وَعَذَابَ النَّارِ، وَأَنْتَ أَهْلُ الْوَفَاءِ وَالْحَمْدِ. اللّٰهُمَّ، فَاغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُوْرُ الرَّحِيْمُ».[3] واته: "خوایە، بەڕاستی

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٢٨ / ٣١٩٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٨٠ / ١٤٩٧. شێخی (ابْنُ حِبَّان) بە (صَحِيْح)ی داناوە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٧ / ٣٤٥ – ٣٤٦ / بە هەردوو ژمارە: ٣٠٧٦ و ٣٠٧٧. هەروەها بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْر / ٥ / ٢٦٩ – ٢٧٠، والتَّلْخِيْصُ الْحَبِيْر / ٢ / ٢٤٧ – ٢٤٨.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٢٨ / ٣٢٠٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٤٠١.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٢٩ / ٣٢٠٢، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٨٠ / ١٤٩٩. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٤٠٢.

فلانی کوڕی فیسار لە پەنای پارێزگاریو چاودێری لوتفی تۆدایە، دەی تۆش لە ئاشووبی ناو گۆڕو لە سزای ئاگری دۆزەخ بیپارێزە، چون تۆ خاوەنی وەفایتو، شایانی ستایشیت. خوایە لێی خۆشبەو، ڕەحمی پێ بکە، بەڕاستی تۆ لێبوردەو میهرەبانیت".

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش دوعایەکی هەڵبژاردوە، کە لە کۆی ئەم حەدیسانەو، چەند حەدیسێکی ترەوە وەریگرتوەو، فەرموویەتی: (اللّهُمَّ، هَذَا عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، خَرَجَ مِنْ رَوْحِ الدُّنْيَا وَسَعَتِها، ومَحْبُوْبُهُ وَأحِبَّاؤُهُ فِيْهَا، إلَى ظُلْمَةِ الْقَبْرِ وَمَا هُوَ لاقِيْهِ، كَانَ يَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ أنْتَ، وَأنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأنْتَ أعْلَمُ بِهِ. اللّهُمَّ، إنَّهُ نَزَلَ بكَ، وَأنْتَ خَيْرُ مَنْزُولٍ بِهِ، وَأصْبَحَ فَقِيْراً إلَى رَحْمَتِكَ، وَأنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِهِ، وَقَدْ جِئْنَاكَ رَاغِبِيْنَ إلَيْكَ، شُفَعَاءَ لَهُ. اللّهُمَّ، إنْ كَانَ مُحْسناً، فَزِدْ فِيْ إحْسَانِهِ، وَإنْ كَانَ مُسِيْئاً، فَتَجَاوَزْ عَنْهُ، وَلَقِّهِ بِرَحْمَتِكَ رِضَاكَ، وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَهُ، وَافْسحْ لَهُ فِيْ قَبْرِهِ، وَجَافِ الْأرْضَ عَنْ جَنْبَيْهِ، وَلَقِّهِ بِرَحْمَتِكَ الْأمْنَ مِنْ عَذَابِكَ، حَتَّى تَبْعَثَهُ إلَى جَنَّتِكَ، يَا أرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ). واتە: (خوایە ئەمە بەندەی تۆیەو، کوڕی بەندەی تۆشە، گوشادیو خۆشی دنیای بەجێهێشتوەو، خۆشەویستەکانیشی تێدایەو، بەڕێکەوتوە بەرەو تاریکایی گۆڕو ئەوەی دێتە ڕێگەی، لە دنیادا شایەتی داوە کە بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو، "مُحَمَّد"یش بەندەو پێغەمبەری تۆیەو، تۆش لە هەموو کەس زاناتریت بە حاڵی ئەم بەندەیەت. خوایە ئەمە هاتۆتە خزمەتت، تۆش باشترین میوان پەزێریت، ئێستە زۆر پێویستی بە ڕەحمو بەزەیی تۆ هەیەو، تۆش پێویستیت بە سزادانی ئەو نیە، ئێمەش هاتوینەتە خزمەتت، دوعای بۆ دەکەینو، تکای بۆ دەکەین. خوایە ئەگەر کەسێکی چاکەکار بوە، تۆش چاکەکانی بۆ زیاد بکەو، ئەگەر خراپەکاریش بوە، چاوپۆشی لێ بکەو لێی ببورەو، بە ڕەحمی خۆت ڕووی ڕەزامەندی خۆتی تێ بکەو، لە ئاشووبو سزای گۆڕیش بیپارێزەو، گۆڕەکەشی بۆ گوشادو فراوان بکەو، زەوی لە لاتەنیشتەکانی دورخەرەوەو، بە

ڕەحمی خۆشت لە سزای خۆت بپارێزە، هەتا زیندووی دەکەیتەوەو، بەرەو بەهەشت بەڕێی دەکەیت، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان).

ئەمە دەقی دوعاکەی ئیمامی (شَافِعِيّ)ـە لە (مُخْتَصَرُ الْمُزَنِيّ)دا (ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت).

هاوەڵانمان فەرموویانە: ئەگەر مردوەکە منداڵ بوو، با دوعا بۆ باوكو دایكی بکاتو، بڵێت: (اللّهُمَّ، اجْعَلْهُ لَهُمَا فَرَطاً، وَاجْعَلْهُ لَهُما سَلَفاً، وَاجْعَلْهُ لَهُما ذُخْراً، وَثَقِّلْ بِهِ مَوَازِيْنَهُمَا، وَأَفْرِغِ الصَّبْرَ عَلَى قُلُوْبِهِمَا، وَلا تَفْتِنْهُمَا بَعْدَهُ، وَلا تَحْرِمْهُمَا أَجْرَهُ). واته: (خوایە بیکە بە پێشەنگو تکاکارو توێشوو بۆ باوكو دایكیو، بەمیش تای ترازووی کردەوە چاکەکانیان قورس بکەو، ئارامیو سەبووریش بەسەر دڵیاندا بڕێژەو، لەدوای ئەمیش تووشی ئاشووبو لێقەومانیان مەکەو، لە پاداشتی چاکەی لەدەستدانیشی بێبەشیان مەکە).

ئەمە ئەو دوعایەیە، کە زانای پایەبەرز (أَبو عَبْدِالله)ی (زُبَيْرِيّ) -کە یەکێکە لە هاوەڵانمان- لە کتێبێکی خۆیدا هێناویەتی، بەناوی (الْكَافِي). زانایانی تریش دوعایەکیان هێناوە بە هەمان ماناو، فەرموشیانە: با لەگەڵیدا بڵێت: (اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا...... هتد).

شێخی (زُبَيْرِيّ) فەرموویەتی: ئەگەر مردوەکە ئافرەت بوو، با بڵێت: (اللّهُمَّ، هذِهِ أَمَتُكَ.....هتد)، پاشان دوعاکە وا لێ بکات، کە لە ڕووی زمانەوانیەوە بۆ ئافرەت بەکار بهێنرێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

سەبارەت بە (اللهُ أَكْبَر)ی چوارەمیش، بەیەك دەنگی زانایان هیچ زیکرێك لەدوایەوە واجب نیە. بەڵام سونەتە ئەوە بڵێت، کە ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبەکەی زانای پایەبەرز (بُوَيْطِيّ)دا فەرموویەتی: لەدوای (اللهُ أَكْبَر)ی چوارەمەوە با بڵێت: (اللّهُمَّ، لا تَحْرِمْنا أَجْرَهُ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ).

زانای پایەبەرز (أَبو عَلِيّ ابْــنُ أَبِــي هُرَيْــرَة) -کـە یەکێکـە لـە هاوەڵانمـان- فەرموویەتی: زانایانی (مُتَقَدِّمِيْن) لـە دوای (اللّٰهُ أَكْبَــر)ی چـوارەمەوە دەیانفـەرموو: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). ئـەوجا فەرموویـەتی: ئەم زیکرە لـە ئیمامی (شَافِعِيّ)ـەوە نەگێڕردراوەتـەوە. خـۆ ئەگـەر کردبێتـی، ئـەوە باش‌و جوانە.

منیش دەڵـێم: بەسـە بـۆ باشـی‌و جـوانی ئـەو زیکـرە، ئـەوەی کـە پێشـتر لـە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)دا، لە (**باسی دوعای خـەم‌و خەفـەت**)دا هێنامان. خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

هەروەها دەڵێم: بەڵگە دەهێنرێتـەوە بـۆ کردنـی دوعـا لـەدوای (اللّٰهُ أَكْبَــر)ی چوارەمەوە بەو حەدیسەی، کە لـە کتێبی (السُّنَنُ الْكُبْرَى)ی ئیمامی (بَيْهَقِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لـە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّٰه)ی کوڕی (أَبِيْ أَوْفَى)وە (خـوا لـە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەو لـەسەر تەرمی کچەکەیدا چـوار (اللّٰهُ أَكْبَــر)ی کـردو، پاشـان دوای چـوارەمیان بـە ئەنـدازەی نێـوان دوو دانـەیان ڕاوەسـتاو، داوای لێخۆشبوون‌و نزای بۆ دەکردو، پاشان فەرمووی: پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) وای دەکرد.[1]

لـە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە، کـە چـوار (اللّٰهُ أَكْبَــر)ی کـردوەو، پاشـان ماوەیـەك ڕاوەستاوە، تاوەکو ئێمە گومانی ئەوەمان برد، کە (اللّٰهُ أَكْبَر)ی پێنجەمیش دەکـات. ئەوجا بەلای ڕاست‌و بەلای چـەپدا سـڵاوی دایـەوە. جـا کـە لێبوویـەوە، ئێمـەش عەرزمان کرد: ئەوە چی بوو؟ ئەویش فەرمووی: من لـەوە زیاترتان بـۆ ناکـەم، کـە بینیومە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) کردوویەتی. یان فـەرمووی: پێغەمبـەری خوا بەم جۆرەی کردوە.[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤٢ / ٦٧٧٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٤٣ / ٦٧٧٩.

ئیمامی (حَاكِم) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (صَحِیْح)ــە.[1]

## باسێك: {حوکمی سلاّودانەوەی نوێژی مردوو، حوکمی ئەو کەسانەش لە نوێژەکە دواکەوتوون}

ئەگەر ئەو کەسەی نوێژی مردوەکە دەکات لە (اللهُ أكْبَر)ەکانو، لە زیکرەکانی دوای ئەوان بوویـەوە، ئـەوا هـەروەکو سـەرجەم نوێـژەکانی تـر، دوو جـار سـلاّو دەداتەوە. بە بەڵگەی ئەو حەدیسەی (عَبْدُاللّه)ی کـوڕی (أبِيْ أوْفَــی)، کـە پێشـتر باسمان کرد.

جا حوکمی سلاّودانەوەش هەر بەو جۆرەیە، کە لـەباسی سلاّودانەوەی سەرجەم نوێژەکاندا باسمان کرد. ئەمەش بریتیە لە مەزهەبی درووستی هەڵبـژێردراو. ئێمـەش لـە مەسـەلـەی سلاّودانەوەی نوێـژی مـردوودا ناکۆکیـەکی لاوازمـان هەیـە، بـەلاّم لەبەرئەوەی لـەم کتێبەدا پێویستمان پێی نیە، بۆیە باسی ناکەم.

ئەوجا ئەگەر کەسێکی دواکەوتوو هاتو، لە بەشێکی نوێژەکەدا بە پێشنوێژەکە گەیشت، ئەوا با دەستبەجێ نوێژەکەی دابەستێتو، سـورەتی (الْفَاتِحَة) بخوێنێـتو، پاشان بەتەرتیب زیکرەکانی دواتریش بخوێنێتو، پێویست ناکات ئەو زیکرە بکـات، کە لـەو کاتەدا پێشنوێژەکە دەیکات.

---

(١) بڕوانـە: الْمُسْــتَدْرَكُ عَلَــی الصَّــحِيْحَيْن / ١ / ٥١٢ / ١٣٣٠. بـەلاّم بـەلای شـێخی عەسقەلانیەوە حەدیسێکی لاوازە. چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بـەناوی (إبْــرَاهِیم)ی کوڕی (مُسْلِم)ی (هَجَرِيّ)ــەوە، کە زۆربەی زانایان بەلاوازیان داناوە. بڕوانـە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٤ / ٤٠٧ - ٤٠٩.

جا ئەگەر شوێنکەوتوەکە (اللهُ أكْبَــر)ی کـردو، بەرلــەوەی زیکـری دواکـەی بکات، پێشنوێژەکە (اللهُ أكْبَر)ێکی تری کرد، ئەوا زیکرەکەی لەسەر دادەکـەوێت، هەروەکو چۆن لـە سەرجەم نوێـژەکانی تـردا سـورەتی (الْفَاتِحَــة) لـەسـەر کەسـی دواکەوتوو دادەکەوێت.

هەروەها ئەگەر پێشنوێژەکە سڵاوی دایەوەو، هێشتا شوێنکەوتوە دواکەوتوەکـە هەندێك لـە (اللهُ أكْبَر)ەکـانی مـابوو، ئـەوا پێویسـتە لـەسـەری (اللهُ أكْبَــر)ەکـانو زیکرەکانی دواشیان بەتەرتیب بکات. ئەمەش مەزهەبی درووستی مەشـهورە بـەلای ئێمەوە. هەروەها بۆچوونێکی لاوازیشمان هەیە، کە دەڵێت: با تەنها (اللهُ أكْبَر)ەکان بکاتو، زیکرەکانیان نەکات. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەگەر کەسێك بە پیادەڕەوی لەگەڵ تەرمێکدا ڕۆیشت چی بڵێت؟

سونەتە کەسی پیادەڕەو سەرقاڵ بێت بە زیکری خوای گەورەوەو، بیریش لـەوە بکاتەوە، کە مردوەکە لـەمەولا پێی دەگاتو، چارەنووسـی چـۆن دەبێـتو، ئێسـتە حاڵی چۆنەو، ئەمەش کۆتایی دنیایەو، چارەنووسی خەڵکەکەیەتی.

هەروەها با زۆر خۆی بپارێزێت لـە کردنی قسەی بێ کەڵك. چونکە ئەمە کـاتی بیرکردنەوەو زیکری خوایەو، بێ ئاگـایيو گاڵتـەکردنو سـەرقاڵبوون بـە قسـەی پڕوپووچ تێیدا زۆر ناشیرینە. چونکە قسە کردن لە شـتی بـێ سـوودا لـە هـەموو کاتو حاڵەتێکدا نەهی لێ کراوە، چی جای ئەم کاتو حاڵەتە؟!

ئەوجا بزانە، کـە هەڵسوکـەوتی ڕاسـتو هەڵبـژێردراو ئەوەیـە کـە زانایـانی (سَلَف)ی لـەسەر بوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئـەویش بریتیـە لـە بێـدەنگی لـەکاتی ڕێ کردن لـەگەڵ تەرمەکەدا. واتـە: نابێـت دەنـگ بـەرز بکرێتـەوە، نـە بـە خوێنـدنی قورئانو، نە بە زیکر کردنو، نە بە خوێندنی هیچ شتێکی تر.

حیکمەتیش لـەم بێدەنگیە ئاشکراو ڕوونە، ئەویش ئەوەیە کە دەروونی کەسەکە هێورترو، بیری جەمتر دەبێت سەبارەت بەوەی پەیوەندی بە تەرمەکـەوە هەیـە، کـە لـەم حاڵـەتەشدا هەر دەبێت وابێت.

جـا ئەمـە بۆچـوونە حـەقو ڕاسـتەکەیەو، تـۆش بـەهۆی زۆری ژمـارەی ئـەو کەسانەوە هەڵمەخەڵەتێ، کە بۆچوونی پێچەوانەی ئەمەیان هەیە. چونکە خواناسـی پایەبەرز (فُضَیْل)ی کـوڕی (عِیَــاض) (خـوای لێ ڕازی بێـت) فەرمایشـتێکی هەیـە، کـە پوختەکەی ئەمەیە: لـەسەر ڕێگەی ڕاست بمێنـەرەوەو پێیـەوە پابەندبـەو، بـا کـەمی پەیڕەوانو شوێنکەوتوانیشی زیانت پێ نەگەیەنێت. خۆیشت لـە ڕێگاکانی گـومڕایی بپارێزەو، بە زۆری ژمارەی پەیڕەوە تیاچوەکانیشیان هەڵمەخەڵەتێ.

له (سُنَن)ی (بَيْهَقِـيّ)شدا حەدیسێکمان بۆ ڕیوایەت کراوە، کە هەر وا دەخوازێت، من وتم.[1]

سەبارەت بەو کارەش کە کەسانی نەزان لە شاری دیمەشق‌و شارەکانی تریشدا ئەنجامی دەدەن‌و، قورئان بەسەر تەرمی مردوودا دەخوێنن‌و، وشەکانی درێژو خاو دەکەنەوەو، فەرمایشتەکان لە مەبەستەکانی خۆیان لادەدەن، ئەوە بە کۆدەنگی زانایان کارێکی حەرامەو، منیش لە کتێبی (التِّبْيَان فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا باسی ناشیرینی ئەو کارەو، زۆر حەرامێتیەکەی‌و، تاوانباربوونی ئەو کەسەم کردوە، کە دەتوانێت ئینکاری بکات‌و، ئینکاریشی ناکات. خواش پشت‌و پەنای هەموو لایەکەو، تەوفیقیش تەنها بەدەستی ئەوە.

## ئەگەر تەرمێك بەلای کەسێکدا تێپەڕی، یان کەسێك چاوی بە تەرمێك کەوت چی بڵێت؟

سونەتە ئەو کەسە بڵێت: (سُبْحَانَ الْحَيِّ الَّذِيْ لا يَمُوْتُ). واتە: پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو زاتە زیندوەی، کە هەرگیز نامرێت.

زانای پایەبەرز قاضی (أَبو الْمَحَاسِن)ی (رُوْيَانِيّ) –کە یەکێکە لە هاوەڵانمان– لە کتێبی (بَحْرُ الْمَذْهَب)دا فەرموویەتی: سونەتە دوعا بکات‌و، بڵێت: (لا إِلَـهَ إِلاّ اللهُ الْحَيُّ الَّذِيْ لا يَمُوْتُ).

---

(١) ئەویش بریتیە لەو فەرمایشتەی، کە شوێنکەوتووی پایەبەرز (قَـيْس)ی کوڕی (عُبَـاد) فەرموویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا پێیان ناخۆشبوو لەکاتی جەنازەو، لەکاتی جەنگ‌و، لەکاتی زیکردا دەنگ بەرز بکرێتەوە. بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْـرَى / ٤ / ٧٤ / ٦٩٧٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: فەرمایشتێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَـائِجُ الْأَفْكَـار / ٤ / ٤١١.

هەروەها سونەتە دوعا بۆ مردوەکە بکات،و، وەسفو سەنای بکات، ئەگەر شایان بوو، بەڵام زیادەڕەوی لە وەسفیدا نەکات.

## ئەوەی ئەو کەسە دەیڵێت، کە مردوەکە دەخاتە گۆڕەکەیەوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)و (بَيْهَقِيّ)و لە غەیری ئەوانیشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، مردووی بخستایەتە ناو گۆڕەوە، دەیفەرموو: «بِاسْمِ اللهِ، وَعَلَى سُنَّةِ رَسُوْلِ اللهِ».

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵانیش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: سونەتە لەگەڵ ئەو زیکرەشدا دوعا بۆ مردوەکە بکات.

یەکێك لە جوانترین دوعاش ئەوەیە، کە دەقی ئیمامی (شَافِعِيّ) لەسەر هاتوە لە کتێبی (مُخْتَصَرُ الْمُزَنِيّ)دا، کە فەرموویەتی: با ئەو کەسانەی مردوەکە دەخەنە ناو گۆڕەکەوە بڵێن: (اللّهُمَّ، أسْلَمَهُ إِلَيْكَ الْأشِحَّاءُ مِنْ أهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَقَرابَتِهِ وَإِخْوَانِهِ، وَفَارَقَ مَنْ كَانَ يُحِبُّ قُرْبَهُ، وَخَرَجَ مِنْ سَعَةِ الدُّنْيا وَالْحَيَاةِ إِلَى ظُلْمَةِ الْقَبْرِ وَضِيْقِهِ، وَنَزَلَ بِكَ وأَنْتَ خَيْرُ مَنْزُوْلٍ بِهِ، إنْ عاقَبْتَهُ، فَبِذَنْبٍ، وَإِنْ عَفَوْتَ عَنْهُ، فَأَنْتَ أَهْلُ الْعَفْوِ، أَنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِهِ، وَهُوَ فَقِيرٌ إِلَى رَحْمَتِكَ. اللّهُمَّ، اشْكُرْ حَسَنَتَهُ، وَاغْفِرْ سَيِّئَتَهُ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَاجْمَعْ لَهُ بِرَحْمَتِكَ الْأمْنَ مِنْ عَذَابِكَ، وَاكْفِهِ كُلَّ هَوْلٍ

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٣٢ / ٣٢١٣، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٦٤ / بە ژمارە: ١٠٤٦، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٥٥ / ٦٨٥. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٤١٢.

دُوْنَ الْجَنَّةِ. اللّهُمَّ، اخْلُفْهُ فِيْ تَرِكَتِهِ فِيْ الْغَابِرِيْنَ، وَارْفَعْهُ فِيْ عِلِّيِّيْنَ، وَعُدْ عَلَيْهِ بِفَضْلِ رَحْمَتِكَ، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ). واته: (خوایه، خێزانو منداڵو خزمو کەسوکارو براکانی ئەم مردوە، کە حەزیان بە لەدەستدانی نەدەکرد، وا دایانە دەستی تۆو تەسلیمی لوتفی تۆیان کردو، ئەویش لەو کەسانە جیابوویەوە، کە حەزی لە نزیکیان بوو. لە فراوانیو گوشادی دنیاو ژیان دەرچوو بۆ تاریکاییو تەسکایی ناو گۆڕو، هاتە خزمەتی تۆو، تۆش باشترین میوان پەزێریت، خۆ ئەگەر سزای بدەیت، ئەوە بەهۆی تاوانەوەیەو، ئەگەر لێشی ببوریت، ئەوە تۆ خۆت لێبوردەو بەخشندەیت. تۆ پێویستت بە سزادانی ئەو نیەو، ئەویش پێویستی بە سۆزو میهرەبانی تۆ هەیە. خوایە پاداشتی چاکەکانی بدەرەوەو، لە خراپەو تاوانەکانیشی خۆشبەو، لە سزای گۆڕیش پەنای بدەو، بە ڕەحمەتی خۆشت لە سزای خۆت بیپارێزەو، لە هەموو نارەحەتیەکانی بەرلە گەیشتنی بە بەهەشت دووری بخەرەوەو بیپارێزە. خوایە ئاگاشت لەو کەسوکارەی بێت کە لێی بەجێدەمێنن‌و، لە تۆماری گشتی ناوو کردەوەی چاکەکاراندا پلەی بەرز بکەرەوەو، دووبارە ڕەحی زیاتری پێ بکە، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان).

## ئەوەی لەدوای ئەسپەردەکردنی مردوەکەوە دەوترێت

سونەتە بۆ ئەو کەسەی لەسەر گۆڕەکە ڕاوەستاوە بە هەردوو دەستی سێ مشت خۆڵ بکاتە سەر گۆڕەکە، لەڕووی سەری مردوەکەوە.

کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: سونەتە لە مشتی یەکەمیاندا بڵێت: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾، لە دوەمیشدا بڵێت: ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾، لە سێیەمیشدا بڵێت: ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ [طه: ٥٥]. واتە: {ئێمە ئێوەمان لە زەوی درووست کردوەو، دەتانگەڕێنینەوە بۆ ناو زەویو، لەویشەوە جارێکی تر دەتانهێنینە دەرەوە}.

سونەتیشە لەدوای لێبوونەوە لە بەخاك سپاردنەكە، ماوەیەك لەپاڵ گۆڕەكەدا دانیشێت، بە ئەندازەی سەربڕینی حوشترێكو، دابەش كردنی گۆشتەكەی. دانیشتوانی سەر گۆڕەكەش خۆیان خەریك بكەن بە خوێندنەوەی قورئانو، دوعا كردن بۆ مردوەكەو، ئامۆژگاریو، چیرۆكو سەرگوزەشتەی پیاوچاكانەوە.

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئێمە لە بەخاك سپاردنی تەرمێكدا بووین لە گۆڕستانی (بَقِيْعُ الْغَرْقَد)و، پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی هێنا بۆلامانو، دانیشتو، ئێمەش لە خزمەتیدا دانیشتینو، گۆچانێك (یان تووڵێك)ی پێبوو، سەری داخستو، بە گۆچانەكەی دەیدا لە زەویەكەو، پاشان فەرمووی: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ، إلاّ قَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ». واتە: "هیچ كەسێك لە ئێوە نیە، كە جێگەكەی خۆیی لەناو ئاگری دۆزەخدا، یان لەناو بەهەشتدا بۆ دیاری نەكرابێت". جا هاوەڵانیش عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئیتر بۆ ئێمە پشت بە نوسراوەكەی چارەنووسی خۆمان نەبەستین؟ ئەویش فەرمووی: «اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ». واتە: "كارو كردەوەی باش بكەن، چونكە هەموو كەسێك لە زانستو تەقدیری خوادا بەرەو ئەو جێگەیە دەبرێت، كە بۆی درووستكراوە". ئیتر تەواوی حەدیسەكەی باس كرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی كوڕی (عَاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: ئەگەر بەخاكتان سپاردم، بە ئەندازەی سەربڕینی حوشترێكو، دابەش كردنی گۆشتەكەی لای

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٦ / ٢٧٤٥ / بە ژمارە: ٧١١٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٠٤٠ / بە ژمارە: ٢٦٤٧.

گۆڕەکەمدا بمێننەوە، تا بەهۆی ئێوەوە هەست بـە غـەریبی نەکـەمو، بشـزانم بەچـی شتێك وەڵامی فریشتە نێردراوەکانی پەروەردگارم دەدەمەوە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُـوْ دَاوُد)و (بَيْهَقِـيّ)دا، بـە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لـە ئیمامی (عُثْمَـان)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لـە بەخاك سـپاردنی مردوویـەك بوایەتـەوە، لـەسەری ڕادەوەستاو، دەیفەرموو: «اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيْكُمْ، وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيْتَ، فَإِنَّهُ الْـآنَ يُسْأَلُ».[2] واتە: "داوای لێخۆشبوون بـۆ براکـەتان بکـەنو، داوای ڕاگـیراوی بـۆ بکەن بۆ وەڵامدانەوەی فریشتەکان. چونکە بەڕاستی ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت".

ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵانی فەرموویانە: سونەتە ئامادەبوان چـەند ئایـەتێك لـە قورئانی پیرۆز لـەسەر گۆڕەکە بخوێنن. هەروەها فەرموویانە: خۆ ئەگـەر بەتـەواوەتی خەتمی قورئانی لـەسەر بکەن، ئەوە باشە.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (بَيْهَقِيّ)دا، بـە ڕشـتەیەکی (حَسَـن)، کـە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَـر) (خوای لێ ڕازی بێت)، پێـی خۆشـبوەو وای بـەباش زانیوە، کە لـەدوای بەخاك سپاردن، سەرەتای سـورەتی (الْبَقَـرَة)و کۆتاییەکەیشـی لـەسەر گۆڕەکە بخوێنرێت.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١١٢ / بە ژمارە: ١٢١.
(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٣٤ / ٣٢٢١، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٥٦ / ٦٨٥٦.
(٣) بڕوانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٤ / ٥٦ / ٦٨٦٠.

## باسێك: {تەڵقینی مردوو}

**کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانمان فەرموویانە: تەڵقینی مردوو لەدوای بەخاك سپاردنی سونەتە.**[1]

جا لەوانەی، کە فەرموویانە سونەتە: زانای پایەبەرز قاضی (حُسَیْن) لە کتێبی (التَّعْلِيْقَة)داو، قوتابیەکەشی -کە بریتیە لە زانای پایەبەرز (أَبو سَعْد)ی (مُتَوَلّي)- لە کتێبی (التَّتِمَة)داو، زانای پایەبەرزی خوانـاس (أَبو الْفَتْحِ نَصْر)ی کوڕی (إِبْرَاهِيْم)ی کوڕی (نَصْر)ی (مَقْدِسِيّ)و، زانای پایەبەرز (أَبو الْقَاسِم)ی (رَافِعِيّ)و، غەیری ئەوانیش.

هەروەها زانای پایەبەرز قاضی (حُسَیْن) ئەم بۆچوونەی لە هاوەڵانەوە نقلّ کردوە.

سەبارەت بە دەقی تەڵقینیش، زانای پایەبەرز شێخ (نَصْر) فەرموویەتی: ئەگەر لێبوویەوە لە بەخاك سپاردنی مردووەکە، با لەلای سەریدا بوەستێت و، بڵێت: (يَا فُلانُ بْنُ فُلانٍ، اُذْكُرْ الْعَهْدَ الَّذِيْ خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنْيَا: شَهَادَةَ أَنْ لا إِلَـهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ، وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ، لا رَيْبَ فِيْهَا، وَأَنَّ

---

(١) شێخی (ابْنُ عَلاَّن) فەرموویەتی: بەڵگەی سونەتبووی تەڵقین ئەوەیە، کە یادخستنەوەی مردووەکەی تێدایەو، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِيْنَ﴾ [الذَّارِيَات: ٥٥]، بەندەی خواش لەو حاڵەتەدا لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە یادخستنەوە هەیە.

زانایان فەرموویانە: تەڵقین دژایەتیەکی نیە لەگەڵ ئایەتی ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُوْرِ﴾ [فَاطِر: ٢٢]و، ئایەتی ﴿إِنَّكَ لا تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾ [النَّمْل: ٨٠]. چونکە پێغەمبەری خوا بانگی کوژراوەکانی ناو بیرەکەی کردو، بیستیشیانو، فەرمووشی: ئێوە لەوان باشتر نابیستن، بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە. هەروەها لەبارەی مردووشەوە فەرموویەتی: خشەو دەنگی نەعلەکانی ئەو کەسانە دەبیسێت، کە ئەسپەردەیان کردوەو، بەجێی دەهێڵن. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ١٩٤ - ١٩٥.

اللهُ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُوْر. قُلْ: رَضِيْتُ بِاللّهِ رَبّاً، وَبِالْإسْلام دِيْناً، وَبِمُحَمَّدٍ -صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- نَبِيّاً، وَبِالْكَعْبَةِ قِبْلَةً، وَبِالْقُرْآنِ إمَاماً، وَبِالْمُسْلِمِيْنَ إخْوَاناً. رَبِّيَ اللهُ، لا إلهَ إلاّ هُوَ، وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيْمِ). واته: (ئـهی فلانـی كـوڕی فیسـار، ئـهو پـهیمانو بهڵێنهت بێتهوه بیر، كه لهسهری دنیات بهجێهێشت، ئهویش شایهتیدان بوو لهسـهر ئهوهی، كه هیچ پهرستراوێكی ڕاستهقینه نیه بێجگـه لـه خـوای تـاكو تـهنهای بـێ هاوتاو، "مُحَمَّد"یش بهندهو پێغهمبهری ئهوهو، ڕۆژی قیامهتیش دێتو، گومانی تێدا نیهو، خوای گهورهش مردوهكانی ناو گۆڕ زیندوو دهكاتهوه. بڵێ: ڕازیم به خوا كه پهروهردگارم بێتو، ڕازیشم به ئیسلام كه ئاینم بێتو، ڕازیشم به "مُحَمَّد" (دروودی خوای لهسهر بێت) كه پێغهمبهرم بێتو، ڕازیشم به كهعبهی پیرۆز كه قیبلهو ڕووگهی نوێژو عیبادهتم بێتو، ڕازیشم به قورئان كه پێشهوام بێتو، ڕازیشم به موسوڵمانان كه براو خوشكم بن. پهروهردگارم تهنها خوایهو، بێجگه له ئهو هیچ پهرسـتراوێكی ڕاستهقینه نیهو، ئهویش پهروهردگاری عهرشی مهزنه).

ئهمه دهقی تهڵقینهكـهی زانـای پایهبـهرز شـێخ (نَصْــر)ی (مَقْدِسِــيّ)ــه، لـه كتێبهكهیدا بهناوی (التَّهْذِيْب).

دهقی تهڵقینی زانایانی تریش ههر لهو نزیكهو، له دهقی ههندێكیانـدا تهڵقینهكـه كورت تره.

پاشان ههندێك لـهو زانایانه لـه بانگ كردنی مردوهكهدا دهفهرموون: (يَا عَبْدَ اللهِ ابْنَ أَمَةِ اللهِ)و، ههندێكیشیان دهفـهرموون: (يَا عَبْدَ اللهِ ابْنَ حَــوَّاءَ)و، ههندێكیشـیان دهفهرموون: (يَا فُلانُ ابْنُ أَمَةِ اللهِ) ناوی دههێنن، یان دهفهرموون: (يَــا فُــلانُ ابْــنُ حَوَّاءَ)، ههموو ئهم تهعبیرانهش ههر به یهك مانایه.

دهربارهی ئهم تهڵقینهش پرسیار كراوه له زانای پایهبهرزو پێشـهوا شـێخ (ابْــنُ الصَّلاح)ی شارهزوری (ڕهحمهتی خوای لێ بێت)، ئهویش لـه (فَتَاوَى)كهیـدا فهرموویـهتی: ئێمه تهڵقین كردنمان بهلاوه پهسهندهو، كاریشـی پـێ دهكـهینو، كۆمـهڵێكیش لـه

هاوەڵە خۆراسانیەکانمان باسیان کردوە. هەروەها فەرمووشێتی: ئێمە حەدیسێکمان لەبارەی تەڵقینەوە لە ڕێگەی (أَبُو أُمَامَةَ)وە ڕیوایەت کردوە، کە ڕشتەکەی ڕاوەستاو نیە، بەڵام پشتگیری کراوەو بەهێز بوە بەهۆی هاتنیەوە لە ڕێگەی ترەوە، هەروەها پاڵپشت کراوە بە کردەوەی زانایانی وڵاتی شامیش لە کۆنەوە.[1]

هەروەها شێخی شارەزووری فەرموویەتی: سەبارەت بە تەڵقینی منداڵی شیرەخۆر، ئەوە بەڵگەیەکی پشت پێ بەستراوی نیەو، ئێمەش بە سونەتی دانانێین. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

(١) بڕوانە: فَتَاوَى ابْنِ الصَّلاحِ / ١ / ٢٦١ / بە ژمارە: ١٠٥. حەدیسەکەش ئیمامی (طَبَرَانِيّ) لە (الْمُعْجَمُ الْكَبِيْرِ) / ٨ / ٢٤٩ / بە ژمارە: ٧٩٧٩)دا ڕیوایەتی کردوە، لە ڕێگەی (سَعِيد)ی کوڕی (عَبْدُالله)ی (أَوْدِيّ)ـەوە، کە فەرموویەتی: شَهِدْتُ أَبَا أُمَامَةَ وَهُوَ فِي النَّزْعِ، فَقَالَ: إِذَا أَنَا مُتُّ، فَاصْنَعُوا بِي كَمَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ –صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ– أَنْ نَصْنَعَ بِمَوْتَانَا، أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: "إِذَا مَاتَ أَحَدٌ مِنْ إِخْوَانِكُمْ، فَسَوَّيْتُمِ التُّرَابَ عَلَى قَبْرِهِ، فَلْيَقُمْ أَحَدُكُمْ عَلَى رَأْسِ قَبْرِهِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: (يَا فُلَانَ بْنَ فُلَانَةَ)، فَإِنَّهُ يَسْمَعُهُ وَلَا يُجِيبُ، ثُمَّ يَقُولُ: (يَا فُلَانَ بْنَ فُلَانَةَ)، فَإِنَّهُ يَسْتَوِي قَاعِدًا، ثُمَّ يَقُولُ: (يَا فُلَانَ بْنَ فُلَانَةَ)، فَإِنَّهُ يَقُولُ: (أَرْشِدْنَا، رَحِمَكَ اللهُ)، وَلَكِنْ لَا تَشْعُرُونَ. فَلْيَقُلْ: (اذْكُرْ مَا خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنْيَا: شَهَادَةَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّكَ رَضِيتَ بِاللهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، وَبِالْقُرْآنِ إِمَامًا)، فَإِنَّ مُنْكَرًا وَنَكِيرًا يَأْخُذُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا بِيَدِ صَاحِبِهِ، وَيَقُولُ: (انْطَلِقْ بِنَا، مَا نَقْعُدُ عِنْدَ مَنْ قَدْ لُقِّنَ حُجَّتَهُ)، فَيَكُونُ اللهُ حَجِيجَهُ دُونَهُمَا". فَقَالَ رَجُلٌ: (يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنْ لَمْ يَعْرِفْ أُمَّهُ؟) قَالَ: «فَيَنْسُبُهُ إِلَى حَوَّاءَ، يَا فُلَانَ بْنَ حَوَّاءَ». جا بۆ هێنانی ئەو حەدیسانەی، کە پاڵپشتی ئەم حەدیسە لاوازە دەکەن، بڕوانە: الْبَدْرُ الْمُنِيْر / ٥ / ٣٣٣ – ٣٣٩ / بە ژمارە: ٨٢. شێخی (ابْنُ الْقَيِّم)یش فەرموویەتی: ئەم حەدیسە ئەگەرچی سابتیش نەبوە، بەڵام هەر ئەوەندە بەسە بۆ کار پێکردنی، کە بەردەوام لە هەموو سەردەمەکاندا کاری پێکراوە، بێ ئەوەی کەس ئینکاری کردبێت. بڕوانە: الرُّوْح / ١٣.

منیش دەڵێم: بۆچوونی ڕاست ئەوەیە، کە هیچ منداڵێك تـەڵقین ناکرێـت، چـی شیرەخۆر بێت، یان گەورەتر، تا باڵغ نەبێتو، نەبێت بە (مُكَلَّف). خواش لـە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی وەسێتی مردوو، کە کەسێکی دیاریکراو نوێژی لەسەر بکات، یان بە شێوەیەکی دیاریکراو، یان لە جێگەیەکی دیاریکراودا بەخاك بسپێردرێت، بە هەمان شێوە کفن و ئەو شتانەی تریش، کە دەکرێنو، ئەوانەش کە ناکرێن

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لــە صــەحیحی بوخاریــدا، لــە (عَائِشَــــة)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: چوومە خزمەتی ئیمـامی (أَبُو بَكْر) (خوای لێ ڕازی بێت) —واتە: لەو کاتەی کە نەخۆش بوو—، پێـی فـەرمووم: لــە چـەند کفندا پێغەمبەری خواتان (دروودی خوای لەسەر بێت) کفن کرد؟ منیش عەرزم کرد: لــە سێ کراسدا. فەرمووی: لە چی ڕۆژێکدا پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) وەفاتی فەرموو؟ عەرزم کرد: لە ڕۆژی دووشەممەدا. فـەرمووی: ئـەی ئـەمڕۆ چـی ڕۆژێکە؟ عەرزم کرد: دووشەممەیە. فەرمووی: هیوادارم لە ئێستەوە هەتا شەو منیش بمرم. پاشان تەماشای ئەو کراسەی کرد، کە لـە نەخۆشیدا لـەبەری دەکردو، پەڵەی زەردی زەعفەرانی پێوەبوو، جـا فـەرمووی: ئـەم کراسـەم بشـۆرنو، دوو کراسـی تریشی بەسەردا زیاد بکەنو، لـە هەرسێکەیاندا کفنم بکەن. منیش عەرزم کرد: ئـەم کراسەیان کۆن بوە!! فەرمووی: کەسی زیندوو لـە کەسی مردوو حەقی زیاترە، کـە پۆشاکی تازە لـەبەر بکات. چونکە بەڕاستی پۆشاکی مردوو بۆ ئەو کێمو زێچاوەیە، کە لـە لاشەی دەردەچن.

جا ئەوەبوو وەفاتی نەفەرموو، هەتا شەوی سێ شەممە، ئیتر بەر لەوەی ڕۆژ ببێتەوە بەخاك سپێردرا.(١)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، کە ئیمامی (عُمَـر)ی کوڕی (خَطَّاب) (خوای لێ ڕازی بێت)، کاتێك بریندار کرا، بە (عَبْدُالله)ی کوڕی خۆی فەرموو: ئەگەر مردم، هەڵم بگرن‌و، (بمبەن بۆلای ماڵی دایکە عَائِشَـة)و، سڵاو بکەن‌و، عەرزی بکەن: (عُمَر) داوا دەکات، ڕێگەی پێبدەن بێتە ژوورەوە. جا ئەگەر دایکە (عَائِشَة) ڕێگەی پێدام، ئەوا بمبەنە ژوورەوە. ئەگەر ڕێگەشی پێ نەدام، ئەوا بمگەڕێننەوە بۆ گۆڕستانی موسوڵمانان.(٢)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (عَامِر)ی کوڕی هاوەڵی خۆشەویست (سَعْد)ی کوڕی (أَبِيْ وَقَّاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: (سَعْد) فەرمووی: گۆڕەکەم بەشێوەی (لَحْد) (واتە: لادر لەڕووی قیبلەوە) بۆ هەڵکەنن‌و، خشتی قوڕیشم لەسەر دابنێن، هەروەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا کراوە (دروودی خوای لەسەر بێت).(٣)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەویش لە کاتی سەرەمەرگیدا فەرموویەتی: ئەگەر مردم، کەس بە گریان‌و هاوارەوە لەگەڵمدا نەیەت‌و، ئاگریش نەهێنن. جا ئەگەر بەخاکتان سپاردم، کەم کەم خاك بکەن بەسەرمداو، پاشان بە ئەندازەی ماوەی سەربڕینی حوشترێك‌و، دابەش کردنی گۆشتەکەی لەدەوری

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦٧ / بە ژمارە: ١٣٢١.
(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦٩ / بە ژمارە: ١٣٢٨.
(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٦٥ / بە ژمارە: ٩٦٦.

گۆڕەکەمدا بمێننەوە، تا بەهۆی ئێوەوە هەست بە غەریبی نەکەمو، بشزانم چی وەڵامی فریشتە نێردراوەکانی پەروەردگارم دەدەمەوە.[1]

هەروەها بە ئەم مانایە حەدیسەکەی هاوەڵی خۆشەویست (حُذَيْفَة)شمان بۆ ڕیوایەت کراوە، کە پێشتر لە باسی (**ئاگادار کردنەوەی خاوەنی مردوو بە مردنی کەسەکەیان**)دا هێنامان.

هەروەها چەند حەدیسێکی تریشمان لەمبارەوە بۆ ڕیوایەت کراوە. بەڵام ئەوەی باسمان کرد بەسە. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

منیش دەڵێم: نابێت لە هەموو شتێکدا بەگوێی مردوەکە بکرێتو، هەموو وەسێتەکانیشی جێبەجێ بکرێن. بەڵکو دەبێت بخرێنە ڕوو بۆ خەڵکانی زاناو خوێندەوار. جا ئەوان ڕێگەیان بە هەرچی دا، با بکرێتو، ڕێگەشیان بە هەرچی نەدا، با نەکرێت.

وا چەند نموونەیەکیش بۆ ئەو حاڵەتانە دەهێنمەوە:

- ئەگەر وەسێتی کرد لە جێگەیەکی دیاریکراوی گۆڕستانی شارەکەی خۆیدا بەخاك بسپێردرێتو، ئەو جێگەیەش خەڵکانی باشی تێدا نێژرابوو، ئەوا پێویستە پارێزگاری لە وەسێتەکەی بکرێتو، بۆی جێبەجێ بکرێت.
- ئەگەر وەسێتی کرد کەسێکی بێگانە نوێژی لەسەر بکات (واتە: خزمو کەسوکاری خۆی نەبێت)، ئایا دەبێت ئەو کەسە پێش بخرێت بەسەر خزمو کەسوکارکەیدا، یان نا؟ زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەمبارەوە: بۆچوونی درووستیش لە مەزهەبی ئێمەدا ئەوەیە، کە خزمەکەی لەپێشترە. بەڵام ئەگەر بێگانە وەسێتبۆکراوەکە پیاوێکی چاكو دیندار بوو، یان کەسێکی زاناو شارەزاو لێهاتوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی پارێزکارو

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ١١٢ / بە ژمارە: ١٢١.

ناوبانگ باش بوو ، ئەوا سونەتە بۆ ئەو خزمەی، کە لــەو سـیفەتانەدا وەکـو ئەو کەسە نیە، زیاتر ڕەچاوی مافی مردوەکە بکات‌و، ئەو کەسە پێش بخـات بەسەر خۆیدا.

- ئەگەر وەسێتی کرد لـە تابوتدا بەخاك بسپێردرێت، ئەوا وەسێتەکەی جێبەجێ ناکرێت. تەنها مەگەر زەویەکە فشەڵ یان نەرم بێت‌و، پێویســت بـە تـابوت بکات، لـەو کاتەدا وەسێتەکەی جێبەجێ دەکرێت‌و، پارەی تابوتەکەش، هەر وەکو پارەی کفن، لـە ماڵی خۆی دەدرێت.
- ئەگەر وەسێتی کرد بگوێزرێتەوە بۆ شارێکی تر، ئەوا وەسـێتەکەی جێـبەجێ ناکرێت. چونکە گواستنەوەی مردوو لــە جێگەیەکـەوە بـۆ جێگەیـەکی تـر حەرامە بەپێی مەزهەبی درووسـتی هەڵبـژێردراو، کـە زۆرێـك لـە زانایـانی لەسەرەو، زانـا (مُحَقِّــق)ــەکانیش بـە ڕاشـکاوی باسـیان کـردوە. بـەڵام بۆچوونێکی لاواز هەیە، کە پێوایە ناپەسەندە. ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت) فەرموویەتی: مەگەر ئەو جێگەی کەسەکەی تێدا مردوە نزیکی شاری (مَكَّة)، یان (مَدِيْنَة)، یان (بَيْتُ الْمَقْدِس) بێت، ئەو کاتە لـەبـەر پـیرۆزی ئـەو شارانە دەکرێت مردوەکە بگوازرێتەوە بۆ ئەوێ.
- ئەگەر وەسێتی کرد دۆشەکە بخەنە ژێری، یان سەرین بخەنە ژێر سەری، یـان هەر شتێکی تری لـەم جۆرە، ئەوا وەسێتەکەی جێبەجێ ناکرێت. بـە هـەمان شێوە ئەگەر وەسێتی کرد لـە قوماشی ئاورێشمدا کفن بکرێت، وەسـێتەکەی جێبەجێ ناکرێـت. چـونکە کفـن کردنـی پیـاوان لـە قوماشـی ئاورێشـمدا حەرامەو، کفن کردنی ئافرەتانیش تێیدا ناپەسەندە، نەك حەرام. نێرەموو کیش لـەم مەسەلـەدا وەکو پیاو وەهایە (واتە: بۆ ئەویش حەرامە).
- ئەگەر وەسێتی کرد لـە زیاتر لـەو ژمارە کفنـەی، کـە شـەرع دایـناوە کفـن بکرێت، یان لـە کراسێکدا کفـن بکرێـت، کـە لاشـەی دانەپۆشـێت، ئـەوا وەسێتەکەی جێبەجێ ناکرێت.

- ئەگەر وەسیێتی کرد قورئان لای گۆڕەکەیدا بخوێنرێت، یان خێرو صەدەقەی بۆ بکرێت...... یان هەر جۆرە کارێکی خێری تر، ئەوا وەسیێتەکەی جێبەجێ دەکرێت، مەگەر شتێکی لەگەڵدا بێت، کە شەرع ڕێگەی پێ نەدات.
- ئەگەر وەسیێتی کرد تەرمەکەی زیاد لەوەی شەرع ڕێگەی پێداوە دوا بخرێت، ئەوا وەسیێتەکەی جێبەجێ ناکرێت.
- ئەگەر وەسیێتی کرد بینایەك لەسەر گۆڕەکەی دروست بکرێت لە گۆڕستانی گشتی موسوڵماناندا، ئەوا وەسیێتەکەی جێبەجێ ناکرێت، بەڵکو ئەو کارە کارێکی حەرامە.

## باسی ئەوەی سوود بە مردوو دەگەیەنێت، لە وتەی کەسانی تر

زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە دوعا کردن بۆ مردووەکان سوودیان پێ دەگەیەنێت و، پاداشتەکەشیان پێ دەگات. بەڵگەشیان بەم فەرمایشتەی خوای گەورە هێناوەتەوە: ﴿وَالَّذِيْنَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِيْنَ سَبَقُونَا بِالْإِيْمَانِ﴾ [الحَشر: ١٠] واتە: {ئەو باوەڕدارانەش، کە لەدوای ئەو کۆچەری و پشتیوانانەوە هاتوون، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، لە ئێمەو لەو برایانەشمان خۆشبە، کە بە ئیمانەوە پێشی ئێمە کەوتوون و، بە ئیمانەوە ڕۆیشتوون}. هەروەها بەڵگەشیان بە هەندێك ئایەتی مەشهوری تر هێناوەتەوە، کە بە هەمان مانا هاتوون و، بە هەندێك حەدیسی مەشهوریش، وەکو ئەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت): «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِأَهْلِ بَقِيْعِ الْغَرْقَدِ»و، «اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا.....هتد»و، هەندێك فەرمایشتی تریش.

زانایانیش بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە گەیشتنی پاداشتی خوێندنی قورئانی پیرۆز بۆ مردوو: بۆچوونی مەشهور لە مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)و، کۆمەڵێکیش ئەوەیە، کە پاداشتی خوێندنی قورئانی پیرۆز ناگات بە مردوو.

ئیمامی (أَحْمَد)ی کوڕی (حَنْبَل)و، کۆمەڵێکیش لە زانایانو، کۆمـەڵێکیش لـە قوتابیەکانی ئیمامی (شَافِعِيّ)ش پێیان وایە، کە دەگات.

بەمەش بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە، کە قورئانخوێن لـەدوای لێبوونـەوەی لـە قورئانەکەی، بڵێت: "خوایە، پاداشتی ئەو قورئانەی کە خوێندم بیگەیەنـە بـە فلانـە کەس". خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

هەروەها سونەتە ستایشی مردوەکە بکرێتو، باسی چاکەکانی بکرێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هـاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: تـەرمێکیان بـەلای پێغەمبەرو هاوەڵانیدا تێپەڕانـد، هەنـدێك لـە هـاوەڵانیش باسـی چـاکەیان دەکـرد، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فـەرمووی: «وَجَبَت». واتـە: (پێویسـت بوو). پاشـان یـەکێکی تریشـیان تێپەڕانـدو، هـاوەڵانیش باسـی خراپـەیان دەکـرد، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، فـەرمووی: «وَجَبَت». واتـە: (پێویسـت بوو). جا ئیمامی (عُمَر)ی کـوڕی (خَطَّـاب) (خوای لێ ڕازی بێت)، فـەرمووی: چی پێویست بوو؟! پێغەمبەریش فەرمووی: «هَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرَاً، فَوَجَبَتْ لَـهُ الْجَنَّـةُ، وَهَذَا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرّاً، فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُـهَدَاءُ اللهِ فِـي الْـأَرْضِ».[1] واتـە: "ئەوەیان باسی چاکەیتان کرد، بەهەشتی بۆ پێویست بوو. ئەوەشیان باسی خراپەیتان کرد، ئاگری بۆ پێویست بوو. ئێوە شایەتی خوان لە زەویدا".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صـەحیحی بوخاریـدا، لـە (أَبُـو الْأَسْـوَد)ەوە، کـە فەرموویەتی: گەڕامەوە شاری مەدینەی پیرۆزو، لە خزمەتی ئیمامی (عُمَر)ی کـوڕی (خَطَّاب)دا دانیشتم (خوای لێ ڕازی بێت)، تەرمێك بەلایانـدا تێپـەڕیو، باسـی چـاکەی کرا، ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "پێویست بوو". پاشان تەرمێکی تریش تێپـەڕیو،

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦٠ / بە ژمارە: ١٣٠١، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٦٥٥ / بە ژمارە: ٩٤٩.

باسي چاکەی کرا، ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "پێویست بوو". ئەوجا تەرمی سێیەمیش تێپەڕی و، باسی خراپەی کرا، ئیمامی (عُمَر)یش فەرمووی: "پێویست بوو". (أَبُو الْأَسْوَد) فەرمووی: منیش عەرزم کرد: چی پێویست بوو، ئەی پێشەوای موسوڵمانان؟! ئەویش فەرمووی: منیش هەر ئەوە دەڵێم، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ، أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ». واتە: "هەر موسوڵمانێك چوار کەس شایەتی چاکەی بۆ بدەن، خوا دەیخاتە بەهەشتەوە". جا ئێمەش عەرزمان کرد: ئەی سێ کەس؟ ئەویش فەرمووی: سێ کەسیش. پاشان عەرزمان کرد: ئەی دوو کەس؟ فەرمووی: دوو کەسیش. ئیتر دەربارەی یەك کەس لێمان نەپرسی.[1]

هەروەها چەندین حەدیسی تری هاووێنەی ئەمانە هەن. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## باسی نەهی کردن لە قسەوتن بە مردوو

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیمانداران‌ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا».[2] واتە: "قسە بە مردووەکان مەڵێن، چونکە ئەوان گەیشتوون بە پاداشتی ئەو کردەوانەی، کە پێشخۆیان خستوەو ناردوویانە بۆ قیامەت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُوْ دَاوُد)و (تِرْمِذِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز -کە ئیمامی (تِرْمِذِيّ) بە لاوازی داناوە- لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٦٠ / بە ژمارە: ١٣٠٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٧٠ / بە ژمارە: ١٣٢٩.

(خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «اذْكُرُوا مَحَاسِنَ مَوْتَاكُمْ، وَكُفُّوا عَنْ مَسَاوِيْهِمْ».[1] واتە: "باسی چاکەکانی مردوەکانتان بکەن‌و، واز لە خراپەکانیان بهێنن".

منیش دەڵێم: زانایان فەرموویانە: قسەوتن بەو مردوە موسوڵمانە حەرامە، کە بە ئاشکرا تاوانی نەکردوە. سەبارەت بە کافرو، ئەو موسوڵمانەش، کە بە ئاشکرا تاوانی کردوە، ناکۆکی هەیە لە نێوان زانایانی (سَلَف)داو، چەند فەرمایشتێکی بەرامبەر بەیەکی تێدا هاتوە، کە پوختەکەی ئەوەیە، کە ئەو حەدیسانەی پێشوو هاتوون دەربارەی نەهی کردن لە قسەوتن بە مردوو.

هەروەها سەبارەت بە ڕێگەپێدانیش بە قسەوتن بە خراپەکاران، فەرمایشتێکی زۆری لەسەر هاتوە، لەوانە: ئەو چیرۆکانەی کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردون‌و، فەرمانیشی کردوە بە ئێمە، کە بیانخوێنینەوەو، لەناو خەڵکیشدا بڵاویان بکەینەوە.

بەهەمان شێوە زۆرێك حەدیسی (صَحِيْح)یش لەوبارەوە هاتون، لەوانە: وەکو ئەو حەدیسەی، کە پێغەمبەری خوا باسی (عَمْرو)ی کوڕی (لُحَيّ)ی تێدا کردوە[2]و، وەکو چیرۆکی (أَبُو رِغَال)[3]و، چیرۆکی ئەو کەسەی، بە گۆچانەکەی دزی لە حاجیان دەکرد[1]و، چیرۆکی (ابْنُ جُدْعَان) [2]و، غەیری ئەوانیش.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٦٩٢ / ٤٩٠٠، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٣٩ / بە ژمارە: ١٠١٩. حەدیسێکی لاوازە، بەڵام پاڵپشتی هەیە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٤ / ٣٧٢.

(٢) پێغەمبەری خوا لەبارەی ئەم کەسەوە فەرموویەتی: بینیم لە ئاگری دۆزەخدا ڕیخۆڵەی خۆی بەشوێن خۆیدا ڕادەکێشا. بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٣ / ١٢٩٧ / بە ژمارە: ٣٣٣٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢١٩١ / بە ژمارە: ٢٨٥٦.

(٣) (أَبُو رِغَال) کەسێك بوە لە هۆزی (ثَمُوْد)، لە قەومەکەی حەزرەتی (صَالِح)، لەکاتێکدا خوای گەورە سزای نارد بۆسەریان، ئەو لە سنووری حەرەمی شاری مەکەی پیرۆزدا بوە،

هەروەها یەکێکی تر لەو حەدیسانە، ئەو حەدیسە (صَـحِیْح)ـەیە، کـە پێشـتر هێنامان، کاتێك تەرمێك تێپەڕی، هاوەڵان باسی خراپەیان کردو، پێغەمبەری خـواش (دروودی خوای لەسەر بێت) نەیفەرموو: وا مەڵێن، بەڵکو فەرمووی: (پێویست بوو).

جا زانایان بۆ یەکخستنەوەی ئەم دەقـە پیرۆزانـە چـەند بۆچـوونێکی جیاوازیـان هەیە: دروستترین‌و بەهێزترینیان ئەوەیە، کـە درووسـتە باسـی خراپـەی مـردووی کافران بکرێت.

سەبارەت بەو مردوە موسوڵمانانەش، کە بـە ئاشـکرا تـاوان‌و خراپـەو بیدعـەو کاری لـەو جـۆرە ئـەنجام دەدەن، ئـەوانیش درووسـتە باسـی خراپـەو بیدعـەکانیان بکرێت، ئەگەر بەرژەوەندیەکی تێدا بـوو، پێویسـتی بـەوە دەکـرد، کـە هۆشـداری بدرێت لـەبارەی حاڵو هەڵسوکەوتیان‌و، دورخستنەوەی خەڵکی لـە قبـوڵ کردنـی

---

جا لـەبەر حورمەت‌و پیرۆزی ئەوێ، بێجگە لـە ئەو، هەموو قەومەکەی تیاچوون. پاشان کـە ئەویش لـە حەرەم هاتۆتە دەرەوە، سزاکە ئەویشی گرتۆتەوەو، ئەویشی لەناوبردوە. بڕوانـە: اَلْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ٣٥١ / بە ژمارە: ٣٢٤٨. ئیمامی (حَاكِم) فەرموویـەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە.

(١) پێغەمبەری خوا لـەبارەی ئەم کەسەوە فەرموویەتی: بینیم لـە ئاگری دۆزەخدا ڕیخۆڵـەی خۆی بەشوێن خۆیدا ڕادەکێشا. ئەو کەسە بە گۆچانەکەی دزی لە حاجیان دەکـرد، ئەگـەر پێـی بزانرایە، دەیوت: شتەکە گیرایە گۆچانەکەم‌و، ئەگـەر پێیشـی نەزانرایـە، شتەکەی دەبـرد. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٢٣ / بە ژمارە: ٩٠٤.

(٢) دایکە (عَائِشَة) دەفەرموێت: عەرزی پێغەمبەری خوام کـرد: {ئـەی پێغەمبـەری خـوا، لـە سەردەمی نەفامیدا (اِبْنُ جُدْعَان) پەیوەندی خزمایەتی‌و ڕەحمی بەجێدەهێناو، خواردنیشی دەدا بە هەژاران، ئایا ئـەو کارانـەی سـوودی پـێ دەگەیـەنن؟} پێغەمبـەری خـواش فـەرمووی: «نەخێر، سوودی پێ ناگەیەنن، چونکە ئەو تەنها یەك ڕۆژیش نـەیوتوە: (پـەروەردگارم، لـە ڕۆژی قیامەتدا لە تاوانەکانم خۆشبە)». بڕوانـە: صَحِيْحُ مُسْـلِم / ١ / ١٩٦ / بـە ژمـارە: ٢١٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: (اِبْنُ جُدْعَان) ناوی (عَبْدُالله) بوەو، ئـامۆزای بـاوکی ئیمامی (أَبُوبَكر) بوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٨ - ٩.

قسەکانیانو، لە شوێنکەوتنی کردەوەکانیان. بەڵام ئەگەر پێویستی بەوە نەدەکرد، ئەوا درووست نیە باسی خراپەیان بکرێت.

جا دەبێت ئەو دەقە پیرۆزانەی سەرەوەش بەم جۆرە لێکبدرێنەوە.

هەروەها زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەو کەسەی حەدیس ڕیوایەت دەکات درووستە جەرح بکرێت، ئەگەر هۆکاری جەرح کردنی تێدا بوو.[1] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) ئەم جەرح کردنەش بە غەیبەتی نارەوا دانانرێت. چونکە مەبەست لێی جیاکردنەوەی فەرموودەی ساغو درووستە لە فەرموودەی ناساغو نا درووست.

# ئەو کەسەی سەردانی گۆڕستان دەکات چی بڵێت؟

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە (عَائِشَـــة)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە فەرموویـەتی: هـەر شـەوێك پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لای ئەو بمایەتەوە، لە کۆتایی شـەودا تەشـریفی دەبـرد بـۆ گۆڕستانی (بَقِيْع)و، دەیفەرموو: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَــوْمٍ مُــؤْمِنِيْنَ، وَأَتــاكُمْ مَــا تُوْعَدُوْنَ، غَداً مُؤَجَّلُوْنَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُوْنَ؛ اللَّهُمَّ، اغْفِــرْ لِأَهْــلِ بَقِيْـــعِ الْغَرْقَدِ».[1] واتە: "سلاوتان لێبێت، ئەی باوەڕدارانی ئەم گۆڕستانە، ئـەو پاداشـتو سزایەی بەڵێنتان پێدرابوو هاتە ڕێتانو، لێپرسینەوەکەشتان بەوردی دوادەخرێت بـۆ سبەینێ (لە ڕۆژی قیامەت)، -ئەگەر خوا بیەوێت- ئێمـەش بـە ئێـوە دەگەینـەوەو بەشوێنتاندا دێین. خوایە لە مردوەکانی گۆڕستانی (بَقِيْع)ی (غَرْقَد) خۆشبە".

دیسان بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لـە (عَائِشَـــة)ی دایکـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، مـن بڵـێم چی؟ (مەبەستی ئەوە بوە، کە لەکاتی سەردانی گۆڕستاندا چی بڵـێـت)، پێغەمبـەری خوایش فەرمووی: بڵـێ: «السَّلامُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِيْنَ وَالْمُسْلِمِيْنَ، وَيَرْحَمُ اللهُ الْمُسْتَقْدِمِيْنَ مِنَّا وَالْمُسْتأخِرِيْنَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُوْنَ».[2] واتە: "سلاوتان لێبێت، ئەی باوەڕدارانو موسوڵمانانی ئەم گۆڕستانە، خوا ڕەحـم بکـات بەوانـەی پێش ئێمە مردوونو ئەوانەش دوای ئێمە دەمرن، -ئەگـەر خـوا بیـەوێت- ئێمـەش دەگەینەوە بە ئێوەو بەشوێنتاندا دێین".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لـە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَـه)دا، بـە چەند ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویسـت (أَبُو هُرَيْـرَة)وە (خـوای لێ ڕازی

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٦٩ / بە ژمارە: ٩٧٤.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٦٩ / بە ژمارە: ٩٧٤.

بێت)، که پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی برد بۆلای گۆڕستانەکەو، فەرمووی: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِيْنَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاحِقُوْنَ».[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەلای گۆڕستانی شاری مەدینەی پیرۆزدا تێپەڕیو، ڕووی کردە گۆڕەکانو، فەرمووی: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْقُبُوْرِ، يَغْفِرُ اللهُ لَنَا وَلَكُمْ، أَنْتُمْ سَلَفُنَا، وَنَحْنُ بِالْأَثَرِ». واتە: "سڵاوتان لێبێت ئەی خەڵکی ئەم گۆڕستانە، خوا لە ئێمەو لە ئێوەش خۆشبێت، ئێوە پێشینانی ئێمەنو، ئێمەش بەشوێنتاندا دێین".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (بُرَيْدَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، هاوەڵانی فێردەکرد، ئەگەر چوون بۆ گۆڕستان، با بڵێن: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمؤْمِنِيْنَ (وَالْمُسْلِمِيْنَ)، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لَلاحِقُوْنَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ».[3] واتە: "سڵاوتان لێبێت ئەی باوەڕدارانو موسوڵمانانی ئەم گۆڕستانە، - ئەگەر خوا بیەوێت- ئێمەش بەشوێنتاندا دێین، داوای ئاسوودەیی لە خوا دەکەم بۆ ئێمەو بۆ ئێوەش".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٣٨ / ٣٢٣٧، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ١ / ٩٣ / بە ژمارە: ١٥٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٤٣٩ / بە ژمارە: ٤٣٠٦. سەیرە ئیمامی نەوەوی ئەم حەدیسەی لەم کتێبانەوە هێناوە، لەکاتێکدا کە لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە!!! بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٢١٨ / بە ژمارە: ٢٤٩.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ٣٦٩ / ١٠٥٣.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٧١ / بە ژمارە: ٩٧٥.

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)شدا هەر بەم جۆرە بۆ ڕیوایەت کراوە. ئیمامی (نَسَائِيّ)ش لەدوای (لَلاحِقُوْنَ)ەوە ئەمەشی بۆ زیاد کردوە: «أنْتُمْ لَنَا فَرَطٌ، وَنَحْنُ لَكُمْ تَبَعٌ».[1] واتە: "ئێوە پێشینانی ئێمەنو، ئێمەش شوێنکەوتووی ئێوەین".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی برد بۆ گۆڕستانی (بَقِيْع)و، لەوێ فەرمووی: «السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِيْنَ، أنْتُمْ لَنَا فَرَطٌ، وَإِنَّا بِكُمْ لاحِقُوْنَ. اللّهُمَّ، لا تَحْرِمْنَا أجْرَهُمْ، وَلا تُضِلَّنَا بَعْدَهُمْ».[2] واتە: "سڵاوتان لێبێت ئەی باوەڕدارانی ئەم گۆڕستانە، ئێوە پێشینەی ئێمەنو، ئێمەش بەشوێن ئێوەدا دێین. خوایە لە پاداشتی خەیری لەدەستدانی ئەم مردوانە بێبەشمان مەکەو، لەدوای ئەوانیش گومڕاو سەرلێشێواومان مەکە".

سونەتە بۆ ئەو کەسەی سەردانی گۆڕستان دەکات، قورئان زۆر بخوێنێتو، زیکریش زۆر بکاتو، دوعاش بۆ مردوەکانی گۆڕستانەکەو، سەرجەم مردوەکانی ترو، موسوڵمانانیش زۆر بکات.

هەروەها سونەتە سەردانی گۆڕستان زۆر بکرێتو، کەسی سەردانیکەریش لە خزمەت گۆڕی پیاوچاکانو خواناساندا زۆر بوەستێت.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ٩٤ / بە ژمارە: ٢٠٤٠، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٩٤ / بە ژمارە: ١٥٤٧.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٧٨ / بە ژمارە: ٥٩١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٥ / ٢٢.

## با ئەو کەسەی سەردانی گۆڕستان دەکات، نەهی بکات لەو کەسەی بە خەفەتەوە لای گۆڕێکدا دەگری‌و، فەرمانیشی پێ بکات، کە ئارام بگرێت‌و، نەهیشی لێ بکات، لە هەرکارو کردەوەیەکی تر، کە شەرع نەهی لێ کردوە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی، کە لەلای گۆڕێکدا دەگریا، جا پێی فەرمووی: «اتَّقِي اللهَ، وَاصْبِرِيْ».[1] واتە: "لە خوا بترسەو، ئارام بگرە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (بَشِيْر)ی کوڕی (مَعْبَد)ەوە –کە ناسراو بە (ابْنُ الْخَصَاصِيَة)– (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ڕێمان دەکرد (دروودی خوای لەسەر بێت)، کوتوپڕ پیاوێکمان بینی، لە نێوان گۆڕەکاندا ڕێی دەکردو، جووتێك نەعلیشی لەپێدا بوو، پێغەمبەری خواش بانگی کردو فەرمووی: «يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ، أَلْقِ سِبْتِيَّتَيْكَ». واتە: "ئەی کابرای نەعل لەپێ، نەعلەکەت داکەنە". ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.[2]

هەروەها تەواوی ئومەتی ئیسلامیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی، کە واجبە فەرمان بکرێت بە چاکەو، نەهیش بکرێت لە خراپەو، بەڵگەکانی ئەم مەسەلەش لە قورئان‌و سونەتی پێغەمبەردا مەشهورن. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٤٢٢ / بە ژمارە: ١١٩٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٣٧ / بە ژمارە: ٩٢٦.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٢٣٦ / ٣٢٣٠، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٤ / ٩٦ / بە ژمارە: ٢٠٤٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٩٩ / بە ژمارە: ١٥٦٨.

## باسی گریان و ترسان لەکاتی تێپەڕبوون بەلای گۆڕی ستەمکاران و، جێگای لەناوچوونیان و، دەربڕینی موحتاجی بۆ خوای گەورە و، هۆشداریدان لە بێئاگایی لەم شتانە

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْـنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خواو هاوەڵانی گەیشتنە ناوچەی (الْحِجْر) -کە جێگەی تیاچوونی هۆزی (ثَمُوْد)ە-، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە هاوەڵانی فەرموو: «لا تَدْخُلُوا عَلَى هَـؤُلاءِ الْمُعَـذَّبِيْنَ، إِلاَّ أَنْ تَكُوْنُوا بَاكِيْنَ، فَإِنْ لَمْ تَكُوْنُوا بَاكِيْنَ، فَلا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ، لا يُصِيْبُكُمْ مَا أَصَابَهُمْ».[1] واتە: "بە گریانەوە نەبێت مەچنە ناو ئەم سزادراوانەوە، خۆ ئەگەر گریانتان نەهات، ئەوا مەچنە ناویانەوە، با ئەوەی تووشی ئەوان بوو، تووشی ئێوەش نەبێت".

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ١٦٧ / بە ژمارە: ٤٢٣. هەروەها ئیمامی موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٤ / ٢٢٨٥ / بە ژمارە: ٢٩٨٠.

## ئەو زیکرو نزاو پاڕانەوانەی، کە لە ڕۆژو شەوی جومعەدا سونەتن

سونەتە لە ڕۆژو شەوی جومعەدا قورئان زۆر بخوێنرێت‌و، زیکرو دوعاش زۆر بکرێن‌و، صەلاواتیش لەسەر پێغەمبەری خوا زۆر بدرێت (دروودی خوای لەسەر بێت)و، سورەتی (الْكَهْف)یش لە ڕۆژەکەیدا بخوێنرێت. ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (الْأُمّ)دا فەرموویەتی: "بەلای منەوە خوێندنی سورەتی (الْكَهْف) لە شەوی جومعەشدا سونەتە".[1]

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، باسی ڕۆژی جومعەی دەکردو، دەیفەرموو: «فِيْهِ سَاعَةٌ، لا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّيْ، يَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى شَيْئاً، إِلاّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ». واتە: "ڕۆژی جومعە ساتێکی تێدایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان لەو ساتەدا کە چاوەڕێی نوێژ دەکات، داوای هەر شتێك لە خوای گەورە بکات، مسۆگەر خوای گەورە ئەو شتەی دەداتی". جا پێغەمبەری خوا بە دەستی پیرۆزی ئاماژەی بە کەمی ساتەکە کرد.[2]

منیش دەڵێم: زانایانی (سَلَف)و (خَلَف) چەندین بۆچوونی جیاوازو زۆر پەرت‌و بڵاویان هەیە سەبارەت بەو کاتە، منیش تەواوی بۆچوونەکانیانم لە شەرحی (الْمُهَذَّب)دا کۆکردۆتەوەو، خاوەنەکانیشیانم دیاری کردووەو، زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەریش لەسەر ئەوەن، کە لەدوای نوێژی عەسرەوەیە.

مەبەستیش بە (قَائِمٌ يُصَلِّيْ) ئەو کەسەیە، کە چاوەڕێی نوێژ دەکات، کە وەکو ئەوە وەهایە خەریکی نوێژ کردن بێت.

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٤٣٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣١٦ / بە ژمارە: ٨٩٣، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٨٣ / بە ژمارە: ٨٥٢.

صەحیحترین حەدیسیش کە لەبارەی ئەو کاتەوە هاتوە، ئەو حەدیسەیە، کە لە صەحیحی موسلیمدا بۆمان ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أشْعَرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «هِيَ مَا بَيْنَ أنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ إِلَى أنْ يَقْضِيَ الصَّلاةَ». واتە: "ئەو کاتە بریتیە لە ماوەی نێوان دانیشتنی ئیمام لەسەر مینبەر، هەتا ئەو کاتەی نوێژەکە تەواو دەکات".[(١)]

سەبارەت بە خوێندنی سورەتی (الْكَهْف)و، صەلاواتدانیش لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەوە چەند حەدیسێکی مەشهوریان لەبارەوە هاتوە، منیش لەبەرئەوەی کتێبەکە درێژنەبێتەوە نایانهێنم. هەروەها حەدیسەکانیش مەشهورن‌و، هەندێکیشیانم لە باسی صەلاواتداندا هێناوە.[(٢)]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَنْ قَالَ صَبِيْحَةَ يَوْمِ الْجُمُعَةِ قَبْلَ صَلاةِ الْغَدَاةِ: "أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّوْمَ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ" ثَلاثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللهُ لَهُ

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٥٨٤ / بە ژمارە: ٨٥٣. پێشتر لە باسی (ئەوەی لە بەیانی ڕۆژی جومعەدا دەوترێت) تێبینیمان لەسەر دیاری کردنی ئەم کاتە نوسی.

(٢) یەکێك لەو حەدیسانەی لەبارەی سورەتی (الْكَهْف)ـەوە هاتوە، ئەو حەدیسەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـە، کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ». واتە: "ئەو کەسەی لە ڕۆژی جومعەدا سورەتی (الْكَهْف) بخوێنێت، خوای گەورە نێوان هەردوو جومعەکەی بۆ ڕووناك دەکاتەوە". ئیمامی (حَاكِم)و (بَيْهَقِيّ) ڕیوایەتیان کردوەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ٣٩٩ / بە ژمارە: ٣٣٩٢، وسُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٣ /٢٤٩ / بە ژمارە: ٥٧٩٢، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٣٨ – ٣٩.

ذُنُوبَهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».[1] واتە: "ئەو کەسەی بەرەبەیانی ڕۆژی جومعە بەر لە نوێژی بەیانی سێ جار بڵێت: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِيْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّوْمُ، وَأَتُوْبُ إِلَيْهِ)، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت، ئەگەرچی لە زۆریدا وەکو کەفی دەریا وابن".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە ڕۆژی جومعەدا تەشریفی ببردایەتە ناو مزگەوتەوە، دەستی دەگرت بە ئەمبەرو ئەوبەری دەرگاکەوەو، پاشان دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اجْعَلْنِيْ أَوْجَهَ مَنْ تَوَجَّهَ إِلَيْكَ، وَأَقْرَبَ مَنْ تَقَرَّبَ إِلَيْكَ، وَأَفْضَلَ مَنْ سَأَلَكَ، وَرَغِبَ إِلَيْكَ».[2] واتە: "خوایە، بمکە بە ڕاسترەوترینی ئەو کەسانەی ڕوویان لەتۆ کردوەو، بشمکە بە نزیکترینی ئەو کەسانەی لەتۆ نزیکبوونەتەوەو، بشمکە بە باشترینی ئەو کەسانەی داوایان لەتۆ کردوەو، لێت پاڕاونەتەوەو، ئارەزووی خزمەتی تۆیان کردوە".

منیش دەڵێم: سونەتە بۆ ئێمەش، کە بڵێین: (اجْعَلْنِيْ مِنْ أَوْجَهِ مَنْ تَوَجَّهَ إِلَيْكَ، وَمِنْ أَقْرَبِ مَنْ تَقَرَّبَ إِلَيْكَ، وَمِنْ أَفْضَلَ مَنْ سَأَلَكَ، وَرَغِبَ إِلَيْكَ). واتە: وشەی (مِنْ) زیاد بکەین. {ئەو کاتە مانای حەدیسەکە بەم جۆرە دەکرێت: خوایە، بمکە بە یەکێك لەو کەسە ڕاسترەوانەی، کە ڕوویان لەتۆ کردوەو، بشمکە بە یەکێك لە نزیکترینی ئەو کەسانەی، کە لەتۆ نزیکبوونەتەوەو، بشمکە بە یەکێك لە باشترینی ئەو کەسانەی، کە داوایان لەتۆ کردوەو، لێت پاڕاونەتەوەو، ئارەزووی خزمەتی تۆیان کردوە}. (چونکە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا داوای کردوە تەنها بۆ خۆی دەست دەداتو، بۆ ئێمە دەست نادات)

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٤٢ / بە ژمارە: ٨٣. ڕشتەکەی لاوازە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨١ / بە ژمارە: ٣٧٤. حەدیسێکی لاوازە، چونکە ڕشتەکەی دوو کەسی نەناسراوی تێدایە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٦٠.

سەبارەت بەو سورەتانەی قورئانی پیرۆزیش، کە لە نوێژی جومعەو، لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا دەخوێنرێن، ئەوە لە باسی زیکرەکانی نوێژدا باسمان کردن.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ئەو کەسەی لەدوای نوێژی جومعە، حەوت جار ئەم سێ سوورەتە بخوێنێت: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ لەگەڵ ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾، خوای گەورە بەهۆیانەوە لە ناڕەحەتیو زەحمەت دەیپارێزێت، تا دەگاتە جومعەیەکی تر.[1]

## باسێك: {زیکر زۆر کردن لەدوای نوێژی جومعەوە}

**سونەتە لەدوای نوێژی جومعەوە زیکری خوای گەورە زۆر بکرێت.**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللهِ وَاذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾. [الْجُمُعَة: ١٠]. واتە: {جا ئەگەر نوێژەکە کۆتایی پێ هێنرا، ئیتر بڕۆنو بە زەویدا بڵاوەی لێ بکەنو، بەشوێن ڕزقو ڕۆزیو فەزڵو لوتفی خوادا بگەڕێنو، زیکرو یادی خواش زۆر بکەن، بەهیوای ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن}.

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٨١ - ١٨٢ / بە ژمارە: ٣٧٥. ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٦١.

## ئەو زیکرانەی دەربارەی دوو جەژنەکە هاتوون

بزانە، کە سونەتە هەردوو شەوی جەژنی ڕەمەزانو جەژنی قوربـان بـە زیکـری خواو، بە صەلاواتدانو، بە عیبادەتی تر زیندوو بکرێنەوە، لەبەر ئەو حەدیسەی، کە لەوبارەوە هاتوە: «مَنْ أَحْيَا لَيْلَتَي الْعِيْدِ، لَمْ يَمُتْ قَلْبُهُ يَوْمَ تَمُوْتُ الْقُلُوْبُ». هـەروەها ڕیوایەت کراوە: «مَنْ قَامَ لَيْلَتَي الْعِيْدَيْنِ لِلّهِ مُحْتَسِباً، لَمْ يَمُتْ قَلْبُـهُ حِـيْنَ تَمُـوْتُ الْقُلُوْبُ». واتـە: "ئـەو کەسـەی تـەنها لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوا هـەردوو شـەوی جەژنەکان بە بەندایەتی زیندوو بکاتەوە، ئـەو کاتـەی دڵـەکان دەمـرن، دڵـی ئـەو نامرێت".

جا حەدیسەکە بەم جۆرە لـە ڕێگەی ئیمامی (شَافِعِيّ)و (ابْنُ مَاجَـه)وە ڕیوایـەت کراوەو، حەدیسێکی لاوازیشە.[١]

هەروەها ئەم حەدیسەمان وەکو فەرمایشتی (أَبُـو أُمَامَـة)و، وەکـو فەرمایشـتی پێغەمبەری خواش بۆ ڕیوایەت کراوەو، هەردوو ڕیوایەتەکەش لاوازن. بـەڵام وەکـو لـە سەرەتای ئەم کتێبـەوە باسمـان کـرد، ئـەو حەدیسـانەی سـەبارەت بـە کـردەوە چاکەکان هاتون، جۆرە چاوپۆشیەکیان تێدا دەکرێت.

ئەوجا زانایان بۆچوونی جیاوازیـان هەیـە سـەبارەت بـەو ئەنـدازە کاتـەی، کـە عیبادەت تێداکردنی بە زیندوو کردنـەوەی شـەوەکە دادەنرێـت: بۆچـوونی بـەهێز لەسەر ئەوەیە، کە زیندوو کردنەوە نایەتەجێ مەگەر بە زۆربـەی شـەوەکە نـەبێت. وتراویشە بە کاتێکی کەمیش هەر دێتەجێ.

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٤٨٥، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٥٦٧ / بە ژمارە: ١٧٨٢.

## باسێك: {(اللهُ أكبَر) كردن له هەردوو شەوی جەژنەكاندا سونەتە}

سونەتە لە هەردوو شەوی جەژنەكاندا (اللهُ أكْبَرُ) بكرێت.

كردنی (اللهُ أكْبَر)یش لە جەژنی ڕەمەزاندا لە ئاوابوونی خۆرەوە دەست پێدەكات، تا ئەو كاتەی، پێشنوێژ دەست بە نوێژی جەژن دەكات.

جا كردنی (اللهُ أكْبَر) لەدوای نوێژەكانو لە هەموو حاڵەتێكی تریشدا هەر سونەتەو، سونەتیشە لەكاتی قەرەباڵغیو كۆبوونەوەی خەڵكیدا زۆر بكرێتو، لەكاتی ڕێ كردنو، دانیشتنو، ڕاكشانیشدا هەر بكرێتو، لە ڕێگەو، لە مزگەوتو، لەسەر جێگەی خەوتنیشیدا هەر بكرێت.

سەبارەت بە جەژنی قوربانیش، لەدوای نوێژی بەیانی ڕۆژی (عَرَفَـة)وە (اللهُ أكْبَر) بكات، تا لە دوایین ڕۆژی (أيَّامُ التَّشْرِيْق)دا نوێژی عەسر دەكات.

ئەوجا لەدوای ئەم نوێژی عەسرەشەوە با هەر (اللهُ أكْبَر) بكاتو، ئیتر وازی لێ بهێنێتو نەیكات.

ئەمە ڕاسترین بۆچوونە، كە ئێمە كاری پێ دەكەینو، ناكۆكیەكی مەشهوریشی تێدایە لە مەزهەبی ئێمەو مەزهەبی زانایانی تریشدا. بەڵام بۆچوونی درووست ئەوەیە، كە باسم كردو، چەند حەدیسێكیشی لەبارەوە هاتوە، كە لە (سُـنَن)ی (بَیْهَقِيّ)دا بۆمان ڕیوایەت كراون.[1]

منیش تەواوی ئەم مەسەلەیەم لە شەرحی (الْمُهَذَّب)دا ڕوون كردۆتەوە، چی لەڕووی ئەو حەدیسانەی، كە لەسەری هاتونو، چی لەڕووی نقڵی مەزهەبەكانیش لەسەریو، باسی هەموو ئەو لقەباسانەشم كردوە، كە پەیوەندیان پێیەوە هەیەو، لێرەش بە كورتی ئاماژە بە مەبەستە سەرەكیو گرنگەكانیان دەدەم.

---

(١) بروانە: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٣ /٢٧٨ – ٢٧٩ / بە ژمارەكانی: ٥٩٢٣ – ٥٩٢٨.

**هاوەڵانمان فەرموویانە: (اللهُ أَكْبَر) کردن ئەوەیە، کە سێ جار بەشوێن یەکدا بڵێت: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ)، ئیتر چەندی بوێت دووبارەی بکاتەوە.**

**ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵانیش فەرموویانە: خۆ ئەگەر ئەمەشی بۆ زیاد بکاتو، بڵێت: (اللهُ أَكْبَرُ كَبِيْراً، وَالْحَمْدُ لِلّهِ كَثِيْراً، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيْلاً، لا إِلهَ إِلاّ اللهُ، وَلا نَعْبُدُ إِلاّ إِيَّاهُ، مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّيْنَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُوْنَ، لا إِلهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، لا إِلهَ إِلاّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، ئەوە کارێکی باشە.**

**کۆمەڵێکیش لە هاوەڵانمان فەرموویانە: قەیناکە ئەگەر ئەوەش بڵێت، کە خەڵکی عادەتیان پێوە گرتوە، ئەویش بریتیە لە: (اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لا إِلهَ إِلاّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، وَلِلّهِ الْحَمْدُ).**

## باسێك: {ئەو کاتانەی (اللهُ أَكْبَر) یان تێدا دەکرێت}

**بزانە، کە لەدوای هەموو نوێژەکانی ئەو ڕۆژانەوە (اللهُ أَكْبَر) کردن سونەتە، ئیتر نوێژی فەرز بن، یان سونەت، یان نوێژی مردوو. هەروەها نوێژە فەرزەکە لە کاتی خۆیدا بکرێت، یان قەزا بکرێتەوە، یان نەزرکراو بێت.**

**جا هەندێك لەمانە بۆچوونی جیاوازیان لەبارەوە هاتوە، کە ئێرە جێگەی ئەوە نیە بەدرێژی باسی بکەین. بەڵام بۆچوونە درووستەکەیان ئەوەیە کە من باسم کردو، فەتواش هەر لەسەر ئەوەو، کاریشی هەر بە ئەو دەکرێت.**

**ئەوجا ئەگەر پێش نوێژ (اللهُ أَكْبَر)ی کرد، بەجۆرێك کە پێچەوانەی بیروباوەڕی شوێنکەوتوەکەی بوو، وەکو ئەوەی، کە پێشنوێژەکە باوەڕی وابێت، کە (اللهُ أَكْبَر) لە ڕۆژی (عَرَفَة)، یان لە ڕۆژەکانی (أَيَّامُ التَّشْرِيْق)دا سونەتەو، شوێنکەوتوەکەش**

باوەڕی وا نەبێت، یان بە پێچەوانەوە، ئایا شوێنکەوتوەکە شوێنی پێشنوێژەکە بکەوێت، یان بەو جۆرە بکات، کە خۆی باوەڕی پێیەتی؟

هاوەڵانمان دوو بۆچوونیان لەم مەسەلەیەدا هەیە: درووستترینیان ئەوەیە، کە با بەپێی بیروباوەڕی خۆی بکات. چونکە بە سڵاودانەوە لە نوێژەکە، ئیتر شوێنکەوتنەکە دەبچڕێت. ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەی، کە پێشنوێژەکە لە ناو نوێژی جەژندا زیاتر لەوە (اللّٰهُ أكْبَر) بكات، کە شوێنکەوتوەکە باوەڕی پێیەتی، کە لەم حاڵەتەدا لەبەر ئەوەی نوێژەکە جەماعەتە، دەبێت شوێنی پێشنوێژەکە بکەوێت.

## باسێك: {(اللّٰهُ أكْبَر) كردن لە نوێژی جەژندا}

سونەتە لە نوێژی جەژندا چەند (اللّٰهُ أكْبَر)ێکی زیادە بکات، بەر لە دەست کردن بە خوێندنی سوورەتی (الْفَاتِحَةَ):

جا با لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت (اللّٰهُ أكْبَر) بکات، بێجگە لە (اللّٰهُ أكْبَر)ی دابەستنی نوێژەکە. لە ڕکاتی دومیشدا پێنج (اللّٰهُ أكْبَر) بکات، بێجگە لە (اللّٰهُ أكْبَر)ی هەستانەوە لە سەجدە.

ئەوجا با (اللّٰهُ أكْبَر)ەکان لە ڕکاتی یەکەمدا لەدوای دوعای دەست پێکردنی نوێژو، لەپێش (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)ـەوە بکرێن‌و، لە ڕکاتی دوەمیشدا لەپێش (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)ـەوە بکرێن.

سونەتیشە لە نێوان هەموو دوو (اللّٰهُ أكْبَر)ێکدا بڵێت: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ). جا زۆربەی هاوەڵانمان بەم جۆرەیان فەرمووە. هەندێکیشیان فەرموویانە: با بڵێت: (لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ).

زانای پایەبەرز (أَبو نَصْرٍ بْنُ الصَّبَّاغ)و، هەندێکی تر لە هاوەڵانمان فەرموویانە: خۆ ئەگەر ئەوەش بڵێت، کە خەڵکی عادەتیان پێوە گرتوە، هەر باشە. ئەویش بریتیە لە: (اللهُ أَكْبَرُ كَبِيْراً، وَالْحَمْدُ لِلّهِ كَثِيْراً، وَسُبْحانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيْلاً).

جا هەریەکە لەمانە دەکرێت بوترێن‌و، ڕێگرێکیش نیە لە هیچکامیان.

خۆ ئەگەر هیچکام لەم زیکرانەی نەکردو، وازی لە حەوت (اللهُ أَكْبَر)و، پێنج (اللهُ أَكْبَر)ەکانیش هێنا، ئەوا نوێژەکەی هەر درووستەو، سەجدەی سەهویش نابات. بەڵام کارێکی باش‌و گەورەی لەدەست داوە.

هەروەها ئەگەر (اللهُ أَكْبَر)ەکانی لەبیر چوو، تا دەستی کرد بە قورئان خوێندن، ئەوا بەپێی بۆچوونی درووست، نابێت بگەڕێتەوە بۆ (اللهُ أَكْبَر)ەکان. ئیمامی (شَافِعِيّ)ش بۆچوونێکی لاوازی هەیە، کە دەفەرموێت: دەکرێت بگەڕێتەوە بۆیان.

سەبارەت بە دوو وتارەکەی نوێژی جەژنیش، سونەتە لە دەستپێکی ئەوەی یەکەمیاندا نۆ (اللهُ أَكْبَر) بکات‌و، لەوەی دوەمیشیاندا حەوت (اللهُ أَكْبَر).

سەبارەت بە قورئان خوێندنیش لە نوێژی جەژندا، ئەوە پێشتر لە باسی صیفەتی زیکرەکانی نوێژدا باسمان کرد، کە سونەتە چی سورەتێکیان تێدا بخوێنێت، ئەویش ئەوە بوو، کە لە ڕکاتی یەکەمدا، لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتی (ق) بخوێنێت‌و، لە ڕکاتی دوەمیشدا (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ) بخوێنێت. خۆ ئەگەر بیەوێت، دەتوانێت لە ڕکاتی یەکەمدا (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى)و، لە ڕکاتی دوەمیشدا (هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ) بخوێنێت.

# زیكرەكانی دە ڕۆژی یەكەمی مانگی (ذُوْ الحِجَّة)

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللهِ فِيْ أَيَّامٍ مَعْلُوْمَاتٍ﴾ [الحَـجّ: ٢٨]. واتە: {ناوی خـوا بهێنـنو زیكـرو یـادی بكـەن لـە چـەند ڕۆژێكـی دیـاریكراوی زانراودا}.

هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّـاس)و ئیمـامی (شَـافِعِيّ)و زۆربـەی زانایـانیش فەرموویانە: ئەو ڕۆژانە بریتین لـە: دە ڕۆژەكەی یەكەمی مانگی (ذُوْ الْحِجَّة).

بزانە، كە سونەتە لەم دە ڕۆژەدا زیاتر لە ڕۆژەكانی تر زیكری خـوا بكرێـتو، سونەتیشە لـە ڕۆژی (عَرَفَة)دا زیاتر لـەوانی تر زیكر بكرێت.

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لـە صەحیحی بوخاریدا، لـە هاوەڵی خۆشەویست (ابْـنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت)، ئەویش لـە پێغەمبـەری خـواوە (دروودی خـوای لەسەر بێت)، كـە فەرموویـەتی: «مَا الْعَمَلُ فِيْ أَيَّامٍ أَفْضَلَ مِنْهَا فِيْ هَذِهِ». واتـە: "هـیچ كردەوەیەكی باش لە ڕۆژانی سـاڵدا لـە كـردەوەی ئـەم چـەند ڕۆژە باشـتر نیـە". هاوەڵان عەرزیان كرد: ئەی جیهاد كردن لە ڕێگـەی خـوادا؟ ئـەویش فـەرمووی: «وَلا الْجِهادُ، إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِـعْ بِشَـيْءٍ».[١] واتـە: "نەخێر، جیهاد كردنیش باشتر نیە، مەگەر پیاوێك بـڕوات بـە گیـانو مـاڵی خـۆی جیهاد بكاتو سەرو ماڵی بخاتە مەترسیەوەو، دواتریش هیچـكامیان لەگـەڵ خۆیـدا نەهێنێتەوە".

ئەمە دەقی ڕیوایەتەكەی ئیمامی بوخاریەو، حەدیسەكەش (صَحِيْح)ـە.

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٢٩ / بە ژمارە: ٩٢٦.

لە ڕیوایەتی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)یشدا بەم جۆرە هاتوە: «مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيْهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللهِ تَعَالَى مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ الْعَشْرِ».[1] واتە: "هیچ ڕۆژێك نیە کردەوەی چاك تێیدا خۆشەویستتر بێت لای خوای گەورە، لەم دە ڕۆژە".

لە ڕیوایەتی ئیمامی (أَبو دَاوُد)یشدا هەر بەو جۆرەیە، بەڵام پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ». کە مەبەستی دە ڕۆژەکەیە.[2]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ەکەی ئیمامی (دَارِمِيّ)دا –بە ڕشتەیەك، کە لە هەردوو صەحیحەکەی بوخاریو موسلیمدا حەدیسی لێوە ڕیوایەت کراوە– پێغەمبەری خوا لەوێدا فەرموویەتی: «مَا الْعَمَلُ فِيْ أَيَّامٍ أَفْضَلَ مِنَ الْعَمَلِ فِيْ عَشْرِ ذِيْ الْحِجَّةِ». عەرزی کرا: جیهادیش؟..... ئیتر تەواوی حەدیسەکەی باس کرد.

لە ڕیوایەتێکیشدا بەم جۆرە هاتوە: «عَشْرِ الْأَضْحَى». واتە: دە ڕۆژەکەی سەرەتای مانگی جەژنی قوربان.[3]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە زانای پایەبەرز (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَيْب)ەوە، ئەویش لە باوکی خۆیەوە، باوکیشی لە باپیرەی خۆیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «خَيْرُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّوْنَ مِنْ قَبْلِيْ: "لا إِلَـهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ"».[4] واتە: "باشترین نزاو پاڕانەوە بریتیە لە نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی (عَرَفَة)، باشترین فەرمایشتیش، کە منو پێغەمبەرەکانی پێش من کردوومانە، بریتیە لە: (لا إِلَـهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ)".

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٣ / ١٣٠ / بە ژمارە: ٧٥٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٧٤١ / بە ژمارە: ٢٤٣٨.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٤١ / بە هەردوو ژمارە: ١٧٧٣ و ١٧٧٤.

(٤) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٧٢ / بە ژمارە: ٣٥٨٥.

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) ڕشتەکەی بە لاواز داناوە.[١]

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە (مُوَطَّأ)ی ئیمامی (مَالِك)یشدا بۆ ڕیوایەت کراوە، بە ڕشتەیەکی (مُرْسَل)و، بە نوقسانی بەشێکیش لە دەقەکەی. کە دەقەکەی لای ئەو بەم جۆرەیە: «أَفْضَلُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَأَفْضَلُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّوْنَ مِنْ قَبْلِي: "لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ"».[٢]

پێمان گەییوە لە زانای پایەبەرز (سَالِم)ی کوڕی (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی ئیمامی (عُمَر)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، کە سوالکەرێکی بینوە لە ڕۆژی (عَرَفَة)دا داوای لە خەڵکی دەکرد، ئەویش پێی فەرموو: (هەی تەمەڵی نەتوانکار، ئایا لەم ڕۆژەدا داوا لە غەیری خوای گەورە دەکرێت؟!).

ئیمامی بوخاریش لە صەحیحەکەیدا فەرموویەتی: ئیمامی (عُمَر) (خوای لێ ڕازی بێت)، لە (مِنَى) لە خێمەکەی خۆیدا (اللهُ أَكْبَر)ی دەکردو، خەڵکی مزگەوتیش گوێیان لە دەنگی دەبوو، ئەوانیش (اللهُ أَكْبَر)یان دەکردو، خەڵکی بازاریش (اللهُ أَكْبَر)یان دەکرد، تا هەموو (مِنَى) دەلەرزیو دەنگی دەدایەوە لە (اللهُ أَكْبَر) کردندا.[٣]

هەروەها ئیمامی بوخاری فەرموویەتی: هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)و (أَبُوْ هُرَيْرَة) لە دە ڕۆژەکەی سەرەتا مانگی (ذُوْ الْحِجَّة)دا دەردەچوون بۆ بازارو، (اللهُ أَكْبَر)یان دەکردو، خەڵکیش لەگەڵ ئەواندا (اللهُ أَكْبَر)یان دەکرد.[٤]

---

(١) چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە بەناوی (حَمَّاد)ی کوڕی (أَبِي حُمَيْد)ەوە، کە زۆربەی فەرموودەناسان بە لاوازیان داناوە. بەڵام شێخ (عَبْدُالْقَادِر)ی (أَرْنَـؤُوْط) لە تەحقیقەکەی خۆیدا بە حەدیسێکی (حَسَن)ی داناوە. چونکە حەدیسەکەی دواتر پاڵپشتی دەکات.

(٢) بڕوانە: مُوَطَّأُ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ١ / ٢١٤ / بە ژمارە: ٥٠٠.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٢٩. حەدیسێکی (مُعَلَّق)ـە.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٢٩. حەدیسێکی (مُعَلَّق)ـە.

## ئەو زیکرانەی دەربارەی خۆر گیران و مانگ گیران هاتوون

بزانە، کە لە کاتی خۆر گیران‌و مانگ گیراندا سونەتە زیکری خوا زۆر بکرێت‌و، نزاو پاڕانەوەش زۆر بکرێت.

هەروەها زانایان کۆدەنگیشن لەسەر ئەوەی، کە سونەتە نوێژ بکرێت بۆ خۆر گیران‌و مانگ گیران.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لە (عَائِشَةَ)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لا يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ، فَادْعُوا اللهَ، وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا، وَتَصَدَّقُوا». [1] واتە: "بەڕاستی خۆرو مانگ دوو نیشانەو بەڵگەن لە نیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوای گەورەو، بۆ مردن‌و ژیانی هیچ کەسێکیش ناگیرێن. جا ئەگەر بینیتان وا گیران، ئەوا لە خوا بپاڕێنەوەو، (اللهُ أَكْبَر) بکەن‌و، نوێژی خۆر گیران‌و مانگ گیران بکەن‌و، خەیرو خەیرات بکەن بە هەژاران‌و نەداران".

هەروەها لە هەندێك لە ڕیوایەتەکانی هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتوە: «فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ، فَاذْكُرُوا اللهَ تَعَالَى». [2]

بە هەمان شێوە ئەم حەدیسەمان لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)یشەوە بۆ ڕیوایەت کراوە.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٥٤ / بە ژمارە: ٩٩٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦١٨ / بە ژمارە: ٩٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٥٧ / بە ژمارە: ١٠٠٤، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٢٦ / بە ژمارە: ٩٠٧.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە ڕێگـەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُوْ مُوْسَى)ی (أَشْعَرِيّ)ـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت)، ئـەویش لـە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَـيْئاً، فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ».[1] واتە: "ئەگەر ئەوەتان بینی، بە ترسەوە پەنا بەن بۆلای زیکری خـواو نـزاو پاڕانـەوەو داوای لێخۆشـبوون کـردن لـە خـوای گەورە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا، لـە ڕێگـەی هاوەڵی خۆشەویست (مُغِيْرَة)ی کوڕی (شُعْبَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کـە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «فَإِذَا رَأَيْتُمُوْهَا، فَادْعُوا اللهَ، وَصَلُّوا».[2]

هەروەها ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەی لە ڕێگەی هاوەڵی خۆشەویست (أَبُـوْ بَكْرَة)وە ڕیوایەت کردوە (خوای لێ ڕازی بێت). خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆشـان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی موسـلیمدا، لـە ڕێگـەی هـاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالرَّحْمَن)ی کوڕی (سَمُرَة)وە، کە فەرموویەتی: هاتم بـۆ خزمـەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت)و، لـەو کاتەشـدا خـۆر گیرابـوو، ئـەویش ڕاوەستابوو نوێژی دەکردو، هەردوو دەستیشی بەرز کردبووەوەو، دەسـتی کـرد بـە (سُبْحَانَ اللهِ)و، (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)و، (اللهُ أَكْبَر)و، (الْحَمْدُ لِلّهِ)و، دوعـا کـردن، هـەتا خۆر دەرکەوتەوە، جا کە دەرکەوتەوە، پێغەمبەری خوا دوو سورەتی خوێنـدو، دوو ڕکات نوێژی کرد.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٦٠ / بە ژمارە: ١٠١٠، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٦٢٨ / بە ژمارە: ٩١٢.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٦٠ / بە ژمارە: ١٠١١، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٦٣٠ / بە ژمارە: ٩١٥.

(٣) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٢٩ / بە ژمارە: ٩١٣.

## باسێك: {درێژ كردنەوەو زۆر خوێندنی قورئان لە نوێژی خۆر گیراندا}

سونەتە لە نوێژی خۆر گیرانو مانگ گیراندا قورئان زۆر بخوێنرێت: جا با لە ڕاوەستانی یەكەمدا بە ئەندازەی سورەتی (الْبَقَــرَة) بخوێنرێتو، لە ڕاوەستانی دوەمیشدا نزیكەی دووسەد (٢٠٠) ئایەت بخوێنرێتو، لە سێیەمیشدا نزیكەی سەدوپەنجا (١٥٠) ئایەتو، لە چوارەمیشدا نزیكەی سەد (١٠٠) ئایەت.

لە ڕكوعی یەكەمیشدا بە ئەندازەی سەد (١٠٠) ئایەت تەسبیحات بكرێتو، لە دوەمیشدا بە ئەندازەی حەفتا (٧٠) ئایەتو، لە سێیەمیشدا بە هەمان ئەندازەو، لە چوارەمیشدا بە ئەندازەی پەنجا (٥٠) ئایەت.

هەروەها سەجدەكانیش وەكو ركوعەكان درێژ بكرێنەوە. سەجدەی یەكەم وەكو ڕكوعی یەكەمو، سەجدەی دوەمیش وەكو ڕكوعی دوەم.

جا ئەم بۆچوونە بۆچوونێكی درووستەو، زانایانیش ناكۆكیەكی بەرچاویان هەیە لەم بابەتەدا.

هەروەها تۆ هیچ گومانت لەوەدا نەبێت كە باسم كردو، وتم: سونەتە سەجدەكانیش درێژ بكرێنەوە. بەهۆی ئەوەی كە لە زۆربەی كتێبەكانی هاوەڵانماندا وا مەشهورە، كە سەجدەكان درێژ ناكرێنەوە. چونكە ئەوە بۆچوونێكی هەڵەیە، یان لاوازە. بەڵكو ڕاستەكەی ئەوەیە، كە سونەتە سەجدەكانیش درێژ بكرێنەوە. چونكە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا لە چەندین ڕێگەوە لە پێغەمبەری خواوە هاتوە، كە سەجدەكانی درێژ كردۆتەوە.[1]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَـارِيِّ / ١ / ٢٦٠ / بە ژمارە: ٧١٢، وە / ١ / ٣٥٤ / بە ژمارە: ٩٩٧، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦٢٣ / بە ژمارە: ٩٠٤.

منیش ئەم بابەتەم بە بەڵگەکانیەوە لە شەرحی (الْمُهَذَّب)دا بەڕوونی هێناوەو، لێرەشدا ئاماژەم بەوە داوە کە لەوێ باسم کردوە، تاوەکو بە پێچەوانەکەی هەڵنەخەڵەتێیت‌و، ئیمامی (شَافِعِيّ)ش لە چەند جێگەیەکدا ئەوەی فەرموە، کە سونەتە سەجدەکان درێژ بکرێنەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە درێژ ناکرێتەوە، بەڵکو لە نوێژەکانی تردا چۆنە، لەمیشدا هەر بەو جۆرەیە.

بەلام ئەم فەرمایشتەی ئەوان جێگەی سەرنجە. چونکە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتوە کە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە درێژ دەکرێتەوە.[1] منیش ئەم بابەتەم لە شەرحی (الْمُهَذَّب)دا بەڕوونی باسکردوە. بۆیە بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە، کە سونەتە ئەمیش درێژ بکرێتەوە.

بەلام سونەت نیە هەستانەوە لە ڕکوعی دوەم‌و، تەحیات‌و دانیشتنەکەی درێژ بکرێتەوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

جا ئەگەر کەسی نوێژخوێن هەموو ئەم درێژ کردنەوانەی واز لێهێناو، تەنها سورەتی (الْفَاتِحَة)ی تێدا خوێند، ئەوە نوێژەکەی هەر درووستە.

(١) بڕوانە: مُسْنَدُ الْإِمَامِ أحْمَدَ بْنِ حَنْبَل / ١١ / ٢١ / بە ژمارە: ٦٤٨٣، وصَحِيْحُ ابْنِ خُزَيْمَة / ٢ / ٣٢١ / بە ژمارە: ١٣٨٩، وسُنَنُ أبِـي دَاوُد / ١ / ٣٨٢ / بە ژمارە: ١١٩٤، والشَّمَائِلُ الْمُحَمَّدِيَّة / ٢٦٤ / بە ژمارە: ٣٢٥، وسُنَنُ النَّسَائِيّ / ٣ / ١٣٧ / بە ژمارە: ١٤٨٢.

سونەتیشە کەسی نوێژخوێن لە هەموو هەستانەوەیەك لە ڕکوع، بڵێت: (سَـــمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا، وَلَكَ الْحَمْدُ). چونکە لە حەدیسی (صَحِیْح)دا ئـەو زیکرەمـان بۆ ڕیوایەت کراوە.[1]

سونەتیشە لە مانگ گیرانـدا قورئـان بـە دەنگـی بـەرز بخوێنرێـتو، لـە خـۆر گیرانیشدا بە دەنگی نزم.

ئەوجا لەدوای نوێژەکە بـا دوو وتـار بخوێنرێـتو، لـە هەردووکیانـدا داوا لـە خەڵك بکرێت، کە لە خوا بترسنو، هانبدرێن لەسـەر گوێڕایـەڵی کردنـی خـوای گەورەو، لەسەر کردنی خەیرو صەدەقەو، ئازاد کردنی کۆیلە. چونکە ئەمانـە لـە چەند حەدیسێکی صەحیحی مەشهوردا سابت بوون.

هەروەها هانیشـیان بـدات لەسـەر شـوکرانە بژێریو سـوپاس گـوزاری نـازو نیعمەتەکانی خوای گەورەو، هۆشداریشیان بداتی لەسـەر بـێ ئاگـاییو، لـەخۆبایی بوون. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی بوخـاریو لـە غـەیری ئەویشـدا، لـە ژنەهاوەڵی خۆشەویست {(أَسْمَاء)ی کچی ئیمامی (أَبُو بَكْر)ەوە} (خوا لە هـەردووکیان ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، فەرمانی کرد بە ئازاد کردنی کۆیلە لە کاتی گیرانی خۆرو مانگدا.[2] خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٥٥ / بە ژمارە: ٩٩٩، وصَحِیْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦١٩ / بـە ژمارە: ٩٠١.

(٢) بڕوانە: صَحِیْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٥٩ / بە ژمـارە: ١٠٠٦، وصَحِیْحُ ابْــنِ خُزَیْمَــةَ / ٢ / ٣٢٩ / بە ژمارە: ١٤٠١، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِیْحَیْن / ١ / ٤٨٠ / بە ژمارە: ١٢٣٢.

## زیکرەکانی نوێژە بارانە

سـونەتە لـە نوێـژە بارانـەدا بـە ملکەچـیو کزۆڵـیـەوە دوعـاو زیکـرو داوای لێخۆشبوون زۆر بکرێت.

ئەو دوعایانەش کە سەبارەت بە نوێژە بارانە هاتون مەشهورو زانـراون. یـەکێك لەوانە بریتیە لە: (اللّهُمَّ، اسْقِنا غَيْثاً مُغِيثاً هَنِيئاً مَرِيئاً غَدَقاً مُجَلّلاً سَحّاً عَامّـاً طَبَقـاً دَائِماً. اللّهُمَّ، عَلى الظِّرَاب وَمَنَابتِ الشَّجَرِ وَبُطُونِ الْأوْدِيَةِ. اللّهُمَّ، إنَّا نَسْتَغْفِرُكَ، إنَّكَ كُنْتَ غفَّاراً، فَأَرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْنَا مِدْرَاراً. اللّهُمَّ، اسْقِنا الْغَيْـثَ، وَلا تَجْعَلْنَـا مِـنَ الْقَانطِيْنَ. اللّهُمَّ، أنْبتْ لَنَا الزَّرْعَ، وَأَدِرَّ لَنَا الضَّرْعَ، وَاسْقِنَا مِنْ بَرَكَاتِ السَّمَاءِ، وَأَنْبتْ لَنَا مِنْ بَرَكَاتِ الْأَرْضِ. اللّهُمَّ، ارْفَعْ عَنَّا الْجَهْدَ وَالْجُوْعَ وَالْعُرْيَ، وَاكْشِفْ عَنَّـا مِـنَ الْبَلاءِ مَا لا يَكْشِفُهُ غَيْرُك).

واتە: (خوایە بارانێکمان بۆ ببارێنە، بێت بە هانامانـەوەو، سـوكو نـەرم بێـتو، چاكو بـێ زیـان بێـتو، ئـاوو خـەیری زۆری پێـوە بێـتو، ولاتو خەڵکەکـەی بگرێتەوەو، بە خورِ لە ئاسمان بێتە خوارەوەو، لەسەر زەویش ڕێ بکاتو، گشـتگیر بێت بۆ هەموو ناوچەکانو، سـەر زەوی داپۆشـێتو، بـەردەوامیش بێـت. خوایـە بەسەر گردو تەپۆڵکەکانداو، بەسـەر جێگـەی ڕوانـی دارو درەختەکانـداو، بـەناو چەمو دۆڵەکاندا ببارێنە. خوایـە ئێمـە داوای لێخۆشـبوونت لێ دەکـەین، چـونکە جەنابت زۆر لێبوردەیت. دەی بارانی ئاسمانمان بەخور بۆ بنێـرە. خوایـە بارانمـان بـۆ بیارێنـەو، نائومێـدمان مەکـە. خوایـە ڕوەکـەکانمان بـۆ برویێنـەو، گـوانی ئـاژەڵو ولاخەکانمان بۆ پڕ بکە لە شیرو، لە فەڕی ئاسمانەکان بارانمان بۆ ببارێنەو، لە فـەڕی زەویش ڕوەکمان بۆ برویێنە. خوایە نارەحەتیو برسێتیو سـەرماو سـۆڵەمان لەسـەر لابەو، ئەو بەڵاو زەحمەتانەشمان لەسەر لابە، کە بێجگـە لـە تـۆ کەسـی تـر توانـای لابردنیانی نیە).

جا ئەگەر پیاوێکیشیان تێدابوو، کە ناوبانگی چاکەی هەبوو، سونەتە بیکەن بە تکاکار بۆ داوای باران بارینەکەیان. وەکو ئەوەی کە بڵێن: خوایە ئێمە داوای باران بارینت لێ دەکەین‌و، فلانە کەسیش دەکەین بە تکاکار لە خزمەتتدا.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی بوخاریدا، کە ئیمامی (عُمَـر)ی کوڕی (خَطَّاب) (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەگەر تووشی وشکەساڵی‌و بێ بارانی ببوونایە، داوای باران بارینی دەکرد بە خاتری (عَبَّاس)ی کوڕی (عَبْدُالْمُطَّلِب)و، دەیفەرموو: ("اللّهُمَّ، إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا، فَتَسْقِيْنَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا، فَاسْقِنَا" فَيُسْقَوْنَ). واتە: "خوایە ئێمە کاتی خۆی داوی باران بارینمان دەکردو، پێغەمبەرەکەتمان دەکرد بە وەسیلە، تۆش بارانت بۆ دەباراندین. ئێستەش داوای باران بارینت لێ دەکەین‌و، مامەی پێغەمبەرەکەت دەکەین بە وەسیلە. دەی بارانمان بۆ ببارێنە". خوایش بارانی بۆ دەباراندن.[1]

هەروەها لە هاوەڵی خۆشەویست (مُعَاوِيَة)و کەسانی تریشەوە هاتوە، کە کەسانی چاکەکاریان کردوە بە وەسیلە بۆ باران بارین.[2]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٤٢ / بە ژمارە: ٩٦٤.

(٢) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: شێخی (ابْنُ عَسَاكِر) لە باسی خواناسی گەورەی شوێنکەوتوان (يَزِيْد)ی کوڕی (أَسْوَد)دا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح) ڕیوایەتی کردوە لە (سُلَيْم)ی کوڕی (عَامِر)ەوە، کە یەکێکە لە شوێنکەوتوە متمانەدارەکان، ئەو فەرموویەتی: بێبارانی‌و وشکەساڵی هات بەسەر خەڵکیدا، ئیمامی (مُعَاوِيَة)ش (يَزِيْد)ی کوڕی (أَسْوَد)ی بردە دەرەوە بۆ پاڕانەوەو داوای باران بارین کردن.

هەروەها شێخی (ابْنُ عَسَاكِر) لە ڕێگەی (سَعِيْد)ی کوڕی (عَبْدُالْعَزِيْز)ەوە ڕیوایەتی کردوە، کە هاوەڵی خۆشەویست (ضَحَّاك)ی کوڕی (قَيْس)یش (يَزِيْد)ی کوڕی (أَسْوَد)ی کردوە بە وەسیلەو تکاکار بۆ باران بارین. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٠٦. بۆ هەردوو چیرۆکەکەش بڕوانە: تَأْرِيْخُ دِمَشْق (ابْنُ عَسَاكِر) / ٦٥ / ١١١ - ١١٣.

سونەتیشە لە نوێژە بارانەدا هەمان ئەو سورەتانە بخوێنرێن، کە لە نوێژی جەژندا دەخوێنرێن‌و، پێشتریش باسمان کردن.

هەروەها سونەتە وەکو نوێژی جەژن لە سەرەتای ڕکاتی یەکەمی نوێژە بارانەشدا حەوت (اللهُ أكْبَر) بکرێت‌و، لە سەرەتای ڕکاتی دوەمیشدا پێنج (اللهُ أكْبَر) بکرێت.

جا هەموو ئەو لقەباس‌و مەسەلانەی سەبارەت بە حەوت (اللهُ أكْبَر)و پێنج (اللهُ أكْبَر)ەکان باسمان کردن، لێرەش هاوشێوەی ئەوانە دێنەوە پێشمان.

پاشان کەسی وتاربێژ دوو وتار دەدات‌و، داوای لێخۆشبوون‌و نزاو پاڕانەوەی زۆریان تێدا دەکات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح) لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم، لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)وە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هەندێك کەس بە گریانەوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرمووی: «اللّهُمَّ، اسْقِنَا غَيْثاً مُغِيْثاً مَرِيْئاً مَرِيْعاً، نَافِعاً غَيْرَ ضَارٍّ، عَاجِلاً غَيْرَ آجِلٍ». ئەوە بوو ئاسمان پڕ بوو لە هەورو، باران دەستی پێ کرد.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لەودا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە زانای پایەبەرز (عَمْرو)ی کوڕی (شُعَيْب)ەوە، ئەویش لە باوکی خۆیەوە، باوکیشی لە باپیرەی خۆیەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، داوای باران بارینی بکردایە، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، اسْقِ عِبَادَكَ وَبَهَائِمَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِ بَلَدَكَ الْمَيِّتَ».[2] واتە: "خوایە، بەندەکان‌و گیانلەبەرەکانت

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٧٤ / بە ژمارە: ١١٦٩.
(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٧٥ / بە ژمارە: ١١٧٦.

ئاوداشته بکەو، سۆزو میهری خۆت بەسەر زەویدا بڵاو بکەرەوەو، وڵاتی مـردووی خۆشت زیندوو بکەرەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لەودا بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح) –ئیمامی (أَبُــو دَاوُد) لــە کۆتایی حەدیســەکەدا فەرموویــەتی: ڕشــتەکەی جوانــە–، لــە (عَائِشَــةَ)ی دایکــی ئیمانداراانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کــە فەرموویــەتی: خــەڵکی سـکاڵای بــێ بــارانیو وشکەساڵیان هێنایــە خزمــەتی پێغەمبــەری خــوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئــەویش فەرمانی کرد مینبەرێکی بۆ دابنێنو، لە جێگەی نوێژەکەیـدا بـۆی دانـراو، بـەڵێنی ڕۆژێکی دا بە خەڵکەکـە، کـە تێیـدا دەچـنە دەرەوە. ئـەوەبوو لـە سـەرتای خـۆر هەڵهاتندا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) تەشـریفی بـردە دەرەوەو، لەسـەر مینبەرەکە دانیشتو، (اللهُ أَكْبَر)ی کردو، سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کردو، پاشان فـەرمووی: «إِنَّكُمْ شَكَوْتُمْ جَدْبَ دِيَارِكُمْ، وَاسْتِئْخَارَ الْمَطَرِ عَنْ إِبَّــانِ زَمَانِـهِ عَنْكُمْ، وَقَدْ أَمَرَكُمُ اللهُ –عَزَّ وَجَلَّ– أَنْ تَدْعُوهُ، وَوَعَدَكُمْ أَنْ يَسْتَجِيْبَ لَكُمْ». واتــە: "ئێوە سکاڵای ئەوەتان کردوە، کە زەویەکانتان پیتو بەرەکەتیان نەماوەو، بـارانیش لە سەرەتای کاتو وادەی خوی دواکەوتوە، خوای گەورەش فەرمانی پێ کردوون، کە لێی بپاڕێنەوەو، بەڵێنیشی پێداون، کە وەڵامتان بداتەوەو، دوعاتان گیرا بکات".
ئەوجا فەرمووی: «(الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مَلِكِ يَوْمِ الــدِّيْنِ)، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ. اللَّهُمَّ، أَنْتَ اللهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْغَنِيُّ، وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً وَبَلاَغاً إِلَى حِيْنٍ». واتە: "سوپاسو سـتایش بـۆ خوای پەروەردگاری عالـەم، کە بەسۆزو میهرەبانەو، پاشاو خاوەنی ڕۆژی دواییەو، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوا، ئەوە دەکات کە خـۆی دەیـەوێت. خوایە هەر تۆ خوایـتو، هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـتەقینە نیـە بێجگـە لـە تـۆ، کـە دەوڵەمەندو بێ نیازیـتو، ئێمـەش هـەژارو نـەدارین، بارانمـان بەسـەردا بباریێنـەو، ئەوەش دەیبارێنیت بیکە بە سەرچاوەی هێزو قوەتو، بشمانگەیەنێتە کـاتێکی تـر". پاشان هەردوو دەستی بەرز کردەوەو، هەر بەرزی دەکردنەوە، تـا سـپایی هـەردوو

بنبـالّى دەركـەوت، پاشـان پشـتى كـردە خەڵكەكـەو، كراسـەكەى خـۆى هەڵگێڕايـەوەو، دەستەكانيشـى هـەر بـەرز كردبوونـەوەو، ئـەوجا ڕووى كـردەوە خەڵكەكەو، تەشريفى هێنايە خوارەوەو، دوو ڕكات نوێژى كرد.

ئەوەبوو خواى گەورە هەورێكى هێناو، دەستى كـرد بـە گرمـەو بروسـكەدان، پاشان بەفەرمانى خوا باران بارىو، بەرلـەوەى پێغەمبەرى خوا بگاتەوە مزگەوتەكەى خۆى، لافاو هەستا. جا كە پێغەمبـەرى خـوا خەڵكەكـەى بينـى چـۆن بـە پەلەپـەل دەچنەوە بۆ ماڵەكانيان، پێكەنى، هەتا دانە پيرۆزەكانى دەركەوتن، پاشان فەرمووى: «أَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ».[1]

منيش دەڵێم: (إِبَّانُ الشَّيْءِ) واتە: كاتو وادەى ئەو شتە. (جَـدْب) واتـە: بـێ پيتىو بەرەكەت نەمان.

جا بزانە، كە ئەم حەديسە بە ڕاشـكاوى ئـەوەى تێدايـە، كـە وتارەكـە لـەپێش نوێژەكەوە بوە. بە هەمان شێوە لـە هەردوو صـەحيحى بوخـارىو موسليمیشـدا بـە ڕاشكاوى هاتوە، كە وتارەكە لەپێش نوێژەكەوە بـوە.[2] ئـەمش وا لێكدەدرێتـەوە، كە ئەو كارە درووستە. بەڵام ئـەوەى لـە كتێبـە فيقهيـەكانى هاوەڵانمـانو زانايـانى تريشدا مەشهورە ئەوەيە، كە سونەتە نوێژەكە پێش بخرێت بەسەر وتارەكەدا، ئەويش لەبەر چەند حەديسێكى تر، كە پێغەمبەرى خوا (درووودى خواى لەسـەر بێـت) نوێژەكـەى پێشخستوە بەسەر وتارەكەدا. خواش لـە هەموو كەس زانا ترە.

هەروەها سونەتە نزاو پاڕانەوەكە هەم بە دەنگـى بـەرز بێـتو هـەم بـە دەنگـى نزمەو، سونەتيشە لەكاتى پاڕانەوەكەدا دەستەكان زۆر بەرز بكرێتەوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ / ٣٧٤ / بە ژمارە: ١١٧٣.

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٤٧ / بە ژمارە: ٩٧٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦١١ / بـە ژمارە: ٨٩٤.

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: با لە دوعاکەیاندا ئەمەش بڵێن: (اللّهُمَّ، أَمَرْتَنا بدُعَائِكَ، وَوَعَدْتَنا إجابَتَكَ، وَقَدْ دَعَوْنَا كَمَا أَمَرْتَنا، فَأجِبْنَا كَمَا وَعَدْتَنا. اللّهُمَّ، اُمْنُنْ عَلَيْنا بِمَغْفِرَةِ ما قَارَفْنا، وَإجابَتِك فِيْ سُقْيَانَا وَسَعَةِ رِزْقِنَا). واتە: (خوایە، فەرمانت پێ کردووین کە لێت بپاڕێینەوەو، بەڵێنیشت پێداوین، کە پاڕانەوەمان گیرای بکەیت، وا ئێمەش وەکو فەرمانت پێ کردین لێت پاڕاینەوە، دەی تۆش وەکو بەڵێنت پێدابووین پاڕانەوەکەمان گیرا بکە. خوایە، منەتی ئەوە بخەرە سەرمان، کە لە تاوانەکانمان خۆش بیت‌و، پاڕانەوەکەمان گیرا بکەو بارانمان بۆ بباریێنەو، ڕزق‌و ڕۆزیمان زیادو فراوان بکە).[1]

هەروەها با دوعا بکات بۆ نێرینەو مێینەی ئیمانداران‌و، صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بدات‌و، ئایەتێك یان دوو ئایەت بخوێنێت‌و، پێشنوێژەکەش بڵێت: داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم، بۆ خۆم‌و بۆ ئێوەش.

هەروەها سونەتە ئەو دوعایەش بکات، کە بۆ ناڕەحەتی‌و تەنگانە دەکرێت‌و، ئەم دوعایەش بکات: (اللّهُمَّ، آتِنا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). هەروەها ئەو دوعایانەی تریش بکات، کە لە حەدیسی (صَحِيْح)دا هاتبون‌و، پێشتر باسمان کردن.

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (الْأُمّ)دا فەرموویەتی: پێشنوێژ لە نوێژە بارانەدا هەر وەکو نوێژی جەژن دوو وتار دەدات‌و، (اللهُ أكْبَر)یان تێدا دەکات‌و، سوپاس‌و ستایشی خوایان تێدا دەکات‌و، صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەدات‌و، داوای لێخۆشبوون زۆر دەکات، بە ڕادەیەك، کە زۆرترینی قسەکانی داوای لێخۆشبوون بێت‌و، با زۆریش بە خەڵکەکە بڵێت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً * يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَاراً﴾ [نوح: ١٠ -

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٤٦ - ٥٤٧.

**١١]**. واته: {منیش پێم وتن: داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە بەڕاستی خوایەکی لێبوردەو گوناهبەخشە. بارانی بەخوڕتان بەسەردا دەبارێنێت}.[١]

پاشان ئیمامی (شَافِعِيّ) ڕیوایەتی کردوە لە ئیمامی (عُمَر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەویش نوێژە بارانەی کردوەو، زۆرترین دوعاکانیشی بریتی بوە لە داوای لێخۆشبوون کردن.[٢]

ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: با زۆرترین دوعاکانی بریتی بن لە داوای لێخۆشبوون کردن، با دوعاکانی بە داوای لێخۆشبوون دەست پێ بکات و، هەر ئەویش بخاتە نێوان قسەکانیەوەو، ئەویش بکاتە کۆتایی قسەکانی و، هەر ئەویش زۆرینەی قسەکانی بێت، تا قسەکانی تەواو دەبێت و، خەڵکیش هان بدات لەسەر تەوبەو پەشیمانی و گوێڕایەڵی خوای گەورەو، خۆنزیك کردنەوە لێیەوە.[٣]

## ئەوەی لە کاتی هەڵکردنی ڕەشەبادا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیمانداران‌ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر ڕەشەبا هەڵیبکردایە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ».[٤] واتە: "خوایە من داوای خەیری ئەم بایەت لێ دەکەم و، خەیری

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٤٦.

(٢) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٤٩.

(٣) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٤٧.

(٤) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦١٦ / بە ژمارە: ٨٩٩.

ئەوەش کە تێیدایەو، خەیری ئەوەش کە پێیدا نێردراوە، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕی ئەم بایەو، لە شەڕی ئەوەی تێیدایەو، لە شەڕی ئەوەش کە پێیدا نێردراوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (ابْنُ مَاجَــه)دا بە ڕشتەیەکی (حَسَن)، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «الرِّيحُ مِـنْ رَوْحِ اللهِ تَعَالَى، تَأْتِيْ بالرَّحْمَةِ، وَتَأْتِيْ بِالْعَذَابِ. فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا، فَلاَ تَسُبُّوهَا، وَسَلُوا اللهَ خَيْرَهَا، وَاسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَـرِّهَا».[1] واتە: "با بەشێکە لە ڕەحمەتی خوا بە بەندەکانی، جا ڕەحمەت دەهێنێت و، سزاش دەهێنێت. ئێوەش ئەگەر بینیتان، قسەی پێ مەڵێن و، داوای خەیرەکەی لە خوا بکەن و، پەناش بەخوا بگرن لە شەڕەکەی".

منیش دەڵێم: وشەی (رَوْح) لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا بە فەتحەی ڕائەکە دەخوێنرێتەوە. زانایانیش فەرموویانە: (مِـنْ رَوْحِ اللهِ) واتە: بەشێکە لە ڕەحمەتی خوای گەورە بە بەندەکانی.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَــه)دا، لە (عَائِشَـــة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) لە کەناری ئاسمانەوە هەورێکی ببینیایە، وازی لە ئیش وکار دەهێنا، باوەکو لە نوێژیشدا بوایە، پاشان دەیفەرموو: «اللَّهُـمَّ، إِنِّيْ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا». دواتر ئەگەر باران دەستی پێ بکردایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، صَيِّباً هَنِيئاً». واتە: "خوایە با بارانێکی زۆرو بەخوڕو بەسوود بێت".[2]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٧ / بە ژمارە: ٥٠٩٧، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَـه / ٢ / ١٢٢٨ / بە ژمارە: ٣٧٢٧.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ / ٧٤٨ / بە ژمارە: ٥٠٩٩، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْـرَى / ٦ / ٢٢٨ / بە ژمارە: ١٠٧٥٣، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٨٠ / بە هەردوو ژمارە: ٣٨٨٩ و

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُبَـيّ)ی کوڕی (كَعْـب)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «لا تَسُبُّوا الرِّيْحَ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مَا تَكْرَهُوْنَ، فَقُوْلُوا: "اللَّهُمَّ، إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ هَذِهِ الرِّيْحِ، وَخَيْرِ مَا فِيْهَا، وَخَيْرِ مَا أُمِرَتْ بِهِ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الرِّيْحِ، وَشَرِّ مَا فِيْهَا، وَشَرِّ مَا أُمِرَتْ بِـهِ». واتە: "قسە بە با مەڵێن، خۆ ئەگەر شتێکتان لێ بینیو پێتان ناخۆشبوو (وەکو تەپوتۆزو، گێژەلوولکە)، ئەوا بڵێن: (خوایە، ئێمە داوای خەیری ئەم بایەت لێ دەکەینو، خەیری ئەوەش، کە تێدایەو، خەیری ئەوەش کە فەرمانی پێ کراوە بیهێنێت. پەناشت پێ دەگرین لە شەڕی ئەم بایەو، لە شەڕی ئەوەی تێدایەو، لە شەڕی ئەوەش کە فەرمانی پێ کراوە بیهێنێت)".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

هەروەها فەرموویەتی: هەر لەم باسەدا حەدیس لە هەریەکە لە دایکە (عَائِشَة)و، (أَبو هُرَيْرَة)و، (عُثْمَان)ی کوڕی (أَبو الْعَاص)و، (أَنَس)و، (ابْنُ عَبَّاس)و، (جَابِر)ەوە ڕیوایەت کراوە (خوا لە هەموویان لێ ڕازی بێت).

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْـنُ السُّـنِّيّ)دا، بە ڕشتەی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (سَلَمَة)ی کوڕی (أَكْـوَع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر با توند بوایە (ڕەشەبا هەڵی بکردایە) پێغەمبەری خوا

---

٣٨٩٠. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٢١.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٤ / ٥٢١ / بە ژمارە: ٢٢٥٢، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ / ٢٣١ / بە ژمارە: ١٠٧٦٩.

(درودی خوای لەسەر بێت) دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَقْحاً لا عَقِيْماً». واتە: "خوایە ئاودارو باراناوی بێت، نەك وشكو بێ باران".(1)

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هەردوو هاوەڵی خۆشەویست (أَنس)ی کوڕی (مَالِك)و، (جَابِر)ی کوڕی (عَبْدُالله)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەوانیش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إِذَا وَقَعَتْ كَبِيْرَةٌ، أَوْ هَاجَتْ رِيْحٌ عَظِيْمَةٌ، فَعَلَيْكُمْ بِالتَّكْبِيْرِ، فَإِنَّهُ يُجَلِّيْ الْعِجَاجَ الْأَسْوَدَ». واتە: "ئەگەر ڕوداوێکی گەورە ڕوویدا، یان ڕەشەبایەکی گەورە هەڵی کرد، ئێوە (اللهُ أَكْبَـر) بکەن، چونکە (اللهُ أَكْبَـر) کردن تەپوتۆزو دووکەڵی ڕەش ڕادەماڵێت".(2).

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ڕشتەی خۆی لە کتێبی (الْـأُمّ)دا ڕیوایەتی کردوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: هەرکەی با هەڵی بکردایە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەکەوتە سەر ئەژنۆو، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، اجْعَلْهَا رَحْمَـةً، وَلا تَجْعَلْهَـا عَذَاباً. اللَّهُمَّ، اجْعَلْهَا رِيَاحاً، وَلا تَجْعَلْهَا رِيْحاً». واتە: "خوایە بیکە بە ڕەحمەتو، مەیکە بە سزا. خوایە بیکە بە بای خەیر (رِيَاح)و، مەیکە بە بای شەڕ (رِيْح)".(3)

هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس) فەرموویەتی: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيْحاً صَرْصَـراً﴾ [فُصِّلَت: ١٦] واتە: {ئێمەش ڕەشەبایەکی زۆر ساردمان بۆ ناردن}. وە فەرموویەتی: ﴿أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الـرِّيْحَ

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٤٦ – ١٤٧ / بە ژمارە: ٢٩٩.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ١٤٠ / بە ژمارە: ٢٨٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٢٨.

(٣) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٥ – ٥٥٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٣١.

الْعَقِيمَ﴾ [الذَّارِيَات: ٤١] واته: {ڕەشەبایەکی نەزۆکی بێفەڕمان نارده سەر گەلی عاد}.
هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ﴾ [الحِجْر: ٢٢] واتە: {بامان نارد تاوەکو نێرو مێی دارو درەختو گژوگیاکان بەیکتر بگەیەنێتو، جووتیان بکات}، وە فەرمووشێتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ﴾ [الرُّوم: ٤٦] واتە: {یەکێك لە نیشانەکانی دەسەڵاتو گەورەیی خوا ئەوەیە، کە با دەنێرێت وەکو مژدەرو مزگێنیدەر بە هاتنی کاتی باران}.[١]

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، حەدیسێکی هێناوە بە ڕشتەیەکی بچڕاو (مُنْقَطِع)، لە پیاوێکەوە، کە سکاڵای هەژاریو نەداری خۆی بردۆتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش فەرموویەتی: «لَعَلَّكَ تَسُبُّ الرِّيحَ!!!». واتە: "ڕەنگە قسە بە با بڵێیت!!!".[٢]

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: نابێت هیچ کەسێك قسە بە با بڵێت، چونکە ئەویش درووستکراوێکی ملکەچو گوێڕایەڵی خوای گەورەیەو، سەربازێکە لە سەربازەکانیو، ئەگەر بیەوێت دەیکات بە ڕەحمەتو، دەشیکات بە سزاو زەحمەت.[٣]

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٦. شێخی (ابْنُ عَلَّان) فەرموویەتی: ئەم فەرمایشتەی (ابْنُ عَبَّاس) دەبێتە بەڵگەو پاڵپشت بۆ ئەو جیاوازی کردنەی، کە پێغەمبەری خوا لە فەرمایشتەکەی خۆیدا لە نێوان (رِيْح)و (رِيَاح)دا کردوویەتی. ئەویش بەوەی کە لە قورئانی پیرۆزیشدا زۆر جار وشەی (رِيْح) بۆ بای سزاو شووم بەکارهێنراوەو، (رِيَاح)یش بۆ بای ڕەحمەتو باش بەکارهێنراوە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٢٧٨.
(٢) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٦. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم حەدیسە حەدیسێکی (مُعْضَل)ـەو، دوو کەسو زیاتریش لە ڕشتەکەی داکەوتونو، هیچ ڕیوایەتێکیشم دەستنەکەوتوە بۆ پاڵپشتی کردنی. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٣٣.
(٣) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٦.

## ئەوەی لە کاتی بەربوونەوەی هەسارەدا دەوترێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ مَسْعُوْد)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: فەرمانمان پێ کراوە، کە ئەگەر هەسارە بەربوویەوە، تەماشای نەکەین و، لەو کاتەدا بڵێین: (مَا شَاءَ اللهُ، لا قُوَّةَ إلاّ بِاللّهِ).[1]

## باسی ئاماژەبۆنەکردن و تەماشانەکردنی هەسارەو هەورە بروسکە

ئەم باسەش هەمان ئەو حەدیسەی باسەکەی پێشووی تێدا هاتوە.

هەروەها ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ڕشتەی خۆی لە کتێبی (الْأُمّ)دا، ڕیوایەتی کردوە لە کەسێکەوە -کە بە درۆزنی دانەناوە- ئەویش لە زانای پایەبەرز (عُـرْوَة)ی کوڕی (زُبَيْـر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چاوی بە هەورەبروسکە یان بە باران کەوت، با ئاماژەی بۆ نەکات، بەڵکو با وەسفی بکات. (واتە: باسی بەهێزی و لاوازی هەورەبروسکەکە بکات، یان باسی زۆریتی و کەمیتی بارانەکە بکات، یان تەسبیحات بکات و باسی گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورە بکات).

ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: عەرەب تاوەکو ئێستەش پێیان ناخۆشە ئاماژە بکرێت بۆ هەورەبروسکەو باران.[2]

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْـنُ السُّـنِّيّ) / ٣٠٨ / بە ژمارە: ٦٥٣. هەروەها ئیمامی (طَبَرَانِيّ)ش ڕیوایەتی کردوەو، حەدیسێکی زۆر لاوازە. بڕوانە: الْمُعْجَـمُ الْأَوْسَـط / ٧ / ٣٥٦ / بە ژمارە: ٧٧١٩، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٢٨١.

(٢) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٧. جا ئەو کەسەی کە ئیمامی (شَافِعِيّ) ناوی نەبردوە بریتیە لە (إبْرَاهِيْم)ی کوڕی (أَبو يَحْيَى)ی (أَسْلَمِيّ)، کە زۆرێك لە زانایان بە کەسێکی لاواز (بگرە

## ئەگەر كەسێك گوێی لە هەورەگرمە بوو چی بلێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، بە ڕشتەیەکی لاواز، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْــنُ عُمَــر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، گوێی لە هەورەگرمەو هەورە تریشقە بوایە، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، لاَ تَقْتُلْنَا بِغَضَبِكَ، وَلاَ تُهْلِكْنَا بِعَذَابِكَ، وَعَافِنَا قَبْلَ ذَلِكَ».[1] واتە: "خوایە، بە خەشمو توڕەیی خۆت مەمانکوژەو، بە سزای خۆشت لەناومان مەبەو، لەپێش دابەزینی سزاکەشت بە بێوەی بمانبەرەوە بۆ خزمەتی خۆت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُوَطَّأ)دا، بە ڕشتەیەکی (صَحِيْح)، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (زُبَيْر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەو

---

هەندێکیان بە درۆزن)یان داناوە. بڕوانە: سِيَرُ أعْلامِ النُّبَلاء / ٨ / ٤٥٠ – ٤٥٤ / بە ژمارە: ١١٩.

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٣ / بە ژمارە: ٣٤٥٠. هەروەها ئیمامی (أحْمَد)و بوخاری لە (الْأدَبُ الْمُفْرَد)داو، (ابْنُ أبِيْ شَيْبَة)و (نَسَائِيّ)و (حَاكِم)و (بَيْهَقِيّ)و (ابْنُ السُّنِّيّ)ش ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردوە. جا شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: سەیرە ئیمامی نەوەوی باسی لاوازی ڕشتەی ئەم حەدیسەی کردوە، کەچی باسی لاوازی ڕشتەی حەدیسەکەی (ابْنُ مَسْعُوْد)ی نەکردوە، لە باسەکەی پێشووتردا (واتە: باسی بەربوونەوەی هەسارە)، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو حەدیسە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردووەو، کەسەکەش تۆمەتی درۆکردنی لەسەرە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٥ / ١٤١ – ١٤٢، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٢٨٤.

ئەگەر گوێی لە هەورەگرمە بوایە، وازی لە قسە کردن دەهێناو، دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الَّذِى يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ، وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ).[1]

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ڕشتەی (صَحِيْح)ی خۆی لە کتێبی (الْأُمّ)دا ڕیوایەتی کردوە لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان، ئیمامی (طَاوُوْس)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر گوێی لە هەورەگرمە بوایە، دەیفەرموو: (سُبْحَانَ مَنْ سَبَّحْتَ لَهُ).

ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: وەکو بڵێیت، ئیمامی (طَاوُوْس) ئەو زیکرەی لەم ئایەتە پیرۆزەوە وەرگرتوە، کە دەفەرموێت: ﴿وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ﴾ [الرَّعْد: ١٣] واتە: {هەورەگرمەش تەسبیحاتو سوپاسو ستایشی خوای گەورە دەکات}.[2]

گێڕاویشیانەتەوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە سەفەرێکدا لە خزمەتی ئیمامی (عُمَر)دا بووین (خوای لێ ڕازی بێت)، تووشی هەورەگرمەو هەورەبروسکەو تەرزە بووین، جا هاوەڵی خۆشەویست {(كَعْب)ی کوڕی (مَالِك)} پێی فەرمووین: هەر کەسێك لەکاتی هەورەگرمەدا سێ جار بڵێت: (سُبْحَانَ مَنْ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ، وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيْفَتِهِ)، لەو هەورەگرمە پارێزراو دەبێت. جا ئێمەش وتمانو، پارێزراویش بووین.[3]

---

(١) بڕوانە: مُوَطَّأ الْإِمَامِ مَالِك (رِوَايَةُ يَحْيَى اللَّيْثِيّ) / ٢ / ٩٩٢ / بە ژمارە: ١٨٠١.

(٢) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٧.

(٣) ئیمامی نەوەوی نەیفەرموە کێ ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە! بۆیە منیش دەڵێم: ئیمامی (طَبَرَانِيّ)و زانای پایەبەرز (أَبُو الشَّيْخ)ی (أَصْبَهَانِيّ)ی گێڕاویانەتەوەو، شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: ڕشتەکەی (حَسَن)ە. بڕوانە: الدُّعَاءُ لِلطَّبَرَانِيّ / ٣٠٤ / بە ژمارە: ٩٨٥، والْعَظَمَة (أَبُو الشَّيْخ الْأَصْبَهَانِيّ) / ٤ / ١٢٩١ - ١٢٩٢، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٤٢ - ١٤٣، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٢٨٦.

## ئەگەر باران باری چی بڵێت؟

بۆمـان ڕیوایـەت کـراوە لـە صـەحیحی بوخاریـدا، لــە (عَائِشَـــةَ)ی دایکـی ئیمانداارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەگـەر چاوی بە باران بکەوتایە، دەیفەرموو: «اللّهُمَّ، صَيِّباً نَافِعاً».[1] واتە: "خوایە بارانێکی بەسوودبێت".

هەر ئەم حەدیسەشمان لە (سُنَن)ی (ابْــنُ مَاجَــه)دا بـۆ ڕیوایـەت کـراوە، کـە پێغەمبەری خوا دوو جار یان سێ جار فەرموویەتی: «اللّهُمَّ، صَيِّباً نَافِعاً».[2]

ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بە ڕشتەی خۆی حەدیسێکی (مُرْسَــل)ی لە کتێبی (الْأُمّ)دا ڕیوایەت کردوە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «اُطْلُبُوا اسْتِجَابَةَ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْتِقَاءِ الْجُيُوشِ، وَإِقَامَةِ الصَّــلاةِ، وَنُــزُوْلِ الْغَيْثِ». واتە: "بەشوێن گیرابوونی نزاو پاڕانەوەدا بگەڕێن لـەکاتی بەیەکگەیشـتن‌و ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای موسوڵمانان‌و کافران‌و، لەکاتی نوێژ دابەستن‌و، لەکاتی باران بارینددا".

ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویـەتی: مـن لـە زیـاد لـە کەسـێکەوە ئـەو فەرمایشـتەم وەرگرتوە، کە داوای گیرابوونی دوعـا بکرێـت، لـەکاتی بـاران بـارین‌و، لـەکاتی دابەستنی نوێژدا.[3]

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٤٩ / بە ژمارە: ٩٨٥.
(٢) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ / ١٢٨٠ / بە هەردوو ژمارە: ٣٨٨٩ و ٣٨٩٠.
(٣) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥٤.

## زیکری دوای باران بارین

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (زَيْد)ی کوڕی (خَالِد)ی (جُهَنِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە (حُدَيْبِيَة) نوێژی بەیانی بۆ کردین -دوای بارانێك، کە شەو باریبوو- جا کە لە نوێژەکە بوویەوە، ڕووی کردە خەڵکەکەو، فەرمووی: «دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموە؟» عەرزیان کرد: خواو پێغەمبەرەکەی زانا ترن. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە فەرموویەتی: «أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِيْ وَكَافِرٌ: فَأَمَّا مَنْ قَالَ: "مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ" فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِيْ، وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ. وَأَمَّا مَنْ قَالَ: "بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا" فَذَلِكَ كَافِرٌ بِيْ، وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ».[1] واتە: "ئەم بەیانیە بەندەکانم بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان ئیمانیان بە من هێناو، بەشێکیشیان کافر بوون. جا ئەوەی وتبێتی: (بە فەزڵو میهری خوا بارانمان بۆ باری)، ئەوە ئیمانی بەمن هێناوەو، باوەڕی بە هەسارەو بورجو ئەو شتانە نەهێناوە. ئەو کەسەش وتبێتی: (بەهۆی فلانە هەسارەو بورجەوە بارانمان بۆ باری)، ئەوە باوەڕی بەمن نەماوەو، باوەڕی بە هەسارەو بورج هێناوە".

منیش دەڵێم: (حُدَيْبِيَة) جێگەیەکی ناسراوە، بیرێکە نزیکی کەمتر لە قۆناغێك لە شاری (مَكَّة)ی پیرۆزەوە دوورە. (واتە: نزیکەی ٢٠ کیلۆمەتر). جا درووستە بە (حُدَيْبِيَة)و، بە (حُدَيْبِيَّة)ش بخوێنرێتەوە. ئەوەی یەکەمیان شێوازێکی درووستو هەڵبژێردراوەو، بۆچوونی ئیمامی (شَافِعِيّ)و زانایانی زمانیشە. بەڵام ئەوەی دوەمیان بۆچوونی زانای پایەبەرز (ابْنُ وَهْب)و زۆرینەی فەرموودەناسانە.

زانایان فەرموویانە: ئەگەر موسوڵمانێك بڵێت: (مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا)و، مەبەستیشی بە (نَوْء) بەدیهێنەرو درووستکەری بارانەکە بێت، ئەوە بێ گومان بە

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٢٩٠ / بە ژمارە: ٨١٠، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ١ / ٨٣ / بە ژمارە: ٧١.

کافرو لەدین هەڵگەڕاوە دادەنرێت. ئەگەر مەبەستیشی ئەوە بێت، کە نیشانەی بارینی بارانەکەیەو، باران لەگەڵ ئەو نیشانەدا دەبارێت و، بارینەکەشی بە کردارو بەدیهێنانی خوای گەورەیە، ئەوە کافر نابێت.

ئەوجا زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە ناپەسەندی ئەو وتەیە: بۆچوونی هەڵبژێردراو ئەوەیە کە ناپەسەندە. چونکە وتەی کافرەکانەو، ڕواڵەتی حەدیسەکەش وا دەگەیەنێت و، ئیمامی (شَافِعِيّ)ش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (الْأُمّ)دا[1] و، زانایانی تریش هەر وایان فەرموە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

سونەتیشە مرۆڤی موسوڵمان سوپاسی خوای گەورە بکات لەسەر ئەو نیعمەتە. واتە: نیعمەتی باران بارین.

---

(١) بڕوانە: الْأُمّ / ٢ / ٥٥١.

## ئەگەر باران زۆر بوو، ترسی زیانیشی لێ کرا چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پیاوێك ڕۆژی جومعە هاتە مزگەوتەوەو، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) لەو کاتەدا بەپێوە وتاری دەداو، پیاوەکەش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، وشترەکانمان بەهۆی کەمی بارانو بێ لەوەڕیەوە تیاچوونو، ڕێگاکانیش بڕاونو وشتریان پێدا ناچێت، یان خەڵکی شتێکیان نیە بیخەنە سەر کۆڵی وشترەکانو بیانهێنن بۆ بازاڕو بازرگانی. جا داوا لە خوا بکە، بارانمان بۆ ببارێنێت. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەردوو دەستی بەرز کردەوەو، سێ جار فەرمووی: «اللّٰهُمَّ، أَغِثْنَا». واتە: "خوایە بارانمان بۆ ببارێنە".[1]

(أَنَس) دەفەرموێت: سوێند بەخوا نە هەورو، نە پەڵە هەورێکیشمان لە ئاسماندا نەدەبینیو، لە نێوان ئێمەو چیای (سَلْع)یشدا (مەبەستی کەژێکە لە نزیك شاری مەدینەی پیرۆز) نە خانوو نە بینایەك نەبوو بەرچاومان بگرێت، ئەوەبوو لەدوای ئەو کەژەوە هەورێك دەرکەوت، وەکو قەڵغان خڕو چڕ بوو. جا کە گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان، بڵاوبوویەوەو، پاشان باران باری. سوێند بەخوا، تا هەفتەیەك خۆرمان نەبینی. پاشان لە جومعەی داهاتوودا پیاوێك لەو دەرگایەوە هاتە ژوورەوەو، پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) بەپێوە وتاری دەداو، پیاوەکەش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، وشترەکانمان تیاچوونو، ڕێگاکانیش بڕاون، جا داوا لە خوا بکە، کە بارانەکە لەسەرمان بگرێتەوە. پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) هەردوو دەستی بەرز کردەوەو، فەرمووی: «اللّٰهُمَّ، حَوَالَيْنَا، وَلَا عَلَيْنَا. اللّٰهُمَّ، عَلَى الْآكَامِ وَالظِّرَابِ وَبُطُوْنِ الْأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ». واتە: "خوایە بە دووروبەرماندا ببارێنە، نەك بە سەرماندا. خوایە ببارێنە بەسەر گردو تەپۆڵکەو ناو دۆڵەکانو، بن

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ١ / ٣٤٤ / بە ژمارە: ٩٦٨، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٦١٢ / بە ژمارە: ٨٩٧.

داروو درەختەکانـدا". ئـەوەبوو بارانەکـە وەسـتاو، ئێمـەش لـە مزگـەوت چـووینە دەرەوەو، بەبەر خۆرەوە بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین.

دەقی ئەم حەدیسە لـە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا هاتوە، بـەلاٌم لـە ڕیوایەتەکەی ئیمامی بوخاریدا لـەبریتی «أَغِثْنَا» نوسراوە «اللّهُمَّ، اسْقِنَا».

بەڕاستی ئەم حەدیسە چەندین سوودی تێدایە[1]و، تـەوفیقیش تـەنها بـە دەسـتی خوایە.

## باسی زیکرەکانی نوێژی تەراویح (صَلاةُ التَّرَاوِيح)

بزانە کە نوێژی تەراویح بەیەك دەنگی زانایان سونەتەو، بیست ڕکاتیشـەو، لـە هەموو دوو ڕکاتێکیشدا سلاٌو دەدرێتەوە.

---

(١) لەوانە:

- ڕێزێکی تایبەتیو ئاشکرای خوایی تێدایە بۆ پێغەمبەرەکە، کە دوعاکەی گیرا کردوە بـۆ بارینی بارانەکەو، بۆ ڕاوەستانەکەشی.
- پێغەمبەری خوا زۆر بە ئەدەبەوە دوعاکەی کـردوە. وەك دەبینرێـت داوای نـەکرد کـە بارانەکە بەیەکجاری ڕاوەستێتو نەبارێت، چونکە ڕەنگە لەلایـەکی تـرو لـە جێگـەو ناوچەیەکی ترەوە بارینەکەی پێویست بێت.
- دوعاکردن بۆ لادانی زەرەرو زیان هیچ دژایەتیەکی لەگـەڵ (تَوَکُّل)و پشتبەخوابەسـتندا نیە. ئەگەرچی باشتر وەهایە کە هەموو شتێك بسپێردرێت بە لوتفی خوا.
- درووستە بەبێ نوێژە بارانەش هەر دوعا بکرێت بۆ باران بارین.
- سونەتە دوعا بکرێت کە باران بەسەر ماڵو خانووی خەڵکیدا نـەبارێت، ئەگـەر ترسـی ئەوە هەبوو کە زۆری بارانەکە زیان بە خانوەکان بگەیەنێت. بڕوانە: شَرْحُ النَّوَوِيّ عَلَى صَحِيْحِ مُسْلِم: ٦ / ١٩٣، وفَتْحُ الْبَارِيْ / ٢ / ٥٠٦ – ٥٠٧، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٢٩٦.

شێوازی خودی نوێژەکەش هەر وەکو شێوازی نوێژەکانی تر وەهایە، بەو جۆرەی کە پێشتر باسمان کردو، هەموو ئەو زیکرانەشی تێدایە، کە پێشتر باسمان کردن، وەکو دوعای سەرەتای دەست پێکردنی نوێژو، تەواو کردنی زیکرەکانی ترو، خوێندنی تەحیات بە تەواوەتیو، پاڕانەوە لەدوایەوەو، زیکرەکانی تریش، کە پێشتر باسمان کردن.

جا ئەمە ئەگەرچی ئاشکراو زانراویشە، بەڵام من بۆیە هۆشداریم لەبارەیەوە دا، چونکە زۆربەی خەڵکی کەمتەرخەمی تێدا دەکەنو، زۆرینەی زیکرەکانی لادەبەنو نایخوێننو، کەچی ڕاستیەکەش ئەوەیە، کە من باسم کرد.

سەبارەت بە خوێندنی قورئانیش تێیدا، ئەوە بۆچوونی هەڵبژێردراو کە زۆرینەی زانایانی لەسەرەو، خەڵکیش بە تێکڕا کاری پێ دەکەن، ئەوەیە کە خەتمەیەکی تەواو لە تەراویحی هەموو مانگەکەدا بکرێت. واتە: نوێژخوێن لە هەموو شەوێکدا نزیکەی جوزئێك لە سی جوزئەکە بخوێنێتو، سونەتیش قورئانەکە بە تەجویدەوەو بە ڕوونی بخوێنێتو، با خۆیشی لەوە بپارێزێت کە نوێژەکە لەسەر شوێنکەوتوەکانی درێژ بکاتەوە، بەوەی کە زیاد لە جوزئێك قورئانیان بۆ بخوێنێت.

هەروەها با زۆر خۆی لەوە بپارێزێت، کە پێشنوێژە نەزانو نەشارەزاکانی زۆرێك لە مزگەوتەکان کردویانە بە عادەت، کە لە ڕکاتی کۆتایی شەوی حەوتەمی مانگی ڕەمەزاندا سورەتی (الْأَنْعَام) بە تەواوەتی دەخوێنن، بە پاساوی ئەوەی، کە ئەو سوورەتە بە یەکجار دابەزیوە. جا ئەم کارە داهێنراوێکی خراپەو، نەزانینێکی ئاشکرایەو، داگرەوەیە بەسەر چەندین شتی خراپدا، کە بە ڕوونی لە کتێبی (التِّبْيَانُ فِيْ آدَابِ حَمَلَةِ الْقُرْآن)دا باسم کردوون.[1] تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

---

(١) هەروەها پێشتریش لەم کتێبەدا باسی کردوون، جا ڕەنگە لەبیری چوویێت. بڕوانە: {ئەو شتانەی لە خوێندنەوەی قورئاندا بیدعەو داهێنراون}.

## باسی زیکرەکانی نوێژی پێویستی (صَلاةُ الحَاجَة)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللّه)ی کوڕی (أَبِيْ أَوْفَــى)وە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێـت)، کـە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسـەر بێـت) فەرموویـەتی: هـەر کەسـێك پێویستیەکی بە خوای گەورە یان بە کەسێکی تـر هـەبێت، بـا دەسـتنوێژێکی چـاك بگرێتو، ئەوجا دوو ڕکات نوێژ بکاتو، پاشان ستایشی خـوای گـەورە بکـاتو، صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا بداتو، ئەوجا بڵێـت: «لا إِلهَ إِلاَّ اللَّــهُ الْحَلِــيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعالَمِيْنَ. أَسْأَلُكَ مُوْجِبَــاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالْغَنِيْمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالسَّلامَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ، لا تَدَعْ لِــيْ ذَنْباً إِلاَّ غَفَرْتَهُ، وَلا هَمّاً إِلاَّ فَرَّجْتَهُ، وَلا حَاجَةً هِيَ لَكَ رِضاً إِلاَّ قَضَيْتَهَا، يـا أَرْحَــمَ الرَّاحِمِيْنَ». واتە: "هیچ پەرستراوێکی ڕاسـتەقینە نیـە بێجگـە لـە خـوای بـەحیلمی بەخشندەی بەڕێز، پاكو بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری عەرشی مەزن، سـوپاسو ستایش بۆ خوای پەروەردگاری عالـەم. خوایە، داوای ئەو شـتانەت لێ دەکـەم، کـە دەبنە هۆکاری دەستکەوتنی سۆزو میهری تۆو، داوای ئەو شتانەشت لێ دەکەم، کە بەدڵنیاییەوە هۆکاری دەستکەوتنی لێخۆشبوونی تۆنو، داوای دەستکەوتی هـەموو کارێکی چاكو، سەلامەتیو بێوەییت لێ دەکەم لە هەموو تاوانو خراپەیـەك. خوایـە هیچ تاوانێکم مەهێڵە، کە لێی خۆش نەبیتو، هیچ خەمو پەژارەیەکم مەهێڵە، کـە نەیڕەوێنیتەوەو لەسەرمی لانەبەیتو، هیچ پێویستیەکیشم مەهێڵە، کـە خـۆت پێـی ڕازیت، هەتا بۆم جێبەجێ نەکەیت، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: لە ڕشتەکەیدا قسە هەیە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٤٤ / بە ژمارە: ٤٧٩، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَــه / ١ / ٤٤١ / بـە ژمارە: ١٣٨٤. ئیمـامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویـەتی: کەسـێکی لاواز لـە ڕشـتەکەیدایە بـەناوی (فَائِد)ی کوڕی (عَبْدُالرَّحْمَن)ـەوە، کە پێی دەوترێت: (أَبُو الْوَرْقَاء).

منیش دەڵێم: سونەتە دوعای خەم‌و خەفەتیش بخوێنێت؟ کە بریتیە لە (اللَّهُـــمَّ، آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً وفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنا عَـــذَابَ النَّـــارِ)، ئەویش لەبەر ئەو حەدیسەی کە پێشتر لە هەردوو صەحیحی بوخاری‌و موسلیمەوە هێنامان، کە سەبارەت بە پێویستی‌و خەم‌و خەفەت هاتبوو.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْـــنُ مَاجَـــه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عُثْمَان)ی کوڕی (حُنَيْف)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پیاوێکی نابینا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، عەرزی کرد: "لە خوای گەورە بپاڕێرەوە تا چاکم بکاتەوە". پێغەمبەریش فەرمووی: "ئەگەر دەتەوێت دوعات بۆ دەکەم‌و، ئەگەر دەشتەوێت ئارام بگرە بۆ خۆت باشترە". پیاوەکەش عەرزی کرد: دوعام بۆ بکە. پێغەمبەریش فەرمانی پێکرد، کە دەستنوێژێکی چاك بگرێت‌و، بەم دوعایە بپاڕێتەوە: «اللَّهُمَّ إِنِي أَسأَلُكَ وأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- نَبِيِّ الرَّحْمَةِ. يَا مُحَمَّدُ، إِنِّيْ تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّيْ فِيْ حَاجَتِي هَـــذِهِ لِتُقْضَى لِـــيْ، اللَّهُـــمَّ، فَشَـــفِّعْهُ فِـــيَّ». واتە: "خوایە، من داوات لێ دەم‌و لێت دەپاڕێمەوەو، پێغەمبەرەکەت (مُحَمَّد) دەکەم بە تکاکار، کە پێغەمبەری ڕەحمەتە. ئەی (مُحَمَّد)، من تۆ دەکەم بە تکاکار بۆلای پەروەردگارم بۆ ئەم پێویستیەم، بەڵکو بۆم جێبەجێ بکرێت. خوایە، تۆش تکای پێغەمبەرم بۆ گیرا بکە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[1]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٦٩ / بە ژمارە: ٣٥٧٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ / ٤٤١ / بە ژمارە: ١٣٨٥. شێخی عەسقەلانیش فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَـــحِيْح)ـەو، ئیمامی (أَحْمَد)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ خُزَيْمَة)و (حَاكِم)یش ڕیوایەتیان کردوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٥٢ - ١٥٣.

## باسی زیکرەکانی نوێژی تەسبیح (صَلاةُ التَّسْبِيح)

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا کە خۆی فەرموویەتی: زیاد لە حەدیسێك لەبارەی نوێژی تەسبیحەوە لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕیوایەت کراوە، بەڵام زۆرێکیان صەحیح نین.[1]

هەروەها فەرموویەتی: زانای پایەبەرز (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك)و، چەند زانایەکی تریش ئەو نوێژەیان بەلاوە پەسەندەو، باسی گەورەیی‌و فەزڵیشیان کردوە.

هەروەها ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: (أَحْمَد)ی کوڕی (عَبْدَة) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: (أَبو وَهْب) بۆی گێڕاینەوەو، فەرمووی: پرسیارم کرد لە (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك) دەربارەی ئەو نوێژەی، کە تەسبیحاتی تێدا دەکرێت، ئەویش فەرمووی: ئەو کەسەی دەیەوێت ئەو نوێژە بکات با (اللهُ أَكْبَر) بکاتو، پاشان بڵێت: (سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمْدِكَ، تَبارَكَ اسْمُكَ وَتَعالى جَدُّكَ وَلا إلهَ غَيْرُكَ). پاشان پانزە (١٥) جار بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ). پاشان (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) بکاتو، (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکاتو، سورەتی (الْفَاتِحَة)و سورەتێکی تریش بخوێنێتو، پاشان دە (١٠) جار بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ). پاشان بچێتە ڕکوعو، دە (١٠) جار ئەو زیکرە بکاتو، پاشان سەری بەرز بکاتەوەو، دە (١٠) جاری تر بیکاتو، پاشان سەجدە بباتو، دە (١٠) جاری تر بیکاتو، پاشان سەری بەرز بکاتەوەو، دە (١٠) جاری تر بیکاتو، پاشان بۆ جاری دوەم سەجدە بباتو، دە (١٠) جاری تر بیکاتو، ئیتر هەر بەم جۆرە چوار ڕکات نوێژ بکات. بەمەش لە هەموو ڕکاتێکدا حەفتاو پێنج (٧٥) تەسبیحاتی تێدایەو، سەرەتا بە پانزە (١٥) تەسبیحات دەست پێ بکاتو، پاشان قورئان بخوێنێتو، پاشان دە (١٠) جار تەسبیحات بکات. جا ئەگەر لەشەودا نوێژەکەی کرد، ئەوە من وام پێخۆشترە کە دوای دوو

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٤٨.

ڕكات سلاو بداتەوە. ئەگەر لە ڕۆژیشدا كردی، ئەوە ئەگەر ویستی با سلاو بداتەوەو، ئەگەر ویستیشی با سلاو نەداتەوە.

لە ڕیوایەتێكی تریشدا لە (عَبْدُالله)ی كوڕی (مُبَارَك)ـەوە هاتوە، كە فەرموویەتی: با لە ڕكوعدا سەرەتا سێ جار بلێت (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيْمِ)و، لە سەجدەشدا سێ جار بلێت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى)، ئەوجا تەسبیحاتەكان بكات.

پرسیاریش كراوە لە (عَبْدُالله)ی كوڕی (مُبَارَك) {پرسیار كەرەكە بریتیە لە: (عَبْدُالْعَزِيز)ی كوڕی (أَبِي رِزْمَةَ)}: ئەگەر كەسەكە لەم نوێژەدا سەهوی كرد، ئایا لە هەردوو سەجدەی سەهوەكەشدا دە جار دە جار تەسبیحات بكات؟ ئەویش فەرموویەتی: نەخێر، بەڵكو تەنها سێ سەد (٣٠٠) تەسبیحاتە.[(١)]

بۆشمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو رَافِع)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی بە (عَبَّاس)ی مامەی: "ئەی مامە، پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵدا نەبەستم؟ دیاریو خەڵاتت نەدەمێ؟ سوودت پێ نەگەیەنم؟" ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. پێغەمبەریش فەرمووی: "مامە، چوار ڕكات نوێژ بكەو، لە هەر ڕكاتێكدا سورەتی (الْفَاتِحَة)و سورەتێكی تریش بخوێنە. جا كە لە خوێندنی ئەوان بوویتەوە، بەرلەوەی بچیت بۆ ڕكوع پانزە جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ). پاشان بچۆرە ڕكوعەوەو، دە جار بیڵێو، پاشان سەرت بەرز بكەرەوەو، دە جار بیڵێرەوەو، پاشان سەجدە ببەو، دە جار بیڵێرەوەو، پاشان سەرت بەرز بكەرەوەو، دە جار بیڵێرەوەو، پاشان سەجدەی دوەم ببەو، دە جار بیڵێرەوەو، پاشان سەرت بەرز بكەرەوەو، بەرلەوەی هەستیتەوە دە جار بیڵێرەوە، بەمەش لە هەموو ڕكاتێكدا ژمارەی زیكرەكان دەبن بە حەفتاو پێنجو، لە هەر چوار ڕكاتەكەشدا دەبێت بە سێ سەد. جا ئەگەر

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٤٧ – ٣٤٩ / بە ژمارە: ٤٨١.

تاوانەکانت (لە زۆریدا) وەکو لمی کەڵەکەبوو لەسەریەکنیشتوو وەها بن، خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت بۆت". مامەیشی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ دەتوانێت هەموو ڕۆژێك ئەم نوێژە بکات و، ئەم زیکرانەشی تێدا بخوێنێت؟ پێغەمبەریش فەرمووی: "ئەگەر نەتتوانی هەموو ڕۆژێك بیخوێنیت، ئەوە هەفتەی جارێك بیخوێنە. خۆ ئەگەر نەشتتوانی هەموو هەفتەیەك بیخوێنیت، ئەوا هەموو مانگێك بیخوێنە. ئیتر هەر پرسیاری لێ کرد، تا پێی فەرموو: ساڵی جارێك بیخوێنە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: ئەمە حەدیسێکی (غَرِيْب)ـە.[1]

منیش دەڵێم: پێشەوای پایەبەرز (أَبو بَكْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) لە کتێبی (الْـأَحْوَذِيِّ فِي شَرْحِ التِّرْمِذِيِّ)دا فەرموویەتی: ئەم حەدیسەی (أَبو رَافِع) حەدیسێکی لاوازە و، ئەصڵێکی (صَحِيْح) یان (حَسَن)ی نیە. هەروەها فەرموویەتی: بۆیە ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش هێناویەتی، تاوەکو هۆشداری بدات لەبارەیەوە، نەوەکو کەس پێی هەڵبخەڵەتێت. هەروەها فەرموویەتی: بۆچوون و فەرمایشتەکەی (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك)یش بەڵگە نیە.

جا ئەمە فەرمایشتی پێشەوای پایەبەرز (أَبو بَكْر)ی (ابْنُ الْعَرَبِيّ) بوو.

شێخی (عُقَيْلِيّ)ش فەرموویەتی: حەدیسێکی سابت سەبارەت بە نوێژی تەسبیح حەدیسێك نەهاتوە.

هەروەها زانای پایەبەرز (أَبو الْفَرَج)ی (ابْنُ الْجَوْزِيّ) حەدیسەکانی نوێژی تەسبیحی بە ڕێگاکانیانەوە باس کردوە، پاشان هەموویانی بە لاواز داناوە و، لاوازیەکەشیانی ڕوون کردۆتەوە. ئەمەشی لە کتێبی (الْمَوْضُوْعَات)دا هێناوە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٢ / ٣٥٠ / بە ژمارە: ٤٨١، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَە / ١ /٤٤٢ / بە ژمارە: ١٣٨٦.

پێشمان گەیشتوە لە پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن)ی (دَارَقُطْنِيّ)ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، کە فەرموویەتی: صەحیحترین شت سەبارەت بە فەرزڵو گەورەیی سورەتەکانی قورئان بریتیە لە فەزڵی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد)و، صەحیحترین شتیش سەبارەت بە فەزڵو گەورەیی نوێژەکان بریتیە لە فەزڵی نوێژی تەسبیح.

منیش ئەم فەرمایشتەم لە کتێبی (طَبَقَاتُ الْفُقَهَاء)دا بە ڕشتەوە هێناوە، لە باسی پوختەی ژیانی پێشەوای پایەبەرز (أَبو الْحَسَن عَلِيُّ بْنُ عُمَرَ الدَّارَقُطْنِيّ).(١)

جا لەم فەرمایشتەوە ئەوە پێویست ناکات، کە حەدیسەکەی نوێژی تەسبیح حەدیسێکی (صَحِيْح) بێت. چونکە فەرموودەناسان دەفەرموون: ئەمە صەحیحترین حەدیسە کە لەم باسەدا هاتوە، ئیتر باوەکو لاوازیش بێت. مەبەستیان ئەوەیە، کە ئەو حەدیسە لەوانی تر لەپێشترەو، لاوازیەکەی کەمترە.

منیش دەڵێم: کۆمەڵێك لە هاوەڵانمان فەرموویانە: نوێژی تەسبیح سونەتە. لەوانە: زانای پایەبەرز (أَبو مُحَمَّد)ی (بَغَوِيّ)و، زانای پایەبەرز (أَبو الْمَحَاسِن)ی (رُوْيَانِيّ).

ئیمامی (رُوْيَانِيّ) لە کتێبی (بَحْرُ الْمَذْهَب)دا لە کۆتایی (كِتَابُ الْجَنَائِز)دا فەرموویەتی: بزانە، کە نوێژی تەسبیح کارێکی پەسەندەو، فەرمایشت هاتوە بۆ هەڵنانی خەڵك لەسەر کردنی، سونەتیشە مرۆڤی موسوڵمان لە هەموو کاتێکدا بیکاتو، لێی غافڵ نەبێت. هەروەها فەرموویەتی: (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك)و کۆمەڵێکیش لە زانایان وایان فەرموە.

---

(١) بەداخەوە لە نوسخە بەچاپگەیەنراوەکەدا ئەو فەرمایشتەی تێدا نیە. بڕوانە: طَبَقَاتُ الْفُقَهَاء الشَّافِعِيَّة (تَحْقِيْق: الدُّكْتُوْر عَلِيّ عُمَر) / ٣١٨ – ٣٢٠ / بە ژمارە: ٢٤٠. مَكْتَبَةُ الثَّقَافَةِ الدِّيْنِيَّة – الْقَاهِرَة / الطَّبْعَةُ الْأُوْلَى / ١٤٣٠ هـ – ٢٠٠٩ م.

ئەوجا فەرموویەتی: پرسیار کراوە لە (عَبْدُالله)ی کوڕی (مُبَارَك): ئەگەر نوێژخوێن لە نوێژی تەسبیحدا سەهوی کرد، ئایا لە هەردوو سەجدەی سەهوەکەشدا دە تەسبیحاتەکە بکات؟ ئەویش فەرموویەتی: نەخێر. بەڵکو نوێژەکە سێ سەد تەسبیحاتی تێدایە.

جا ئەگەرچی پێشتریش ئەم فەرمایشتەم هێنابوو سەبارەی سەجدەی سەهو، بەڵام بۆیە ئێستەش هێنامەوە لەبەر سوودێکی ورد، ئەویش ئەوەیە، کە ئەگەر زانایەکی وەکو ئەم پێشەوایە (واتە: شێخی رُوْيَانِيّ)، ئەم فەرمایشتە بهێنێت و، ئینکاریشی نەکات، ئەوە وا پیشان دەدات، کە ئەویش هەر هەمان بۆچوونی هەیە. بەمەش زانایانی خاوەنی ئەم بۆچوونە زۆر دەبن و، ئەم (شێخی رُوْيَانِيّ)ـەش یەکێکە لە هاوەڵە پایەبەرزو شارەزاکانمان. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.[1]

---

(١) ئیمامی (سُيُوْطِيّ) لە کتێبی (تُحْفَةُ الْأَبْرَار)دا بەشێوەیەکی کورت باسی نوێژی تەسبیحی کردوە، کە پوختەکەی بریتیە لەمە:

ئیمامی نەوەوی لەم کتێبەو لە کتێبی (الْمَجْمُوْع)و لە هەندێك کتێبی تریشدا وای هێناوە، کە حەدیسی قبوڵکراو (صَحِيْح یان حَسَن) لەبارەی نوێژی تەسبیحەوە نەهاتوەو، لە هەندێك لە کتێبەکانیشیدا (وەکو: تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَات) فەرموویەتی: لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و لە غەیری ئەویشدا حەدیسێکی (حَسَن)ی لەبارەوە هاتوە.

جا هەروەکو چۆن ئیمامی نەوەوی دوو بۆچوونی جیاوازی هەیە لەبارەی حەدیسی نوێژی تەسبیحەوە، بەهەمان شێوە شێخی عەسقەلانیش دوو بۆچوونی جیاوازی هەیە لەبارەیەوە، لە هەندێك لە کتێبەکانیدا بە (حَسَن)ی داناوەو، لە هەندێکیشیاندا بە لاواز.

بەڵام شێخ (ابْنُ الصَّلاح)ی شارەزووریش حەدیسەکەی بە حەدیسێکی (حَسَن) داناوەو، فەرموویەتی: لە چەند ڕێگەیەکەوە ڕیوایەت کراوە، کە هەندێکیان پاڵپشتی ئەوانی تریان دەکەن. بۆیە بۆ کار پێکردن دەشێت، بەتایبەتی لە مەسەلەی عیباداتدا.

سەبارەت بەوەش کە شێخی (ابْنُ الْجَوْزِيّ) حەدیسەکانی نوێژی تەسبیحی لە کتێبی (الْمَوْضُوْعَات)دا هێناوە، ئەوە زۆرێك لە زانایان بەرپەرچیان داوەتەوە. شێخی عەسقەلانی لە کتێبی (الْخِصَالُ الْمُكَفِّرَة)دا فەرموویەتی: شێخی (ابْنُ الْجَوْزِيّ) کارێکی خراپی کردوە،

که ئەو حەدیسانەی لەو کتێبەدا هێناوە. ئیمامی زەرکەشیش فەرموویەتی: بێ گومان شێخی (ابْنُ الْجَوْزِيّ) بەسەهودا چوە لە هێنانی حەدیسی نوێژی تەسبیح لە کتێبی (الْمَوْضُوْعَات)دا، چونکە حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە، نەوەك (ضَعِيْف)، چیجای ئەوەی (مَوْضُوْع)و هەڵبەستراو بێت.

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم زانایانە حەدیسەکەی نوێژی تەسبیحیان بە (صَحِيْح) داناوە: (ابْنُ خُزَيْمَة)و (حَاكِم)و (ابْنُ مَنْدَة)و (آجُرِّيّ)و (خَطِيْب)ی بەغدادیو (أَبُو سَعْد)ی (سَمْعَانِيّ)و (أَبُو مُوْسَى)ی (مَدِيْنِيّ)و (أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْمُفَضَّل)و (ابْنُ الصَّلاح)و (مُنْـذِرِيّ)و (نَوَوِيّ) لە کتێبی (تَهْذِيْبُ الْأَسْمَاءِ وَاللُّغَات)داو (سُبْكِيّ)و چەند زانایەکی تریش.

هەروەها زانای پایەبەرز (صَلاحُ الدِّيْن)ی (عَلائِيّ)و (سِرَاجُ الدِّيْن)ی (بُلْقِيْنِيّ)یش هەر بە (صَحِيْح)یان داناوە.

ئیمامی (سُيُوْطِيّ) خۆیشی فەرموویەتی: منیش نوسراوێکی تایبەتیم لەبارەی نوێژی تەسبیحەوە هەیە، بەناوی: (التَّصْحِيْحُ فِيْ صَلاةِ التَّسْبِيْحِ). بڕوانە: تُحْفَةُ الْأَبْرَار / ٩٢ – ٩٥.

## باسی ئەو زیکرانەی کە پەیوەندیان بە زەکاتەوە هەیە

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ﴾ [التَّوبَة: ١٠٣] واتە: {زەکات لە ماڵی ئەو کەسانە وەربگرە، تا بەهۆی ئەو زەکاتەوە لە چڵکی تاوان پاكو خاوێنیان بکەیتەوەو، دوعای خەیریشیان بۆ بکە}.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُاللهِ)ی کوڕی (أَبِيْ أَوْفَى)وە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکێك زەکاتو صەدەقەیان بهێنایە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئەویش دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ». واتە: "خوایە، ڕەحمەتی خۆت دابارێنە بەسەریاندا". جا (عَبْدُاللهِ) فەرمووی: (أَبُو أَوْفَى)ش زەکاتەکەی خۆی هێنا بۆ خزمەتیو، ئەویش فەرمووی: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِيْ أَوْفَى».[1] واتە: "خوایە ڕەحمەتی خۆت دابارێنە بەسەر خێزانو خانەوادەی (أَبُو أَوْفَى)دا".

ئیمامی (شَافِعِيّ)و هاوەڵانیش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: بۆچوونی هەڵبژێردراو لەسەر ئەوەیە، کە کەسی زەکاتوەرگر بە کەسی زەکاتدەر بڵێت: (آجَرَكَ اللّهُ فِيْما أعْطَيْتَ، وَجَعَلَها لَكَ طَهُوراً، وَبَارَكَ لَكَ فِيْما أَبْقَيْتَ). واتە: (خوای گەورە پاداشتت بداتەوە لەبریتی ئەوەی کە داوتەو، بیکات بە پاکەوەکەر بۆتو، فەڕو بەرەکەتیش بخاتە ئەوەی، کە بۆ خۆتت هێشتۆتەوە).

جا ئەم دوعایە سونەتە بۆ ئەو کەسەی زەکاتەکەی وەرگرتوە، ئیتر ئایا ئەو کەسە بێت کە زەکات کۆدەکاتەوە، یان یەکێك بێت لە هەژارو نەدارەکان. بەڵام دوعاکە واجب نیە بەپێی بۆچوونی مەشهووری مەزهەبەکەی ئێمەو مەزهەبی زانایانی تریش.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ٢ / ٥٤٤ / بە ژمارە: ١٤٢٦، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٧٥٦ / بە ژمارە: ١٠٧٨.

هەندێکیش لــە هاوەڵانمان فەرموویانــە: ئــەو دوعایــە واجبــە. چــونکە ئیمــامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: پێویستە لەسەر فەرمانڕەوای موسوڵمانان کە دوعای خــەیری بۆ بکات. بەڵگەکەشی بریتیە لە ڕواڵەتی ئەو فەرمانەی، کە لــە ئایەتەکــەدا هــاتوە (واتە: وَصَلِّ عَلَيْهِمْ).

زانایان فەرموویانە: سونەت نیە لە دوعاکەدا بڵێــت: (اللَّهُمّ صَلِّ عَلَى فُــلانٍ). واتە: (خوایە صەلاوات بدە لەسەر فلاّنە کەس). مەبەستیش لەو فەرمایشتەی خوای گەورە، کە فەرموویەتی (وَصَلِّ عَلَيْهِمْ)، ئەوەیە، کە دوعایان بۆ بکە.

سەبارەت بەو فەرمایشــتەی پێغەمبــەری خــواش (دروودی خوای لەسەر بێت)، کــە فەرموویــەتی: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ». ئــەوە بۆیــە وای فــەرموە، چــونکە بــەکارهێنانی وشەی (صلاة) یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەو، بۆیە ئــەو بــۆی هەیــە ڕووبــەڕووی کەسێك بەکاری بهێنێت، بەپێچەوانەی ئێمەوە (کە بۆمان نیە).

زانایان فەرموویانە: هەروەکو چۆن ناوترێت (مُحَمَّد عَزَّ وَجَلَّ)، باوەکو کەسێکی (عَزِيْز)و (جَلِيْل)یش بێت، بە هەمان شێوە ناوترێت: (أَبو بَكْر، یان عَلِيّ –صَــلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم–). بەڵکو دەوترێت: (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، یــان (رِضْــوَانُ اللهِ عَلَيْــهِ)، یــان هاووێنەی ئەمان. بۆیە ئەگەر وتی: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئەوە بۆچوونی درووست کە زۆربەی هاوەڵانمانی لەسەرە، ئەوەیە کە ناپەسەندە. هەنــدێکیش لــە هاوەڵانمــان فەرموویانە: ناوترێت ناپەسەندە، بەڵکو باشــتر وەهایــە وا نــەوترێت. هەندێکیشــیان فەرموویانە: درووست نیە، بەڵکو حەرامە.

بە هەمان شێوە نابێت بۆ غەیری پێغەمبەران بوترێت: (عَلَيْهِ السَّلام)، یان شــتێکی لەو جۆرە، مەگەر بەشێوەی ڕووبەڕوو پێی بڵێــت (عَلَيْكَ السَّــلام)، یــان وەڵامــی سڵاوەکەی بداتەوە. چونکە سڵاو کردن سونەتەو، وەڵامدانەوەشی واجبە.

پاشان هەموو ئەمەی کە باسمان کرد، تایبەتبوو بە صەلات‌و سەلام لەسەر کەسانی غەیری پێغەمبەران، کە خۆیان بەتەنها مەبەست بن. بەلاّم ئەگەر بەشوێنکەوتوویی پێغەمبەرانەوە صەلات‌و سەلام لەسەر ئەوانیش بدرێت، ئەوە ناکۆکی تێدا نیە کە کارێکی دروستە. بۆ نموونە دەوترێت: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِهِ، وَأَصْحَابِهِ، وَأَزْوَاجِهِ، وَذُرِّيَّتِهِ، وَأَتْبَاعِهِ). چونکە زانایانی (سەلەف) ڕێگریان لەوە نەکردوە. بەڵکو ئێمە فەرمانیشمان پێکراوە لە تەحیات‌و لە شتی تردا کە بەو جۆرە بکەین. ئەمیش بەپێچەوانەی ئەوەی، کە بە تەنها صەلاوات بدرێت لەسەر کەسێك.

جا منیش پێشتر ئەم بابەتەم بە درێژی باسکرد، لە (**(کتێبی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا** (دروودی خوای لەسەر بێت))). لە (**باسی صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەران‌و لەسەر خزم‌و کەس‌وکارەکانیشیان بە شوێن ئەواندا**).

## باسێك: {حوکمی نیەتهێنان لەکاتی دەرکردنی زەکاتدا}

بزانە کە نیەتی دەرکردنی زەکات واجبەو، نیەتەکەشی بە دڵ دەبێت، وەکو عیبادەتەکانی تر. سونەتیشە بە زمانیش نیەت بهێنێت، هەر وەکو عیبادەتەکانی تر. جا ئەگەر تەنها بە زمان نیەتی هێناو، بە دڵ نەیهێنا، ئەوە بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر دروستی نیەتەکەی: دروستترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە کە نیەتەکەی دروست نیە.

هەروەها پێویست نیە لەسەر کەسی زەکاتدەر ئەگەر نیەتی هێنا لەگەڵیشیدا بڵێت: ئەمە زەکاتە. بەڵکو هەر ئەوەندە بەسە کە زەکاتەکە بدات بە کەسێك، کە پێی بشێت. خۆ ئەگەر وتیشی: ئەمە زەکاتە، ئەوە هیچ زیانی نیە. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

## باسێك: {نزاو پاڕانەوە لەكاتی دەركردنی زەكاتدا}

ئەو كەسەی زەكات یان صەدەقە یان نەزر یان كەفارەت یان شتێكی لەو شێوە دەدات، سونەتە بڵێت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [البقرة: ١٢٧]. چونكە خوای گەورە لە باسی حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)و حەزرەتی (إِسْمَاعِيْل)ی كوڕیدا (درودو سەلامی خوایان لەسەر بێت)و، لە باسی ژنەكەی (عِمْرَان)یشدا لەسەر زمانی ئەوانەوە وای فەرموە.

حەزرەتی (إِبْرَاهِيْم)و حەزرەتی (إِسْمَاعِيْل) فەرموویانە: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [البقرة: ١٢٧] واتە: {ئەی پەروەردگارمان، بە لوتفی خۆت ئەم كارە چاكەمان لێ وەرگریت، بەڕاستی تۆ بیسەری داواكەمانیت‌و، زاناو شارەزایت بە نیەت‌و مەبەستمان}.

ژنەكەی (عِمْرَان)یش فەرموویەتی: ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ [آل عِمْرَان: ٣٥] واتە: {ئەی پەروەردگارم، من ئەوەی لە سكمدایە نەزرم كردو تەرخانم كرد بۆ خزمەتكاری ماڵەكەی تۆ (بَيْتُ الْمَقْدِس)، دەی تۆش بە لوتفی خۆت لێم قبوڵ بفەرموو، بەڕاستی تۆ بیسەری داواكەمی‌و، زاناو ئاگاداریشیت بە نیەت‌و مەبەستم}.

## ئەگەر کەسێك مانگی یەکشەوەی بینی، یان مانگی بینی چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ەکەی ئیمامی (دَارِمِيّ)و کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (طَلْحَة)ی کوڕی (عُبَيْدُالله)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بە مانگی یەکشەوە بکەوتایە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنا بِالْيُمْنِ وَالْإِيْمَانِ وَالسَّلامَةِ وَالْإِسْلامِ. رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ». واتە: "خوایە ئەم مانگە بە بەرەکەتو بە ئیمانو بە سەلامەتیو بە ئیسلامەتیەوە هەڵبێنە بەسەرماندا. ئەی مانگەکە، پەروەردگاری منو پەروەردگاری تۆش هەر خوایە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (مُسْنَد)ەکەی ئیمامی (دَارِمِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بە مانگی یەکشەوە بکەوتایە، دەیفەرموو: «اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنا بِالْأَمْنِ وَالْإِيْمَانِ وَالسَّلامَةِ وَالْإِسْلامِ، وَالتَّوْفِيقِ لِمَا تُحِبُّ وَتَرْضَى. رَبُّنا وَرَبُّكَ اللَّهُ».[2] واتە: "خوا لە هەموان گەورەترە، خوایە ئەم مانگە هەڵبێنە بەسەرماندا بە ئاسایشو بە ئیمانو بە سەلامەتیو بە ئیسلامەتیو بە

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٧ / بە ژمارە: ١٦٨٨، وسُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٥٠٤ / ٣٤٥١.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ الدَّارِمِيّ / ٢ / ٧ / بە ژمارە: ١٦٨٧. هەروەها شێخی (ابْنُ حِبَّان)و ئیمامی (طَبَرَانِيّ)یش ڕیوایەتیان کردوە. جا شێخی (هَيْثَمِيّ)و شێخی عەسقەلانیش ڕشتەکەیان بە لاواز دانەوە. بەڵام شێخ (شُعَيْب)ی (أَرْنَؤُوط) لە تەخریجی حەدیسەکانی (صَحِيْح)ی (ابْنُ حِبَّان)دا فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْحٌ لِغَيْرِهِ)یە. بڕوانە: صَحِيْحُ ابْنِ حِبَّان / ٣ / ١٧١ / بە ژمارە: ٨٨٨، والْمُعْجَمُ الْكَبِيْر / ١٢ / ٣٥٦ / بە ژمارە: ١٣٣٣٠، ومَجْمَعُ الزَّوَائِد / ١٠ / ١٣٩ / بە ژمارە: ١٧١٤٨، ونَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٩٠، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٣٠.

تەوفیقیەوە بۆ ئەو کارەی خۆت پێت خۆشەو، پێی ڕازیت. ئەی مانگەکە، پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری تۆش هەر خوایە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (كِتَابُ الْأَدَب)ی (سُنَن) ئیمامی (أَبُو دَاوُد)دا، لە زانای پایەبەرزی شوێنکەوتوان {(قَتَادَة)ی کوڕی (دِعَامَة)}وە، کە ئەو پێی گەیشتوە، ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بە مانگی یەکشەوە بکەوتایە، سێ جار دەیفەرموو: «هِلالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ، هِلالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ، هِلالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ، آمَنْتُ بِاللهِ الَّذِيْ خَلَقَكَ». واتە: "مانگی خەیرو بەرەکەت بێت لە ڕزق‌و ڕۆزی‌و مانگی دینداری‌و ڕاپەڕاندنی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت. ئەی مانگەکە، من ئیمانم بەو خوایە هەیە، کە تۆی بەدیهێناوە". پاشان دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ ذَهَبَ بِشَهْرِ كَذَا، وجَاءَ بِشَهْرِ كَذَا».[1] واتە: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی فلانە مانگی بەڕێکردو، فیسارە مانگی هێنا".

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتوە لە (قَتَادَة)وە، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، چاوی بە مانگی یەکشەوە بکەوتایە، ڕووی لێ وەردەگێڕا.[2]

ئیمامی (أَبُو دَاوُد) ئەم دوو حەدیسەی بەم جۆرە بە (مُرْسَل)ی ڕیوایەت کردوە.

لە هەندێك لە نوسخەکانی (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)دا هاتوە، کە ئیمامی (أَبُو دَاوُد) فەرموویەتی: لەم باسەدا حەدیسێکی (مُسْنَد)ی (صَحِيْح) لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت) نەهاتوە.[3]

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ /٧٤٦ / بە ژمارە: ٥٠٩٢.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ /٧٤٦ / بە ژمارە: ٥٠٩٣.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ /٧٤٦.

هەروەها ئەم حەدیسەمان لە کتێبەکەی (ابْنُ السُّنِّي)شدا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبو سَعِيْد)ی (خُدْرِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێت).[1]

سەبارەت بە بینینی مانگیش حەدیسێکمان لە کتێبەکەی (ابْنُ السُّنِّي)دا بۆ ڕیوایەت کراوە، لە (عَائِشَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەستی گرتمو، مانگیش لەو کاتەدا هەڵدەهات، جا پێی فەرمووم: «تَعَوَّذِيْ بِاللهِ مِنْ شَرِّ هَذَا الْغاسقِ إِذَا وَقَبَ».[2] واتە: "پەنا بەخوا بگرە لە شەڕو خراپەی ئەم شەوە تاریکە، ئەگەر تاریکاییەکەی هەموو شوێنێك دابگرێت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە (حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء)دا بە ڕشتەیەکی لاواز، لە (زیاد)ی (نُمَيْرِيّ)ـەوە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (أَنَس)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێی بخستایەتە مانگی (رَجَب)ـەوە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، بارِكْ لَنَا فِيْ رَجَبَ وَشَعْبَانَ، وَبَلِّغْنا رَمَضَانَ».[3] واتە: "خوایە بەرەکەت بخەرە هەردوو مانگی (رَجَب)و (شَعْبَان)ـەوە بۆمانو، بشمانگەیەنە بە مانگی ڕەمەزان".

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٤ / بە ژمارە: ٦٤٢. ڕشتەکەی لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٣٢.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣٠٦ / بە ژمارە: ٦٤٨. ئیمامی (تِرْمِذِيّ)ش ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردوەو، فەرمووشێتی: حەدیسێکی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـەو، ئیمامی (حَاكِم)یش فەرموویەتی: ڕشتەکەی (صَحِيْح)ـە. جا پێم سەیرە، کە ئیمامی نەوەوی تەنها لە ڕێگەی شێخی (ابْنُ السُّنِّيّ) ڕیوایەتی کردوە!!! بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ / ٤٥٢ / بە ژمارە: ٣٣٦٦، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ٢ / ٥٨٩ / بە ژمارە: ٣٩٨٩.

(٣) بڕوانە: حِلْيَةُ الْأَوْلِيَاء / ٦ /٢٦٩.

هەروەها ئەم حەدیسەمان بە زیادەیەکەوە لە کتێبەکەی (ابْنُ السُّـنِّي)شـدا بـۆ ڕیوایەت کراوە.(١)

## باسی ئەو زیکرانەی کە لە ڕۆژوودا سونەتن

سونەتە کەسی ڕۆژووگـر نیـەتی ڕۆژوو بـە دڵۆ بـە زمـان بهێنێـت، وەکـو بـۆ عیبادەتەکانی تریش وتمان. خۆ ئەگەر تەنها بە دڵ هێنای، ئەوە بەسێتی. بەڵام ئەگـەر تەنها بە زمان هێنای، ئەوە بەبێ ناکۆکی ئەو نیەتە جێگەی بۆ ناگرێـتو درووسـت نیە.

سونەتیشە ئەگەر لەکاتی بەڕۆژووبووندا کەسێك قسەیەکی خراپـی پـێ گـوت، یان نەفامیەکی کرد بەرامبەری، ئەو دوو جار یان زیاتر پێی بڵێت: من بەڕۆژووم.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لـە هـاوەڵی خۆشەویست (أَبو هُرَيْرَةَ)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوای لێ بێت) فەرموویـەتی: «الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا صَامَ أَحَدُكُمْ فَلا يَرْفُثْ وَلا يَجْهَلْ، وَإِنِ امْـرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّيْ صَائِمٌ، إِنِّيْ صَائِمٌ، مَـرَّتَيْنِ».(٢) واتـە: "ڕۆژوو قـەڵغانو بەربەستە بۆ ڕۆژەوان لە تاوانی دنیاو لە سزای دواڕۆژ، جا ئەگەر یەکێك لە ئێـوە ڕۆژووی گرت، با قسەی خراپو نەفامی نەکاتو، ئەگەر کەسـێکیش شـەڕی پـێ گێڕا، یان قسەی پێ گوت، با ئەو دوو جار بڵێت: (من بەڕۆژووم)".

منیش دەڵێم: وتراوە: با ئەو قسەیە بە زمان بکات، بە جۆرێك کە ئەو کەسـەی قسە خراپەکەی بەرامبەری کردوە گوێی لێبێت، بەڵکو واز بهێنێت. وتراویشـە: بـا

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٣١٠ / بە ژمارە: ٦٥٩. زیادەکەش بریتیە لەمـە: «إِنَّ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ لَيْلَةٌ غَرَّاءُ، وَيَوْمَهَا يَوْمٌ أَزْهَرُ».

(٢) بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيّ / ٢ / ٦٧٠ / بە ژمارە: ١٧٩٥، وصَحِيْحُ مُسْـلِم / ٢ / ٨٠٦ / بە ژمارە: ١١٥١.

بە دڵ بیڵێت، تاوەکو خۆی لە بێ ئەدەبی کەسە نەفامەکە بپارێزێت و، پارێزگاری لە ڕۆژوەکەی خۆیشی بکات. جا بۆچوونی یەکەمیان بەهێزترە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (ابْنُ مَاجَه)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُم: الصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ، وَالْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ». واتە: "سێ کەس نزاو پاڕانەوەیان ڕەد ناکرێتەوە: ڕۆژوەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوەو، پێشەواو فەرمانڕەوای دادپەروەرو، دوعای کەسی ستەملێکراو".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە.[1]

منیش دەڵێم: ڕیوایەتەکە بەم جۆرە هاتوە (حَتَّى يُفْطِرَ). خواش لە هەموو کەسێك زاناترە.[2]

## ئەوەی کەسی ڕۆژوەوان لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا دەیڵێت

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە (سُنَن)ی (أَبُو دَاوُد)و (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەربانگی بکردایەتەوە، دەیفەرموو: «ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ /٥٧٨ / بە ژمارە: ٣٥٩٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ /٥٥٧ / بە ژمارە: ١٧٥٢.

(٢) شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: وەکو بڵێیت ئیمامی نەوەوی بەم فەرمایشتەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەو تەعبیرە بەم جۆرەش ڕیوایەت کراوە (حِيْنَ يُفْطِر). جا ڕاستە کە بەم جۆرەش ڕیوایەت کراوە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ١٩٨، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٣٨.

الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الْأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى».[1] واتە: "تینوێتی ڕۆیشــتو، دەمارەکـان تەڕبوونەوەو، پاداشتیش دەستکەوت، ئەگەر خوا بیەوێت".

منیش دەڵێم: وشەی (ظَمَأ) کۆتاییەکەی درێژناکرێتەوەو، بە مانای تینوێتی دێت. خوای گەورە فەرموویـەتی: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ لا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ﴾ [التوبـة: ١٢٠]. جـا ئەمـە ئەگەرچی ڕوونو ئاشکراشە، بەڵام بۆیە باسم کرد، چونکە خەڵکم بینیوە کـە لێـی گۆڕاوەو، وای زانیوە درێژ دەکرێتەوە. (واتە: بە (ظَمَاء) خوێندویەتیەوە).[2]

بۆمان ڕیوایـەت کـراوە لـە (سُـنَن)ی (أَبـو دَاوُد)دا، لـە زانـای پایەبـەرزی شوێنکەوتوان (مُعَاذ)ی کوڕی (زُهْرَة)وە، کە پێیگەیشـتوە، ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەربانگی بکردایەتەوە، دەیفـەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ صُـمْتُ، وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ». واتە: "خوایە، بۆ تۆ بەڕۆژوو بـووم‌و، لەسـەر ڕزق‌و ڕۆزی تۆش بەربانگم کردەوە".[3]

ئیمامی (أَبو دَاوُد) بەم جۆرە بە (مُرْسَل)ی ڕیوایەتی کردوە.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکـەی (ابْنُ السُّـنِّي)دا، لـە (مُعَـاذ)ی کـوڕی (زُهْرَة)وە، کـە فەرموویـەتی: ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)،

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ /٧١٩ / بە ژمـارە: ٢٣٥٧، وسُنَنُ النَّسَـائِيِّ / ٢ /٢٥٥ / بـە ژمارە: ٣٣٢٩. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (حَسَن)ـە. بڕوانە: الْفُتُوحَـاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٣٩.

(٢) زانای پایەبەرز مەلا عەلی قاری فەرموویـەتی: ئـەم فەرمایشـتەی ئیمـامی نـەوەوی جێگـەی سەرنجە. چونکە ئەو وشەیە لـە ئایەتەکـەدا بـە (ظَمَـاء)یش خوێنراوەتـەوە. هـەروەها لـە قاموسیشدا هاتوە: کە مەصدەری (ظَمِئَ) بەم دوو جۆرە هاتوە: (ظَمَـأ)و (ظَمَـاء). ئـەوجا فەرموویەتی: ڕەنگە ئیمامی نەوەوی مەبەستی ئەوە بێت، کە ئەو وشـەیە لـەڕووی ڕیوایـەوە هەر بە (ظَمَأ) هاتوە، نەك بفەرموێت لـەڕووی زمانەوانیەوە بە (ظَمَاء) نەهاتوە. بڕوانـە: مِرْقَاةُ الْمَفَاتِيْح / ٤ / ١٣٨٦.

(٣) بڕوانە: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ١ /٧١٩ / بە ژمارە: ٢٣٥٨.

بەربانگی بکردایەتەوە، دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ أعَانَنِي، فَصُمْتُ، وَرَزَقَنِي، فَأفْطَرْتُ».[1] واتە: "سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە هاوکاری کردم، تا بەرۆژوو بووم‌و، ڕزق‌و ڕۆزیشی دام، تا بەربانگم کردەوە".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی (ابْنُ السُّنِّي)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عَبَّاس)ـەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەربانگی بکردایەتەوە، دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ، لَكَ صُمْنا، وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْنا، فَتَقَبَّلْ مِنَّا، إنَّكَ أنْتَ السَّمِيعُ العَلِيمُ».[2] واتە: "خوایە بۆ تۆ بەرۆژوو بووین‌و، لەسەر ڕزق‌و ڕۆزی تۆش بەربانگمان کردەوە، دەی تۆش لێمان وەرگرە، بەڕاستی تۆ بیسەرو زانایت".

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو کتێبەکەی (ابْنُ مَاجَه)و (ابْنُ السُّنِّي)دا، لە (عَبْدُالله)ی کوڕی (أبِيْ مَلِيْكَة)وە، ئەویش لە هاوەڵی خۆشەویست (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَمْرو)ی کوڕی (عَاص)ـەوە (خوا لە خۆی‌و باوکیشی ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: لە پێغەمبەری خوام بیستوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «إنَّ لِلصَّائِمِ عِنْدَ فِطْرِهِ لَدَعْوَةً مَا تُرَدُّ». واتە: "بەڕاستی ڕۆژوەوان لەکاتی بەربانگدا نزاو پاڕانەوەیەکی هەیە، ڕەد ناکرێتەوە".

پێشەوای پایەبەرز (ابْنُ أبِيْ مَلِيْكَة) فەرموویەتی: گوێم لە (عَبْدُالله)ی کوڕی (عَمْرو)ەوەبوو، ئەگەر بەربانگی بکردایەتەوە، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إني أسألُكَ

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٦ / بە ژمارە: ٤٧٩. ئەمیش هەر وەکو حەدیسەکەی پێشوو حەدیسێکی (مُرْسَل)ـە.

(٢) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيّ) / ٢٢٦ – ٢٢٧ / بە ژمارە: ٤٨٠. ڕشتەکەی زۆر لاوازە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٣٩.

بِرَحْمَتِكَ الَّتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ أنْ تَغْفِــرَ لِــيْ).[1] واتــه: (خوایــه بــه‌و ڕه‌حمــه‌ت‌و میهره‌بانیه‌ی خۆت، كه هــه‌موو شــتێكی گرتۆتــه‌وه، داوات لێ ده‌كــه‌م لــێم خــۆش ببیت).

## ئه‌گه‌ر كه‌سی ڕۆژووان لای كه‌سێك به‌ربانگ بكاته‌وه چی بلێت؟

بۆمان ڕیوایه‌ت كــراوه لــه (سُــنَن)ی (أَبُــو دَاوُد)و لــه غــه‌یری ئه‌ویشــدا بــه ڕشته‌یه‌كی (صَحِيْح)، له هاوه‌ڵی خۆشه‌ویست (أَنَس)ــه‌وه (خوای لێ ڕازی بێـت)، كــه پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خوای له‌سه‌ر بێـت)، ته‌شریفی هێنا بۆلای هاوه‌ڵی خۆشه‌ویســت (سَعْد)ی كوڕی (عُبَادَة)و، ئه‌ویش نان‌و مێوژی هێنایــه خزمــه‌تی.[2] جــا پێغه‌مبــه‌ری خوا ده‌ستی كرد به خواردن‌و، دواتر فــه‌رمووی: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وأَكَــلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَــةُ».[3] واتــه: "داواكــارم لــه پــه‌روه‌ردگار هه‌میشه ڕۆژووه‌وانــان بــه‌ربانگتان لــه‌لا بكه‌نــه‌وه‌و، چــاكه‌كارانیش نانتــان بخــۆن‌و، فریشته‌كانیش داوای لێخۆشبوون‌و میهره‌بانی خواتان بۆ بكه‌ن".

بۆشمان ڕیوایه‌ت كراوه لــه كتێبه‌كه‌ی (ابْنُ السُّنِّيِّ)دا، لــه هــاوه‌ڵی خۆشه‌ویســت (أَنَس)ــه‌وه (خوای لێ ڕازی بێت)، كه فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا (دروودی خـوای

---

(١) بڕوانه: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ١ /٥٥٧ / بــه ژمــاره: ١٧٥٣، وعَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّنِّيِّ) / ٢٢٧ / به ژماره: ٤٨١. شێخی عه‌سقه‌لانی فه‌رموویه‌تی: حه‌دیســێكی (حَسَن)ــه. بڕوانــه: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٢٠٢، والْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٤٢.

(٢) له زۆربــه‌ی نوســخه‌كاندا بــه‌م جــۆره هــاتوه (بِخُبْــزٍ وَزَيْــتٍ). جــا شــێخی عه‌ســقه‌لانی فه‌رموویه‌تی: وا ده‌زانم خۆی (زَبِيْب) بوه‌و، به هه‌ڵه گــۆڕدراوه بــۆ (زَيْت). بڕوانــه: نَتَــائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٢٠٤.

(٣) بڕوانه: سُنَنُ أَبِيْ دَاوُد / ٢ /٣٩٥ / به ژماره: ٣٨٥٤.

لەسەر بێت)، بەربانگی لای خەڵكێك بكردایەتەوە، دوعای بۆ دەكردن‌و، دەیفەرموو: «أفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وأكَلَ طَعَامَكُمُ الْأبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ».[1]

## نزاو پاڕانەوەی شەوی قەدر (لَيلَةُ القَدْر)

بۆمان ڕیوایەت كراوە لە كتێبەكانی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)و (نَسَائِيّ)و (ابْنُ مَاجَـــه)و لە غەیری ئەوانیشدا، بـە چـەند ڕشتەیەكی (صَـــحِيْح)، لـە (عَائِشَـــة)ی دایكـی ئیماندارانەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، كە فەرموویەتی: عـەرزی پێغەمبـەری خـوام كـرد: قوربان ئەگەر زانیم شەوی قەدر كام شەوەیە، چی تێدا بڵـێم؟ ئـەویش فـەرمووی: بڵێ «اللَّهُمَّ، إنَّكَ عَفُوٌّ، تُحِبُّ العَفْوَ، فَـــاعْفُ عَنِّـــي». واتـە: "خوایـە، تـۆ زاتێكـی لێبوردەیت‌و، لێبوردنیشت خۆش دەوێت، جا كەوابوو لێم خۆشبە".

ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێكی (حَسَن)ی (صَحِيْح)ـە.[2]

هاوەڵانمان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) فەرموویانە: سونەتە لەو شەوەدا زۆر لەم دوعایە بكات‌و، سونەتە قورئانیش بخوێنێت‌و، ئەو زیكرو دوعایانەی تریش بكـات، كـە لـە جێگە پیرۆزەكاندا سونەتن‌و، ئێمەش پێشتر بە كۆمەڵێ بـە پـەرت‌و بڵاویـش باسمـان كردن.

---

(١) بڕوانە: عَمَلُ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَة (ابْنُ السُّــنِّيّ) / ٢٢٧ / بـە ژمـارە: ٤٨٢. شـێخی عەسـقەلانی فەرموویەتی: ڕشتەكەی لە جۆری (حَسَن)ـە. بڕوانە: نَتَائِجُ الْأفْكَار / ٥ / ٢٠٤.

(٢) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ /٥٣٤ / بە ژمـارە: ٣٥١٣، وسُنَنُ النَّسَائِيّ الْكُبْرَى / ٦ /٢١٨ / بە ژمارە: ١٠٧٠٨، وسُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ /١٢٦٥ / بە ژمـارە: ٣٨٥٠، والْمُسْتَدْرَكُ عَلَى الصَّحِيْحَيْن / ١ / ٧١٢ / بە ژمارە: ١٩٤٢.

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (مـن بـە سـونەتی دەزانم، کـە مرۆڤی موسوڵمان لە شەوی قـەدردا چـەنێك کۆشـش دەکـات، لــە ڕۆژەکەشـیدا هەروەکو شەوەکەی بیکات). ئەمە دەقی فەرمایشتەکەی ئەو بوو.

هەروەها سونەتە لە شەوی قەدردا زۆر دوعا بۆ کاروباری موسوڵمانان بکـات. چونکە ئەمە نیشـانەو پیشـەی پیاوچـاکانو بەنـدە ڕاسـاڵەکانی خـوای گەورەیـە. تەوفیقیش تەنها بە دەستی خوایە.

## باسی زیکرەکانی مانەوە لەناو مزگەوتدا (الاعتِکاف)

سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لــە ئیعتیکافـدا قورئـان زۆر بخوێنێـتو، زیکرەکـانی تریش زۆر بکات.

بزانە کە ئەو زیکرو دوعایانەی کە لە حەجدا دەکرێن زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بە گرنگەکانیان دەکەین.

جا ئەو زیکرانە دەبن بە دوو بەشەوە:

- **زیکرەکانی سەفەر کردن بۆ حەج.**
- **زیکرەکانی خودی حەج کردن.**

سەبارەت بەو زیکرانەی لە سەفەری حەجدا دەکرێن، ئەوە دوایان دەخەین و، –ئەگەر خوای گەورە بیەوێت– لە زیکرەکانی سەفەر کردندا باسیان دەکەین.

سەبارەت بەو زیکرانەش کە لە خودی حەج کردندا دەکرێن، ئەوە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت هەر بەپێی ڕیزبەندی ڕاپەڕاندنی کارەکانی حەج کردن باسیان دەکەین و، منیش بەڵگەو حەدیسەکان بۆ زۆربەیان ناهێنمەوەو لایان دەبەم، لەبەرئەوە کتێبەکە درێژ نەبێتەوەو، کەسی خوێنەر بێتاقەت و ماندوو نەکات. چونکە ئەم باسە زۆر درێژە، بۆیە –ئەگەر خوای گەورە بیەوێت– بەشێوەیەکی کورت و پوخت باسی دەکەم.

یەکەم زیکرێك لەوانە ئەوەیە، کە ئەگەر ویستی ئیحرام ببەستێت، با خۆی بشۆرێت و، دەستنوێژ بگرێت و، بەرگ و پۆشاکی ئیحرام لەبەر بکات.

پێشتریش باسمان کرد، کە ئەو کەسەی دەستنوێژ دەگرێت چی زیکرێك دەکات و، ئەو کەسەش خۆی دەشۆرێت چی زیکرێك دەکات و، چی زیکرێکیش دەکات ئەگەر پۆشاکێك لەبەر بکات.

پاشان دوو ڕکات نوێژ دەکات. پێشتریش زیکرەکانی نوێژمان باس کرد.

جا سونەتە لە ڕکاتی یەکەمی نوێژەکەدا، لەدوای سورەتی (الْفَاتِحَة)وە سورەتی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنێت‌و، لە ڕکاتی دوەمیشدا سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێت.

پاشان ئەگەر لە نوێژەکە بوویەوە، سونەتە هەر دوعایەك خۆی دەیەوێت بیکات‌و، پێشتریش باسی کۆمەڵێك لەو دوعاو زیکرانەمان کرد، کە لەدوای نوێژەکانەوە دەکرێن.

پاشان ئەگەر نیازی ئیحرامی هەبوو، با بە دڵ نیەت بهێنێت‌و، سونەتیشە بۆ یارمەتیدانی دڵی بە زمانیش بڵێت: نیەتم هەیە واجبی حەج جێبەجێ دەکەم‌و، ئیحرام بە حەج دەبەستم بۆ خوای گەورە. ئەوجا دەست بکات بە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْك).

جا ئەوەی کە واجبە بریتیە لە نیەتهێنان بە دڵ‌و، ئەوەی زمانەکە سونەتە. بۆیە ئەگەر تەنها بە دڵ نیەتی هێنا، ئەوە بەسە. بەڵام ئەگەر تەنها بە زمان هێنای، ئەوە بەس نیە.

پێشەوای پایەبەرز (أَبُو الْفَتْح) (سُلَيْم)ی کوڕی (أَيُّوب)ی (رازِيّ) فەرموویەتی: ئەگەر لەدوای نیەتهێنانەوە بڵێت: (اللَّهُمَّ لَكَ أُحْرِمُ نَفْسِي وَشَعْرِيْ وَبَشَرِيْ وَلَحْمِيْ وَدَمِيْ) ئەوە باشترە. واتە: (خوایە تەنها بۆ تۆ گیان‌و مووی لاشەم‌و پێست‌و گۆشت‌و خوێنم دەخەمە ئیحرامەوە).

یەکێکی تر لە زانایان فەرموویەتی: هەروەها با بڵێت: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ). کە ئەمە دەقی تەلبیە کردنی پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لەسەر بێت).

سونەتیشە لە یەکەم جاری تەلبیە کردنەکەدا بڵێت (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِحَجٍّ)، ئەگەر ئیحرامی بە حەج بەستبوو. یان بڵێت: (لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ)، ئەگەر ئیحرامی بە (عُمْرَة)

بەستبوو. ئیتر بەپێی مەزهەبی درووستی هەڵبژێردراو لەدوای ئەو جارە لە تەلبیەکانی دواتردا باسی حەجو عومرە ناکات.

ئەوجا بزانە کە تەلبیە کردن سونەتە. بۆیە ئەگەر نەیشیکات، حەجو عومرەکەی هەر درووستنو، هیچیشی ناکەوێتە سەر. بەڵام فەزڵێکی گەورەی لەدەست دەرچوەو، شوێنی پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) نەکەوتوە.

ئەمەش بۆچوونی درووستی مەزهەبەکەی ئێمەو مەزهەبی زۆربەی زانایانیشە. بەڵام هەندێك لە هاوەڵانمان تەلبیە کردنیان بە واجب داناوەو، هەندێکیشیان بەمەرجی درووستی حەجەکەیان داناوە. جا بۆچوونی ڕاست ئەوەی یەکەمیانە. بەڵام هەم لەبەر شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، هەم لەبەر دەرچوونیش لەو ڕاجیاییە سونەتە بکرێتو تەرك نەکرێت. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

جا ئەگەر ئیحرامی بۆ کەسێکی تر دەبەست، ئەوە با بڵێت: نیەتمە حەج دەکەمو، ئیحرامیش بە حەج دەبەستم بۆ خوای گەورە لەبریتی فلانە کەس، (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ عَنْ فُلانٍ)...... هەتا کۆتایی ئەو زیکرانەی، کە کەسێك بۆ خۆی دەیانکات، ئەگەر ئیحرام بۆ خۆی ببەستێت.

## باسێك: {حوکمەکانی تەلبیە کردن}

سونەتە لەدوای تەلبیە کردنەکە صەلاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، سونەتیشە بپارێتەوە بۆ خۆیو بۆ هەر کەسێکیش خۆی بیەوێت، بۆ دنیاو بۆ دوارۆژو، داوای ڕەزامەندیو بەهەشت لە خوای پەروەردگار بکاتو، پەنای پێ بگرێت لە ئاگری سەختی جەهەنەم.

سونەتیشە لە هەموو حاڵەتێکدا تەلبیە زۆر بکات، چی بە ڕاوەستانەوە، یان بەدانیشتنەوە، یان بە سواری، یان بە ڕاکشان، یان لەکاتی دابەزین، یان لەکاتی ڕێ کردن، یان بەبێ دەستنوێژی، یان بە لەش گرانی، یان لەکاتی سوڕی مانگانەی ئافرەتدا. هەروەها لەکاتی تازەبوونەوەو گۆڕانی حاڵەتەکانیشدا بەپێی کاتو شوێن سونەتە هەر تەلبیە بکات، وەکو هاتنی شەوو ڕۆژو، کاتی بەرەبەیانو، کاتی بەیەکگەیشتنو کۆبوونەوەی دۆستو هاوڕێکانو، لەکاتی هەستانەوەو، دانیشتنو، بەرەوژوورکەو، بەرەوخوارکەو، سواربوونو دابەزینو، لەدوای نوێژەکانەوەو، لە هەموو مزگەوتەکاندا.

ڕاستترین بۆچوون لەسەر ئەوەیە، کە لەکاتی (طَوَاف)و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەدا تەلبیە ناکات. چونکە ئەوان زیکری تایبەت بەخۆیان هەیە.

هەروەها سونەتە لەکاتی تەلبیەکردندا ئەوەندە دەنگ بەرز بکاتەوە، کە بۆ خۆی زەحمەت نەبێت. بەڵام ئافرەت بۆی نیە دەنگ بەرز بکاتەوە. چونکە دەنگی ترسی توشبوونی فیتنەی لێ دەکرێت.

سونەتیشە هەموو جارێك سێ جار یان زیاتر صیغەی تەلبیەکە بڵێتەوەو، بەشوێنیەکدا بیانهێنێتو، بە قسە یان بە شتی تر لەیەکیان نەبچڕێنێت. خۆ ئەگەر کەسێك سڵاوی لێ کرد، با وەڵامی سڵاوەکەی بداتەوە. بەڵام ناپەسەندە لەو حاڵەتەدا سڵاوی لێ بکرێت.

هەروەها ئەگەر شتێکی بینی، کە سەرنجی ڕاکێشا، با پەیڕەو لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بکاتو، بڵێت: (لَبَّيْكَ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الْآخِرَةِ).

ئەوجا بزانە کە تەلبیە کردن هەر سونەتە، هەتا لە ڕۆژی جەژندا بەردەکان دەگرێتە جەمرەی عەقەبە {کە نزیکترینی سێ جەمرەکەیە لە شاری (مَكَّـة)ی پیرۆزەوە}، یان تا ئەو کاتەی کە (طَوَاف)ی (إِفَاضَـة) دەکات (کە یەکێکە لە

پایەکانی حەجو، حەجیش بەبێ ئەو درووست نیە)، ئەگەر ئەمی پێشخست بەسەر جەمرەی عەقەبەدا.

جا ئەگەر دەستی کرد بە یەکێك لەم دوانە، با هەر لە سەرەتای دەست پێکردنیەوە واز لە تەلبیە کردن بهێنێتو، خۆی بە (اللهُ أكْبَر) کردنەوە خەریك بکات.

ئیمامی (شَافِعِيّ) فەرموویەتی: با کەسی عومرەکار هەر تەلبیە بکات، تا ئەو کاتەی دەست دەهێنێت بە بەردە ڕەشەکەدا.[١]

## باسێك: {ئەگەر گەیشتە حەرەمی شاری مەکەی پیرۆز چی بڵێت؟}

ئەگەر ئەو کەسەی ئیحرامی بەستوە گەیشتە سنوری حەرەمی شاری (مَكَّة) – خوای گەورە پیرۆزتری بکات–، سونەتە بڵێت: (اللَّهُمَّ، هَذَا حَرَمُكَ وَأَمْنُكَ، فَحَرِّمْنِي عَلَى النَّارِ، وَأَمِنِّي مِنْ عَذَابِكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ، وَاجْعَلْنِي مِنْ أوْلِيَائِكَ وَأَهْلِ طَاعَتِكَ). واتە: (خوایە، ئەمە حەرەمو جێگەی ئەمنو ئاسایشی تۆیە، جا لێت دەپاڕێمەوە کە لاشەم لە ئاگر حەرام بکەو، لەو ڕۆژەشدا کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە، لە سزای خۆت بمپارێزەو، بمکە بە یەکێك لە دۆستەکانی خۆتو، بە یەکێك لەو کەسانەی گوێڕایەڵیو فەرمانبەرداریت دەکەن).

هەروەها هەر دوعایەکی تریشی پێخۆش بوو، با بیکات.

---

(١) واتە: تا ئەو کاتەی دەست دەکات بە (طَوَاف)، ئیتر ئایا بۆی بکرێت دەست بهێنێت بە بەردە ڕەشەکەدا یان نا. بڕوانە: الْأُمّ / ٣ / ٥٢٩.

## باسێك: {ئەگەر چاوی بە کەعبەی پیرۆز کەوت چی بڵێت؟}

ئەگەر چوە ناو شاری (مَكّة)ی پیرۆزەوەو، چاوی کەوتە سەر کەعبەی پیرۆزو، گەیشتە ناو مزگەوت، سونەتە دەستەکانی بەرز بکاتەوەو، دوعا بکات. چونکە لە حەدیسدا هاتوە کە دوعای کەسی موسوڵمان لەکاتی بینینی کەعبەدا گیرایە.[1]

هەروەها با لەو کاتەدا بڵێت: (اللَّهُمَّ، زِدْ هَذَا البَيْتَ تَشْرِيفاً وَتَعْظِيماً وَتَكْرِيماً وَمَهَابَةً، وَزِدْ مِن شَرَّفَهُ وكَرَّمَهُ مِمَّنْ حَجَّهُ أو اعْتَمَرَهُ تَشْرِيفاً وَتَكْرِيماً وَتَعْظِيماً وَبِرّاً). واتە: (خوایە ئەم ماڵە زیاتر پیرۆزو گەورەو بەڕێزو سامدار بکەو، ئەو کەسەش کە هاتوە بۆ حەج یان بۆ عومرەو، بە چاوی پیرۆزیو ڕێزەوە تەماشای کردوە، تۆش زیاتر ڕێزدارو پایەبەرزی بکەو، چاکەی لەگەڵدا بکە).

هەروەها با بڵێت: (اللَّهُمَّ أنْتَ السَّلامُ وَمِنْكَ السَّلامُ، حَيِّنا رَبَّنا بالسَّلامِ). پاشان بپارێتەوەو داوای خەیری دنیاو دواڕۆژ بکاتو، لەکاتی چونەژوورەوەی مزگەوتیشدا هەر ئەوە بڵێت، کە لە سەرەتای ئەم کتێبەوە باسمان کرد، بۆ چوونە ژوورەوەی هەموو مزگەوتەکان.

## باسی زیکرەکانی (طَوَاف) کردن

سونەتە یەکەم جار لەکاتی دەست هێنان بە بەردە ڕەشەکەداو، لە سەرەتای دەست کردن بە (طَوَاف)دا بڵێت: (باسْمِ اللَّهِ، وَاللهُ أكْبَرُ؛ اللَّهُمَّ، إيْمَاناً بِكَ، وَتَصْدِيقاً بِكِتابِكَ، وَوَفاءً بِعَهْدِكَ، وَاتِّباعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). واتە: (بەناوی خواوە، خواش لە هەموان گەورەترە. خوایە، ئەم کارە دەکەم وەکو

---

(١) بڕوانە: نَتَائِجُ الْأَفْكَار / ٥ / ٢٥٧ – ٢٥٨.

باوەڕێك بە تۆو، بەڕاستدانانی کتێبو قورئانەکەتو، وەفایەك بە پەیمانەکەتو، شوێنکەوتنی سونەتی پێغەمبەرەکەت -درودی خوای لەسەر بێت-).

هەروەها سونەتە ئەم زیکرە لە هەموو (طَوَاف)ێکدا دووبارە بکاتەوە، لەکاتی گەیشتنی بە بەرامبەری بەردە ڕەشەکە.

ئەوجا لەکاتی هێواش ڕاکردنەکەی سێ سووڕانەوەکەی یەکەمدا، با بڵێت: (اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً مَبْرُوراً، وذنْباً مَغْفُوراً، وَسَعْياً مَشْكُوراً). واتە: (خوایە بیکە بە حەجێکی لێوەرگیراوو، تاوانێکی لێخۆشبووو، هەوڵو کۆششێکی بەپاداشت). لە چوار سورانەوەکەی تریشدا کە ماون، با بڵێت: (اللَّهُمَّ، اغْفِر، وَارْحَمْ، وَاعْفُ عَمَّا تَعْلَمْ، إِنَّكَ أَنْتَ الأعَزُّ الأكْرَم. اللَّهُمَّ رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَة، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةَ، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). واتە: (خوایە، لێم خۆشبەو، ڕەحمم پێ بکەو، لەو تاوانانەشم ببوورە، کە خۆت پێیان دەزانیت. چونکە بەڕاستی تۆ زۆر دەسەڵاتدارو بەتواناو بەخشندەو میهرەبانیت. خوایە، ئەی پەروەردگارمان، لە دنیا چاکەمان بدەیتێو، لە دوارۆژیشدا هەر چاکەمان بدەیتێو، لە سزای ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە).

ئیمامی (شَافِعِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێم خۆشە لە (طَوَاف)دا بوترێت: (اللَّهُمَّ رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

هەروەها فەرموویەتی: پێیشم خۆشە کە ئەم دوعایە لە هەموو سوڕانەوەکاندا بوترێت.

سونەتیشە لە نێوان هەموو سوڕانەوەکاندا ئەو دوعایانە بکات، کە پێی خۆشە بۆ دینو دنیای خۆی یان کەسێکی تر. خۆ ئەگەر کەسێك دوعا بکاتو، کۆمەڵێکیش (آمِیْن) بکەن، ئەوەش هەر کارێکی باشە.

لە زانای پایەبەرز شێخ (حَسَن)ی (بَصْرِيّ)ەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هاتوە، کە نزاو پاڕانەوە لەوێ لە پانزە (١٥) جێگەدا گیرا دەبێت: لە (طَوَاف)داو، لەلای

(مُلْتَزَم)داو، لەژێر (مِيْزَاب)داو، لەناو (بَيْت)داو، لای سەرچاوەی ئاوی (زَمْزَم)داو، لەسەر کێوی (صَفَا)و (مَرْوَة)و، لە هاتن‌و چوونی نێوانیانداو، لە پشتی مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمو، لە (عَرَفَات)و، لە (مُزْدَلِفَة)و، لە (مِنَى)و، لای سێ (جَمْرَة)کەدا. بۆیە ئەو کەسە لە لوتفی خوا بێبەشە، کە لەو جێگایانەدا دوعای زۆر ناکات‌و، زۆر ناپاڕێتەوە.

مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)و زۆرینەی هاوەڵەکانیشی ئەوەیە، کە خوێندنی قورئان لە کاتی (طَوَاف)دا سونەتە. چونکە کاتی زیکر کردنەو، باشترین زیکریش بریتیە لە خوێندنی قورئان. بەلاّم زانای پایەبەرز (أَبُو عَبْدِاللهِ)ی (حَلِيْمِيّ) -کە یەکێکە لە گەورەترین زانایانی مەزهەبی ئیمامی (شَافِعِيّ)- پێی وایە، کە خوێندنی قورئان لە کاتی (طَوَاف)دا سونەت نیە. چونکە ئەگەر خوێندنی قورئان لە زیکر باشتر بوایە، پێغەمبەری خوا لێی لانەدەدا. خۆ ئەگەر کردبیشێتی، ئەوا نقلّ دەکرا، وەکو چۆن زیکر نقلّ کراوە. جا بۆچوونی درووست ئەوەی یەکەمیانە.

هاوەڵانمان فەرموویانە: خوێندنی قورئان لە (طَوَاف)دا لەو دوعایانە باشترە، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەرو هاوەڵان‌و شوێنکەوتواندا نەهاتوون. سەبارەت بەوانەش کە لە فەرمایشتی ئەواندا هاتون، بۆچوونی درووست لەسەر ئەوەیە، کە ئەوان لە خوێندنی قورئان باشترن. وترایشە: خوێندنی قورئان لەوان باشترە.

زانای پایەبەرز شێخ (أَبُو مُحَمَّد)ی (جُوَيْنِيّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: سونەتە لە ڕۆژەکانی بەجێهێنانی حەجدا خەتمەیەکی قورئان لەکاتی (طَوَاف)دا بکات، بەمەش پاداشتێکی گەورەی دەست دەکەوێت. خواش لە هەموو کەس زاناترە.

سونەتیشە کە لە (طَوَاف)و لە دوو ڕکاتە نوێژەکەی (طَوَاف) لێبوویەوە چی دوعایەکی پێخۆشە بیکات. جا یەکێك لەو دوعایانەی کە سەبارەت بەو کاتە هاتوە، ئەمەیە: (اللَّهُمَّ، أَنَا عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكِ، أَتَيْتُكَ بِذُنُوبٍ كَثِيرَةٍ وأعْمالٍ سَيِّئَةٍ،

وَهَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ النَّارِ، فَاغْفِرْ لِيْ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ). واته: (خوایه من بەندەی تۆمو، کوڕی بەندەی تۆشم، بە تاوانێکی زۆرو، چەندین کردەوەی خراپەوە هاتوومەتە خزمەتت، ئەمەش جێگەی ئەو کەسەیە پەنا بەتۆ دەگرێت لە ئاگری دۆزەخ، دەی تۆش لێم خۆشبە، چونکە بەڕاستی تۆ لێبوردەی میهرەبانیت).

## باسی دوعا کردن لە (مُلْتَزَم)دا

(مُلْتَزَم): بریتیە لە نێوان دەرگای کەعبەی پیرۆزو بەردە ڕەشەکە. وەکو باسیشمان کرد دوعا تێیدا گیرا دەبێت.

جا یەکێك لەو دوعایانەی، کە سەبارەت بەم جێگە هاتوە ئەمەیە: (اللَّهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ حَمْداً يُوَافِي نِعَمَكَ، وَيُكَافِئُ مَزِيدَكَ، أَحْمَدُكَ بِجَمِيعِ مَحَامِدِكَ، مَا عَلِمْتُ مِنْهَا، وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، عَلَى جَمِيعِ نِعَمِكَ، مَا عَلِمْتُ مِنْها، وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَعَلى كُلِّ حَالٍ. اللَّهُمَّ، صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ. اللَّهُمَّ، أَعِذْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَأَعِذْنِيْ مِنْ كُلِّ سُوْءٍ، وَقَنِّعْنِي بِمَا رَزَقْتَنِي، وَبَارِكْ لِيْ فِيْهِ. اللَّهُمَّ، اجْعَلْنِيْ مِنْ أَكْرَمِ وَفْدِكَ عَلَيْكَ، وَأَلْزِمْنِي سَبِيلَ الِاسْتِقَامَةِ حَتَّى أَلْقَاكَ، يَا رَبَّ الْعَالَمِيْنَ). واتە: (خوایە، سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، سوپاسو ستایشێکی وەها، کە لەگەڵ هەموو نازو نیعمەتەکانتدا بێتو، هاوتاو یەکسان بێت لەگەڵ زیادبوونی نازو نیعمەتەکانتدا، سوپاسو ستایشت دەکەم بە هەموو جۆرەکانی، ئەوەی دەیزانمو، ئەوەش نایزانم، لەسەر هەموو نازو نیعمەتەکانت، ئەوەی دەیزانمو، ئەوەش نایزانمو، لەسەر هەموو حاڵەتێکیش. خوایە، دروودو سڵاوی خۆت بڕژێنە بەسەر پێغەمبەرو ئالو بەیتی پێغەمبەردا. خوایە، لە شەیتانی دورخراو لە ڕەحمەتی خۆتو لە هەموو خراپەیەك پەنام بدەو، بەوەی پێت بەخشیوم بمپارێزەو، بەرەکەتیشی تێ بخە بۆم. خوایە بمکە بە یەکێك لە بەرێزترینی ئەو کەسانەی کە هاتوونەتە خزمەتت، هەتا بەخزمەتیشت

دەگەمەوە لەسەر ڕێگەی ڕاستو درووست بمهێڵەرەوە، ئەی پەروەردگاری عالەم).

پاشان هەر دوعایەکی پێخۆشە با بیکات.

## باسی دوعاکردن لە (حِجْر)ی ئیسماعیلدا

(حِجْر): (بریتیە لەو بەشە زەویەی، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕوکنە شامیەکەوەو، بە دیوارێکی نزمی نیوە بازنە دەورەدراوەو، لای هەریەکە لە دوو ڕوکنەکەوە دەروازەیەکی تێدایە)[1]. ئەم جێگەیە بە بەشێك لە بەیت دادەنرێتو، وەکو باسیشمان کرد دوعا تێیدا گیرا دەبێت.

جا یەکێك لەو دوعایانەی، کە لە حەدیسدا سەبارەت بەم جێگەیە هاتوە ئەمەیە: (يا رَبِّ، أَتَيْتُكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ مُؤَمِّلاً مَعْرُوفَكَ، فَأَنِلْني مَعْرُوفاً مِنْ مَعْرُوفِكَ، تُغْنِيني بِهِ عَنْ مَعْرُوفِ مَنْ سِوَاكَ، يا مَعْرُوفاً بِالْمَعْرُوفِ). واتە: (خوایە، لە گەشتو ڕێگایەکی دوورو نارەحەتو زەحمەتەوە هاتوومەتە خزمەتت، ئومێدم بە چاکەی تۆ هەیە، دەی تۆش چاکەیەك لە چاکەکانی خۆتم لەگەڵدا بکە، تا لە چاکەی غەیری تۆ بێنیازم بکات، ئەی ئەو کەسەی بە کردنی کاری چاك ناسراویت).

---

(١) بڕوانە: رَوْضَةُ الطَّالِبِيْنَ وَعُمْدَةُ الْمُفْتِيْن / ٣ / ٨٠.

## باسی دوعا کردن لەناو (بَيْت)دا

پێشتر باسمان کرد کە دوعا تێیدا گیرا دەبێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (نَسَائِيّ)دا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أُسَامَة)ی کوڕی (زَيْد)ەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت)، کە کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) تەشریفی بردە ناو بەیتەوە، ڕووی کردە دیواری پشتەوەی کەعبەو، ڕوخسارو ڕوومەتی خۆی لەسەر داناو، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو، لێی پاڕایەوەو، داوای لێخۆشبوونی لێ کردو، پاشان تەشریفی برد بەرەو هەریەکە لە گۆشەکانی کەعبەو، ڕووی تێکرد بە (اللّٰهُ أَكْبَر) کردنو، بە (لا إِلَهَ إِلاّ اللّٰهُ)و، بە (سُبْحَانَ اللّٰهِ)و، بە (الْحَمْدُ لِلّٰهِ)و، بە پاڕانەوەو، بە (اسْتَغْفِرُ اللّٰهَ) کردنو، پاشان تەشریفی هێنایە دەرەوە.[1]

## باسی زیکرەکانی هاتوچۆی نێوان (صَفَا)و (مَرْوَة)

پێشتر باسمان کرد کە دوعا تێیدا گیرا دەبێت.

جا سونەتە لەسەر کێوی (صَفَا) زۆر بەپێوە ڕابوەستێتو، ڕوو بکاتە قیبلەو، (اللّٰهُ أَكْبَر) بکاتو، بپاڕێتەوەو، بڵێت: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، وللَّهِ الحَمْدُ، اللَّهُ أَكْبَرُ عَلَى مَا هَدَانا، والحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى مَا أَوْلانَا، لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، يُحْيِي ويُمِيتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. لا إِلهَ إِلاَّ اللَّهُ، أَنجزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، لا إله إلاّ اللهُ، وَلا نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّيْنَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكافِرُون. اللّٰهُمَّ، إِنَّكَ قُلْتَ: ﴿ادْعُونِيْ أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ النَّسَائِيّ / ٥ / ٢١٩ / بە ژمارە: ٢٩١٤. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: حەدیسێکی (صَحِيْح)ـە. بڕوانە: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٣٩٤.

[غـافِر: ٦٠]، وَإِنَّكَ لا تُخْلِفُ الْمِيْعَادَ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ كَما هَدَيْتَنِي لِلْإِسْلامِ أَنْ لا تَنْزِعَـهُ مِنِّي حَتَّى تَتَوَفَّانِيْ وَأَنَا مُسْلِمٌ). واتـه: (خـوا لـه هـەموان گـەورە تـرەو، سـوپاس‌و ستایشیش هەر شایستەی ئەوە، خوا لە هەموان بە گەورەتر دەزانین لەسـەر ئـەوەی هیدایەتی داوین‌و، سوپاس‌و ستایشیش بۆ خوا لەسەر ئەوەی پێیداوین‌و، کردووینـی بە چاودێرو سەرپەرشتیار بەسەریەوە. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیـە بێجگـە لـە خوای تاك‌و تەنهای بێ هاوتا، کە موڵك‌و سامان هی ئـەوەو، سـوپاس‌و ستایشـیش هەر شایستەی ئەوە، زیندوو دەکاتەوەو، دەمرێنێـت‌و، خـەیریش بەدەسـتی ئـەوەو، تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. هیچ پەرستراوێکی ڕاسـتەقینە نیـە بێجگـە لـە خوا، بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێ کردو، بەندەکەی سەرخسـت‌و، خۆشـی بـە تـەنها حیزبەکانی سەرشۆڕ کرد. هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خواو، ئێمەش تەنها ئەو دەپەرستین‌و، بە دڵسـۆزی‌و ئیخلاصـەوە دینـداری بـۆ دەکـەین، بـاوەکو کافرەکانیش پێیان ناخۆشبێت. خوایە تۆ خۆت فەرمووتە: ﴿هاوار بکەنە مـن‌و لـێم بپاڕێنەوە، بەدەنگتانەوە دێم‌و، پاڕانەوەکەتان گیرا دەکەم﴾، تۆش پێچەوانەی بەڵێنی خۆت ڕەفتار ناکەیت، وا منیش داوات لێ دەکە، وەکو چۆن هیدایەتت داوم بۆ سەر ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام، هـەتا گیانیشـم دەکێشـیت ئـەو هیدایەتـە لـە نـاو دڵـم دەرمەهێنەو، با هەر بە موسوڵمانی بمرم).

پاشان بپاڕێتەوە بۆ خـەیری دنیـاو دوارۆژو، ئـەم زیکـرو پاڕانەوەیـە سـێ جـار دووبارە بکاتەوە. بەڵام با تەلبیە نەکات. خۆ ئەگەر گەیشتیشە لای کێـوی (مَرْوَةَ)، با بچێتە سەری‌و، لەوێش هەر ئەو زیکـرو پاڕانەوانـە بکـات، کـە لەسـەر کێـوی (صَفَا) کردنی.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (ابْنُ عُمَر)ەوە (خوا لـە هـەردووکیان ڕازی بێت)، کە ئەو لەسـەر کێـوی (صَفَا) دەیفـەرموو: (اللَّهُــمَّ، اعْصِـمْنَا بِـدِيْنِكَ وَطَوَاعِيَتِكَ وَطَوَاعِيَةِ رَسُولِكَ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-، وَجَنِّبْنَا حُدُودَكَ. اللَّهُمَّ، اجْعَلْنا نُحِبُّكَ، وَنُحِبُّ مَلائِكَتَكَ وَأَنْبِياءَكَ وَرُسُلَكَ، وَنُحِبُّ عِبادَكَ الصَّالِحِينَ. اللَّهُمَّ، حَبِّبْنـا

إِلَيْكَ وَإِلى مَلائِكَتِكَ وإلَى أنْبِيائِكَ وَرُسُلِكَ، وإلى عِبادِكَ الصَّالِحِينَ. اللَّهُمَّ يَسِّرْنا للِيُسْرَى، وَجَنِّبْنا العُسْرَى، وَاغْفِرْ لَنا فِي الْآخِرَةِ وَالْأُوْلَى، وَاجْعَلْنا مِنْ أئمَّةِ الْمُتَّقِينَ).[1] واته: (خوايه، به ئاينه‌كه‌ى خۆت‌و به گوێڕايه‌ڵى كردنى خۆت‌و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ت له تاوان بمانپارێزه‌و، له به‌زاندنى سنووره‌كانيشت لامانده. خوايه، وامان لێ بكه خۆت‌و فريشته‌كانت‌و پێغه‌مبه‌ره‌كانت‌و به‌نده چاكه‌كاره‌كانتمان خۆش بوێت. خوايه خۆشه‌ويستمان بكه لاى خۆت‌و فريشته‌كانت‌و پێغه‌مبه‌ره‌كانت‌و به‌نده چاكه‌كاره‌كانت. خوايه كارى ئاسانمان پيشان بده‌و بمانخه سه‌رى‌و، له كارى قورس‌و گران لاماندەو، له دنياو دواڕۆژدا لێمان خۆشبه‌و، بمانكه به يه‌كێك له پێشه‌واياني به‌نده ديندارو پارێزكاره‌كانت).

هه‌روه‌ها با له ڕۆيشتن‌و هاتنى نێوان (صَفَا)و (مَرْوَة)شدا بلێت: (رَبِّ اغْفِرْ، وَارْحَمْ، وَتجاوَزْ عَمَّا تَعْلَمُ، إِنَّكَ أنْتَ الْأعَزُّ الْأكْرَمُ. اللَّهُمَّ آتِنا فِي الدُّنْيا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). واته: (خوايه لێم خۆشبه‌و، ڕه‌حم پێ بكه‌و، چاوپۆشى بكه له‌وه‌ى خۆت ده‌يزانيت، به‌ڕاستى تۆ ده‌سه‌ڵاتدارترين‌و به‌خشنده‌ترين كه‌سيت. خوايه له دنيادا چاكه‌مان پێ ببه‌خشه‌و، له دواڕۆژيشدا هه‌ر چاكه‌مان پێ ببه‌خشه‌و، له ئاگرى دۆزه‌خيش بمانپارێزه).

جا له‌و دوعايانه‌ى كه هه‌ڵبژێردراون بۆ هاتوچۆى نێوان (صَفَا)و (مَرْوَة)و، بۆ هه‌موو جێگه‌يه‌ك:

- (اللَّهُمَّ، يا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قَلْبِيْ عَلَى دِيْنِكَ). واته: (خوايه، ئه‌ى هه‌ڵسووڕێنه‌رو هه‌ڵگێڕه‌وى دڵه‌كان، دڵم ڕاگيراو بكه له‌سه‌ر ئاينه‌كه‌ت).
- (اللَّهُمَّ، إِنِّي أسأَلُكَ مُوْجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالسَّلامَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ، وَالفَوْزَ بِالْجَنَّةِ، وَالنَّجاةَ مِنَ النَّارِ). واته: (خوايه من داواى ئه‌و شتانه‌ت لێ

(١) بڕوانه: سُنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٥ /٩٤ / به ژماره: ٩١٢٩. شێخى عه‌سقه‌لانى فه‌رموويه‌تى: حه‌ديسێكى (صَحِيْح)ـه. بڕوانه: الْفُتُوْحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٤ / ٤٠٠.

دەکەم، کە مایەی ڕەحمەتو میهرەبانی تۆن‌و، ئەوانەش کە هۆکاری لێخۆشبوونی تۆن‌و، داوای سەلامەتیشت لێ دەکەم لە هەموو تاوان‌و خراپەیەك‌و، داوای شادبوون بە بەهەشت‌و، ڕزگاربوون لە دۆزەخت لێ دەکەم).

- (اللَّهُمَّ، إِنِّي أسأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالعَفَافَ وَالغِنَى). واتە: (خوایە، من داوای ڕێنموویی‌و ترسی خۆت‌و داوێن پاکی‌و هەبوون‌و دەوڵەمەندیت لێ دەکەم).
- (اللَّهُمَّ، أعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِك). واتە: (خوایە، یارمەتیم بدە لەسەر زیکری خۆت‌و لەسەر شوکرو سوپاسی خۆت‌و، لەسەر بەندایەتی خۆت بەشێوەیەکی جوان".
- (اللَّهُمَّ، إِنِّي أسأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ، وَما لَمْ أعْلَمْ. وأعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرّ كُلِّهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ، وَمَا لَمْ أعْلَمْ. وَأسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرّبَ إِلَيْها مِنْ قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ. وأعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْها مِنْ قَوْلٍ أوْ عَمَلٍ). واتە: (خوایە، من داوای هەموو خەیرو چاکەیەکت لێ دەکەم، ئەوەی دەیزانم‌و ئاگام لێیەتی‌و، ئەوەش نایزانم‌و ئاگام لێی نیە. پەناشت پێ دەگرم لە هەموو شەڕو خراپەیەك، ئەوەی دەیزانم‌و ئاگام لێیەتی‌و، ئەوەش نایزانم‌و ئاگام لێی نیە. داوای بەهەشتت‌و ئەو گوفتارو کردارەشت لێ دەکەم، کە لە بەهەشت نزیکم دەکاتەوە. پەناشت پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ‌و ئەو گوفتارو کردارەش، کە لە دۆزەخ نزیکم دەکاتەوە).

خۆ ئەگەر قورئان بخوێنێت، ئەوە باشتریشە.

جا باشتر وەهایە کە ئەم زیکرانەش بکات‌و، دوعاش بکات‌و، قورئانیش بخوێنێت. خۆ ئەگەر ویستی تەنها یەکێکیان بکات، ئەوا با کامیان گرنگ‌و لەپێشترە ئەوەیان بکات.

## باسی ئەو زیکرانەی کە لە دەرچوونیدا لە (مَكَّة)وە بۆ (عَرَفَات) دەیانکات

ئەگەر لە شاری (مَكَّة)ی پیرۆزەوە بەرەو (مِنَى) دەرچوو، سونەتە بلێت: (اللَّهُمَّ، إِيَّاكَ أَرْجُو، وَلَكَ أَدْعُو، فَبَلِّغْنِي صَالِحَ أَمَلِي، وَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَامْنُنْ عَلَيَّ بِما مَنَنْتَ بِهِ عَلَى أَهْلِ طَاعَتِكَ، إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ). واتە: (خوایە، تەنها ئومێدم بەتۆ هەیەو، لەتۆش دەپاڕێمەوە، دەی تۆش بمگەیەنەرە هیوا باشەکانم و، لە تاوانەکانم خۆشبەو، ئەو منەتە بنێ بەسەرمدا، کە ناوتە بەسەر بەندە گوێڕایەڵەکانتدا، بەڕاستی تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

ئەوجا ئەگەر لە (مِنَى)وە بەرەو (عَرَفَة) کەوتەڕێ، سونەتە بلێت: (اللَّهُمَّ، إِلَيْكَ تَوَجَّهتُ، وَوَجْهَكَ الْكَرِيْمَ أَرَدْتُ، فَاجْعَلْ ذَنْبِي مَغْفُوراً، وَحَجِّي مَبْرُوراً، وَارْحَمْنِي، وَلاَ تُخَيِّبْنِي، إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ). واتە: (خوایە تەنها ڕووم لە دەرگای سۆزو میهری تۆ کردوەو، ڕەزامەندی تۆشم مەبەستە، دەی تۆش لە تاوانەکانم خۆشبەو، حەجەکەشم لێ وەرگرەو، بەزەییشت پێمدا بێتەوەو، نائومێدم مەکە، بەڕاستی تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

هەروەها با تەلبیە بکات و، قورئانیش بخوێنێت و، زیکرو دوعاکانی تریش زۆر بکات و، زۆریش بلێت: (اللَّهُمَّ، آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

## باسی ئەو زیکرو دوعایانەی کە سونەتە لە (عَرَفَات)دا بکرێن

پێشتر لە زیکرەکانی جەژندا ئەو حەدیسەی پێغەمبەری خوامان هێنا، کە فەرمووبووی: "باشترین نزاو پاڕانەوە بریتیە لە نزاو پاڕانەوەی ڕۆژی (عَرَفَة)،

باشترین فەرمایشتیش، کە منو پێغەمبەرەکانی پێش من کردوومانە، بریتیە لە: (لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْرٌ)".

بۆیە سونەتە زیکرو دوعای زۆر تێدا بکرێتو، هەوڵو کۆششی زۆری لەوبارەوە تێدا بدرێت. چونکە ئەو ڕۆژە باشترین ڕۆژەکانی ساڵە بۆ دوعا کردنو، سەرەکیترینو گرنگترین ڕوکنەکانی حەجیش هەر لەو ڕۆژەدایەو، درووستی حەجەکەش لەسەر ڕاپەڕاندنی ڕوکنی ئەو ڕۆژە ڕاوەستاوە. بۆیە باشتر وایە بۆ مرۆڤی موسوڵمان، کە هەرچی توانای خۆی هەیە لەو ڕۆژەدا بەکاری بهێنێت بۆ زیکرو دوعا کردنو، خوێندنی قورئانو، هەموو جۆرە زیکرو دوعایەکیشی تێدا بکاتو، دوعا بۆ خۆی بکاتو، لە هەموو جێگەیەکدا زیکری خوا بکاتو، بە تەنهاو لەگەڵ کۆمەڵیشدا هەر دوعا بکاتو، دوعا بۆ خۆیو، بۆ باوکو دایکیو، بۆ خزمو کەسوکاریو، بۆ مامۆستاکانیو، بۆ هاوقوتابیەکانیو، بۆ هاوڕێکانیو، بۆ خۆشەویستەکانیو، بۆ تێکڕای ئەوانەی چاکەیان لەگەڵدا کردوەو، بۆ هەموو موسوڵمانانیش بکات. با زۆر وریابێت، کەمتەرخەمی لەم شتانەدا نەکات. چونکە ئەو ڕۆژە قەرەبوو ناکرێتەوە، بە پێچەوانەی ڕۆژەکانی ترەوە.

با هەوڵیش نەدرێت سەجع بەکاربهێنرێت لە دوعا کردندا. چونکە دەبێت بەهۆی مەشغوڵبوونی دڵو، دەرنەبڕینو لەبیرچوونی ملکەچیو زەلیلیو خۆبەکەمزانینو موحتاجیو هەژاری. بەڵام قەیناکات ئەگەر هەندێك دوعای خۆی یان کەسێکی تری لەبەربێتو، دوعاکانیش سەجعیان تێدابێت، بە مەرجێك خۆی مەشغوڵ نەکات بە چۆنێتی ڕێکخستنیانو، ڕەچاو کردنی ئیعرابەکانیانەوە.

سونەتیشە لەکاتی دوعا کردندا دەنگی نزم بکاتەوەو، زۆریش داوای لێخۆشبونو تەوبە بکات لە هەموو ئەو سەرپێچیانەی کە کردوونیو، بە قەناعەتی تەواویشەوە دوعا بکاتو، زۆر سووربێت لەسەر داواکانیو، چەندبارەیان بکاتەوەو، پەلەش نەکات لە گیرابوونیو، چاوەڕوان بێت زوو دوعاکانی گیرا بن.

هەروەها سونەتە لە سەرەتاو لە کۆتایی دوعاکانیەوە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بکات‌و، صەلاواتیش لەسەر پێغەمبەری خوا بدات‌و، هەوڵی تەواویش بدات کە ڕوو لە قیبلەو دەست بە دەستنوێژ بێت.

بۆشمان ڕیوایەت کراوە لە کتێبەکەی ئیمامی (تِرْمِذِيّ)دا، لە ئیمامی (عَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: زۆرترین پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، لە وەستانی ڕۆژی (عَرَفَة)دا بریتی بوو لە: «اللَّهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ كَالَّذِيْ نَقُولُ، وَخَيْرًا مِمَّا نَقُولُ. اللَّهُمَّ، لَكَ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي، وَإِلَيْكَ مَآبِي، وَلَكَ رَبِّ تُرَاثِي. اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَوَسْوَسَةِ الصَّدْرِ وَشَتَاتِ الْأَمْرِ. اللَّهُمَّ، إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَجِيءُ بِهِ الرِّيحُ».[1] واتە: "خوایە سوپاس‌و ستایش بۆ تۆ، وەکو ئەوەی ئێمە دەیڵێین‌و، باشتریش لەوەی ئێمە دەیڵێین. خوایە نوێژو بەنداریەتی‌و دینداری‌و ژیان‌و مردنم بۆ تۆیەو بەدەستی تۆیەو، بۆلای تۆش دەگەڕێمەوەو، ئەوەش لێم بەجێدەمێنێت هەر بۆ تۆیە. خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزای ناو گۆڕو، لە وەسوەسەو خەیالاتی ناو دڵو سینەو، لە پەرت‌و بلاوی کاروبارم. خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی با لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت".

هەروەها سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لەو ماوەیەدا تەلبیە زۆر بکات‌و، صەلات‌و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) زۆر بدات‌و، لەگەڵ زیکرو دوعاکانیشدا زۆر بگری. چونکە ئەوێ جێگەی داوەرینی فرمێسکەکانەو، جێگەی چاوپۆشی‌و لێبوردنی تاوانەکانەو، جێگەی ئومێدی گیرابوونی دوعاکانە. جا

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ التِّرْمِذِيّ / ٥ /٥٣٧ / بە ژمارە: ٣٥٢٠. ئیمامی (تِرْمِذِيّ) فەرموویەتی: حەدیسێکی (غَرِيْب)ـە لەم ڕێگەیەوەو، ڕشتەکەشی بەهێز نیە.

منیش دەڵێم: چونکە کەسێك لە ڕشتەکەیدایە، بەناوی (قَيْس)ی کوڕی (رَبِيْع)ی (أَسَدِيّ)ـەوە، کە زۆرێك لە زانایان بە لاوازیان داناوە. بڕوانە: مِيْزَانُ الِاعْتِدَال فِيْ نَقْدِ الرِّجَال (الذَّهَبِيّ) / ٣ / ٣٩٣ / بە ژمارە: ٦٩١١.

بەڕاستی دیمەنێکی هەر زۆر مەزنەو، کۆبوونەوەیەکی تەواو گەورەیە، کە باشترین بەندە چاکو دڵسۆزەکانی خوای گەورە لەوێدا کۆدەبنەوەو، گەورەترین کۆبوونەوەی دنیاشە.

جا هەندێك لە دوعا هەڵبژێردراوەکان بۆ ئەم ڕۆژەو بۆ ئەم جێگەیە بریتین لە:

- (اللَّهُمَّ، آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).
- (اللَّهُمَّ، إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَإِنَّه لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِيْ مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ). واتە: (خوایە، من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوەو، تەنها جەنابیشت لە تاوانەکان خۆش دەبیت. دەی بە لوتفی خۆت لێم خۆشبەو، ڕەحم پێ بکە، چونکە تۆ زاتێکی تاوانبەخش‌و میهرەبانیت).
- (اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ مَغْفِرَةً تُصْلِحْ بِها شَأْنِي فِي الدَّارَيْنِ، وَارْحَمْنِي رَحْمَةً أَسْعَدُ بِهَا فِي الدَّارَيْنِ؛ وَتُبْ عليَّ تَوْبَةً نَصُوحًا لا أَنْكُثُهَا أَبَداً، وَأَلْزِمْنِي سَبِيْلَ الاسْتِقَامَةِ لا أَزِيغُ عَنْها أَبَداً). واتە: (خوایە بە لێبوردنێکی وەها لێم ببورە، کە لە هەردوو دنیادا کاروبارمی پێ سازو ڕێك‌وپێك بکەیت‌و، بەزەییەکت پێمدا بێتەوە، کە بەهۆیەوە لە هەردوو دنیادا بەختەوەرو سەرفراز بم‌و، تەوبەیەکیشم لێ وەرگرە، کە هەرگیز نەیشکێنم‌و، لەسەر ڕێگەی ڕاستیش ڕاگیراوم بکەو بمهێڵەرەوە، بەجۆرێك کە هەرگیز لێی لانەدەم).
- (اللَّهُمَّ، انْقُلْنِي مِنْ ذُلِّ الْمَعْصِيَةِ إِلَى عِزِّ الطَّاعَةِ، وَأَغْنِنِي بِحَلالِكَ عَنْ حَرَامِكَ، وَبِطاعَتِكَ عَنْ مَعْصِيَتِكَ، وَبِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ، وَنَوِّرْ قَلْبِي وَقَبْرِي، وَأَعِذْنِي مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ، وَاجْمَعْ لِيَ الْخَيْرَ كُلَّهُ). واتە: (خوایە لە زەلیلی نافەرمانی خۆتەوە بمگوێزەرەوە بۆ بەرێزی گوێڕایەڵی خۆت‌و، بە حەلاڵەکانی خۆشت بێنیازم بکە لە حەرامەکانت‌و، بە گوێڕایەڵی خۆشت بێنیازم بکە لە نافەرمانی خۆت‌و، بە

فەزڵو لوتفی خۆشت بێنیازم بکە لە غەیری خۆت‌و، دڵم‌و گۆڕەکەشم ڕووناك بکەرەوەو، لە هەموو شەڕو خراپەیەکیش بمپارێزەو، هەموو خەیرو چاکەیەکیشم پێ خەڵات بکە).

## باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی کە لەکاتی ڕۆیشتن لە (عَرَفَة)وە بۆ (مُزْدَلِفَة) سونەتن

پێشتر باسمان کرد، کە سونەتە لە هەموو جێگاکاندا تەلبیە زۆر بکرێت. جا ئێرەش یەکێکە لە گرنگترینی ئەو جێگایانە.

هەروەها سونەتە مرۆڤی موسوڵمان لەم کاتەدا قورئان زۆر بخوێنێت‌و، دوعاش زۆر بکات.

هەروەها سونەتە ئەم زیکرە زۆر دووبارە بکاتەوە: (لا إلهَ إلاّ اللهُ، وَاللهُ أكْبَرُ).

هەروەها سونەتە بڵێت: (إلَيْكَ اللَّهُمَّ أرْغَبُ، وَإيَّاكَ أرْجُو، فَتَقَبَّلْ نُسُكِي، وَوَفِّقْنِي، وَارْزُقْنِي فِيْهِ مِنَ الْخَيْرِ أكْثَرَ مَا أطْلُبُ، وَلا تُخَيِّبْنِي، إنَّكَ أنْتَ اللَّهُ الْجَوَادُ الْكَرِيْمُ). واتە: (خوایە من ئارەزووی خزمەتی تۆم هەیەو، ئومێدیشم بە لوتفی تۆ هەیە، دەی تۆش بەندایەتی‌و دینداریم لێ قبوڵ بکەو، تەوفیقم بدەو، زیاتر لەوە خەیرو چاکەم پێ ببەخشە، کە خۆم داوای دەکەم‌و، نائومێدیشم مەکە، بەڕاستی تۆ خوایەکی بەخشندەو بەڕێزیت).

ئەوجا ئەم شەوە بریتیە لە شەوی جەژن‌و، پێشتریش باسی گەورەیی‌و فەزڵی زیندوو کردنەوەی شەوی جەژنمان کرد بە زیکرو بە نوێژ. جا لەپاڵ ئەوەدا کە شەوێکی گەورەیە، جێگەیەکی گەورەشەو، کەسەکەش لەو کاتەدا لە سنوری حەرەمی شاری (مَكَّة)ی پیرۆزدایەو، لە ئیحرامدایەو، لەناو کۆمەڵێك حاجیدایەو،

دوای ئەوەشە، کە ئەم عیبادەتە گەورەیەی جێبەجێ کردوەو، ئەو دوعا پیرۆزانەشی لەو جێگە پیرۆزەدا کردوە.

## باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی کە لە (مُزْدَلِفَة)و (المَشْعَرُ الحَرَام)دا سونەتن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ﴾ [البقرة: ١٩٨] واتە: {جا کاتێك دوای بانگی مەغریب لە کێوی عەرەفەوە بەرەو (مُزْدَلِفَة)و (الْمِشْعَرُ الْحَرَام) بەرێکەوتن، لای (الْمِشْعَرُ الْحَرَام)دا زیکرو یادی خوا بکەنو، زیکریشی بکەن کەوا بەو جۆرە هیدایەتی داونو، رێگەی راستی پیشان داون، ئەگەرچی پێشتر لە ریزی گومرایاندا بوون}.

بۆیە سونەتە لەو شەوەی حاجی لە (مُزْدَلِفَة)دا دەمێنێتەوە زۆر بپارێتەوەو، زیکری خوا زۆر بکاتو، قورئان زۆر بخوێنێتو، تەلبیەش زۆر بکات. چونکە ئەو شەوە شەوێکی گەورەو مەزنە، وەکو لە باسەکەی پێشوودا باسمان کرد.

یەکێکیش لەو دوعایانەی کە باسکراوە لەم جێگەدا بکرێت ئەمەیە: (اللَّهُمَّ، إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنْ تَرْزُقَنِي فِي هَذَا الْمَكانِ جَوَامِعَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، وَأَنْ تُصْلِحَ شَأْنِي كُلَّهُ، وَأَنْ تَصْرِفَ عَنِّي الشَّرَّ كُلَّهُ، فَإِنَّه لا يَفْعَلُ ذَلِكَ غَيْرُكَ، وَلاَ يَجُودُ بِهِ إِلاَّ أَنْتَ). واتە: (خوایە من لەم جێگەدا لێت دەپارێمەوەو داوای هەموو خەیرو چاکەیەکت لێ دەکەمو، داواشت لێ دەکەم، کە هەموو کاروبارم سازو رێكوپێك بکەیتو، هەموو شەڕو خراپەیەکیشم لێ لادەیت، بەڕاستی بێجگە لەتۆ کەس توانای کردنی ئەمانەی نیەو، بێجگە لە تۆش کەس توانای بەخشینی ئەم خەلاَتانەی نیە).

جا ئەگەر ئەو ڕۆژە نوێژی بەیانی کرد، با لە سەرەتای کاتەکەیەوە بیکاتو، هەوڵیش بدات زۆر بەزوویی بیکاتو، پاشان بڕوات بەرەو (الْمَشْعَرُ الْحَرَام)، کە کەژێکی بچووکە لە کۆتایی (مُزْدَلِفَة)دایەو، پێی دەوترێت: (قُزَح). خۆ ئەگەر توانی سەرکەوێت پێیدا با سەرکەوێت، ئەگینا، با لە بنی کەژەکەدا ڕوو بە کەعبە بوەستێتو، (الْحَمْدُ لِلّهِ)و (اللهُ أكْبَرُ)و (لا إلهَ إلاّ اللهُ)و (سُبْحَانَ اللهِ) بکاتو، تەلبیەو دوعاش زۆر بکات.

هەروەها سونەتە بڵێت: (اللَّهُمَّ، كَما وَقَفْتَنا فِيهِ، وَأرَيْتَنا إيَّاهُ، فَوَفِّقْنا لِذِكْرِكَ كَما هَدَيْتَنا، وَاغْفِرْ لَنا، وَارْحَمنَا كَما وَعَدْتَنا بقَوْلِكَ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ * ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ [البقرة: ١٩٨ – ١٩٩]. واتە: (خوایە وەکو لەم جێگەدا وەستاندووتینو، پیشانت داوین، تەوفیقمان بدە بۆ کردنی زیکری خۆت، وەکو چۆن هیدایەتت داوین، لێشمان خۆشبەو، ڕەحممان پێ بکە، وەکو بەم فەرمایشتەی خۆت بەڵێنت پێداوینو، فەرمایشتەکەشت حەقو ڕاستە: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ * ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾).

هەروەها با ئەم زیکرەش زۆر بکات: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

هەروەها سونەتە بڵێت: (اللَّهُمَّ، لَكَ الْحَمْد كُلُّهُ، وَلَكَ الكَمالُ كُلُّهُ، وَلَكَ الْجَلالُ كُلُّهُ، وَلَكَ التَّقْدِيسُ كُلُّهُ. اللَّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ جَمِيْعَ مَا أسْلَفْتُهُ، وَاعْصِمْني فِيْما بَقِيَ، وَارْزُقْني عَمَلاً صَالِحاً تَرْضَى بِهِ عَنِّي، يَا ذَا الْفَضْلِ الْعَظِيْم. اللَّهُمَّ، إنِّيْ أسْتَشْفِعُ إلَيْكَ بخَواصِّ عِبادِكَ، وَأتَوَسَّلُ بكَ إلَيْكَ، أسْألُكَ أنْ تَرْزُقَني جَوَامِعَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، وَأنْ تَمُنَّ عَليَّ بِمَا مَنَنْتَ بِهِ عَلَى أوْلِيائِكَ، وَأنْ تُصْلِحَ حَالِي فِي الْآخِرَةِ وَالدُّنْيا، يَا أرْحَمَ

الرَّاحِمِينَ). واته: (خوایه هەموو سوپاس‌و ستایش‌و تەواویتی‌و گەورەیەتی‌و پیرۆزی‌و ڕێزێك هەر شایستەی تۆیە. خوایە لە هەموو ئەو تاوانانەم خۆشبە کە لە تەمەنی ڕابردوومدا کردوومن، لەو ماوە تەمەنەش کە ماوە لە تاوان بمپارێزەو، کارو کردەوەیەکی چاکی وەهام پێ خەلاَت بکە، کە بەهۆیەوە لێم ڕازی بیت، ئەی خاوەنی بەخششی گەورەو مەزن. خوایە من تکات لێ دەکەم‌و لێت دەپاڕێمەوە تو خاتری بەندە چاکە تایبەتەکانت‌و، لوتف‌و سۆزو بەخشندەیی خۆشت دەکەم بە وەسیلە بۆ خزمەتت، داوات لێ دەکەم هەرچی خەیرو چاکە هەیە پێم ببەخشەو، ئەو منەتە بنێ بەسەرمدا، کە ناوتە بەسەر دۆست‌و خۆشەویستەکانی خۆتداو، لە دوارۆژو لە دنیاشدا حاڵم ڕێك‌وپێك‌و چاك بکە، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان).

## باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی کە لەکاتی ڕۆیشتن لە (الْمَشْعَرُ الْحَرَام)ـەوە بەرەو (مِنَى) سونەتە بکرێن

ئەگەر شەبەق هەڵهات با لە (الْمَشْعَرُ الْحَرَام)ـەوە بڕوات بەرەو (مِنَى)و، لەو ڕێگەشدا با تەلبیەو زیکرو دوعا زۆر بکات‌و، با زۆرتر خەریکی تەڵبیە کردن بێت، چونکە ئیتر ئەمە دواین کاتێتی‌و، ڕەنگە جارێکی تر دوای ئەم جارە خوای گەورە بۆی نەنوسیبێت کە تەلبیە بکاتەوە.

## باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی کە لە ڕۆژی جەژندا لە (مِنَى)دا سونەتن

ئەگەر (الْمَشْعَرُ الْحَرَام)ی بەجێهێشت‌و، گەیشتە (مِنَى)، سونەتە بڵێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِيْ بَلَّغَنِيْها سالِماً مُعافَىً. اللَّهُمَّ، هَذِهِ مِنَى قَدْ أتيتُها، وَأنا عَبْدُكَ وَفِيْ قَبْضَتِكَ، أسْألُكَ أنْ تَمُنَّ عَليَّ بِمَا مَنَنْتَ بِهِ عَلَى أوْلِيائِكَ. اللَّهُمَّ، إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الْحِرْمانِ

وَالْمُصِيبَةِ فِي دِيْنِي، يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِيْنَ). واتە: (سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بە سەلامەتی‌و لەشساغی گەیاندمیّ ئێرە. خوایە ئەمە "مِنَی"یەو، من هاتووم بۆی‌و، بەندەی تۆم‌و لە بەردەستی تۆشدام، داوات لیّ دەکەم ئەو منەتە بنێیت بەسەرمدا، کە ناوتە بەسەر دۆستەکانی خۆتدا. خوایە من پەنات پیّ دەگرم لەوەی لە فەزڵو لوتفی تۆ بێبەش ببم‌و، لە ئاینەکەمدا تووشی بەڵاو نەهامەتی ببم، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزەکان).

ئەوجا ئەگەر دەستی کرد بە هاویشتنی بەردەکان بۆ (جَمْرَة)ی (عَقَبَة)، ئیتر هەر لەگەڵ یەکەم بەردیاندا با واز لە تەلبیە کردن بهێنێت‌و، خۆی بە (اللهُ أَكْبَرُ) کردنەوە خەریك بکات‌و، لەگەڵ هەر بەردێکدا (اللهُ أَكْبَرُ)ێك بکات. سونەتیش نیە لەکاتی هاویشتنی بەردەکاندا بوەستێت بۆ دوعا کردن.

خۆ ئەگەر خوێنی حەیوانێکی کەوتبوە سەرو، سەری بڕی، سونەتە لەکاتی سەربڕینەکەدا بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أكبرُ؛ اللَّهُمَّ، صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَسَلِّمْ. اللَّهُمَّ، مِنْكَ وَإِلَيْكَ، تَقَبَّلْ مِنِّي). واتە: (بەناوی خواوە، خوا لە هەمووان گەورەترە. خوایە درودو میهری خۆت بڕژێنە بەسەر پێغەمبەرو خزم‌و کەسوکارەکەیدا. خوایە ئەم حەیوانە لە تۆوەیەو، بۆ تۆشە، دەی تۆش لێم وەرگرە). بەڵام ئەگەر حەیوانەکەی لەبریتی کەسێکی تر سەردەبڕی، ئەوا با بڵێت: (تَقَبَّلْ مِنْ فُلانٍ واتە: خوایە لە فلانە کەسی قبوڵ بکە).

پاشان ئەگەر لەدوای سەربڕینی حەیوانەکە سەری خۆیشی تاشی، ئەوە هەندێك لە زانایانمان بە سونەتیان داناوە، کە لەکاتی سەرتاشینەکەدا دەست بگرێت بە پێشی سەری خۆیەوەو، سیّ جار (اللهُ أَكْبَرُ) بکات‌و، پاشان بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى مَا هَدَانا، وَالْحَمْدُ لِلّهِ عَلَى مَا أنْعَمَ بِهِ عَلَيْنا. اللّهُمَّ، هَذِهِ نَاصِيَتِي، فَتَقَبَّلْ مِنِّي، وَاغْفِرْ لِي ذُنُوْبِي. اللّهُمَّ، اغْفِرْ لِيْ وَلِلْمُحَلِّقِينَ وَالْمُقَصِّرِينَ، يَا وَاسِعَ الْمَغْفِرَةِ، آمِيْن). واتە: (سوپاس‌و ستایش بۆ خوا لەسەر ئەوەی هیدایەتی داوین‌و، لەسەر ئەو نازو

نیعمەتانەش کە ڕژاندوونی بەسەرماندا. خوایە من لەخزمەتی تۆدام، تۆش لێم قبوڵ بکەو، لە تاوانەکانم خۆشبە. خوایە لە منو لەو کەسانەش خۆشبە، کە قژیان دەتاشن، یان دەیقاچن، ئەی ئەو زاتەی، کە خاوەنی لێخۆشبوونێکی فراوانیت، ئەم دوعایەمان لێ قبوڵ بکە).

ئەوجا ئەگەر لە سەرتاشینەکە بوویەوە، با (اللهُ أكْبَرُ) بکاتو، ئەوجا بڵێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِيْ قَضَى عَنَّا نُسُكَنا. اللَّهُمَّ، زِدْنا إِيْمَاناً وَيَقِيْناً وَتَوْفِيْقاً وَعَوْناً، وَاغْفِرْ لَنَا وَلِآبائِنا وَأُمَّهَاتِنَا وَجَمِيْعِ الْمُسْلِمِيْنَ أجْمَعِيْنَ). واتە: (سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە یارمەتی داین بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بەندایەتیە. خوایە باوەڕو دڵنیاییو تەوفیقو یارمەتیمان بۆ زیاد بکەو، لە خۆمانو باوکمانو دایکمانو تەواوی موسوڵمانانیش خۆشبە).

## باسێك سەبارەت بەو زیکرانەی کە لە ڕۆژەکانی (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ)دا لە (مِنَى)دا سونەتن

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە صەحیحی موسلیمدا لە هاوەڵی خۆشەویست (نُبَيْشَةُ الْخَيْر)ی (هُذَلِيّ)ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللَّهِ تَعَالَى».[1] واتە: "سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان ڕۆژی خواردنو خواردنەوەو زیکری خوای گەورەن".

بۆیە سونەتە لەو ڕۆژانەدا زیکر زۆر بکرێتو، باشترینی زیکرەکانیش بریتیە لە خوێندنی قورئانی پیرۆز.

---

(١) بڕوانە: صَحِيْحُ مُسْلِم / ٢ / ٨٠٠ / بە ژمارە: ١١٤١.

ئەوجا ئەگەر لە ڕۆژەکانی هاویشتنی بەردەکاندا، بەردەکانی هاویشت بۆ (جَمْرَة)ی یەکەم، سونەتە لەوێدا ڕابوەستێت‌و، ڕوو بکاتە کەعبەو، (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (اللَّهُ أَكْبَرُ)و (لا إلهَ إلاّ اللَّهُ)و (سُبْحَانَ اللهِ) بکات‌و، بە ملکەچی‌و کزۆڵیەوە دەست بکات بە نزاو پاڕانەوە. ئیتر هەر بەو شێوەیە بە ئەندازەی خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة) بمێنێتەوەو، پاشان با لەلای (جَمْرَة)ی دوەمیشدا –کە ئەوەی ناوەڕاستە– بەهەمان شێوە بکات. بەڵام با لەلای (جَمْرَة)ی سێیەمدا –کە بریتیە لە (جَمْرَة)ی (عَقَبَة)– ڕانەوەستێت.

## باسێك: {زیکر زۆر کردن لەدوای لێبوونەوە لە حەج}

ئەگەر (مِنَى)ی بەجێهێشت ئیتر حەجەکەی تەواو دەبێت‌و، زیکرێك نەماوە کە پەیوەندی بە حەجەکەیەوە هەبێت. بەڵام کەسەکە هەر لە سەفەردایە. بۆیە سونەتە (اللَّهُ أَكْبَرُ)و (لا إلهَ إلاّ اللَّهُ)و (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (سُبْحَانَ اللهِ)و ئەو زیکرانەی تر بکات، کە بۆ کەسی سەفەرکەر سونەتن. کە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت لە جێگەی خۆیدا بە ڕوونی باسیان دەکەین.

ئەگەر چوە ناو شاری (مَكَّة)ی پیرۆزەوەو، ویستی (عُمْرَة) بکات، ئەوا با هەموو ئەو زیکرانە بکات، کە تایبەتن بەو کارانەی کە لە نێوان حەج‌و (عُمْرَة)دا هاوبەشن. ئەوانیش بریتین لە: بەستنی ئیحرام‌و، (طَوَاف)و، هاتوچۆی نێوان (صَفَا)و (مَرْوَة)و، سەربڕینی حەیوان‌و، سەرتاشین. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

## ئەو كەسەی ئاوی (زَمْزَم) دەخواتەوە چی بڵێت؟

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هاوەڵی خۆشەویست (جَابِر)ەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَاءُ زَمْزَمَ لِما شُرِبَ لَهُ».[1] واتە: "ئاوی زەمزەم بۆ ئەو مەبەستە دەشێت، کە بۆی خوراوەتەوە".

ئەمەش یەکێکە لەو حەدیسانەی کە زانایانو پیاوچاکان کاریان پێکردوەو، خواردویانەتەوە بە مەبەستی دەستخستنی هەندێك خواستی گەورەو مەزنو، دواتریش پێی گەیشتون.

زانایان فەرموویانە: هەر کەسێك ئاوی (زَمْزَم)ی بخواتەوە بۆ لێخۆشبوونی تاوانەکانی، یان بۆ چاکبوونەوەی لە نەخۆشی، یان بۆ شتێکی تری هاوشێوە، سونەتە لەکاتی خواردنەوەیدا بڵێت: (خوایە، من پێم گەیشتوە، کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: «مَاءُ زَمْزَمَ لِما شُرِبَ لَهُ». خوایە، وا منیش دەیخۆمەوە تا لێم خۆش ببیتو، فلانە شتو فیسارە شتم بۆ بکەیت، دەی تۆش لێم خۆش بە، یان ئەو کارەم بۆ بکە). یان بڵێت: (خوایە، من دەیخۆمەوە بە مەبەستی چاکبوونەوە لە نەخۆشی، دەی تۆش چاکم بکەرەوە). یان هەر وتەیەکی تری لەم شێوە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە.

---

(١) بڕوانە: سُنَنُ ابْنِ مَاجَه / ٢ /١٠١٨ / بە ژمارە: ٣٠٦٢، وسُـنَنُ الْبَيْهَقِيّ الْكُبْرَى / ٥ /١٤٨ / بە ژمارە: ٩٤٤٢. شێخی (ابْنُ عَلاّن) فەرموویەتی: جیاوازیەکی زۆر هەیە لە فەرمایشتی زانایاندا سەبارەت بە پلەی ئەم حەدیسە، منیش ڕیسالەیەکی تایبەتیم لەبارەوە نوسیوە، بەناونیشانی (النَّهْجُ الْأَقْوَمُ فِي الْكَلامِ عَلَى حَدِيْثِ مَاءِ زَمْزَم)و، دواتریش ئەم ڕیسالەیەم خستۆتە ناو کتێبی (دُرَرُ الْقَلائِدِ فِيْمَا يَتَعَلَّقُ بِزَمْزَمَ وَالسِّقَايَةِ مِنَ الْفَوَائِد). جا پوختەی قسە لەبارەی حەدیسەکەوە ئەوەیە، کە حەدیسێکی (صَحِيْح)ە. بڕوانە: الْفُتُوحَاتُ الرَّبَّانِيَّة / ٥ / ٢٨.

## باسێك سەبارەت بە زیكرەكانی ماڵاوایی و خواحافیزی

ئەگەر ویستی لە شاری (مَكَّة)ی پیرۆز دەربچێت‌و، بەرەو ولاتەكەی خۆی بگەڕێتەوە، با (طَوَاف)ێك بكات بۆ ماڵاوایی كردن‌و خواحافیزی، پاشان با بێت بۆلای (مُتْلَزَم)و، لەوێدا بوەستێت‌و، بڵێت: (خوایە، ئەم ماڵە ماڵی تۆیەو، ئەم بەندەیەش بەندەی تۆیەو، كوڕی كەنیزەكی تۆیە، بەسواری ئەو درووستكراوە ڕامكراوە منت هەڵگرتوە، تا بەم ولاتانەدا هێنامت‌و، هەر بە لوتف‌و نازو نیعمەتی خۆت منت گەیاندە ئێرەو، هاوكاریت كردم لەسەر جێبەجێ كردنی پایەو ئەركەكانی حەج. جا ئەگەر لێم ڕازی بویت، ئەوا زیاتر لێم ڕازی بە، ئەگینا هەر ئێستە لێم ڕازی بە، بەرلەوەی ماڵەكەم لە ماڵەكەت دوربكەوێتەوە. ئەگەر ڕێگەم پێ بدەیت ئێستە كاتی گەڕانەوەمە، من تۆو ماڵەكەت بە هیچی تر ناگۆڕمەوەو، پشتیش ناكەمە تۆو ماڵەكەت. خوایە لاشەم ساغ بكەیت‌و، دینم پارێزراو بكەیت‌و، بە خۆشیش بگەڕێمەوەو، هەتا زیندووشم هەر گوێڕایەڵی تۆ بم‌و، خێرو بێری دوارۆژو دنیاشم پێ ببەخشە، چون بەڕاستی تۆ دەسەلات‌و توانات بەسەر هەموو شتێكدا هەیە).

جا با لە سەرەتای ئەم پاڕانەوەیەو لە كۆتاییەكەشیەوە سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە بكات‌و، صەلاواتیش لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بدات، وەكو پێشتریش باسمان كرد بۆ دوعاو پاڕانەوەكانی تر.

ئەگەر ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا بوو، سونەت وەهایە لای دەرگای مزگەوتدا ڕابوەستێت‌و، ئەم دوعایە بكات‌و، پاشان بگەڕێتەوەو بڕوات. خواش لە هەموو كەس زانا ترە.

## باسێك سەبارەت بە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)و، زیکرەکانی زیارەتەکە

بزانە، کە باشتر وایە بۆ هەر یەکە لەو کەسانەی حەج دەکەن، کە بچن بۆ زیارەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئیتر ئایا لەڕێگەکەیاندا بێت، یان نا. چونکە زیارەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) یەکێکە لە گرنگترین ئەو کارانەی کە مرۆڤی موسوڵمان لە خوای گەورە نزیك دەکەنەوەو، یەکێکیشە لە بەقازانجترینی هەوڵو کۆششەکانو، یەکێکیشە لە باشترینی کارو کردەوەکان.

جا ئەگەر بەڕێکەوت بۆ زیارەتەکە، با لە ڕێگەدا صەلاوات زۆر بداتو، هەرکاتێکیش چاوی کەوتە سەر دارو درەختەکانو حەرەمو سنوری شاری مەدینەی پیرۆز، ئیتر با صەلاوات زیاتر بداتو، داواش لە خوای گەورە بکات، کە بەم زیارەتە سودمەندی بکاتو، لە هەردوو دنیا بەختەوەری بکات.

هەروەها با بڵێت: (خوایە، دەرگاکانی سۆزو بەزەیی خۆتم لێ بکەرەوەو، لەم زیارەتەی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرەکەتدا ئەو خەڵاتەم پێشکەش بکە، کە پێشکەشی دۆستەکانو بەندە گوێڕایەڵەکانی خۆتت کردوەو، لێشم خۆش ببەو، بەزەییت پێمدا بێتەوە، ئەی باشترین داوالێکراو).

ئەوجا ئەگەر ویستی بچێتە ناو مزگەوتەوە، سونەتە هەر ئەوە بڵێت، کە لەکاتی چوونە ژوورەوەی مزگەوتەکانی تردا دەیڵێت، کە پێشتر لە سەرەتای کتێبەکەدا باسمان کرد.

پاشان ئەگەر نوێژی سڵاوی مزگەوتی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) کرد، ئیتر با بێت بۆ خزمەتی گۆڕە پیرۆزەکەی پێغەمبەرو، ڕووی تێ بکاتو، پشت بکاتە قیبلەو، بە ئەندازەی چوار باڵ دوور لە دیواری گۆڕەکە بوەستێتو، بەبێ دەنگ بەرز کردنەوە سڵاو بکاتو، بڵێت: (السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ الله، السَّلامُ عَلَيْكَ يا خِيرَةَ

اللهِ مِنْ خَلْقِهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يَا حَبِيبَ اللَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكَ يَا سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ، السَّلامُ عَلَيْكَ وَعلى آلِكَ وأصْحابِكَ وأهْلِ بَيْتِكَ وَعَلَى النَّبِيِّينَ وَسَائِرِ الصَّالِحِينَ؛ أشْهَدُ أنَّكَ بَلَّغْتَ الرِّسالَةَ، وأدَّيْتَ الْأمانَةَ، وَنَصَحْتَ الْأُمَّةَ، فَجَزَاكَ اللَّهُ عَنَّا أفْضَلَ مَا جَزَى رَسُولاً عَنْ أُمَّتِهِ). واته: (سڵاوت لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا، سڵاوت لەسەر ئەی باشترین درووستکراوی خوا، سڵاوت لەسەر ئەی خۆشەویستی خوا، سڵاوت لەسەر ئەی سەردارو کۆتایی پێغەمبەران، سڵاو لەسەر خۆتو لەسەر خزمو کەسوکارو هاوەڵەکانو خانەوادەکەتو، لەسەر پێغەمبەرانو تێکڕای پیاوچاکانیش. من شایەتی دەدەم کە تۆ پەیامەکەت گەیاندوەو، سپاردەکەت بەجێگەیاندوەو، ئامۆژگاری ئومەتەکەت کردوە. دەی خوا لەبریتی ئێمە باشترین پاداشتت بداتەوە، باشتر لەو پاداشتەی کە دەیدات بە پێغەمبەرێك لەبرێتی ئومەتەکەی).

ئەگەر کەسێکیش ڕایسپاردبوو کە سڵاو لە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بکات، با بڵێت: (سڵاوت لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا لە برێتی فلانی کوڕی فلان).

ئەوجا با بە ئەندازەی باڵێك بگەڕێتەوە بۆلای ڕاستو، سڵاو بکات لە ئیمامی (أَبُو بَكْرٍ) (خوای لێ ڕازی بێت). پاشان باڵێکی تریش بگەڕێتەوە بۆ سڵاو کردن لە ئیمامی (عُمَر) (خوای لێ ڕازی بێت). پاشان بگەڕێتەوە بۆ جێگەکەی یەکەم جاریو، ڕوو بە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕابوەستێتو، بیکات بە وەسیلە بۆ خۆیو، بیکات بە تکاکار بۆلای خوای پەروەردگارو، دوعاش بکات بۆ خۆیو دایكو باوکیو هاوڕێکانیو دۆستو خۆشەویستەکانیو، ئەوانەش چاکەیان لەگەڵدا کردوەو، دوعاش بۆ تێکڕای موسوڵمانان بکاتو، زۆریش خۆی بە دوعا کردنەوە خەریك بکاتو، ڕاوەستانەکەی لەو جێگە پیرۆزەدا بە خەڵاتێکی گەورە بزانێتو، (الْحَمْدُ لِلَّهِ)و (سُبْحَانَ اللهِ)و (اللهُ أكْبَرُ)و (لا إلهَ إلاّ اللهُ) بکاتو، صەلاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بداتو، هەموو ئەمانە زۆر

بکاتو، پاشان بچێت بۆلای (رَوْضَة)ی پیرۆز -کە لەنێوان گۆڕی پیرۆزیو مینبەرەکەیدایە- لەوێش دوعا زۆر بکات.

بۆمان ڕیوایەت کراوە لە هەردوو صەحیحی بوخاریو موسلیمدا، لە هاوەڵی خۆشەویست (أَبُو هُرَيْرَة)وە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: «مَا بَيْنَ قَبْرِيْ وَمِنْبَرِيْ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ».(۱) واتە: "نێوان گۆڕو مینبەرەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت".

جا ئەگەر ویستی لە شاری مەدینەی پیرۆز دەرچێتو سەفەر بکات، سونەتە بە دوو ڕکات نوێژ خواحافیزی لە مزگەوتەکە بکاتو، چی دوعایەکیشی پێخۆشە بیکاتو، پاشان بێتەوە خزمەتی گۆڕە پیرۆزەکەو، هەروەکو یەکەم جار سڵاو بکاتەوەو، دوعاکە دوبارە بکاتەوەو،ماڵئاواییو خواحافیزی لە پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) بکاتو، بڵێت: (خوایە ئەم زیارەتەم نەکەیت بە دوایین جار کە بێمە خزمەتی پێغەمبەرەکەتو، بە منەتو فەزڵی خۆت ڕێگایەکی ئاسانم بۆ دەستەبەر بکە، تا بگەڕێمەوە بۆ هەردوو شارە پیرۆزەکەی (مَكَّة)و مەدینەو، لە دنیاو دۆڕۆژدا لێبوردنو لەشساغیم پێ ببەخشەو، بە سەلامەتیو بە دەستکەوتو بەبێ ترس بمانگەڕێنەرەوە بۆ وڵاتەکانی خۆمان).

ئیتر ئەمە کۆتایی ئەو زیکرانەی حەج بوون، کە خوای گەورە سەرکەوتووی کردم لە کۆکردنەوەیاندا. جا ئەگەرچی جۆرە درێژ کردنەوەیەکیشی تێدابوو نیسبەت بە ئەصڵی کتێبەکە، بەڵام نیسبەت بەوەی کە لەو بارەوە ئاگامان لێیەتی هەر کورتە.

---

(۱) لە هیچکامیاندا بەو دەقە نەهاتوە، بەڵکو بەم دەقە هاتوە: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ». بڕوانە: صَحِيْحُ الْبُخَارِيِّ / ۱ / ۳۹۹ / بە ژمارە: ۱۱۳۸، وصَحِيْحُ مُسْلِم / ۲ / ۱۰۱۰ / بە ژمارە: ۱۳۹۰. هەروەها حەدیسەکە لە ڕێگەی هەریەکە لە (أَبُو هُرَيْرَة)و (عَبْدُالله)ی کوڕی (زَيْد)ی (مَازِنِيّ)شەوە ڕیوایەت کراوە.

داوا لە خوای بەخشندە دەکەین، کە سەرکەوتومان بکا بۆ گوێڕایەڵی کردنی بڕیارەکانیو، لەگەڵ براکانماندا لە ماڵە بەڕێزەکەی خۆیدا کۆمان بکاتەوە.

جا من لە کتێبی (الْمَنَاسِك)دا هەندێك باسی تەواوکەرو ئەو لقەباسانەشم ڕوون کردۆتەوە، کە پەیوەندیان بەم زیکرانەوە هەیە. خواش لە هەموو کەس زانا ترە بە بۆچوونی ڕاستو درووست. هەموو سوپاسو ستایشێکیش هەر شایستەی ئەوەو، هەموو نازو نیعمەتو سەرکەوتنو پاراستنێکیش هەر لە ئەوەوەیە.

لە (عُتْبِيّ)ـەوە هاتوە -کە (ناوی: مُحَمَّدُ بنُ عُبَيْدِ اللهِ بنِ عَمْرِو بنِ مُعَاوِيَةَ بنِ عَمْرِو بنِ عُتْبَةَ بنِ أَبِي سُفْيَانَ بنِ حَرْب)ـە- ئەو فەرموویەتی: لە خزمەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لەسەر بێت) دانیشتبووم، ئەوەبوو عەرەبێکی دەشتەکی هاتو، وتی: سلاوت لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا. بیستوومە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاؤُوكَ فاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ واسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّاباً رَحِيماً﴾ [النّساء: ٦٤] واتە: {خۆ ئەگەر ئەوانە لەو کاتەی ستەمێك لە نەفسی خۆیان دەکەنو، تاوانێك ئەنجام دەدەن، ئەگەر بێنە خزمەتی تۆو، داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەنو، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات، دەبینن کە خوای گەورە زۆر لێبوردەو میهرەبانە}. جا وا منیش هاتوومەتە خزمەتت، داوای لێخۆشبوونی تاوانەکانم دەکەمو، تۆش دەکەم بە تکاکار بۆلای پەروەردگارم. ئەوجا وتی:

يَا خَيْرَ مَنْ دُفِنَتْ بِالْقَـاعِ أعْظُمُـهُ فَطَابَ مِنْ طِيْبِهِنَّ الْقَـاعُ وَالْـأكَمُ
نَفْسِي الْفِدَاءُ لِقَبْرٍ أنْـتَ سَـاكِنُهُ فِيْهِ الْعَفَافُ وَفِيْهِ الْجُـوْدُ وَالْكَـرَمُ

واتە: ئەی باشترین کەسێك، کە لاشەو ئێسکە پیرۆزەکانی لەناو زەویدا شاردراونەتەوەو، لە بۆنخۆشی ئەوانیشەوە دەشتو تەختاییو تەپۆڵکەو بەرزاییەکانیش بۆنخۆش بوون، گیانم قوربانی ئەو گۆڕەی تۆی تێدا نیشتەجێیتو، پڕە لە پاکێتیو بەخشندەییو ڕێزو حورمەت.

ئەوجا هەستا ڕۆیشت‌و، منیش چاوەکانم نیشتنە سەریەك‌و، لە خەودا بەخزمەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) گەیشتم‌و، پێی فەرمووم: ئەی (عُتْبِيّ)، بڕۆ بگە بە کابرای دەشتەکی‌و، مژدەی بدەرێ، کە خوای گەورە لێی خۆش بوو.[1]

* * * * *　　* * * * *　　* * * * *

(١) هەروەها شێخی (ابْنُ الْجَوْزِيّ)و شێخی (ابْنُ النَّجَّار)و شێخی (ابْنُ عَسَاكِر)یش چیرۆکێکی هاوونەی ئەمەیان لە (مُحَمَّد)ی کوڕی (حَرْب)ی (هِلالِيّ)ـەوە گێڕاوەتەوە. بڕوانە: مُثِيْرُ الْغَرَامِ السَّاكِنِ إِلَى أشْرَفِ الْأمَاكِنِ / ٤٩٠، والدُّرَّةُ الثَّمِيْنَة فِيْ أخْبَارِ الْمَدِيْنَة (ابْنُ النَّجَّار) / ١٥٨ – ١٥٩، وإتْحَافُ الزَّائِرِ وَإطْرَافُ الْمُقِيْمِ لِلسَّائِرِ فِيْ زِيَارَةِ النَّبِيّ -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ابْنُ عَسَاكِر) / ٥٤ – ٥٥.

هەروەها بڕوانە هەریەکە لە: إمْتَاعُ الْأسْمَاعِ بما لِلنَّبِيِّ مِنَ الْأحْوَالِ وَالْأمْوَالِ وَالْحَفَدَةِ وَالْمَتَاعِ (الْمَقْرِيْزِيّ) / ١٤ / ٦١٥، ووَفَاء الْوَفَا بأخْبَارِ دَارِ الْمُصْطَفَى (السَّمْهُوْدِيّ) / ٤ / ١٨٥ – ١٨٦، والْمَوَاهِبُ اللَّدُنِّيَّة بِالْمِنَحِ الْمُحَمَّدِيَّة (الْقَسْطَلانِيّ) / ٣ / ٥٩٦ – ٥٩٧، وسُبُلُ الْهُدَى وَالرَّشَاد فِيْ سِيْرَةِ خَيْرِ الْعِبَاد (الصَّالِحِيّ) / ١٢ / ٣٨٠ – ٣٨١.

# ناوەڕۆكی بەرگی یەكەم